کەلیموڵڵای تەوەحودی

وەرگێڕانی: عەدنان بەرزنجی

# کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

(بەشی دووەم)

کەلیموڵڵا تەوەحودی

# کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

(بەشی دووەم)

وەرگێڕانی

عەدنان بەرزنجی

سلێمانی ٢٠٠٦

ناوی کتێب: کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان

نووسینی:  کەلیموڵڵا تەوەحودی

وەرگێڕانی: عەدنان بەرزنجی

بابەت: مێژوویی

بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

بەرگ: قادر میرخان

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق

تیراژ:  ۱۰۰۰ دانە

نرخ: ۳۰۰۰ دینار

ژمارەی سپاردن:  ٥٩٤ ی ۲۰۰٥

چاپی : یەکەم ساڵی ۲۰۰٦

چاپ: دەزگای حەمدی

کوردستان -سلێمانی

www.sardam.info

به ناوی خوا

# پێشەکی وەرگێڕ

یـــان لـەناو بۆگەن و نزمایی ژیان        یان بە سەربەرزییەوە بسپێرە گیان

ئەوینی نەتەوە و گەل، ئەوینی نیشتمان و ئاو و خاك، ئەوین بە گیانی بەرزی مرۆڤایەتی بۆتە جەوهەری قەڵەمەکەم، هەرچەند دەکەم خولیای تاسەباری ئـەم عەشـقەم دەسـتم لـێ بـەر نادات. ئەوەتا لەم رۆژانەدا چـاوم بـە یەکـەم کۆرپـەی وەرگێـڕان کـەوت، زۆر گەشـامەوە و لـە کانگای دڵمەوە لە خودا پاڕامەوە تاکو ئەو هێز و هەڵمەتەم پێ بدات بـەڵکو بتـوانم هـەنگاوی گەورەتر و چالاکانەتر بۆ سەربەستی کوردستان هەڵ بگرم. گەرچی کارەکەی من لە چـاوی ئـەم نیشتمانەدا زۆر بچووکە، بەڵام بۆ خۆم و بۆ ئەم رادەی هەڵمەتە باش و لەبارە.

چەند خاڵی هەرە باش لەم کتێبەدا هەیە کە هەر وەکو لە بەرگی یەکەمدا ئامـاژەم پێـی کردهێنانەوەی بەڵگەکانە بە بێ ئەوەی نووسـەر دەسـتی تـێ ببـات. هـەر وەهـا لێکۆڵینـەوەی مەیدانی نووسەر لەسەر ناوچە و گوندەکانی خوراسان بۆ وەدەست هێنـانی بەڵگـە و پـەرتووکی مێژوویی زۆر لەبەرچاوە. ئەرکە لەسـەر ئێمـەی کـورد کـە ئـەم هەوڵـەی نووسـەر لەبەرچـاو ون نەکەین و هەر وەها دەبێ رای بگەینم کە هاتنەدەرەوەی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە بـە کـوردی هاوکات بوو لەگەڵ بەچاپ گەیشتنی کتێبێکیتری نووسەر بە نـاوی «نادرشـای ئەفـشار» کـە ئەویش بەڵگەییەکی هەرە چاکە بۆناساندنی بەشێکیتر لە مێژووی تاریکی کوردسـتان و پیـاوە مەزنە کردەکان کە مێژووی ئێران و عـەرەب ئاماژەی پێ نەکردووە. زۆر بە کورتی دەبێ سپاسی

هەوڵ و تێکۆشانی بەڕێزان کاك ئاری و کاك ئاراز عەبدی و خوشکە بەیان زەمانی بکەم کە بۆ نووسین و تایپی ئەم کتێبە یارمەتی زۆریان داوم و هەروەها سپاسی تایبەتی خۆم ئاراستەی دایکی میهرەبانم دەکەم کە هانی دام بۆ قەت رانەوەستانم. سپاس بۆ بنەماڵەکەم بە گشتی. هیوام سەرکەوتنی هەموو گەلانی ژێر چەپۆکەیە.

بە سپاسەوە

وەرگێڕ: عەدنان بەرزنجی/ سنە پاییزی ٢٠٠٥

# پێشەکی نووسەر

دروشمی گشتی کوردەکانی ئێران بە تایبەت کرمانجی خوراسان پاراستنی سەربەخۆیی ئێران و هەلکردنی ئالآی ولآتەکە بووە. هەر بۆیە زۆر کەس لەم کوردانە لەم ڕێگادا بوون بە قوربانی، هەر وەکو سەرلەشکر سەردادوەر دەفەرمێت: ئەگەر کوردەکان و ئەفشارەکان لە باکووری خوراسانەوە نەبوایان خوا ئەزانێ چی دەهات بە سەر خەلکی ئەم ناوچانەدا.

کوردەکان وەکو لەمپەری ڕێگای ئوزبەکەکان و تورکمانەکان وەستان، بەلآم کاتی بۆ مێژووی ئێران دەڕوانین قەت یەك ڕستەش سەبارەت بە ئازایەتی کوردەکان نایتە بەرچاومان و ئەوەش لە بەر ئەوەی کە مێژوونووسان لەتاو سەرکردەکانیان نەیانوێراوە بینووسن. بە داخەوە کوردەکان زۆر ساویلکە بوون و هەر خەریکی پاراستنی سنوورەکان بوون بە هێزی دەست و زۆری باسك شانازیان دەکرد و ئیتر نەکەوتنە بیری زانیاری و خوێندن و هەر ئەوە بوو بە هۆی جیمانی گەلەکەمان تەنانەت کەسیشمان تێدا هەلنەکەوت کە مێژووی ئەو هەموو گیانبازیە بنووسێ. زۆر لە ڕۆژ ئاشکراترە ئەگەر پەرتووك و نامیلکەی ڕۆژهەلآتناسان نەبوایات ئێستاش ئەو تۆزە زانیاریەمان سەبارەت بە کورد نەدەبوو.

ئەگەر پێش ئەوەی ڕەزاشای پالەوی دەسەلآت پەیدا بکات کەسانێ بیریان لە نووسینی مێژووی کوردی کرمانج بکردبایات بە متمانەوە دەلێم کە ئێمە ئێستا خاوەنی زۆر شت بووین و ئاستی زانستمان زۆر لەسەرەوە بوو. بۆیە حەز بە بێدەنگ بوون ناکەم و پڕ بە دلّ هاوار ئەکەم. هاوار، هاوار تا کۆیەرەی داهاتوو هوشیاری خۆیان و نەتەوەکەیان بن.

متمانەم هەیە کە مێژووی کورد (کورمانج) بەم تۆزە نووسینەم دوای پێی نایە و هەروەها هەمووی ڕاستییەکانم نەتوانیوە بدرکێنم، لەبەر ئەوەی زۆر بەلگە هەیە کە هێشتا نەکەوتوونەتە دەستی من تاکۆ بیاننووسم و بۆیە هەر لێرەوە داوای یارمەتی هەمەچەشنە دەکەم لە برا و

خوشکانی هێژام بۆ پەرەدان بە کاری گەورەتر بۆ گەلەکەمان و زیندوو کردنەوەی ناوی گەورەپیاوانمان.

وەك فیردەوسی دەفەرمێ:

| | |
|---|---|
| چنین نامداران و گردنکشان | کە دادم یکایک از ایشان نشان |
| همە مردە از روزگار دراز | شد از گفت من نامشان زندە باز |
| چو عیسی من این مردگان را تمام | سراسر همە زندە کردم بە نام |

واتا: ئەم کەڵە پیاوانەی کە ناونیشانیانم دا

هەموویان مردووبوون دوای باسەکەی من ناویان زیندوو بووەوە

من هەر وەکو عیسای مەسیح هەمووی ئەم مردووانەم بە ناو زیندوو کردەوە

ئەمڕۆ کە کوردەکان لە سەرانسەر جیهاندا پەڵپەل بوونەتەوە، بەڵام هەر ئێرانی و موسڵمان چ ئەو کوردانەی کە لە لوبنانن، چ ئەوانەی کە لە سووریە و عێراق و تورکیە و ڕووسیە و ئێران و پاکستان و هیند و ئەفغانستان... هتدن.

ئەگەر وڵاتی ئێران بە بۆنەی خوێڕێ بوونی دەسەڵاتدارەکانیەوە بوو بە هۆی پەڵپەل بوونی وڵاتی پان و بەرینی کوردستانەوە ڕەخنە لە کوردەکان نابێ بگیردرێت و هەمووی تف و نفرینەکان موبارەکی دەسەڵاتدارە خوێڕیەکانی ئێرانی دوای کەریمخانی زەند بێت.١

کورد هەر ئێرانیە و ئێران مەڵبەندی کوردە

تەوەحودی

---

١- دریك کونان مامۆستای زانکۆی بەغداد دەڵێت: وڵاتی کوردستان بە گشتی سەر بە ئێران بووە، لە سەدەی ١٥ی زایینیدا دەسەڵاتی ئێران کەم بووەوە و ئیمپراتووری عوسمانی بەشی زۆری کوردستانی داگیر کرد.

هەر لە ساڵی ٦١٢ی پێش زایینەوە کە ئێرانیەکان (ماد) ئیمپراتووری ئاشووریان شکست دا، کوردستان هەر لە داوێنی ئێراندا بووە تا ساڵی ١٥١٤ی زایینی واتا شەڕی چالدوران.

کورد و کوردستان، دریك کونان

وەرگێر: هاتێفی ل ٢٥

# کوردەکان، بەناوبانگترین سنوورەوانەکانی ئێران

بە شایەتی مێژوو، نەتەوەی کورد کە لە کۆنترین ئاریاییەکانن و لە ناوچەی بەرپانی ئاسیادا نیشتەجێ بوون و ناوی ئێرانیان بۆ ئەم ناوچەیە تەرخان کرد کە بە مانای «پەرەستشگا»یە[٢] و یەکەمین حکوومەتی ڕێکوپێکی دنیا لە ژێر ناوی «ماد»دا بەدیهات و دژ بە زلهێزەکانی ئەو ڕۆژەی دنیا وەستان و وڵاتی ئێرانیان لە هێرشی ئەو دەسەڵاتانە پاراست.

مێژووی ئێران سەرانسەر باسی ئازایەتی و لێهاتوویی کوردەکان دەکات، هەمووی ئەو ڕەنج و تێکۆشانەش بۆ یەك مەبەستە و ئەویش «پاراستنی سەربەخۆیی ئێران».

«گزنفۆن» مێژوونووسی بەناوبانگی یوونانی لە کتێبی «گەڕانەوەی دە هەزار یوونانی»دا دەنوسێت: کاتێ کە سوپای هەرەگەورەی دەهەزار کەسی لە باکووری نێوان دوو ڕووبار (بین‌النهرین)ەوە گەیشتنە وڵاتی کوردەکان، خۆیانیان لە بەرانبەر دیواری شکستناپەزێری کوردەوە بینی کە تا ئەوڕۆ لەشکر و سوپای بەهێزی وەهایان نەدیبوو. ناوبراو سەبارەت بە یەکێ لە کوژراوەکانی سوپای یوونان بە دەستی کوردەکان دەنووسێت: تیر کڵاوەخوودە ئاسنیەکەی شکاندبوو و مێشك و ئێسقانی هاڕیبوو. ئەمن هیچ کاتێ چەکداری بەهێزم وەکو چەکدارە کوردکان نەدیوە. تیر و کەمانەکانیان سێ ئەرەش دەبێت. هەروەها کاتێ کە تاقمێك

---

٢- کوردەکان وشەی ئێرانیان لەگەڵ «ی» نەناسراودا دەخوێندەوە و شێوەی نووسینی کوردی وشەی «ایران» بە شێوەی «ئێران» و «ئێر»، «ئار»ە کە هەردووکیان بە مانای «موقەدەس» و «ئاگر»ن. لەوێوە کە ئاگر لە مێژووی ئێراندا بە پاکترین کەرەستەکان ئەژمێردراوە و هەموو کاتێ خەڵك پێداویستیان پێی بووە و ئەم وشەیەش لە«ئێر»ەوە گیراوە و لەبەر ئەوەی وڵاتی ئێران وەکو ئاگر جێگای ڕێز و حورمەت بووە، بۆیە ناوی ئێرانیان بۆی تەرخان کردووە کە دەتوانین مانای ڕێزدار و خۆشەویستی لێ بکەینەوە. لێرە وا بە جوانی مانای ئاریایی دەردەکەوێ کە بە دانیشتوانی ناوچەی ئێران گوتراوە. دوای ماوەیێك بڕێك لەو ئاریاییانە کە کورد نین لەم وڵاتە کۆچ دەکەن و ڕوو دەکەنە هێندۆستان و ئەورووپا و بەشی هێندوئەورووپی پێك دەهێنن، کەچی ئەمڕۆ کاتێ بە جوانی بۆ زمانەکانی ئەورووپایی وەکو فەڕانسەوی و ئینگلیس و ئەڵمانی دەڕوانین زۆر وشە دەبینین کە لە کوردیشدا هەن و ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەخەن. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە کتێبی «دایرەتولمەعارف کورمانجی»دا.

لە کوردکان گەمارۆی ئەم سوپایە ئەدەن، سەرۆکی سوپای یوونانیەکان دەگات بەو قەناعەتەی کە توانای بەربەرەکانێیان نیە.

ڕاستی هەر وایە، بە درێژایی مێژوو بۆمان دەرکەوتووە کە هەر زاڵمێك ویستبێتی ناوچە و وڵاتی ئێران بە زۆر داگیر بکات، گەلی کوردی وەکو لەمپەرێك لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجەکانیدا دیوە و ڕێگەچاری هەر پەشیمانبوونەوە و دەستهەڵگرتن لە داگیرکردنی ئەم زێدووڵاتە بووە. ئەو کەسانەی کە بەو باوەڕەن کە کوردەکان دەیانەوێ لە ئێران جیا ببنەوە و سەربەخۆ بن، هەڵە دەکەن و بیروباوەڕێکی جوانیان نییە، چونکە ئێران زێدی کوردەکانە و کورد بە بێ‌ئێران و ئێران بە بێ‌کورد بێ‌مانایە. کورد لە هەر شوێنێك بێت هەر ئێرانیە؛ بەڵام بە داخەوە لەم چەند سەدەی ڕابردووەدا وڵاتی ئێران بە بۆنەی لاوازبوونی دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە دابەش بووەتە نێوان دراوسێکاندا و هەر کام بەشێك لە کوردستانیان دابڕکردووە. ئەمە بەو مانایە نییە کە کوردەکانی سێ پارچەی ناوچەکانی‌تر ئێرانی‌بوونی خۆیانیان لە بیر بردبێتەوە و بۆ زەقکردنەوەی ئەم ڕاستیەش دەتوانین ئاماژە بە شەڕوپێکدادانی کوردەکان دژ بە دەسەڵاتدارەکانی ئەو وڵاتانە بکەین؛ وەکو شەڕی کوردەکانی لوبنان و عێراق و سووریە لەگەڵ دەسەڵاتدارە عەرەبەکاندا و هەروەها شەڕی کوردکانی تورکیە لەگەڵ دەسەڵاتی تورکیەدا. ئەو کاتەی کە شەڕی نێوان ڕژێمی فاشیستی بەعسی عێراق لەگەڵ ئێراندا دەستی پێکرد، بینیمان کە کوردەکان هەر سەر بە خەڵکی ئێران بوون. کوردەکان بە درێژی مێژوو لایەنگری زێدووڵات و کولتووری نەتەوەیی و ناوچەیی خۆیان بوون. دەستەبراوەکەی قارەمانێ وەکو سارۆبیرە لە شەڕی چاڵدوڕان و ئەمیرخان برادۆست (لەپزێڕین) لە ئازربایجان و قەلبە ئەنجن ئەنجن کراوەکەی جەجووخان لە خوراساندا هەمووی دڵۆپێکە لە زەریاری ئازایەتی گەلی کورد. دوای ئاماژە کردن بە ئازایەتی کوردەکانی خوراسان لە شەڕی نێوان عێراق و ئێراندا زۆر سووچ و لایەنی تاریکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە ئەگەر تەنیا بە ناوی کەڵە قارەمانە کوردانەی ئەو شەڕە ئاماژە بکەین کتێبێکی گەورەی دەوێت کە بینووسین. مەبەستمان لەم باسانە ئەوەیە کە ئێمپریالیستەکان بزانن ئێمەی ئێرانی و بە تایبەت کورد لەو کەسانە نین کە ئەوان بە ئاسانی بتوانن شەشخانی

هومێدمان لێ ببەستن. ژنە کوردەکان ئەو دایکانەن کە ڕۆڵەگەلێك وەکو سەلاحەدین ئەیووبی و سەردار عێوەز زەعفەرانلویان لە داوێنی خۆیاندا پەروەردە کردووە.

ئەمیر حسەینخان زەعفەرانلوو دەفەرمێت: «خۆ ئێمە ماستاو نین ڕووسیەکان هەڵمانلووشێنن، ئێمە دیوارێکمان لە پیاو، پێك هێناوە کە لە دیواری بەردیش بەبڕشتترە.»

هیدایەت بەیگ هەورامانی یەکێ لەو سەردارە کوردانەیە کە لە شەڕی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی دەسەڵاتداری سوڵتان موحەمەد سەفەوی (باوکی شاعەباس) و سوڵتان موراد عوسمانیدا لە ناوچەی قەراباغ ڕوویدا و بەشداری کردووە، هاوکات کە دەستی چەپی ئەبڕێت، تەنیا بە دەستێکەوە شەڕی کردووە و سەربازە ئێرانیەکانیشی هان داوە تاکو نەترسانە شەڕ بکەن. لەم شەڕەدا دوو ئامرهێزی سوپای ئێران یانێ داوودسوڵتان ڕوملوو و ئەرەسخان دەکوژرێن. سوپای ئێران لەم شەڕەدا پێکهاتێك بوو لە ٧ هەزار کەس لە خەڵکی شیروان، چەخوورسەعد، گەنجە و شۆماخی. سوپای عوسمانیش ٥٠ هەزار کەس بوون. کوردکانی موکری، کەلهوڕ، چەمەشگەزك، شادلوو، زیك و زەنگەنە بە سەرۆکایەتی حەمزە میرزایی وەلیعەهدەوە ئازایەتییێکی زۆریان پیشان داوە. (بۆ زانیاری زۆرتر بڕواننە کتێبی عالەمئارای عەباسی، ل ٨٧)

هەروەها لە شەڕەکانی نێوان ئێران و ڕۆم کە لە سەردەمی شاتەهماسبی یەکەم بە سەرۆکایەتی ئیسماعیل میرزا (شائیسماعیلی دووەم) ڕووی دا، کەسانێ وەك سەلیمخان کورد زەنگەنە، حەیدەرخان زەنگنە و شەهباز سوڵتان بانەیی و مورتەزا قولیخان ئەردەڵان و خانەکانیتری جەلالی و مەحموودی و موکری و چامەشگەزك ئازایەتی و لێهاتوویێکی زۆریان لە خۆیانەوە پیشان داوە.[٣]

٣– ئێران و قەزیەی ئێرانی، لورد کەرزەن، وەرگێڕاوی وەحید مازندەرانی، ل ١٧٢–١٥٠.

# کوردەکان لە ئێرانی باستاندا

وەك گوتمان کوردەکان بۆ هیچ کاتێ خۆیانیان لە ئێران جیا نەکردۆتەوە و بۆ پاراستنی ئاووخاکی زێدوولاتی خۆیان ڕەنج و تێکۆشانیان داوە. کاتێ بۆ کتێبە مێژووییەکانی ئێران و جیهان بە تایبەت کتێبی «گەڕانەوەی دەهەزار یوونانی» نووسراوەی گزنفوون سەرداری بەناوبانگی یوونانیەکان دەڕوانینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە سەربازە داگیرکەرە یوونانیەکان چلۆن لە بەرانبەر سەربازە کوردکانەوە شکست دەخۆن. کاتێ کە یوونانیەکان گەیشتنە ناوچەی کوردنشینی مووسڵ کە ئەوان بەو ناوچەیان گرتووە «ولاتی کوردووکەکان» یان «کوردەکان». لە هەمان کاتدا دەڵێن کاتێ کە سەربازە ئێرانیەکانمان دیل دەکرد و دەیانمانخستە بەر باسوخواست،[٤] ئەوان دەیانگوت: «ئەم کوردانە خەلکێکی شەڕکەر و بەبڕشت و ئازا و لێهاتوون.» کاتێ کە پاشای هەخامەنشی سوپایەکی ١٢٠ هەزار کەسی نارد بۆ شەڕی ئەم کوردانە، هەمووی ئەم سوپایە کوژرا و تەنانەت تاقەکەسیان لێ دەرنەچوو. سەربازە ئێرانیەکان دەیانگوت: ئەگەر ئێوە بتوانن خۆتان بە دەست کوردەکانەوە ڕزگار بکەن، بچنە ئەرمەنستان - کە یەکێ لە ولاتە دەولەمەندەکانی ئێرانە- کەلك و قازانجی زۆرتان وەدەست دەکەوێ. یەکەمین ڕێگای کوێستانی کوردستان بە ئێمەوە نزدیك بوو، بۆیە ئێمەش بەر لە ئەوەی کوردکان بکەونە بیری ئەوەی بەرەنگاری ئێمە ببنەوە کەوتینە بیری ئەوەی کە ئەو شوێنە بگرینە دەستەوە و فەرمانمان دا بە هێزەکانی خۆمان تاکو وەرگەڕێنەوە شوێنەکەی خۆیان و خۆیان برازێننەوە بۆ هێرشی دوایی. لە دۆڵ و نشێوەکاندا گوندگەلێکی بچووك دەبیسران کە خەلك ئەو گوندانەیان بەجێهێشتبوو و هاوڕێ لەگەڵ ژن و منداڵەکانیاندا پەنایان بردبووە شاخ و کێوەکان. ئێمە پێداویستی و کەلوپەل و پێخۆری زۆرمان بردبوو کە نەوەك هێزەکانمان بکەونە بیری دزی و تالان کردن، ئەگەرچی ئەو مسینانەی کە لە مالی کوردەکاندا بوو، نەمانئەتوانی چاوی لێ دابخەین، بەلام نەماندەویست لە هیچ ئاستێکدا جەردەگەری بکەین،

٤– پێم وایە هێزەکانی داریووشی دووەمی هەخامەنشی بووبێتن کە ئەم شکستەیان خواردووە.

چونکه مەبەستمان ئەوە بوو کە دڵی کوردەکان وەدەست بهێنین، بەڵکو بتوانین بە بێ‌شەڕ و پێکدادان بە مەبەستەکانی خۆمان بگەین. هەر کوردێکمان کە ئەبینی و دەمانگوت ئێمەش وەکو ئێوە دژی پاشای ئێران وەستاوین قەت وڵامێکمان نەدەبیست. نیوەشەو کاتێ کە لە کوێستانەوە گەیشتینەوە گوندەکان، کوردەکان پەلاماری ئێمەیان دا و ئەمە ئەو ڕاستیەی ئەنواند کە کوردەکان ئەتوانن ئەژماری خۆیان زیاد بکەن و هێزەکان بەرەو نەمان و شکست بتلێننەوە. ئێمەش لە ڕووی ناچارییەوە شەوانە لە دۆڵەکاندا دەماینەوە و زۆریش ئەترساین چونکە هێزە کوردکان لە سەر شاخەکانەوە بوون و هەموو کاتێ لەوە دەترساین کە هێرش بهێننە سەرمان.

بەیانی ڕۆژی دوایی ئەمن و سەرۆکەکانی‌تری سوپای یوونان گەیشتینە ئەو قەناعەتەی کە هەموو دیلەکان و هەرچی کە پێداویستی سوپاکە نییە لەوێ بەجێ بهێلین و خۆمان لە ڕێگاییێکی بەرتەسکەوە بڕۆین. ئەو ڕۆژە تۆزێك شەڕ کرا، بەڵام ڕۆژی دوایی بایەکی زۆر توند و بەبڕشت هەڵیکرد. لە هەمان کاتیشدا کوردەکان دەستیان کرد بە تیر هاویشتن و ئێمە لە ڕووی ناچارییەوە هێمن‌هێمن ڕێگای خۆمانمان لەبەر گرت و ڕۆیشتین (لێرەدا گزنفۆن لەوە سەری سوڕماوە کە چلۆن تیری کوردەکان ئەوەندە تیژ بووە کە کڵاوخوودی سەربازە یوونانیەکان بدڕێنێ و ببێتە هۆی کوشتنیان). هاوکات دەڵێ هیچ کاتێ شتێکی‌تری سەرسوڕهێنەرم وەکو تیری کوردەکان نەبینیوە، کەمانەکانیان سێ ئەرەش بەرزە و دوو ئەرەش درێژە و ئەوەندە قورس بوو کە ئێمە بە جێگای خشت[٥] کەڵکمان لێ وەردەگرت. بە هەر شێوەییێك بوو گەیشتینە خێوەتگاکە، من سەرۆکێکی‌تری یوونانیەکانم بە ناوی «خیریسف»دا بەر تانە و قسەی تاڵ کردن و ڕامگەیاند کە بۆچی ڕانەوستاوە و ئێمەی بە تەنیا بەجێ‌هێشتووە و بۆتە هۆی لە دەستچوونی دوو کەس لە هەڤاڵەکانمان، بەڵام بە ڕاستی ئەو ڕاستی دەگوت و ئەم ڕاستیەشم کاتێ بۆ دەرکەوت کە گوتی: ئەو کوێرە ڕێگەیە دەبینی، ئێمە دەبێ لەوێوە بڕۆین و کەچی ئێمە زۆر پەلەمان کرد و ئێستا دەبینی کە کوردەکان توانیویانە ئەوێ بگرن و ڕێنوێنەکانی

---

٥- «خشت» نێزەیێکی بچووك بوو کە لە نێوەڕاستیدا حەڵقەییێکی ئاورێشمی هەبووە بۆ جێگەی ئەنگوست.

سوپاکەش دەڵێن جگە لەو ڕێگەیە، ڕێگەیێکیترمان نییە. بە ڕاستی بارودۆخەکەمان زۆر خراپ بوو، شەشخانی هومێدمان لێ بەسترابوو، ئەمن (گزنفۆن) لە شەڕێکمدا دژ بە کوردەکان توانیم دوو کەسیان لێ دیل بکەم و بۆیە بە خیریسیف پێشنیارم کرد کە سەبارەت بە بارودۆخی ڕێگاکان لەو دوو کەسە بپرسێت.

ئەگەرچی یەکەمین دیلەکە زۆر ترسابوو، بەڵام گوتی جگە لەو ڕێگە، ڕێگەیەکیترمان نییە، هەر بەو بۆنەوە ئەومان لە پێش چاوی هەموانەوە کوشت و دیلی دووەم هاتە باس و گوتی: لەم دەوروبەرەدا ڕێگایەك هەیە کە ئەتوانن کەرەسە و ئامێر و پێداویستی لەوێوە ببەن و ئەم هەڤاڵە بێچارەی منەش کە بە دەستی ئێوە کوژرا، درۆی نەگوت؛ بەڵام ترسابوو؛ چونکە ماڵی کچ و زاواکەی وا لە ئەوێوە و لەوە ترسا کە بکوژرێن. ئەمن پرسیارم کرد: کە لەو ڕێگەدا چ تەنگیگەلێك هەیە؟ دوایی زانیمان کە لەو ڕێگادا تەپۆلکەیەك هەیە و دەبێ پێش لە هەموو شوێنێك ئەوێ داگیر بکرێ. دەنا هیچ جێگای هومێد نییە کە بتوانین سەربکەوین.

بۆیە هەموو ئامرهێزەکانمان کۆکردەوە و هەرچی پێویست بوو پێیانمان گوت و دەستەیەکمان بە حەزی خۆیان تەرخان کرد. هاوکات سێ کەس لە سەرکردەکانی چەکی قورس و سەرکردەییێکی چەکی سوك کە لە شەڕەکاندا ئازایی زۆریان نواندبوو کەوتنە پێشەوە و دوای خواردنی پارووییێکی نان هاوڕێ لەگەڵ دوو هەزار هێزدا ئامادەی شەڕ کران و لەگەڵ ئەو دیلەدا بەڕێ کەوتن. کەچی لەم کاتەدا بارانی پاییزی دەباری و تاریکایی شەویش ئاسمانی داگرتبوو.

ئەمن (گزنفۆن) هاوڕێ لەگەڵ ئاخرین کەسی هێزەکەدا کەوتینە ڕێ تاکو دوژمن کە لە شاخەکانەوە بوون ڕاویان بنێین. بەڵام ئەم کارە فێڵبازی بوو لەبەر ئەوەی تەنیا دەمانویست هێزەکانی دوژمن سەرگەرم بکەین و بیریان لەو تەپۆلکەیە ببڕین.

کوردەکان بەردیان تل ئەکردەوە کە پەراشپەراش دەبووەوە و هەر پریشەیەکی هەزاران خەروار قورس بوو، ئەو بەردانە ئەوەندە بە برشت دەهاتن چما بە قەڵماسك دەیخەی. ئێمە هەر دڵەڕاوکێمان بوو هەتا ئاسۆ تاریك بوو، جا ئەو کاتە گەڕاینەوە بۆ نێو خێوەتگاکانمان و دوژمن هەر خەریکی بەرد تل کردنەوە بوو. هاوکات ئەو دەستەیەش کە ئێمە بەردەبارانیانمان

کردبوو به مەبەستەکەیان گەیشتبوون و پاسگایەکیان داگیر کردبوو (یوونانیەکان پێیان وا بوو که به گرتنی ئەو پاسگایە کاری دوژمن تەواوە)، بەڵام بەیانی بۆیان دەرکەوتبوو دوژمن هێشتا زۆر به قووەتە. چاکی لەوەدا بوو ئەو ڕۆژە تەمومژ بوو و هیچ شوێنێك دیار نەبوو، بۆیە هێزەکەی ئێمە توانیبوویان زۆر بڕۆنه پێشەوە و شەیپووریان دەکێشا و بەم شێوەیە هەواڵمان دەزانی و دەچووینە یارمەتیانەوە، بەم شێوەیە ڕژاینە سەر دوژمن. کاتێ «خیریسف» دەنگی شەیپوورەکەی بیست، هێرشی کردە سەر ڕێگە کوێستانیەکە و سەرکردەکانی‌تر هاوڕێ لەگەڵ هێزەکاندا بەرەو پێش ڕۆیشتن. سەربازەکان نێزەکانی خۆیانیان دەشەکاندەوە و یەکتریان هان ئەدا تاکو هێرش ببەن، ئەمنیش لەو ڕێگاوە کە دیلەکەیان پێ پیشان دابووم بە ئامێر و پێداویستێکی زۆرەوە دەڕۆیشتم، هاوکات دەبوایە ئێمە سێ تەپۆلکەمان داگیر بکردبایات تاکو بمانتوانیبایە لەو تەنگانە دەربهاتبایاتین. کاتێ کە گەیشتینە دوایین تەپۆلکە زۆری نەمابوو کە ڕێگەچارمان لێ بزر بێت. دوژمنەکان لە پێشەوە بە دوامان کەوتبوون و بەردیان تل دەکردەوە و دەیانترساندین. ئەو سەربازەی کە بۆ پاراستنی گیانی من تەرخان کرابوو لە ترسان ئێمەی بەجێ‌هێشت. نزیك بوو کە ئێمە بەردەباران بین، بەڵام یەکێ لە سەربازەکان بە ناوی «ئووریلخ» گیانی منی لە مردن نەجات دا و ڕزگارمی کرد.

ئەو ڕۆژەمان بە خێر بردە ئاکام و جارێکی‌تر سوپاکەمان کۆکردەوە و دوای شەڕێکی قورس لەگەڵ کوردەکاندا گەیشتینە ناوچەیەك کە ماڵ و خانووگەلێکی زۆر خۆشی لێ بوو و کەلوپەل و پێداویستی زۆرمان لەوێ وەدەست کەوت، شەرابیش زۆر بوو. من و خیریسف پێشنیاری ئاگربەسمان دا بە کوردکان و ئەوانیش قەبووڵیان کرد و تەرمەکانیشیان پێمان دایەوە (ئێمە لەگەڵ ئەردەشێری پاشادا ئاگربەسمان نەکردووە، بەڵام لەگەڵ کوردەکاندا ئاگربەسمان کردووە) ئێمەش دیلەکانی ئەوانمان ئازاد کرد.

ڕۆژی دوایی کوردەکان پێش‌تر لە ئێمە کەوتنە بیری هێرش و دۆڵ و نشێوەکانیان گرتەوە و ئێمەش لەملاولەولاوە هێرشمان کردە سەریان. کاتێ کە خێریسف بەرەنگاری دوژمن دەبووەوە من دەچووم لە سەر شاخەکان و بە شێوەیەك کە زاڵ بووم بە سەر دوژمندا و هەموویان لە ژێرچاودێری مندا بوون و هاوکات چاوم بە پاشەکشێیانەوە بوو. ئەم کارەمان زۆر

پڕقازانج بوو، ئەگەرچی چەك و ئامێرەکانمان زۆر قورس بوون، بەڵام بۆ سەرکەوتن لە سەر کێوەکاندا، بگرە لە کوردکانیش بەهێزتر بووین. ئەگەرچی چەکی ئەوان هەر قەڵماسك و تیروکەوان بوو. بەڵام کاتێ ئەو کوردانە پاشەکشێیان دەکرد، قەت پێیان نەدەگەیشتین و کەمانی «دانیکرتی» (کە لە جەزیرەی کرتدا دروست کراوە) گوێخۆری هیچ کوێیەك نەبووە. ئەو ڕەوتە بەردەوام بوو هەتاکو ڕۆژێك لە ڕۆژانی پاییزی لە خواری خۆمەوە کاریزێکم بینی لە تەنیشتی ڕۆخانەی «سانتریتس»[٦]ەوە. لەم کاتەدا تۆزێك ماندووییم دەرچوو و لەبەر ئەوەی کەلوپەلی زۆرمان پێبوو، شەومان بە خۆشی ڕابوارد و ئەفسانە و چیرۆکی زۆرمان سەبارەت بە کوردەکان بۆ یەکتر گێڕایەوە و حەوت ڕۆژ بوو کە بێوچان شەڕمان کردبوو و لەم شەڕەدا سەربازی زۆرترمان لێ کوژرابوو تا شەڕی نێوان ئێمە و ئەردەشیر و تیسافرێن.[٧]

شەوی ڕابردوو کوردەکان لە تەنیشتی خێوەتگاکەماندا خۆیان شاردبووەوە و چاوەڕوان بوون تاکو بە دیتنی ئێمە هێرش بهێننە سەرمان و قاڵمان ببڕنەوە، ئەوەندە تەنگیان لێمان هەڵچنی کە ٣٦ سەعات لەوێ ماینەوە.[٨]

لە ئاکامدا دوای تۆزێك شەڕ و پێکدادان، سوپای یوونان لە دەستی کوردەکانەوە دەرئەچێ و لە چۆمەکە دەپەڕنەوە و دەچنە ناوچەی ئەرمەنستان کەوا لە تەنیشتی زەریای ڕەشەوەیە.

ئەمە بڕێك لە ڕاستیەکان بوو کە لە لایەن سەرکردەییێکی یوونانییەوە گوتراوە. ئەوەش ڕاستی بێ ئەم سەربازانە هەموویان چریك و ناکارامە بوون و ئەگەر لەگەڵ سوپای کورددا دەربکەوتبایاتن چی دەگوت و چلۆن سوپای یوونان ڕزگاری دەهات.

---

٦- چۆمێك لە باشووری دەریاچەی وانە کە جێگای ژیانی کوردەکانی قەرامانلوو، قەراچورلوو، سیوەکانلووە.

٧- تیسافرێن لە سەرۆکە گەورەکانی ئەردەشێری هەخامەنشیە.

٨- گزنفوون، گەڕانەوەی ١٠ هەزار یوونانی، وەرگێڕاوی جفری هاوس هۆڵە و مەنووچێهر ئەمری، ل٧٩.

# کوردستان دوای هاتنی ئاییــنی پیــرۆزی ئیسلام

لە سەردەمی هاتنی ئاییـنی ئیسلامدا «مەداین» پایتەختی ساسانیەکان بوو و هەروەها مەیدانی شەڕی نێوان سوپای ئیسلامی و ساسانی هەر دەوروبەری مەداین بوو کە لەگەڵ خاکی کوردستاندا هاوسنوور بووە. زۆرتـر لـە هـەموو نەتەوەیـەك کوردەکـان بـەرەنگاری عەرەبـەکان بوونەوە و دژ بە ئەوان وەستان، ئەگەر چاوێك بـخشێنیـنە سەر شەڕەکانی جەلەولا و نەهاوەندا ئەم ڕاسـتیەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە. پاڵپـشتکردنی خـەڵکی ناوچـەی پـاوە و هـەورامانات لـە یەزدگردی سێیەم و پێشنیارکردنیان بە یەزدگرد کە بە جێگای ڕۆیشتـن بۆ خوراسان ڕوو بکاتە کوردستان، ئەم ڕاستیە جوانتـر و چاکتـر زەق دەکاتەوە. هەروەها زۆربەی شەڕەکانی ئێرانی دژ بە عەرەب بە سەرۆکایەتی ئەبوموسلێم خوراسـانی هـەر لـە خـاکی کوردسـتاندا ڕووی داوە و دواییـن بەشی ئەم شەڕانەش لە ناوچەی زاب -کوردستانی ئەمڕۆژی-دا ڕوویـداوە کـە ئاکـامی ئەم شەڕە بە شکستی مەروانی حیمار -دواییـن خەلیفەی ئەمەوی- و لەناوچوونی زنـجیـرەی حکوومەتی ئەمەوی گەیشت بە ئاکام. کوردەکان لەم شەڕانەدا بە ڕاستەوخۆ بەشداریان کردووە. دەبێ ئاماژە بەمەش بکرێ کە دایکی مەروان کیژەکوردێکی جوان بوو و کاتێ لە شەڕێ نێـوان کورد و عەرەبەکاندا دیـل کـرا، بـاوکی مـەروان کـردی بـە هاوبەشـی ژیـانی خـۆی. هـەروەها هاریکاری عـەشیـرەتی کوردی شوقاقی لەگەڵ ئیمام حـسێندا دژ بـە یەزیـد لـە کەربـەلا وەکـو ئەستێرەیێك لە ئاسـمانی کوردەواریدا ئەدرەوشێتەوە.

بـەڕێز سـدێق لـە نامیلکـە زانـستیەکەی خۆیـدا نووسـیویەتی: ئازایـەتی و لێهـاتوویی کوردەکانی شاپووری فارس بە سەرۆکایەتی عەبدوڕڕەحـمانی کوڕی موحەمـەدی ئەشعەس لـە شەڕی دژ بە حەججاجی کوڕی یووسف بوو بە هۆی لەناوبردنی ئەم زاڵمە خوێنڕێژەی زەمانەوە و توانیان لە کوردستان بەدەریان کەن.

شۆڕشی کوردەکان دژ بە خەلیفە مێهدی «عەبباسی» کە لە ساڵێ ١٤٨ کۆچی مانگیدا ڕووی دا، زۆر پەرەی سەند بە شێوەیێك خەلیفە لە ڕووی ناچارییەوە هاروونەڕەشیدی کوڕی کرد

بە والی کوردستان و ئازەربایـجان. لێرەدا باسی بەربەرەکانێی ئەوان و خەڵکی خـەزەر دەکرێت کە هێرشیان هێنابووە سەر خاکی ئێران.

شەڕی ئەوان دوابەدوای شەڕی «جەعفەری کوڕی فـێهرجەس» دژ بە «موعتەسەم بیلا» و شکستی عەرەبەکان لە نزیکی کێوی داسندا ڕووی دا.

هەروەها ڕاپـەڕینی کوردەکـانی دەوروبـەری ئێـسفەهان و جیبـال و شـەڕی ئـەوان دژ بـە خەلیفەی ئەو کاتە لە ساڵی ٢٣١ کۆچی مانگی ئەو کاتە و بەرگری لە پێشڕەوی غـەزەکان بـۆ زێد و وڵاتی ئێران قەت لە بیـری مێژوو و مێژوونووسان ناچێتەوە.[٩]

پاراستنی قەڵای بەناوبانگی تکریت لە بەرانبەر بێڕەحـمیەکانی تەیـمووری لەنگـەوە بـۆ هیچ کاتێ لە بیـری ئێرانیەکان ناڕواتـەوە و بـە نەتـەوەی کـورد شـانازی دەکـەن. «نیزامـەدین شامیمەراح» کە خۆی یاریدەدەری تەیـمووری لـەنگ بـوو لـە بـارەی ئازایـەتی ئـەم کوردانـەوە وەهای نووسیوە: «... جارێکی‌تر ناپیاوەکان ناپیاوی دەکـەن و شـەڕ دەسـتی پێکـرد و پاشـای پایەبەرز (تەیـموور لەنگ) زۆر لەم بەسەرهاتە تووڕە دەبێ و فەرمانی شەڕێکی سوور ئەدات و کاتێ سوپای ئێمە بەرەو پێش ڕۆیـشت لـە ناکـاو چـاومان بـە هێزێـکی چـەکدار کـەوت و بـە فەرمانی ئەمیـر، ڕەهەند لێ درا بۆ ژێر قەڵاکە و کاتێ ئەو هێزە بەم بەسەرهاتەیان زانی، خێرا کەوتنە بیـری ڕێگەچارە دۆزینەوە و سوپای ئێمە ئەوەندەی ئاگر باراند تـاکو دیوارەکـانی قـەڵا هەمووی ڕووخا.»

هەروەها ئـەم نووسـەرە نووسـیویەتی: بڕیـار درا خـەڵکی ئاسـایی لـە چـەکدارەکان جیـا

---

٩- بەڕێز «ئەدیب تووسی» نووسیویەتی: ڕاپـەڕینی کوردەکـان دژ بـە عـەرەب لـە ناوچـە کوردنشینەکانی کوردستان و ئازەربایـجاندا دەستی پێکرد کە لە هەموان گرنگتـر ڕاپـەڕین و شۆڕشـی بابـەکی خۆڕەمـدینی زەردەشتی بوو کە ساڵی ٢٠٩ تا ٢٢٢ دژ بـە عەرەبـەکان شـەڕی کـردووە. لـە ئاکامـدا بـە بۆنـەی ناپیـاوی ئەفشینەوە خۆی داوەتە دەسـتی خەلیفـەی عەبباسییەوە. هـەروەها سـاڵی ٣٢٧ی کۆچـی جـارێکی‌تر لە کوردستان دیسم کوڕی ئیبـراهیم شۆڕشی کردووە...
هەروەها لە ساڵی ٣٣٠ی کۆچی موحەمەدی سالاری (لە کوردەکانی سالاری) تـا ٤٢٠ی کۆچـی سـەربەخۆیی خۆی پاراستووە و لـە ئازەربایـجاندا دەسـەڵاتی بە دەسـتەوە بـووە و ئـەردەبێل پایتەخـەتی ئـەو بوو و کوردەکـانی ڕەوادی دوای ئـەو تـا سـاڵی ٥١١ی کۆچـی دەسـەڵاتی ئازەربایـجانیان بـە دەسـتەوە بـوو.
نووسراوەی بەڕێز تووسی، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتی تەبرێز، ژمارە ٤ ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی هەتاوی.

بکرێنەوە و هەموویان دابەش ببن لە نێوان هێزەکەدا و پاشای چەکدارەکانیش بکوژن و لە سەری ئەوان منارە دروست بکرێ و هەروەها دیوارێکی قەڵاکە هەر بمێنێتەوە بە دیاری تاکو خەڵکی عالەم بزانن هێزەکانی ئێمە چەندە بەبڕشتن.

هەر بە بۆنەی ئەم بەربەرەکانێیە قارەمانانەی گەلی کوردەوە بوو کە بە دڕندانەترین شێوە لە لایەن تەیمووری لەنگەوە هێرش کرایە سەریان.

ئەمیرنیزام شامی لە کاتێکدا ئەمیر تەیموور بەرەو بەغدا دەڕوات وەهای نووسیوە: «پاشان، ئەمیر تووڕە دەبێت و شێرانە فەرمان ئەدات بە سوپاکە تاکو پێشڕەوی بکەن و سەرەتا لە کوردستانەوە دەست پێ بکەن، چون کوردە جەردەکان لە کاتی گەڕانەوەی هێزەکەمان لە شام هێرشیان هێناوەتە سەرمان و زۆر، زۆریشیان کوشتووە، بۆیە فەرماندەکان سەرەتا هێرشیان کردە سەر کوردستان و لە نێو تۆف و کڕیوەی زستاندا ئەو خێڵە جەردە و چەتەیانە تالان کرد و تەفروتونایانیان کرد و بەفری سپی زستان لە خوێنی ئەواندا سووری سوور دەینواند.[١٠]

ئازیزان و خوێنەرانی هێژا سەرنج بدەن کە ناپیاوەکانی ئەو کاتەش چلۆن بە کوشتنی کوردەکان شانازییان کردووە و گەشاونەتەوە. دەی ئەگەر نەتەوەی کورد بۆ وەستان لە بەرانبەر زوڵم و زۆری ناپیاوەکانەوە نەبێ، کەی شەڕیان کردووە و چ کەسێك چاوی بە زڵم کردنی کورد کەوتووە. تا دنیا دنیایە پیاوەتی نەتەوەی کورد لە بیری پیاوە بە شەرەفەکانی جیهان ناڕواتەوە.[١١] بەڕێز حسێن مەسرور لە نامیلکەیێکی پڕبایەخدا کە لە گۆڤاری ڕادیۆی ئێران چاپ کراوە، سەبارەت بە مێژوو و ڕەگەزی کورد نووسیویەتی: «... عەشیرەتە کوردەکان لە خاوەری نزیك واتە لە ڕووباری مەدیترانە تاکو ئێران دەبیندرێن کە هەموویان لە عەشیرەتە پارسیەکان جیا دەبنەوە و هەر ماوەیێك لە وڵاتێکدا ژیاون، وەکو عەشیرەتی «درووز» کە لە ناوچەی سووریە و لوبناندا دەژین و ئەم کوردانە سەردەمێك لە وڵاتی ئێراندا بوون. هێرۆدوت

١٠- زەفەرنامە، مێژووی فەتحەکانی ئەمیر تەیموور گۆرکانی، ل ١٢٥ تا ١٢٣.

١١- ڕەزم ماهانە، ژمارەی ٧، بەفرانباری ساڵی ٣٢٧ی کۆچی هەتاوی، مەقالەی بەڕێز سدیق بە سەر دێڕی کوردستان ئێرانەوە، ل ٥٤.

ئەم عەشیرەتە بە شەشەمین عەشیرەتێ دادەنێ کە ڕوویان کردە شارنشینی. پێم وایە کاتێ کە «سلووکیدەکان»[١٢] سوپای ئێرانیان لە ناوەندی حکوومەتی خۆیاندا دادەمەزراند و بوون بە هۆی ئەوەی کە ئەمانە پەنا ببەنە کوێستانەکانی سووریە، هەروەها لە سەردەمی ئەشکانی و ساسانیەکاندا جارێکی‌تر ئەم کارەساتە ڕووی داوە، چون ساڵەهای ساڵ ناوچەکانی شام و سووریە لە ژێر دەسەڵاتی ئەشکانییەکان و ساسانییەکاندا بووە.

«حەمزەی ئێسفەهانی» نووسیوویەتی: «ئەنووشیروان ١٢ هێز و سوپای ڕازاندوە و هەر هێزێکیش بۆ پاراستنی سنوورێك بەڕێ کران. وا دیارە ئەم هێز و سوپایانە هەر ئەو کوردانە بن کە لە دەرەوەی ئێرانەوە ژیاون...

زمانی عەشیرەتە کوردەکان لە هەر شوێن و مەڵبەندێکدا بن هەر ئەو زمانی «مادی» یان «پەهلەوی»ەیە کە زمانی پارێزگاکانی‌تری ئێران بە تایبەت زمانی گیلەکی،[١٣] تەبەری، کاشانی و ئێسفەهانی هەر لەم خێزانە زمانەیە و جوانترین و ڕازاوەترین شیعر و هەڵبەست و گۆرانی ئەوان هەر ئەو شیعر و گۆرانیانەیە کە بە زمانی کوردی گوتراوە.

دەبێ ئاماژەش بکرێ کە عەشیرەتەکانی لوڕ و بەختیاری بەشێکن لە عەشیرەتی کورد و تا سەردەمی عەزودودەوڵەی دەیلەمی، کوردەکان تا دەوروبەری ئێسفەهان دەگەیشتن و هەر ئەم کوردانە دوایی بە لوڕ ناسران.

لە سەردەمی دەیلەمیەکاندا بە تایبەت عەزودودەولی دەیلەمی، هێزە کوردەکان لە ژێر فەرمانی ئەودا کۆچ درانە شام و کارە گرنگە دەوڵەتیەکانیان پێ سپێردرا. دوای لەناوچوونی دەیلەمییەکان و دەست پێکردنی شەڕە سەلیبیەکان، جارێکی‌تر لەم شەڕانەشدا هەر کوردەکانی ئێران بوون کە توانیان سەرکەوتن وەدەست بهێنن و سەرۆکە کوردەکان لەم سەردەمەدا هەتاکو وڵاتی میسر و نیل فەرمانڕەواییان کردووە و کەڵەپیاوانێ وەکو سەلاحەدین ئەیووبیان[١٤]

---

١٢- جێگرەکانی ئەسکەندر مەقدوونی لە ئێراندا.

١٣- زمانی گیلەکی زۆر بە زمانی کرمانجی خوراسانەوە نزیکە و زۆر وشەیان وەکو یەك وایە.

١٤- سەبارەت بە قارەمانی شەڕەکانی سەلیبی لە دنیای ئیسلامدا واتا سەلاحەدین ئەیووبی زۆر کتێب و بەرهەم و نووسراوە هەیە، بەڵام دەبێ بڵێین کە سەلاحەدین ئەیووبی و کوردەکانی شادیلوو لە یەك ڕەگەز و عەشیرەتن.

پەروەردە کردووە. عەشیرەتی بارزان کە ئێستا لە کوردستان دان، سەردەمێك لە کرماندا حکومەتیان کردووە، بەڵام نازانین ئەم عەشیرەتە چ وەختێك لە کرمانەوە ڕوویان کردۆتە کوردستان. زمانی کوردی لە هەر ناوچەیێکدا کە بێت لەگەڵ زمانە ناوچەییەکاندا تێکەڵ بووە، بەڵام هیچ کاتێ ڕەنگی خۆی نەگۆڕیوە...

دوای هاتنی ئایینی ئیسلامیش، ناوچەی کوردستان هەر خێوەتگا و مەڵبەندی ئێرانیەکان بووە...[١٥]

بە واتای مامۆستا «مەسروور» لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی سەفەویەکانیشدا سەرۆکە کوردکان هەر دەوری خۆیانیان لە دەست نەداوە و ١٧ کەس لە سەرۆك و فەرمانڕەواکانی قزڵباش هەر کورد بوون.[١٦]

چاك وایە لێرەدا باسی دوو فەرمانڕەوای گەورەی کورد بکرێت یانێ «سارۆبیرە» قارەمانی شەڕی چاڵدوڕان و «ئەمیرخان لەپزێڕین»[١٧] سەردار و ئاڵاهەڵگری «قەڵای دمدم».[١٨]

## سارۆبیرە قارەمانی چاڵدوڕان

بە بێ‌شك و گومان شەڕی چاڵدوڕان وەکو بلێین یەکێ لە شەڕە پڕبایەخەکانی خەڵکی ئێرانە، چون ئەم شەڕە حوکمی مان و نەمانی ناوچەکە ئەدات. شەڕی چاڵدوڕان شەڕێکی زۆر سەخت و نالەبار بوو. چونکە کاتێ کە شائیسماعیل سەفەوی یەکەمین هەنگاوی لە ڕێگای یەکێتی ئێراندا هەڵگرت و دەیویست بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش سوپا و ئەرتەشێکی ڕازاوەی ببێت و بۆیە ڕووی کردە کوردستان و موحەممەد قەرەباغی کە ئەفسەرێکی کوردی دانیشتووی قەراباغ بوو، بە پەلە خۆی گەیاندە تەبرێز و هەواڵی هێرشی سوڵتان سەلیم

---

١٥- هێشتا کوردەکان لە ناوچەکانی خاش و بەلووچستان و باشووری ڕۆژئاوایی پاکستاندا هەن.

١٦- گۆڤاری ڕادیویی ئێران، ژمارە ٢٣ ل ١٠، نامیلکەی مامۆستا حسەین مەسروور.

١٧- LAP-ZERRIN

١٨- DEMDEM

ئیمپراتووری عوسمانی گەیاندە پاشای سەفەوی. لە هەمان کاتدا شائیسماعیل بە مەبەستی کۆکردنەوەی سوپا و ئەرتەش لە ناوچەی کوردستان دابوو.

کاتێ ئەم هەواڵە نالەبارە گەیشتە دەستی شائیسماعیل خێرا ڕووی کردە تەبرێز و بە سوپاییێکی کەمەوە کە لەژێر دەسەڵاتیدا بوون دژ بە عوسمانیەکان بوونەوە. ٢٥ هەزار ئێرانی بە چەکە سەرەکیەکانەوە وەکو دار و شمشێر و گورز و قەڵماسك لە بەرانبەر ٢٢٥ هەزار سەربازی عوسمانیەوە کە لە سەر تا پایان چەك دەباری و هاتبوونە مەیدانەوە و دژ بە ڕازاوەترین ئەرتەشی ئەو سەردەمەی دنیاوە بەربەرەکانیان دەکرد.

یەكبەیەکی سەربازەکانی ئێران لە دەشتی چاڵدوڕاندا هەر یەکیان ڕۆستەمێکی دەوران بوون کە بە تەواوی هێزەوە شەڕیان دەکرد و لە شەرەف و ناموسی خۆیان و گەلەکەیان دیفاعیان کردووە و مەرگی سووریان بە چاك زانیوە تا ژیانی ناپیاوانە. ئەم سەربازانە کاتێ برستیان لێ دەبڕا و دەکەوتنە هەلاکەتی مردن، خۆیانیان ڕوو بە دوژمن دەخست، تاکو دوژمن پێی وانەبێ کە پشتیان لە شۆڕش هەڵکردووە. جا لە ناو هەمواندا قارەمانێك وەکو سارۆبیرەی کورد لە هەموان بەبڕشتترە و بە گورزی خۆی تۆپەکانی دوژمنی لە کار خستووە. بۆیە نووسەری کتێبی «شای شەڕی ئێرانیەکان لە شەڕی چاڵدوڕان و یوونان» سارۆی بە «شێرەپیاوێك لە کوردستان» ناو دەبات و ئاوەهای سەبارەت بە سارۆ نووسیوە:

## ١- شێرەپیاوی کوردستان

لە نێوان ئەفسەرە ئێرانیەکاندا پیاوێك بوو بە ناوی سارۆبیرە کە ناوبانگی «قوورچی» بوو. لە بەر ئەوەی کەسێك بوو کە چەکی ئاگرینی شەمخاڵی دروست کردووە و دروستکردنی باروت هەر لە ژێردەستی ئەودا بووە بۆیە پێتان گوتووە «قوورچی»، لە سەردەمی سەدەی ١٦ی زایینی (سەدەی ١٠ی کۆچی)دا واتە سەردەمێك کە پیاوی زل و ماقوڵ و بەقووەت لە ئێراندا کەم نەبوون، سارۆبیرە ڕووی دەکردە هەر شوێنێك دەبووە سەرمەشق و بە یەکەم دەردەچوو. بڕێك جار بۆ شۆخی ئەفسەرێکی کەڵەگەتی بەرز دەکردەوە و وەکو منداڵێك کایە و

شۆخی لەگەڵیدا دەکرد، سارۆبیرە لە شاری بانەی سەر بە ناوچەی کوردستاندا هاتۆتە دنیا و کاتێ تەمەنی گەیشتە ٥ ساڵ، بابی کەمانێك و تیرێکی بۆی کڕی و پێی گوت بۆ خۆت ژیانی خۆت دابین بکە. جا بزانن لەم تەمەنەدا ئەگەر منداڵێك بە تەنیا جێ بهێڵیت جگە لە گریان چیتر نازانێ. بەڵام سارۆبیرە لە تەمەنی ٥ساڵاندا بە تەنیایی ژیانی خۆی دابین دەکات و ئاوڕ لە کەس ناداتەوە. سارۆی منداڵ هەموو ڕۆژێك بۆ دابینکردنی نان و پێخۆری خۆی ڕووی دەکردە کێو و دەشت و بیابان و نەچیری دەکرد و بەشی خۆی دەخوارد و بەشی باب و دایکیشی دەهێنایەوە. ئەو شوێنەی کە سارۆبیرەی تێدا دەژیا، پڵنگی زۆری لێبوو و زۆرجار تووشی پڵنگ دەهات و خێرا دەست بەجێ دەیکوشت و لاشەکەی دەهێنایەوە و لە پێستی ئەو پڵنگە جلوبەرگی بۆ خۆی ئەدووری لە نێو لاوە بانەییەکاندا جگە لە سارۆبیرە کەسیتر جلوبەرگی پڵنگانەی لەبەر نەکردووە.

بۆیە سارۆبیرە زۆر ناوبانگی دەرکرد و پێیان دەگوت: «پڵنگینەپووش» سارۆبیرە هەموو جۆرە چوارپاییێکی نەچیرکردووە، بەڵام زۆرتر لە هەمووی پەز و بزنی کێوی ڕاو کردووە. شکارچیە بەساڵاچووەکان زۆرجار مەنعی سارۆبیرەیان کردووە و گوتوویانە تۆ بۆ شکار لە شوێنگەلێکەوە دەڕۆیت کە نە مرۆڤ، تەنانەت هیچ گیاندارێکیتریش ناتوانێ لەوێوە بڕوا، هەر پیاوێك ئەگەر بۆ نەچیری بزنەکێوی هەوڵی دابێت، بێشك مردووە، چونکە بزنی کێوی شوێنگەلێکەوە ڕۆیشتووە کە پیاو پای دەخزێ و لەسەر تاشەبەردەکانەوە بەردەبێتەوە و گ دەرنابات، کاتێ سارۆبیرە گەیشتە تەمەنی ١٥ ساڵان ئەوندە جوان و کەڵەگەت بوو هاوشارییەکانی پێیان دەگوت «زۆراب». زۆراب کوڕی جوانی ڕۆستەم و پاڵەوانی بەناو شانامەی فیردەوسییە.

سارۆ لە هەر شەقامێکی شاری بانەوە دەڕۆیشت هەموو کچەکانی شار دەهاتنە دیتنی و تەماشای باڵای نەونەمامی ئەویان دەکرد، کەچی ئەو ئاوڕێکی لە ئەو کچانە نەئەدایە. سارۆ لەم تەمەنەدا جگە لە خودای دلۆڤان لە کەسیتر نەترساوە، جەردە و چەتەکان بە بۆنەی سارۆبیرەوە ڕوویان نەکردۆتە بانە. سارۆ لەم تەمەنە کەمەیدا لە پیاوی ٣٠ ساڵان ٣٥ ساڵان بەقووەتتر بووە.

سارۆبیـرە کاتیّ بیـنی بە تەنیایی لاشەی ئەو شکارانەی بۆ نارِواتەوە کەوتە بیـری ئەوەی تاکو چەند کەس لە لاوەکانی بانە بباتە یارمەتی خۆیـەوە و لـەم رِۆژە بـە دواوە سارۆبیــرە بـە «سارۆقەسساو» ناسراوە و بازارِیّکی چاك بۆ خۆی دروست دەکات. سارۆبیـرە کاتیّ کە شکاری دەکرد وەکو ئەندازیاریّکی ئاکادیـمی برِشتی تیـر و توندوتیـژی شـکارەکەی ئەنـدازە گرتـووە و زانیویەتی چەندە دەخایەنیّت تاکو ئەو تیـرە بگاتە ئەو شکارە. سـارۆ ئـەم زانیاریـەی هـەر لـە دەشت و کیّوەکانی کوردستاندا وەدەست هیّناوە.

سارۆبیـرە لە بانەدا سەربەخۆ دەژیا و قەت لە کەس فەرمانی نـەبردووە و ئەگەرچـی ئـەو سـەردەمە سـەردەمی زلّـم و زۆر و غـەدرلیّکردنی زۆرداران لـە فەقیــران بـووە، بـەلاّم سـارۆ و دارودەستەکەی قەت زلّمیان لـە کـەس نـەکردووە و پیاوانـە ژیـاون و هاوکـات ئیزنیـان نـەداوە کەسیش غەدریان لیّ بکات. کاتیّ کە خەلّك بینیان سارۆ پیاویّکی پیاوانەیە کردیان بە قـازی خۆیان. ناوبراو پیاویّکی رِاستبیّژ و قازییّکی هـەرە چـاك بـوو. شائیـسماعیل لـە سـەردەمی دەسەلاّتداریّتی خۆیدا سـەردانیّکی کوردسـتانی کـردووە و کـاتیّ گەیـشتۆتە بانـە و ناوبـانگی سارۆی بیستووە، داوای کردووە تاکو ئەو کورِە ببیـنیّ. کاتیّ دیویەتی زۆر خۆشی لیّ هاتووە و گوتوویەتی: سارۆ حەزت لیّیە ببیتە سەربازی سوپاکەی ئیّمە؟ سارۆیش لە وەلاّمدا گوتوویـەتی: من پیّداویستییّکم بە خزمەتی سوپای تۆ نییە، چونکە من و هاورِیّکانـم لـە رِیّگـای شـکارەوە ژیان دەکەین.[١٩] شائیـسماعیل گوتی: سارۆ من دەزانـم کە تۆ هیچ نیازیّکت بە من نییە، بەلاّم من بە تۆ و کەسانیّکی وەکو تۆ زۆر نیازم هەیە، جا بۆچی لاویّکی وەکو تۆ پیّداویستی ژیـانی خۆت لە رِیّگای شکارەوە وەدەست بهیّنی. ئەگەر تۆ بیّیتە نیّو سوپای منـەوە هـەم تـۆ قـازانج دەکەیت، هەم منیش. سارۆ لە وەلاّمـدا گـوتی: ئیّمـە دارودسـتەییّکی دۆسـت و هەڤالیّــن کـە پیّکەوە ژیان دەکەین، نامانەویّ بۆ هیچ کاتیّ لیّك جیا ببیـنەوە، ئەگەر من بیّمە نیّو سوپاکەی تۆوە، دەبیّ هەڤالەکانیشم بهیّنـم. شائیـسماعیل گـوتی: تۆ دەتەویّ هەر کەسیّك لەگـەلّ خـۆت بهیّنی بیهیّنە. لەم رِۆژە بە دواوە سارۆ دەچیّتە نیّو سوپای شائیـسماعیلی سـەفەوییەوە. لـەو

---

١٩– ئەمە وەلاّمیّکە وەکو ئەو وەلاّمەی کە یەکیّ لە دیّنشینەکانی کوردی زاقەرانلوو لە وەلاّمی فەتحعەلیشای قاجارِدا پیّی گوت. (برِوانە بۆ بەرگی یەکەمی ئەم کتیّبە)

کاتەدا بە سەرباز کەڵەگەتەکان نازناوی «قوورچی» ئەدرا، لەبەر ئەوەی زۆر قورس بوون. شەمخاڵەکانی (قوورچی) ئەو سەردەمە وەکو تۆپێك بوون کە قۆناخەکەی ببێت و دەبوای ئەم قوورچیانە چەکە قورسەکانیان لە ئەستۆ بگرتایەت، دەی ئەم لاوە کوردە کە لە هەموان بەهێزتر بوو، هەم شەمخاڵە و هەم قوورچی. هاوکات هەڤاڵەکانیشی زۆر و هەیبەتیان وە دەست هانی.

شائیسماعیل لە یەکەمین شەڕدا بۆی دەرکەوت کە سارۆ و هەڤاڵەکانی چەندە بەبڕشتن. شەڕ لە دوای شەڕ سارۆ مەقامی باڵای دەگرت. بە شێوەیەك کە کاتێ شەڕی چاڵدوڕان دەستی پێکرد، ئەم لاوە کوردە ئەفسەرێکی ڕەدەباڵای سوپاکە بوو. (سەربازە کورد و لوڕەکان لە ژێر فەرمانی سارۆدابوون). شائیسماعیل لە گەرماگەرمی شەڕەکەدا بوو و بۆی دەرکەوت کە ڕۆمیەکان زۆریان هێناوە بۆ ئێرانیەکان، لە هەمان کاتدا وای بە چاك زانی دوو هەزار سەربازی کورد و لوڕ بە سەرۆکایەتی سارۆبیرەوە ڕەوانەی شەڕی تەنێبەتەنێ بکات.

چەکی سەربازە لوڕەکان دار بوو و زۆر لە شەڕی داردا توانا و لێهاتوو بوون و سەربازە کوردەکانیش شمشێر و گورزیان بە دەستەوە بوو. جگە لەم دوو عەشیرەتە، تامێکیتر لە سەربازە ڕۆملوویيەکان لە ژێردەسەڵاتی سارۆدا بوون.

کاتێ سارۆ بە سەربازەکانیەوە هێرشی کردە سەر دوژمن، حەسەن بەیگوڵڵا و ئەمیرعەبدولباقی و سەربازەکانیان تۆزێ حەسانەوە و ماندوویێتان دەرکرد. سارۆ بە هەر دەستگۆزانەوەیێك یەك کەسی دەکوشت و هاوکات هەڤاڵەکانی کە لە بانەدا لەگەڵیا گۆشتفرۆشیان دەکرد هاوڕێی بوون. تێڵاکانی دەستی ئەم سەربازانە کە لە داری گوێز و بەڕوو پێکهاتبوو زۆر قورس بوون و دەسکەمێکیان لە گورزەکەی سارۆ نەبوو.

سارۆ و هاوڕێکانی وەکو سەربازەکانی «ئیچ ئوقلان» مەشقی سەربازیان نەکردبوو، بەڵام لە ئازایی و لێهاتوویيدا مامۆستای هەر سەربازێك بوون و مەکتب و زانکۆی نیزامی ئەوانیش شاخەکانی شاری بانە بوو، هەرئەم خاڵە بۆتە هۆی سەرکەوتنی ئەوانەوە. ئەم سەربازانە بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆیان هەموو ناپیاوییەکانیان لەبەر پێی خۆیاندا لائەدایەوە. سارۆبیرە لەم شەڕەدا دوای ماوەیێکی کورت کە بە قەڵخانەوە شەڕی دەکرد، خێرا سپەریشی فڕێ دا و گوتی لە خێراییم دەگرێتەوە و من شتی وام ناوێ، هەر بەم شێوەیە سارۆ توانی درزێك بخاتە

نێوان سوپاكەی ئیچ ئوقلان و بەرەو پێش بڕوات ئەگەرچی ڕۆژ بە ڕۆژ لە ئەژماری سوپاكەی كەم دەبوەوە، لەبەر ئەوەی هاوكات كە سەربازەكانی سارۆ بە دەستی هێزەكانی ئیچ ئوقلان دەكوژران، هێزەكانی عوسمانیش بە تیروكەوان، سەربازەكانی لوڕ و كوردیان نیشان دەگرت و شەهید دەكران، هەر لەم كاتەدا بوو كە سارۆبیرە بریندار بوو و گۆنای ئەم شێرە كوردە تیری خوارد، كەچی سارۆ وەكو بڵێی دڕكێ لە لەشی دەردەهێنێ تیرەكەی لە گۆنای كێشا درەوە و هاوارێكی كرد و گورزەكی خستەوە كار و سەربازەكانی توركی یەك لە دوای یەك بێ‌گیان دەكرد. لەم كاتەدا سوڵتان سەلیم بە سەربازەكانی دەوربەری خۆی ڕاگەیاند كە ئەگەر ئێستە نەتوانین بەرنگاری ئەم كورد و لوڕانە ببینەوە تا دڵی وڵاتی خۆمان دەمانبەنەوە و پێم وایە سەرۆكی ئەم سەربازانە سارۆبیرەی كورد بێت؛ كەچی بە جوانی بۆ سارۆی ڕوانی، ئەوی بینی و گوتی وای خۆیەتی و بە هەموانی ڕاگەیاند وەرن بێن ئەوسەربازەی كە لە هەمویان كەڵەگەتتر و باڵای بەرزترە ئەوە سارۆبیرەیە.

سارۆبیرە و سەربازەكانی بە بێ ئەوەی ئاوڕ لەوە بدەنەوە كە ئەژمارێكی زۆریان لێ ئەكوژرێت، دەڕۆنە پێشەوە و حەسەن بەیگ و ئەمیرعەبدولباقیش بە دوایان كەوتوون. ئەم ئازاییەی خێڵی كورد و لوڕ و ڕوومڵووە سوپای ئێرانی زیندوو كردەوە و جارێكی دیكە پیشانیان دا كە سەركەوتن بە ئەژماری زۆر نییە.

شائیسماعیل كە خۆی زۆر لە شەڕدا كارئامە بوو، بۆی دەركەوت كە سەربازەكانی توانیویانە سوپای دوژمن تێك بشكێنن؛ بەڵام خۆشیان زۆریان لێ كوژاووە و هەروەها سەربازەكانیش هەرچەندە بڕۆنە پێشەوە زۆرتر بە تۆپخانەكانی دوژمن نزیك دەبنەوە و ئەمە جێگای مەترسی بوو، بۆیە شائیسماعیل بە یەكێ لە سەربازەكانی خۆی فەرمانی دا تاكو بڕوات و بە فەرماندەكانی شەڕ ڕابگەیەنێ لەمە زۆرتر نەچنە پێشەوە و پاشەكشێ بكەن....
لەم كاتەدا ٩ هەزار سەربازی ئێرانی خەریكی شەڕپێكادان بوون كە چی ٤ هەزار كەسیان لێ كوژرابوو و ئەو پێنج هەزار سەربازەكەی دیكە توانیبوویان درزێكی گەورە بە پانای ٨٠ زێرع بخەنە نێو سوپای دوژمنەوە.

شائیسماعیل که خۆی له سەر تەپۆلکەیەکەوە بارودۆخەکەی لە ژێر چاوەدێری دابوو و فیداکاری و گیانبازی سەربازەکانی ئێرانی ئەبینی، لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بڵێت و هەر دەیگوت بارەقەڵڵا سارۆبیرە، ئەو ڕۆژەی کە من تۆم لە بانەدا بینی، بۆم دەرکەوت کە چەندە ئازا و لێهاتووی، من لە حەزرەتی عەلی داواکارم کە لە پشتی تۆ بێت. وای جارێکی‌تر تیرێك تۆی پێکا؛ بەڵام نا، تۆ ئازاتر لەوەیت کە بۆ تیرێك بنالێنی و ئەو تیرە وەکو مێشولەییێکە بۆ تۆ. وای ئەی ئەمیرعەبدولباقی کە ڕیشە سپیەکەت لە خوێندا سوور بووە و خۆزگەم بە تۆ ئەگەر بەو حاڵەوە شەهید ببیت، چۆن دەبیتە هاونشینی حەزرەتی عەلی و لە ئاوی حەوزی کەوسەر دەخۆیتەوە. ئاخ ئەی ئەڵڵاهـ یارخانی ئەفشار ئافەریم بۆ زۆر و باسکت...

دوای ماوەیێك کاتێ کە شائیسماعیل لە خۆشیدا سەمای دەکرد لە ناکاو بانگی هەڵدا و گوتی: تەماشا کەن تەهموورس شادلوو[20] چلۆن دەڕواتە پێشەوە، تەهموورس کورد شادلوو بە یەکجارە خۆی خستە نێو سەربازەکانی ئیچ ئوقلانەوە و بەو گورزە پۆڵاییەی کە بە دەستیەوە بوو یەك بە یەك سەربازە تورکەکانی گێج و وڕ دەکرد، هاوکات چەن کەس لە سەربازە ئێرانیەکان بۆ یارمەتی تەهموورس خۆیانیان گەیاندە ناوەندی شەڕەکەوە و دەستیان دا بە شەڕێکی شێرانەوە و کەچی سات بە سات لە ئەژماری ئەو سەربازە ئێرانیانە کەم دەبوەوە و ۲۵ هەزار سەربازی عوسمانی چواردەوری ئەوانیان گەمارۆ دابوو.

مێژوونووسە تورکەکان نووسیویانە: سەربازەکانی ئێچ‌ئوقلان کە گرنگترین بەشی سوپا ۲۲۵ هەزار کەسیەکەی تورکیە بوون، بە بۆنەی زۆرەملێی سەربازە ئێرانیەکانەوە پاشەکشێتان نەکردووە؛ بەڵکو بە بۆنەی ئەوەی کە سەربازە ئێرانیەکان زۆرتر بکێشنە نێو مەیدانی شەڕانخێزەوە، کاری ئاوەهایان کردووە. دەی تەنانەت ئەگەر ئەم واتایەش ڕاست بێت، گەورەیی سەربازە کوردەکان ڕادەگەیەنێت کە چلۆن توانیویانە بە ٥ هەزار کەسەوە ۲۵ هەزار کەس بە خۆیانەوە سەرگەرم بکەن. بۆیە کەوتنە بیری ئەوەی ئاگری تۆپخانە دابگرسێنن.

مێژوونووسە عوسمانیەکان بەو باوەڕەن کە سەبازەکانی ئیچ‌ئووقلان ئەگەرچی لە

---

۲۰- کوردەکانی شادلوو پێش ئەوەی کە ڕوو بکەنە خوراسان لە باکووری ئازەربایجان و ناوچەکانی قەفقاز و قەراباغ و ئێرواندا ژیاون.

مەیدانی شەڕانـخێزدا پێنج بەرانبەری سەربازە ئێرانیەکان بوون، بەڵام نەیانتوانی پاشەکشێیان پێ بکەن، کەچی خۆیان لە ڕووی فـێڵەوە پاشەکشێیان کرد تاکو هێزە ئێرانیـەکان بـخەنە بـەر تیـری تۆپخانەوە، ئەگەرچی کاتێ کە سوپای ئیچئوقلان دێنە مەیدانەوە و سەرۆکی هێزەکـەیان نەیئەویست پاشەکشێ بکات و بە زۆر پاشەکشێیان پـێ کـرا و کـاتێ سـوڵتان سـەلیم ئەمـەی بینی، زۆر تووڕە دەبێ و دەڵێ سەربازی تورك توانای بەربەرەکانێ لەگەڵ هێزی ئێرانـدا نیـە و بۆیە سوپای ئیچئوقلان دەنێرێتە پێشەوە تاکو بەرنگاری سوپای ئێران ببنـەوە، ئـێچ ئـوقلانیش توانای کاری وەهای نەبوو و پاشەکشێی کـرد کـە ئەمـە هێـز و توانـای ئێرانیەکانـە و ئـەویش توانای بەربەرەکانێی نابێ و بە ناچار پاشەکـشێ دەکـات. دەبیـــنن کـە ئـەم ئـاڵوگۆڕەش هـیچ کاریگەرییێکی نەبوو.

سوڵتان سەلیم وەهای بیـر دەکردەوە کە ئەتوانێ بەو هێزەوە سوپای خۆی هـەتاکو تـەبرێز بفڕێنێ و سوپای ئێران لە مەیدانی شەڕانـخێزدا کارێکی بە سەریان دەرهێنابوو کە تەنانەت لە ئاگری تۆپخانەی دوژمنیش ئاوڕیان نەئەدایەوە و پێیان وابوو بە هیچ ئاگرێك ناسوتێن، بـەڵام شائیسـماعیل کە خۆی لە سەر تەپۆلکەییێکەوە سەیری مەیـدانی شـەڕی دەکـرد، دەیزانـی کـە ئاگری تۆپخانە زۆر دلگرانکەرە و بۆیە جەلیلوسـوڵتانی زولقـەدری نـاردە مەیدانـەوە تـاکو بـە هێزەکە ڕابگەیەنێت کە بەرەو ئاگری تۆپخانەی دوژمن نەڕۆنە پێشەوە، بەڵام بە داخەوە ئەسپی ئەم نێردراوە بە بۆنەی خێرایی زۆرەوە درا بە عەرزدا هەتا نێو چۆمەکە ڕانەوەستا و ئەگەرچـی جەلیلولقەدر بە پەلە هەستایەوە تاکو خۆی بگەیەنێتە هێزەکە و بەرگری بکات لە پێشڕەوییان، بەڵام سەربازەکانی ئێران گەیشتـنە نزیکی تۆپخانەوە و هێزەکەی ئیچ ئوقلان بە پەلە خۆیانیـان لە هێزەکـانی ئێـران دوورکـردەوە و نیوەیـان بـەرەو بـاکوور و نیوەیـان ڕوویـان کـردە باشـوور و ئێرانیەکانیش لە نێوەڕاستی مەیداندا مانەوە. لە هەمان کاتدا ئـاگری تۆپخانـە هەڵگیـرسا و دەشتی چاڵدوڕانی خستە لەرزەییێکی زۆرەوە.

شائیسـماعیل کـاتێ جـوان ڕوانیـەوە، بـۆی دەرکـەوت کـە هێزەکـانی لـە ژێـری ئـاگری تۆپخانەشدا هـەر بـەرەو پـێش دەڕۆیـشتـن و زانـی فەرمانەکـەی نەگەیـشتووەتە هێزەکـانی. ئەمیـرعەبدولباقی شەهید کرا، زولقەدریش لە دوورەوە باڵای بەرزی سارۆبیـرەی بیـنی و خێـرا

هەوڵی دا تاکو پەیامی پاشای پێ ڕابگەیەنێت، کاتێ لە دوورەوە هاواری دەکرد لە سارۆ ناکاو تۆپێك هات و لێی دا و بە یەکجارە کردی بە خۆڵەمێش هاوکات تۆپێکیش هات و لە دەستی ڕاستی سارۆبیرەی دا و بریندار بوو، یانێ دەستی ڕاستی لە لەشی جیا بوەوە و گورزەکەشی بە دەستی ڕاستیەوە بوو کە سارۆ نەچوو بە دووی دەستیدا و خێرا ڕۆیشت و گورزەکەی گرتە دەستەوە و نەعرەتەییێکی کێشا و لە ناو ئاگری تۆپخانەدا هێرشی کردە سەر تۆپچیەکان و ئەژمارێکی زۆری لێیان کوشت و زۆربەشیان پاشەکشێیان کرد و سارۆش بە گورزەکەی زۆربەی تۆپەکانی شکاند. سەرۆکی هێزەکانی عوسمانی فەرمانی دا بە هێزە چەکدارەکان تاکو ئەو قارەمانە کوردە تیرباران بکەن. ئەوانیش بە قسەی سەرۆکی خۆیانیان کرد و لاشەی سارۆبیرە وەکو بلێی گیانلەبەرێکە و پەڕی دەرکردووە تیری دەرکردبوو، جا بە بۆنەی ئەوەی دەستی بڕابوو و لە لەشی جیا ببوەوە، سەری و جەستەی هەر برین بوو و خوێنێکی زۆری لێ ڕۆیشتبوو ناکاو بەرچاوی ڕەش بووەوە و درا بە عەرزدا و کەوت، لەم کاتەشدا سەربازە تورکەکان نەیانئەوێرا بێنە پێشەوە و هێشتا لێی ئەترسان کە نەوەك جارێکیتر هەڵسێتەوە و هێرش بکاتە سەریان. سوڵتان سەلیم کە خۆی لە دوورەوە چاوی بەم بارودۆخەوە بوو کاتێ زانی سارۆبیرە کەوتووە، خێرا نوێنەرێکی نارد و ڕایگەیاند کە کەس حەقی نییە سەری ئەم کوردە قارەمانە لە لەشی جیا بکاتەوە.

سوڵتان سەلیم کە بۆ داگیرکردنی ئێران هاتبوو و ئێستا چاوی بە پاڵەوانانێکی وەکو سارۆ کەوتبوو نەیانئەوێرا سەری لە لەشی جیا بکەنەوە.

دەبێ ئاماژە بکرێ سێ کەس لە فەرماندە بەناوبانگەکانی ئێران یانێ سارۆبیرە و ئەسلان و ئەمیر عەبدولباقی شەهید کران و تەنیا حەسەن بەیگوڵلا مایەوە و هاوڕێ لەگەڵ سەربازەکانیتری ئێراندا پاشەکشێیان کرد.

بەڵێ براکانم بزانن ئێمە لە ئێراندا (کوردستان)[21] ئاوەها شێرانێکمان بووە کە بە خوێنی خۆیان زێد و وڵاتی ئێرانیان لە دوژمنان پاراستووە و ئیزنی زڵم و زۆریان پێیان نەداوە. ئێمە

---

٢١- وەرگێڕ

سەردارانیّ وەکو ئاریوبەرزەنــمان هەیـە کـە لـە دەربەنـدی فارسدا ئەسکەندر مەقدوونی لـە حاڵێکدا توانی بێتە پێشەوە کە لاشەی ئەوان بوو بە فەرشی بەرپێی ئەو زاڵمە خوێنڕێژە، یانیّ گیانی خۆیانیان باخت کرد و بە شەرەفەوە مردن و ژیانی شەرمەزارانەیان بـە لاوە زۆر ناحـەز و ناشیـرین بوو، ڕۆحی ئەم کەڵەپیاوانە بەرزە و خوا بیکات ئەم ڕۆحانـە هـەر لـە خۆشـیدا بـن و ئیتـر ئێمە لە سەرمانە کە بۆ پاراستنی ئەم ڕەنج و تێکۆشانانە هەوڵ بدەین تاکو ئەم ڕێگە هەر پڕ ڕێبوار بێت.

## ٢- ئەمیــرخان برادۆست

ئەمیـرخان برادۆست لە ساڵی ١٠١٩ی کۆچی مانگیدا دژ بە دەسەڵاتی شاعەباس وەستا و قەڵای دەمدەمی کردە مەکۆی شۆڕشگێڕە کوردەکـان. لـە سـەرەتای ئـەم ساڵەدا بـە بۆنـەی شۆرشی کوردە جەلالیەکانەوە شاعەباس پەلاماریان ئـەدات، نووسـەری عالـەمئـارای عەباسـی دەڵێت کوردە جەلالیەکان ئەوەندە شەڕاشوون تەنانەت ئەگـەر بێگانـە شـەڕیان لەگـەڵ نـەکات، پێکەوە شـەڕ و بەربـەرەکانیّ دەکـەن. شـاعەباس بـۆی دەرکـەوت کـە کوردەکـان تـا ڕادەیێـك دوژمنایەیتان پێکەوە هەیە بۆیە کەوتە بیـری ئەوەی تاکو ئەم دوژمنایەتیـە پـەرە پـیّ بـدات. بۆیە موحەمـمەدپاشای کوردی کرد بە ئەمیری جەلالییەکان. موحەمـمەدپاشا بـە هێزێکـەوە لە ئێسفەهانەوە ڕەوانەی ئازەربایــجان بـوو و جگـە لـە سـەرۆکە قزلباشـەکان چـەن کـەس لـە فــەرمانڕەوا کوردەکـانیش هــاوڕێی موحەمــەدخانیان دەکـرد؛ بــە تایبــەت کەســانیّ وەکــو خەسرەوسوڵتان میـربووی (لە کورد پازووکیەکان) بە حـەوت سـەد سـوارەوە و خـەلیل سـۆڵتان میـرسیلسپەر (سەرۆکی عەشیـرەتی سیرسپرانلوو) بـە سـیّسـەد سـوارە و قوبادخـان مـوکری فەرمانڕەوای مەراغە لەگەڵ موحەمـمەدپاشادا بەرەو کوردستان و دیاربەکر هاتن و هەڵوێستیان ئەوە بوو کە ئەگەر هەر فەرمانڕەوا کوردێك هاوبیـریان بوو ڕێزی لیّ بگرن و ئەگەرنە دەستوبرد خوێنی برژێنن. ئەم هێز و لەشکرە لـەوێوە تـا ئـەرزرۆم هـاتن و گەیشتـنە ئەمیـر گوونـەخان حاکمی چەخۆری سـەعد (ئەمیـر گوونـەخان بـاوکی زیـادئۆغلی قاجـاڕ بـوو)، لـەم سـەفەرەدا

شاعەبباس فەرمانی دا بە ئەمیرخان برادۆست کە لە پیاوەگەورەکانی کوردی موکری و حاکمی ورمێ بوو تاکو ئەم هێزە بە جوانترین شێوە ڕێنوێنی بکات. جگە لەم هێزەی کە ناومان برد، هێزێکی دیکە بە سەرۆکایەتی ئیمام قولیخانی حاکمی لار (کوڕی ئەللاوێردیخان) لە لایەن شاعەبباسەوە ڕاسپێری کوردستان کرا تاکو هوشیاری بارودۆخی نالەباری ناوچەی کوردستان بێت.

موحەمەدپاشای جەلالی کاتێ کە گەیشتە ناوچەکە، داوای کرد لە کوردحەیدەر جەلالی کە یەکێ لە سەرۆکە بەناوبانگەکانی کوردە جەلالییەکان بوو تاکو بگاتە خزمەتی. کاتێ کە کوردحەیدەر هاتە خزمەتی موحەمەدشا، زۆر بە تووڕەییەوە لەگەڵیا باس و وتووێژی کرد، کوردحەیدەر کاتێ ئەمەی بیست، زۆر تووڕە بوو و دەستی کرد بە قسەی توندوتیژ کردنی دژ بە موحەمەدشا و هاوکات گوتی تۆ پیاوی پاشای سەفەویت و کوردایەتیت لەبیر چۆتەوە و خەڵکی کورد هەرگیز پیاوی وەك تۆی ناوێ. موحەمەدپاشا بۆی دەرکەوت کە کوردحەیدەر دەبێتە لەمپەری ڕێی و لە هەمان کاتدا فەرمانی دا بە جەلالیەکان تاکو سەری حەیدەرکوردیان لە لاشەی جیا کردەوە و ئەم هەواڵەی گەیاندەوە شاعەبباس و ئەویش زۆر سوپاسی لێ کرد. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە شاعەبباس لە کورد دوژمنی بۆ کورد دروست کردووە و سەردارێکی کورد بە دەستی سەردارێکی دیکەی کورد دەکوژێت.

ئەگەرچی دەبوایە لەم سەفەرەدا ئەمیرخان برادۆست فەرمانڕەوای ورمێ، یارمەتی موحەمەدپاشای جەلالی بدات تاکو عەشیرەتە کوردەکان سەرکوت بکرێن، بەڵام ئەم سەرۆکە کوردە ئەم کارەی نەکرد و دەستی نەدا بەم کارە نامەردانەوە و چاك دەیزانی کە شاعەباس بە سیاسەتە حیزانەی خۆیەوە دەیەوێت کوردەکان تووشی شەڕی براکوژی بکات و بۆیە کەوتە بیری تاکو قەڵای دەمدەمی بنیات نا.

بۆ شارەزایی زۆرتر لەم بارەوە دەبێ تۆزێك زۆرتر ئاوڕ لە سەر ئەمیرخان بدەینەوە. شاتەهماسب قەراتاجی کوردی کرد بە فەرمانڕەوای ناوچەکانی تەرگوڕ و مەرگوڕ کە سەر بە ناوچەکانی ورمێ و ئوشنوییە بوون. دوای مردنی شاتەهماسب، دەسەڵاتداری ڕۆمی شەرقی توانی بڕێك لە سەرۆکە کوردەکان بکات بە هەڤاڵی خۆی و لە ئاکامدا توانی ناوچە

کوردنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیە هەتا ورمێ بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و شاموحەمەد بەیگ کە یەکێ لە پیاوەگەورەکانی عەشیرەتی برادۆست بوو کرایە سەرۆکی ئەو ناوچانە.

ئەمیرخان برادۆست کە پیاوێکی ئازا و ئێراندۆست بوو لە شاموحەمەد فەرمانی نەبرد و بوو بە هەڤالی عومەربەیگ حاکمی سەهران و دژ بە ڕۆمیەکان دەستی کرد بە شەڕکردن و ئازایەتییێکی زۆری لە خۆیەوە پیشان دا و لە ئاکامدا دەستێکی خۆی کرد بە فیدای ڕێگا و ئامانجەکانی خۆی و سەربەخۆیی ئێران. مامۆستا حسەین مەسروور لە بەرگی دووەمی «١٠ نەفەر قزڵباش»دا نووسیویەتی:

ئەمیرخان لە خانە گەورە و بەناوبانگەکانی کورد بوو کە لە تەبرێز و ئەو ناوچەگەلەدا دەسەڵاتی بووە. گوندی حاجی‌کەندی لە داوێنی کێوی سەهەند دایە کە موڵکی ئەمیرخان بووە و کۆشك و خانووگەلێکی زۆر ڕازاوە و خۆشی لەوێ بنیات ناوە و کاتێ کە سوپای ئێران بە سەرۆکایەتی حەمزە میرزای برای شاعەبباسەوە لە شەڕی دژ بە ڕۆمیەکاندا سەردەکەون، جێژنی سەرکەوتنی خۆیان لەو کۆشکەدا بەڕێوە دەبەن و هاوکات ئەمیرخان زۆر ڕێزی حەمزەمیزرا دەگرێت. دوای ماوەیێك کە هەواڵی کوژرانی حەمزەمیرزا گەیشتە دەوڵەتی عوسمانی، جارێکی‌تر عوسمانیەکان هێرشیان کردە ناوچەکانی قەفقاز و ئازەربایجان و ئەو ناوچانەیان داگیر کرد ئەمیرخان برادۆست و قوباد کەلهوڕ لەم شەڕانەدا ئازایەتییێکی زۆریان لە خۆیانەوە پیشان داوە. ئەگەرچی زۆربەی کوژراو و بریندارەکان لە شەڕی ئێران و ڕۆمدا لە گەلی کورد بوون و بەندیخانەکانی تەبرێز و قەفقاز و ڕۆم پڕ کرابوو لە کوردە دیلکراوە تەبرێزییەکان: «لە لەشکری قزڵباش و شیروانیان و خەڵکی قەراباغ و جەماوەرێکی‌تر کە کوردەکان و گورجیەکانی شاهیسوون بوون کە ئەمانەیان نەبردە بەندیخانەی یەدی قەلعەی عوسمانی و هەر لە تەبرێزدا مانەوە.»[22]

لە ئاکامدا لە لایەن ئەمیرخان برادۆست و ئەسکەندەرخان خۆش خەوەر ئوستاجلوو و قوبادخان کەلهوڕ و خەڵکی بەئەمەکی تەبرێز هێرش کرایە سەر ئەم بەندیخانەیە و لەشکرگا و

٢٢- دە نەفەر قزڵباش، حسەین مەسرور، بەرگی ٢.

پادگانی ڕۆمیەکان ئاگری تێ بەربوو، هەموو دیل کراوەکان ڕزگار کران و داگیرکەران بە ئاگری توورەیی خەڵکی نەبەزی ئێران ئاگر دران.

ماوەییێك تێپەڕی و سەرکردە ئازەری و کورد و لوڕەکان و گیلانیەکان لە سایین قەڵای ئازەربایجاندا لێژنەیەکیان بوو و گەیشتن بە ئەو ئاکامەی کە دەسەڵات لە سوڵتان موحەممەد وەربگرنەوە و عەبباس میرزای کوڕی بکەن بە پاشا. پاڵپشتی کردنی ئەمیرخان لە عەبباس‌میرزا بوو بە هۆی ئەوەی کە مەجلیسی گەورەی ئێران دەنگ بدات بە پاشایەتی شاعەبباسەوە. یەکەمین کەسێك کە لەم کۆبوونەوەدا قسەی کرد، زیاد ئوغلی کوڕی ئەمیرگوونەخانی قاجار فەرمانڕەوای قەراباغ بوو کە لە شەڕی چاڵدوڕاندا بەشداری کردبوو. دووەمین کەسێ کە قسەی کرد فەرهاد بەیگ جەوانشیر بوو سێیەمین کەس شاهۆیردی‌خان لوڕ بوو کە بە دژایەتی شاعەباسەوە دەستی کرد بە قسەکردن و بە تەواوی کۆبوونەوەکەی تێك دا.

ئەمیرخان کاتێ زانی بارودۆخەکە نالەبارە خۆی هەستا و وەکو سەرۆکی لێژنەکە دەستی کرد بە باس‌کردن نووسەری «دە نەفەر قزلباش» نووسیویەتی: کوڕێکی ٣٢ساڵان کە کڵاوێکی کوردی لەسەر نابوو و ڕشتەی مرواری پێوە هەڵواسرابوو و ڕوومەتی داپۆشابوو کە پێیان دەگوت ئەمیرخان برادۆست سەرۆکی عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەی ورمێ بوو و هەمووی قزلباشەکان لە ئازایی و لێهاتوویدا ناوبانگیان بیستبوو. کۆتێکی کردبووە بەری کە بە فیرووزەوە ئاڕایشت کرابوو و خەنجەری زێڕیشی لە کەمەردا بوو و هاوکات ڕووی کردە جەماوەرەکە و گوتی: براکانی من، ئەمن لە لایەن خەڵکی کوردستانەوە قسە دەکەم و هەرچی کە من ئەیلێم قسەی هەموو خەڵکی کوردستانە.

کەڵە پیاوانی ئێران با وەکو دەزانن من لە سەرەتای هێرشی دوژمنەوە تا ئەمرۆ هاوڕێ لەگەڵ عەشیرەتەکەم دژ بە دوژمن وەستاوین و مافە ڕەواکانی خۆمان پاراستووە بە بێ ئەوەی داوای یارمەتیمان لە عالی‌قاپوور سەرۆکایەتی سەفەوی لە قەزوین کردبێ و ئاوڕمان لە یارمەتی سوڵتان موحەممەد نەداوەتەوە، قەت نەوەستاوم و خەو و پێخۆرم لە خۆم حەرام کردووە، وەك هەموان دەزانن ڕۆمیەکان بۆ لەناوبردنی من بە هەموو شێوەیێك کاریان کردووە و

هەوڵیان داوە بەڵام بە پێی ڕەحمی خوداوە هێشتا زیندوو ماوم و ئەو دەرفەتەم نەداوە دوژمنەکانم سەر ڕاست بکەنەوە و هەموویانم تێك شکاند.

ئەم کوڕە کوردە ئەوەندە جوان قسەی کرد کە هەموان هەڕایان کرد تاکو باڵا و ڕوومەتی ئەم کەڵەپیاوە ببینن و بزانن کێیە، ئەمیرخان چاکترین سەرباز و ئامرهێزی سەردەمی خۆی بووە و قیافەیێکی پیاوانە و ڕوومەتێکی لێهاتووانەی بوو کە لە هەر شوێنێکەوە دەڕۆیشت، خەڵك شەرمیان لێ کردووە.

ئەمیرخان بە زمانی کوردی ڕایگەیاند: پاڵەوانان، سەربازە کەڵە تواناکان، ئێوە بزانن ئەمن قەت ڕانەوەستام بۆیە توانیم «سپای خواندگار[٢٣]» لە ناوچەی ئەرزۆمیدا شکست بدەم؛ بەڵام دراوسێکان کە یارمەتیدەری ئەوان بوون هەر لەگەڵ ئێمەدا دژایەتیان دەکرد و ئەمن لەگەڵ ئەوانیش بە شەڕ هاتم و تەنانەت دەستێکی خۆمم لەم ڕێگەدا کرد بە قوربانی...

ئەمیرخان بەم قسەی خۆیەوە توانی هەستی نەتەوایەتی خۆی بە جوانی پیشان بدات و هەروەها ئەم قسانە پیشاندەری ناتوانی دەسەڵاتدارێتی سوڵتان موحەممەد خودابەندەیە، دانیشتوان لەم دانیشتنەدا زۆر بەو قسانە بیریان کردەوە و زانیان واتاکانی هەمووی ڕاستە و هاوکات داوای کرد لە دانیشتوان کە بۆ ئەوەی عەبباس بەهادورخانی کوڕی سوڵتان موحەممەد بکەن بە پادشا دەست بدەن بە شۆڕشەوە.

ئەم قسانە زۆر پڕ قازانج بوو، ئەگەرچی خان ئەحمەخانی گیلانی زۆر هەوڵی دا کە لەم کارە بەرگری بکات، بەڵام دوای قسەکانی ئەحمەد گیلانی، خان ئەحمەد کورد ئەردەڵان کە دوایی خوشکەکەی شاعەبباسی کرد بە ژنی خۆی و لە شەڕی ئێران و ڕۆمدا سەرکەوتنی زۆری وەدەست هانی، ئاکامی هانی بە قسەی ئەوانەی وا دژی پاشایەتی شاعەبباس بوون و هاوکات بانگی هەڵدا و گوتی ئافەرین بۆ ئەمیرخان و دروود بۆ شێرەپیاوانی کوردستان و بەم قسەی سایین قەڵای هێنایە لەرزە.[٢٤]

ئێستا بزانین شاعەبباس لە کاتی دەسەڵاتدارێتی خۆیدا چلۆن لەگەڵ ئەمیرخاندا ڕەفتی

---

٢٣- پاشا و ئیمپراتووری ڕۆم

٢٤- دە نەفەر قزڵباش، ب ٢ ل ٩٩، حسەین مەسروور.

کردووه. شاعەباس لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتی خۆیدا زۆر پیاوانە لەگەڵ ئەمیرخاندا ڕەفتاری کردووە؛ بەڵام دوای ماوەییێك خەڵك ئەوەندە خراپەی ئەمیرخانیان دەگوت کە لە هەموان زۆرتر ناپیاوێك وەکو بوداقخان تورکمان پەناك حاکمی تەبریز کارێکی کرد کە شاعەبباس ڕقی هەستا لە ئەمیرخان برادۆست و بوو بە هۆی شەڕی نالەباری دمدمەوە.

بەڕێز مەسروور نووسیویەتی لە سەردەمی سەفەویەدا ئەگەرچی تورکەکان زۆر لە دام و دەزگا حکومیەکاندا بەشدار بوون، بەڵام سەرۆکە کوردەکانیش زۆر بێدەسەڵات نەبوون و ١٧ سەرۆکی کورد لە حکومەتی سەفەویەدا پۆستی گرنگیان بە دەستەوە بوو، دوای ئەوەی شاعەبباس بوو بە پاشا، ئەو دیلە ڕۆمیانەی کە لە شەڕی ئازەربایجاندا دیل کرابوون، لە بەرچاوی شاعەباسەوە ڕۆیشتن ناکاو پاشا چاوی بە دیلێکی باڵابەرزی کورد کەوت کە بە دەستی کوڕەلاوێکیتری کورد دیل کرابوو کە تەنیا دەستێکی بوو. شاعەباس زۆر سەری سوڕما و پرسیاری کرد لە دیلەکە کە: تۆ خەڵکی کوێیت؟ دیلەکە گوتی: من خەڵکی جەزیرەم[٢٥] و ڕەگەزم کوردە، لە هەمان کاتدا ئەو سەرۆکە کوردانەی کە لە خزمەتی پاشادا بوون، دەستیان کرد بە سرتە کردن. پاشا پرسیاری کرد تۆ چلۆن بە دوو دەستەوە دیلی دەستێکی ئەو پیاوە بوویت؟ (پاشا بە زمانی کوردی ئەم پرسیارەی پرسی.) دیل کاتێ کە بینی پاشا بە زمانی کوردی لەگەڵیا باس دەکات[٢٦] بە سەرسوڕمانەوە دیلبوونی خۆی لەبیر چووەوە.

---

٢٥- دوای سەرکەوتنی عەرەبەکان بە سەر ئێراندا ناوی زۆربەی ناوچەکانی ئێرانیان گۆڕی، بە تایبەت ناوی کوردستانیان کردە جەزیرە (کوردستان عێراق).

٢٦- ڕەگ و ڕیشەی سەفەویەکان بە جوانی دیار نییە کە لە کوێوە هاتوون، ئەوەی کە دەڵێن لە بنەماڵەی ئیمام مووسای کازمن، ڕاست نییە. سەبارەت بە کورد بوونیشیان دەڵێن کە یەکێ لە بابەگەورەکانیان ناوی فیرووز شەریعەتی بووە و وا دیارە لە کوردەکانی سووریە بن و یان نە لە ڕەگەزی ئاریایی بوون کە بە زمانی ئازەری قسەیان کردووە. ئازەری زمانێك بوو کە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی فارسیدا بوو و دوای دەسەڵات پەیدا کردنی تورکەکان بە سەر ئازەربایجاندا ڕۆژبەڕۆژ ئەم نەتەوەیە بەرەو نەمان تلایەوە و کەچی دەڵێن تاقمێکیان لە خەڵخاڵ ماونەتەوە، سەفەویەکان بەو بۆنەوە بە تورکی قسەیان دەکرد و پەرەیان بەو زمانەش دا کە لەو سەردەمەدا تورکەکان دەسەڵاتێکی زۆریان بە دەستەوە بوو و ئەو پادشا سەفەویانەش بەم شێوەیە توانیان دڵی زۆربەی خەڵك وەدەست بهێنن و هەروەها بەو بۆنەشەوە خۆیانیان لە ڕەگەز و بنەماڵەی ئیمام مووسا دەزانی چونکە دەیانویست لە ڕێگای مەزهەبەوە زاڵ بن بە سەر ئێراندا و بۆیە خۆیانیان بە جێگر و خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ) دەزانی.

پیاوە کوردەکە زەردەییێکی برد و بە زمانی کوردی گوتی: قوربان جارێك کە هەزار پاییێك دێڵی دەستی کرمێك دەبێ، لێیان پرسی تۆ چلۆن بە هەزار پاوە دیلی دەستی ئەو کرمە بوویت. هەزارپا گوتی: خۆزگە بە جێگەی ئەم گشتە پاوە چاوێکی دوارۆژبینیم بوایات. هەموو دانیشتووان زۆر بەو قسەیە کەنین. شاعەبباس گوتی: سەرۆکی عەشیرەتی ئێوە کێیە؟ وڵامی دایەوە میرشەرەفە[27] کە بە هێزێکی بەبڕشتەوە لە دڵی سوپای دوژمنەوە خۆی بۆ هاوکاری ئێوە ڕازاندۆتەوە.

خان ئەحمەخان ئەردەڵان حاکمی شارەزوور بیگلەربەیگی کوردستان[28] کە لە تەنشتی پاشاوە وەستابوو و گوێبیستی ئەم قسانە بوو بە پاشای ڕاگەیاند کە ئەی پاشای بەرێز! میرشەرەف کوردە و متمانەم هەیە ڕۆمیەکان بە زۆر بردوویانەتە نێو هێزەکەیانەوە و من چاك دەزانم ئەو یارمەتیدەری هێزی دوژمن نییە پاشا تۆزێ بە سمێڵەکانی خۆی کایەی کرد و بە دیلەکەی گوت: «سوی زادە[29]» لەبەر ئەوەی ئێوەی کورد لە خۆمانن من تۆ ئازاد دەکەم بەڵام دەبێ نامەییێك لە لایەن منەوە ببەی بۆ میرشەرەف و ئایا کەسێك هەیە بێت بە زامنی تۆ کە ئەگەر ئازاد کرای بە متمانەوە ئەم نامە بگەیەنێتە دەستی میرشەرەفی سەرۆکی کوردەکانی جەزیرە؟

دیلەکە بە شێوەیێکی هەژارانە هەر بۆ دەوروبەری پاشا دەڕوانێت بەڵکو کەسێك بەزەیی پێدا بێت و ببێت بە زامنی. بەڵام کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە.

پاشا گوتی: بڕوانە ئێستا سێ کەس لە سەرۆکە کوردەکان لەم جەماوەرەدان کە هەر کام لە ئەمانە بەشێك لە خاکی کوردستانیان بە دەستەوەیە، لەوانەیە کە یەکێکیان ببێ بە زامنی تۆ. ئەو سێ سەرۆکە کوردە هەر کام بە بیرێکەوە نەچوونە یارمەتی ئەو دیلەوە و یارمەتیان

---

٢٧- مەبەست ئەمیر شەرەفخان بەدلیسی نووسەری شەرەفنامەیە. ئەمیربەیگ مووسڵلوو لە کوردەکانی مووسڵە کە لە لایەن شائیسماعیل سەفەویەوە نازناوی «خان»ی پێ درا و پلەی «لەزگ»ی وەدەست هانی و پاشان بوو بە دەسەڵاتداری خوراسان و هەرات.

٢٨- خان ئەحمەدخان بە بۆنەی دەورێك کە لە خۆرئاوای ئێراندا بووی شاعەبباس خوشکەکەی خۆی بۆی مارە کرد.

٢٩- ماقولزادە، ئەم وشەیە لە کوردستانی خوراساندا باوە.

نەدا، لەبەر ئەوەی لە سیاسەتی شاعەباس ئەترسان.

لە ئاکامدا پاشا ڕووی کردە ئەو پیاوە و گوتی من دەبمە زامنی تۆ، لەبەر ئەوەی گەورە پیاو هیچ کاتێ پیاوەتی لەبیر ناباتەوە. پاشا فەرمانی دا تاکو دەستی ئەو دیلەیان کردەوە و نامەیێکی نووسی بۆ میرشەرەفخان و کاتێ ئاسمان ئەستێرەی گرت بە خۆ، دیلەکە ڕەوانەی هێز و سوپای ڕۆمیەکان کرا. ڕۆژی دوایی پاشا فەرمانی دا تاکو ئەو پیاوەی کە تەنیا دەستێکی بوو و توانیبووی ئەو سەرکردە دیل بکات بیهێنن تاکو دیداری بکات. ئەم کوڕە ناوی ئەمیربەیگ بوو لە عەشیرەتی سیاتاج کە باوك و باوەگەورەی هاتبوونە نێو عەشیرەتی شاهیسوونەوە.[٣٠]

ئەمیربەیگ دەیگوت من بە ٢٥ سەربازەوە ٦٠٠ سەربازی دوژمنم تێك شکاندووە. ئەمیربەیگ قۆڵەکەی هەلکرد و پاشان باڵەبڕاوەکەی پیشانی پاشا و خەڵکەکە دا و گوتی ئەم دەستەی خۆمم لە شەڕەکانی ئازەربایجاندا کردۆتە فیدای ئێران.[٣١] بە بیستنی ئەم قسەیە هەموان گوتیان ڕاستە هەر وایە.

پاشا هەر بۆی دەڕوانی و ئەم کارەساتەی بە کارەساتێکی دڵتەزێن دەزانی کە لاوێکی ئاوەها لێهاتوو دەستی بڕاوە. ئەمیرخان دەیگوت ئەگەر من دەستم نییە چونکە بۆ پاراستنی زێد و وڵاتەکەمە و قەت نیگەران نیم و هاوکات زۆر پێشی دڵخۆشم و بە بێدرۆ حازرم گیانیشم بکەم بە فیدای ئەم ئاو و خاکە.

پاشا بە بیستنی ئەم قسانە بانگی کرد لە زێڕگەرباشی و گوتی لە زێڕی چاك دەستێك دەبێ بۆ ئەم لاوە نەبەزە دروست بکرێ تاکو ئەم لاوە و لاوانیتر بزانن کە ئێمە بۆ گیانبازیەکانی ئەم بەڕێزانە ڕێز و حورمەتمان هەیە.

خەڵکی کاتێ ئەم قسەیان لە پاشاوە بیست، زۆر سەریان سوڕما و بۆ یەکتریان دەڕوانی و دەیانگوت خۆزگە بە ئەمیربەیگ. یانێ ئەمیربەیگ ٢ مەن زێڕی چاکی پێ ئەدرێت!؟

---

٣٠- شاهیسوون یان شاهی سەیران، خەڵکێك بوون کە یارمەتی شاعەباسیان داوە و خۆیانیان بە لایەنگری ئەو زانیوە و زۆربەشیان تورك بوون.

٣١- وەك چلۆن سارۆبیرە لە شەڕی چاڵدوڕان لە پێشدا دەستی و پاشان خۆشی بوو بە قوربانی.

دەست لە زێڕ دروست کرا و بانگی ئەمیرخانیان کرد تاکو بڕوات و دەستی زێڕی پێ بدرێت و لە دەستی پاشاوە وەری بگرێ کاتێ گەیشتە خزمەتی پاشا، پاشا گوتی: ئەمیرخان! (دانیشتووانی کۆڕەکە هەموویان سەریان سوڕمابوو کە چلۆن ئەمیربەیگ بوو بە ئەمیرخان) ئیستا وەرەپێشەوە تا ئەم دەستە زێڕەت پێ بدەین ئاخر تۆ لە شەڕێکدا ئەم دەستەت لە دەست داوە کە بۆ وەدەست هێنانی سەروەری و سەربەخۆیی ئێران بووە و ئێمەش دەیسەلمێنین کە هەر کەسێ پیاوەتی بکات بە پیاوەتیەوە وڵامی دەدەینەوە. ئێمە نازناوی «خان» دەدەین بە تۆ و جگە لەوەش خەڵاتی‌تریش دەکرێیت. پاشان پاشا ڕووی کردە وەزیرەکانی خۆی و گوتی: بەڕێزان! خانەکان! ماقووڵزادەکانی کورد! لە سەرتانە ئێوەش ئەنگوستیلەی خۆتان بکەنە ئەنگوستی ئەم کەڵەپیاوەی کوردەوە تاکو لەم خەڵات بەخشینەی پاشادا بەشدار بووبێتن. ئەوانیش هاتنە پێشەوە و بە دڵ و گیان ئەو کارەیان کرد.

ئەو سەرۆکە کوردانەی کە دیارییان دا بە دەستە بڕاوەکەی ئەمیرخانی برادۆست بریتی بوون لە: عەلی‌مەردان‌خان زیك بیگلەربەیگی قەندەهار، قەلەندەرسوڵتان حاکمی زەنجان، ئەبداڵ عەلی‌خان فەرمانڕەوای کرماشان، بایندەرخان تاڵش، بەهرام عەلی سوڵتان سووفی حاکمی دەیلەمیان، ئیمامقولی‌خان سیامەنسوور حاکمی ئێسفەراین، سلێمان‌خان دەنبەڵی، مەقسوود سوڵتان شوقاقی، عاشوور خان چەگەنی، نەفەس سوڵتان گەڕووسی، گەدایی سوڵتان گولایی[٣٢]، مەراغە حسەین‌خان خۆڕەم‌ئابادی حاکمی لوڕستان و خەلیل‌خان بەختیاری. هاوکات دەسەڵاتی ئەروومی و بلووك خۆشاب کوردستان درایە دەستی ئەمیرخانی برادۆستەوە و پاشا پێی گوت: ئەمیرخان بە خێڵی برادۆست بڵێ کە بە قسەی شەیتان نەکەن و دەست نەدەن بە شۆڕشەوە.[٣٣]

نووسەری عالەم‌ئارای عەبباسی دەڵێت: کاتێ کە شاعەبباس دەڕوات بۆ ئیروان و نەخجەوان، داوای کردووە لە ئەمیرخانی برادۆست تاکو بڕواتە خزمەتی. ئەمیرخان دەڕوات و

---

٣٢- بڕێك لەم عەشیرەتە لە سیستاندا نیشتەجێن.

٣٣- ڕادیۆ ئێران، گۆڤاری دایرەی گشتی نەشری ڕادیۆ، ژمارەی ٢٣، ل ١٠. ڕەگەزی کورد، نووسراوەی بەڕێز حسەین مەسرور و هەروەها بڕوانە بۆ کتێبی دە نەفەر قزلباش، بەرگی ٢.

پاشا دەسەڵاتی ورمێ و ئوشنەوییە و تەرگۆڕ و مەرگۆڕی پێ ئەدات و نازناوی «خان»ی بۆ هەڵدەبژێرێ.[٣٤]

ئەمیرخان برادۆست لەم ڕۆژە بە دواوە بە «خانی لەپزێڕین» ناویانگی دەرکردووە. ئەمیرخان کە پیاوێکی ئازا و لێهاتوو بووە، زۆری نەخایاند کە توانی جێگە و شوێنێك بۆ خۆی وەدەست بهێنێ و هەروەها توانی سەرۆکی کوردەکانی ئێران و تورکیە کۆ بداتەوە و بۆ پاراستنی سەربەخۆیی ئێران دژ بە تورکیە بووەستن. ئەمیرخان زۆر ڕێزدار و شکۆدار بوو و هیچ یەك لە خانەکانی‌تری کورد لە کوردستانی گەورەدا وەکو ئەمیرخان ڕێز و حورمەتیان لێ نەگیراوە.

بەڵام بە داخەوە جارێکی‌تر دوژمنان ئیزن نادەن کورەکوردێك گەورە بێت و کەسانێ وەك میربوداق خانی دەسەڵاتداری تەبرێز کەوتنە بیری ئەوەی پیلانێك دابڕێژن تاکو ڕقی پاشای ئێران دژ بە ئەمیرخان هەڵبگرسێنن. ئەمیرخان کاتێ بەم کارەساتەی زانی، بۆی دەرکەوت کە هەر وەختێ بێت پاشای ئێران خوێنی دەڕژێنێ، وەکو فەرهادخانی قارەمانلوو و زوڵفەقارخانی برای فەرهادخان دەبێ بە ناپیاوی بیکوژن، بۆیە بیری دەکردەوە تاکو ڕێگەچارێك پەیدا بکات بەڵکو بتوانێ لەم تەنگی و چەڵەمە ڕزگاری بێت. بۆ ئەم ئامانجە داوای کرد لە پاشا تاکو ئیزنی بدات قەڵای دمدم بنیات بنێ. بەو بیانوەی کە ئەگەر سپای دوژمن هێرشی هێنا بۆ ناوچەی ورمێ بتوانێ ژن و منداڵەکەی لە دیل بوون بپارێزێ. پاشاش ئیزنی ئەو کارەی پێ دا و ئەمیر لە سێ فرسەخی شارۆچکەی ئەرۆمیەوە لە سەر کێوێکی بەرزەوە لە خاکی تەرگۆڕدا قەڵاییێکی بنیات نا. ئەم قەڵایە لە سەردەمی ساسانیەکاندا قەڵای بەناوبانگی کوردستان بووە و پاشان لە سەردەمی شەڕی ئێران و عەرەبدا ڕووخاوە و ئێستا سەرلەنوێ بنیات نرایەوە. پیربوداق‌خانی فەرمانڕەوای تەبرێزیش داوای کرد لە پاشا تاکو ئیزنی ئەم کارە بە ئەمیرخان نەدات لەبەر ئەوەی کە ئەم کارە هیچ قازانجێکی بۆ حکوومەت نییە.

پاشا کە پیاوێکی گوێ‌لەمشت بوو فەرمانی دا بە پیربوداق تاکو بڕوات و ئیزنی

---

٣٤- عالەمئارای عەبباسی، ل ٧٩٢.

بنیاتنانی ئەم قەڵایە نەدات بە ئەمیرخان. نوێنەری پیربوداق خان لە لایەن سەربازەکانی ئەمیرخانەوە کوژرا. هەر لەم سەردەمەدا بوو کە موحەممەد پاشای جەلالی بۆ سەرکوت کردنی کوردحەیدەر لە ئێسفەهانەوە هاتبوو بۆ ئازەربایجان و پاشا، پیربوداق خانی کرد بە سەرۆکی ئەم هێزە تاکو یارمەتی موحەممەدپاشا بدات.

دەی ئەمیرخان برادۆست کە خۆی عەبباس میرزای کرد بە شاعەباس و لە شەڕەکاندا ئازایەتی زۆری نواندبوو و چلۆن دەڕواتە ژێر دەسەڵاتی ئەم ناپیاوانە. ئەمیر لە نامەیێکدا کە بۆ پاشای نووسی دانی بەوە دانا کە پیربوداقخان لەبەر ئەوەی دوژمنی منە بۆیە خراپەی منی بە لای بەرێزتەوە گوتووە و ئەمنیش لەبەر ئەوە فەرمانی ئەو جێبەجێ ناکەم.

پاشا لە ڕێی ناچارییەوە حەسەنخانی نامی بە جێگای پیربوداقخان ڕەوانەی ورمێ کرد بەڵام تا حەسەنخان گەیشتە سنووری ورمێ ئەمیرخان کە موحەممەد پاشای بە سەرۆکی کوردەکانی جەلالی نەدەزانی لە یارمەتیکردنی ئەو پەشیمان بووەوە و دەرباز بوو، کەچی شەڕ و پێکدادانێك کەوتە نێوانی ئەم دوو سەرۆکە کوردە و زۆربەی کوردە جەلالیەکان بوون بە هەڤالی ئەمیرخان و حەسەنخانیش ئەم بارودۆخەی پێگەیشت و بە پاشای ڕاگەیاند و هاوکات داوای یارمەتیشی لێ کرد.

پاشا یەکێ لە گەورەترین سیاسەتەوانەکانی خۆی بە ناوی «حاتەمبەیگ ئێعتمادودەولە»ی نارد بۆ شیکردنەوە و تاقیکردنەوەی بارودۆخەکە. لەم کاتەدا ئەمیرخان لە قەڵاکەدا سەنگەری گرتبوو و حاتەمبەیگ دوای ماوەیێکی زۆر باس و لێدوانێکی درێژ لەگەڵ ئەمیرخاندا، نەیتوانی ئەمیرخان ئەهوون بکاتەوە و گەڕایەوە و بارودۆخەکەی بە پاشا ڕاگەیاند و فەرمانی هێرش بە قەڵا لە لایەن پاشاوە درا.

ئەسکەندەربەیگ تورکمەن کە نووسەر و مێژوونووسی تایبەتی شاعەبباس بوو و نووسەری کتێبی عالەمئارای عەبباسیە و زۆریش کتێبەکەی جێگەی متمانە نییە؛ بەڵام لە نێوان خراپە گوتنو جوێنەکانیدا کە بە کوردی داویە، دەتوانین بەو قەناعەتە بگەین کە نووسەر نەیتوانیوە شۆڕشە مەزنەکانی ئەمیرخان و عەشیرەتە کوردەکانیتر وەکو عەشیرەتی

موکری و جەلالی و حەکاری بخاتە پشت گوێ؛ بەڵام بۆ ئەوەی پاشا ئافەرینی پێ بڵێت زۆربەی ڕاستیەکانی ئەم شۆڕشانەی نەدرکاندووە.

ئەسکەندەر بەیگ وەك چلۆن خۆی دەڵێت هاوڕێ لەگەل سوپای شاعەبباسدا ڕۆیشتووە بۆ قەڵای دمدم تاکو بەسەرهاتەکانی ئەوی بنووسێتەوە ئەسکەندەربەیگ بارودۆخی قەڵاکە لە کاتێکدا کە گەمارۆ دراوە ئاوەها باسی لێوە دەکات: قەڵای ناوبراو لە سەر کێوێکی بەرزەوەیە کە بەرزایی زۆرە و پانایی کەم. ئەم قەڵایە لە باکوور و باشوورەوە دەگاتە چەم و دۆڵ. دوڵەکە زۆر قووڵە و جگە بە پەیجە نەبێ ناتوانی لەوێوە سەرکەوی. لە ڕۆژهەڵاتەوە قەڵاکە دەگاتە کێو و لەوێوە دەروازەیێکی هەیە، بەڵام لە ڕۆژئاواوە بە دەشت و هەوار نزدیك دەبێتەوە. کەچی دەروازەکەشی ئەوەندە بەرتەسکە و لە ناو کوچك و بەردێك دایە کە زۆر سەخت و نالەبارە. بەردەکان لە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە زۆر گەورەن تاکو دوژمن نەتوانێ لە ڕێگای تونێلەوە بگاتە ئەوێ و لە بەشی کۆتایی قەڵاکەشەوە لە ترسی تونێل کەندنی دوژمن بورجێکی هەرەگەورەی دروست کردووە کە زۆر بەرزە ئاوی قەڵاکەش لە ئاوی باران دابین دەکرێ کە دەڕژێتە ناو حەزێك و لەوێ کۆ دەبێتەوە ئەگەرچی لە بەشی باکووری قەڵاکەوە چۆمێك هەیە کە تۆزێك ئاوی هەیە؛ بەڵام زۆر کەمە. ئەمیرخان ئاوی ئەو چاوکەیەی بردۆتە نێو حەوزەکە و شەو تا بەیان حەوزەکە پڕ دەبێ لە ئاو و ئاوی شەو و ڕۆژێکی دانیشتوانی قەڵاکە دابین دەکرێت. لە سەر حەوزەکەوە گۆمەزێکیان دروست کردووە و بە شێوەیێك دروست کراوە کە کەسێ لە دەرەوە بێت، قەت نایبینێ کە چییە و خۆیان پێی دەڵێن «بووزلق» یان «قارلق» کە بە شێوەی «سوولق» دروست کراوە و لە دەرەوە کەس ناتوانێ بیبینێ.

ئەم قەڵایەی کە ناومان برد لە ڕاستیدا پێنج قەڵایە کە بریتین لە قەڵای ئەسڵی، قەڵای خوار و سوولق، بووزلق، قەڵای گەورە کە لە بەشی ڕۆژهەڵاتیەیە و زۆر قەڵاییێکی ڕێکوپێکە و دوورە لە دەستبردی دوژمن.

قەڵاییێك بەم شێوەیە کە لە ژێر دەسەڵاتی کوردەکان دایە و سەرۆکی ئەو کوردانەش ئەمیرخانی لەپزێڕینە و ئێستا لە لایەن بوداقخان و حاتەمبەیگ و گەنجعەلیخانی زیك و

هێزە خوراسانیەکانەوە گەمارۆ دراوە.

جگە لە کوردە جەلالیەکان، سیل سپرانلووەکانیش هەر دژی ئەمیرخانن. دوای ماوەییێك کە قەڵا لە لایەنی دوژمنەوە گەمارۆ دراوە، خێڵی ئەمیرخان تووشی بێئاوی دەبن و زۆربەیان لە تینوویەتیدا دەمرن و زۆربەشیان تەسلیمی دەستی حاتەمبەیگ دەبن و بەم شێوەیە دەرگاکانی قەڵایان بۆ دوژمن کردەوە و جێگای حەوزی سوولق بە دوژمن پیشان درا و ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە دوای ٣ ساڵ شەڕ و پێکدادان هێزەکانی شاعەباس ئەو قەڵایەیان داگیر کرد و کەڵە پیاوێکی وەك ئەمیرخان شکستی خوارد. بە فەرمانی حاتەمبەیگ تونێلێك هەلکنرا. کوردەکان کاتێ بەم پیلانەیان زانی شەوانە لە قەڵا دەهاتنە دەرەوە و شێرانە لەگەڵ دوژمندا شەڕیان دەکرد و کاتێ خۆر تیشکی خۆی دائەبەزاند دەچوونەوە نێو قەڵاکەوە. هەبوونی چەکە ئاگرییەکان بە تایبەت ئاگری تۆپخانەی دارودەستەی حاتەمبەیگ ڕۆژی ڕۆشنی لە ژن و منداڵی کوردەکانی قەڵا کرد بە تاریکەشەو لە هەمووان نالەبارتر نەبوونی ئاو بوو کە زۆری ئازار ئەدان و هەتاکو نزدیکی مردن بردیانی.

لە سێیەمین ساڵی گەمارۆدانی قەڵاکەدا حاتەمبەیگ لە ڕێگەی تونێلەوە توانی بە حەوزی ئاوی سوولق دەست پەیدا بکات و لە ناوی ببات و هیوای کوردەکانی کرد بە جەهەندەم و ئەمە یەکەمین هەنگاوی سەرکەوتنی خێڵی سەفەوی بوو. لە شەوێکدا کە خێڵی سەفەوی هێرشیان کردبووە سەر ئاوی سوولق، کوردەکان پەلاماریانیان داوە. ئەسکەندەربەیگ لەم بارەوە ئاوەهای نووسیوە: ئەوشەوە لە نیوەی تێپەڕیبوو کە دوو هێز هێرشیان بردە سەر قەڵاکە، هێزێکیان لە لای ژوورەوە پەلاماری قەڵاکەی داوە و لەگەڵ خەڵکدا شەڕی کردووە تاکو بتوانێ ئەوان بە خۆیانەوە سەرگەرم بکات و ئەو هێزەکەی دیکە لە نێو تونێلەکەوە هێرشیان هێنا و کوردەکان تا دوا دڵۆپی خوێنیان شەڕیان کرد و ئەو قەڵایەیان بە خوێنی خۆیان سوور کردەوە بەڵام تەسلیم نەبوون. لەم شەڕەدا ١٠ کەس لە هێزی سەفەوی کوژران و ٨ کەس بریندار بوون کە لەو ٨ کەسەش تەنیا دوو کەس زیندوو مان و کاتێ برانە خزمەتی ئەمیرخان زۆر ڕێزی لێیان گرت و برینەکانیانیشی سارێژ کرد کە ئەو دوو بریندارە یەکیان ئێسفەهانی و ئەویتریان کوردی پازووکی بوو.

شکستی سوپای ئێران لەم شەڕەدا بوو بە هۆی تووڕەیی حاتەمخانەوە و کەوتە بیری ئەوەی تاکو هەوڵ بدات هەرچیٚ زووتر ئەو قەڵایە داگیر بکات.

هاوکات خێڵی سەفەوی بە تۆپ و ئاگرباران کارێکیان بە سەر خێڵی قەڵاکە دەرهێنا کە عەشیرەتی جەلالی لەم کارە تووڕە بوون و سوپای ئێرانیان بەجیٚهێشت. شاعەباس کە مزگێنی زێڕ و پووڵ و پارەی بە ئەوان دابوو، نەیتوانی پەشیمانیان بکاتەوە و ١٢ هەزار کوردی جەلالی بەرەو ڕۆم گەڕانەوە. ئەم کوردە جەلالیانە دەڕۆیشتن تاکو بە گرتنی هێز و چەك لە پاشای ڕۆم بێنەوە یارمەتی برا کوردەکانیانەوە تاکو لەو قەڵایە ڕزگاریان بکەن؛ بەڵام بۆیان نەکرا. لە کوردە جەلالیەکان جگە لە موحەممەد پاشا کەس‌تر نەمابوەوە و ئەویش بە بۆنەی ناخۆشیەوە لە پەنای قەڵاکەدا گیانی دەرچوو.

حاتەمبەیگ[٣٥] کە ئامرهێزی سوپاکە بوو ئەویش هەر لەویٚ گیانی دەرچوو. مردنی حاتەمبەیگ بوو بە هۆی دڵسەردی سوپای ئێرانەوە و هاوکات کوردەکان وچانێکیان تازە کردەوە بەڵام بە داخەوە ئەم بارودۆخە زۆر دەوامی نەبوو و ئیمامقولیخان ئامرهێزی بەناوبانگی شاعەبباس بە هێزێکەوە گەیشتە ئەویٚ و درێژەی بە شەڕ دا. لەم شەڕە نابەرابەرەدا کە ٣ ساڵ درێژەی بوو ئەمیرخان و هەڤاڵەکانی پیاوانە شەڕیان کردووە و زێد و وڵاتی خۆیان لە دوژمن پاراستووە. هەڤاڵەکانی ئەمیرخان بە ئەویان گوت: متمانەت بە ئێمە بیٚ گەر مەرگە پێکەوەین و ئەگەر ژیانە با پێکەوە بین و قەت لێك جیا نابینەوە، بەڵام بە داخەوە نەبوونی ئاو و پێخۆر تەنگی لە ئەمیرخان و هاوڕێکانی هەڵچنی و لە قەڵا هاتنە دەریٚ هێرشیان کردە سەر دوژمن و دوای شەڕێکی پیاوانە و کوشتنی زۆری هێزەکانی سەفەوی قەڵای دمدم لە خوێنی پیاوەتی ئەواندا سوور بوو و هەموویان شەهید کران و قەبری ئەم شەهیدە باڵابەرزە نەمرانە جێگای عیبادەتی هەموو لاوە کوردێکە.

---

٣٥- نووسەری فێردەوسوتەواریخ دەڵێت: حاتەم بەیگ ساڵی ١٠١٩ی کۆچی لە پەنای قەڵای دمدمدا دەمرێت و تەرمەکەی دەبەنەوە بۆ تەبرێز و لەوێشەوە بۆ مەشهەد بەڕیٚ دەکریٚ و لە نێو گۆڕستانی حاتەمخانیدا دەنێژرێت. ئەم گۆڕستانە ساڵی ١٠١٠ی کۆچی دروست کراوە، نامەی ئاستانی قودسی ڕەزەوی، خاکەلێوەی ١٣٤٠، ل ٥١.

# کوشتن و بڕینی کوردەکانی موکری بە فەرمانی شاعەبباس

دوای کارەساتی دڵتەزێنی دمدم شاعەبباس هات بۆ موکریان و فەرمانی کوشتن و بڕینی عەشیرەتە کوردەکانی دا بە ئامرهێزەکانی و ناپیاویەکانیان تا ڕادەیێك بوو کە تەنانەت چەنگیزخانی مەغوول و ئەنووشیروانی ساسانیش کاری ناپیاوانەی وەهایان نەکردووە.

عەشیرەتی کوردی موکری لە سنووری گاودۆڵی مەراغە و سۆڵدوو و میاندوئابدا نیشتەجێ بوون. لە سەردەمی شاتەهماسبدا یەکەمین سەرۆکی عەشیرەتی موکری ئەمیربەیگ بوو کە پاشا دەسەلاتێکی وەهای نەمابوو و هەر کام لە ئامرهێزەکانی سپا خۆیانیان بە پاشایەك دەزانی، ئەمیرخانیش بە مەبەستی سوننی بوونیەوە کەوتە سەری تاکو سەربەخۆیی کوردستان وەدەست بهێنێ.

ئەمیرخان نوێنەری سوڵتان موحەممەدی کوشت و فەرمانڕەوایی مەراغەشی لە حاکمی دەست نیشانی ئێران سەندەوە و هەر ڕۆژ دەسەلاتی زۆرتری پەیدا دەکرد. دوای مردنی ئەمیرخان شێخ حەیدەری کوڕی، بوو بە سەرۆکی کوردەکان و کاتێ کە سوڵتان موحەممەد سەفەوی ڕۆیشت بۆ ئازەربایجان حەیدەرخان ڕۆیشت بۆ پێشوازی. دوای ماوەیێك شێخ حەیدەر لە پەنای قەلای نیروان و لە شەڕێکی سووردا بۆ پاراستنی شاری مەراغە دژ بە ڕۆمیەکان وەستا و شەهید کرا. بە بۆنەی ئەم پیاوەتیەی کە حەیدەرخان کردی سەرۆکایەتی عەشیرەتی موکری و دەسەلاتی مەراغە درا بە کوڕی ٧ ساڵانی، یانێ قوبادخان. قوبادخان، ئەمیرخانی برادۆستی مامی کرد بە سەرۆکی حکوومەتی گەرمڕوود و هەروەها دەسەلاتی نەدا بە خانئەبداڵی مامی و بۆیە دژی قوبادخان وەستا و لە شەڕێکدا کە ڕووی دا ئەبداڵ خان تێك شکا و خۆی خستە پەنای ئەمیرخانی برای کە حاکمی گەرمڕوود بوو. کاتێ ئەمیرخان لە قەلای دمدمدا شۆڕشی کرد شاعەبباس فەرمانی دا بە قوبادخان تاکو بڕوات بۆ یارمەتی ئێعتمادوسەڵتەنە و دژ بە ئەمیرخان بووەستێ، بەلام قوبادخان ئەم فەرمانەی پاشای بەڕێوە نەبرد و بە هاتنی بەهار ڕووی کردە کێوەکانی قەراباغ و هەروەها سوپاکەی شاعەبباسیشی لەو

ناوچەیە ڕاو نا و ئەسپەکانیانی دزی و لە نێوان لاوە کوردە موکریەکاندا دابەش کران.

دوای تێك شکاندنی ئەمیـرخان بە داخەوە قوبادخان وایزانی شاعەبباس پیاوێکی ڕاست بێژەو بۆیە چووە خزمەتی و ١٥٠سەربازیـشی لەگەڵـدا بـوو؛ بـەڵام پاشـا نامەردانـە فـەرمانی کوشتیانی دا و هەموویانی کرد بە قوربـانی. دوای ئـەم کارەسـاتە پاشـا فـەرمانی کوشتـن و بڕینی کوردە موکریەکانی داوە هێزەکەشی کـە لـە خـۆی ناپیـاوتر بـوون هێرشیان کـردە سـەر کوردەکـان و زۆربـەیانیان لێیـان کوشـت و کـاتیَ ٦٠ کـەس لـە پیـرەمێرد و ژن و منـداڵی کوردەکانیان دیل کردبوو و هێنایانیانە خزمەتی شاعەباس خێرافەرمانی کوشتـنی ئـەوانی دا. هەروەها حسەین سوڵتان برازای شێخ حەیدەر کە لە ورمێدا بوو بەبێ تەوەی خەبەرداری شتێك ببێ، هاتە خزمەتی پاشا و ئەویش بە بێڕەحم و بەزەیی خۆی و سەربازەکانی هاوڕێی کوشت.

نووسەری عالەمئارای عەباسی نووسیویەتی: هەموو ئەو کوردانەی کە دەهاتنە خزمـەتی پاشا و دەکوژران ناوی هەموویان نووسراوە و لەو چەند ڕۆژە دا کە لـە پـەنای قـەڵای گاودوڵـدا بوون دەستەدەستە دەهاتنە خزمەتی پاشا و هەموویان بە تێخی تیژی «بـارامی خـوێنئاشـام» دەکوژران. لە جەماوەردا خێڵی موکریان ڕوو بە ئاکام بوون و هەموویان کەوتنە بەر شـمشێری تووڕەیی پاشاوە و ژن و منداڵەکانیشیان بەند کران.[٣٦] دەسەڵاتی بانە لەم سەردەمەدا لە دەستی ئەسکندەر سوڵتانی کوردەوە بوو و کاتیَ بیستی پاشا عەشیـرەتی کورد بە شێوەیێکی ناپیاوانە لەناو دەبات و هەروەها پاشا لە سەری دایە کە هێرش بهێنێتە سەر بانە و خەڵکی ئەوێش لەناو ببات؛ بۆیە ئازەیەتییێکی زۆری لە خۆیەوە پیشان دا و کەفـەنی کـردە بـەر و شـمشێر لـە مـل ڕۆیشتە خزمـەتی پاشا. پاشا کە لە سەری دابوو بۆ لەناو بردنی کوردەکان هێـرش بباتـە شـاری بانە، کاتیَ ئەم ئازایەتیەی بیـنی لەم کارەی پەشیمان بووەوە.

سـاڵی ١٠٢٤ی کۆچـی کـاتیَ کـە شـاعەبباس لـە مازندەرانـدا بـوو هـەواڵیان بـرد کـە کوردەکانی موکری جارێکیتر قـەڵای دمـدمیان گرتـووە، پاشـا زۆر بـەم هەواڵـە تێـك چـوو و فەرمانی کوشتـن و بڕینی ئەوانی دا بە سەربازەکانی. بەسەرهاتەکە بەم شێوەیە بوو کە یـەکیَ

---

٣٦– عالەمئارای عەبباسی، نووسراوەی ئەسکەندەربەیگ تورکمان، ل ٨١٤.

لە ژنەکانی ئەمیرخانی برادۆست کە لە نێو قەڵاکەدا لە ژێر چاوەدێری خێڵی پاشادا بوو پەیامێکی بە نهێنی نارد بۆ ئەڵەغبەیگی کورد موکری تاکو ئەو شەوەی وا دەست نیشانی پاشا لە قەڵاکە دەرواتە دەرەوە بۆ شکار، هێرش بهێنێ و جارێکیتر قەڵاکە بگرێتەوە. ئەڵەغ بەیگ ئەم کاەی کرد و خێرا توانی هێزەکانی شاعەبباس شکست بدات و قەڵاکە بگرێتەوە؛ بەڵام ئەم سەرکەوتنە زۆر بەردەوام نەبوو، لەبەر ئەوەی سوپای شاعەباس لە چوار لاوە هێرشیان هێنا و قەڵاکەیان دوای شەڕێکی سوور گرتەوە دەست. ئەگەرچی جێگای وتنە کە ئەڵەغبەیگ توانی ژنەکەی ئەمیرخان و دانیشتوانی قەڵا ڕزگار بکات و لەگەڵ خۆی بیانباتە دەرێ و تا یێلاخی موکری نەوەستا. هەر ئەم باسەیە کە برای بەڕێزم مامۆستا ئەحمەد شەریفی دەڵێت: یەکێ لە کچەکانی ئەمیرخان جارێکیتر شۆڕشی کردووە.

## عەشیرەتی کورد شوقاقی ئازەربایجان

بۆ ناساندنی عەشیرەتی کورد شوقاقی کە ئێستا بە زمانی توورکی قسان دەکەن و لە ئازەربایجانی ڕۆژهەڵاتدا نیشتەجێن، دەبێ بە شێوەیێکی جیاواز لە سەریان باس بکەین؛ بەڵام بە فەرمانی مامۆستای پایەبەرز بەڕێز موحەممەد فەتحی شوقاقی باسێکی کورتم سەبارەت بە کوردەکانی شوقاقی لەم بەرگەدا هانی، ئەگەرچی لە لاپەڕەی ٤٨٨ی بەرگی یەکەمیشدا ئاماژەیێك کرا، بەڵام چاك وایە جارێکیتر دووپات بکرێتەوە و زۆرتر باس بکرێت و خزمەت و ئازایەتی ئەم عەشیرەتە بۆ سەربەخۆیی ئێران و کوردستان بخرێتەوە ڕوو.

زانا و کەڵەزانا و نووسەر و ئەندازیارگەلێکی زۆر لە نێو ئەم عەشیرەتەدا هەڵساونەتەوە و زۆر زۆر خزمەتی خەڵکی ناوچەکەیان کردووە بە تایبەت دەبێ ئاماژە بە خوالێخۆش بوو ئەندازیار میرزا مێهدیخان شوقاقی بکرێت کە یەکێ لە خوێندکارەکانی سەردەمی ناسرەدینشای قاجار بوو و دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران زۆر خزمەتی بەم ئاو و خاکە کردووە و کە مزگەوتی سپاسالاری تاران لە ئەو پیاوە بە یادگاری ماوەتەوە. بۆ ئەوەی زۆرتر مێرزا

مێهدیخان مومتەحێنودەوڵە بناسین دەبێ کتێبی «خاتراتی مومتەحێنودەوڵە»[٣٧] بخوێنینەوە.

میرزا مێهدی شوقاقی کوڕی میرزا ڕەزاقولیخانی گەرمڕوودی شوقاقی جێگری وەزارەتی دەرەوە و ئامۆزای سادقخانی شوقاقی بەناوبانگ بوو. تیمسار حسەنعەلیخانی شوقاقی کە لە پێشەکی ئەم کتێبەدا لە زمانی سەرلەشکر عەزیروڵڵا زەرغامیەوە -باوکی ئەرتەشبۆد عێزەتوڵڵا زەرغامی- کە ئەویش لە باوکی بیستوویە کە حسەین پاشاخان زەرغام سەڵتەنە[٣٨] دەڵێت: بە پێی ئەو هەواڵانەی کە بە دەستم گەیشتووە و لە لایەن پیاوە پێشووەکانەوە سینە بە سینە گەیشتۆتە دەستمان، ١٣٠٠ ساڵ پێش لە ئێستا ئەم عەشیرەتە بە ناوێکیترەوە لە کێوەکانی کوردستاندا ژیاون و بۆ قشلاخی خۆیان ڕۆیشتوونەتە باکووری عێراق؛ لەو سەدەمەدا خەڵکی ئەم عەشیرەتە تازە ئیمانیان بە ئایینی ئیسلام هێنابوو و ڕێزی زۆریان بۆ ئیمام عەلی دائەنا. ساڵی ٦٣ی کۆچی مانگی کاتێ کە ئەم عەشیرەتە لە کاتی قشلاخدا ڕۆیشتبوون بۆ ناوچەکانی کەرکوك و مووسڵ و سلێمانیە، پیاوەکانی یەزیدی کوڕی معاویە داوایان لێیان کردبوو تاکو بۆ شەڕی دژ بە ئیمام حسەین یارمەتییان بدەن؛ بەڵام خێڵی ئەم عەشیرەتە ئاوڕیان لێیان نەداوەتەوە و یارمەتی خێڵی یەزیدیان نەداوە.

ناوی شوقاقی کە بە ئەم عەشیرەتە دراوە بەو بۆنەوە بوو کە کاتێ یەزید داوای یارمەتی لەم عەشیرەتە کردووە، گوتوویانە ئەسپەکانمان شوقاقیانە و ناتوانین یارمەتیان بدەین و لەم ڕۆژە بە دواوە بە عەشیرەتی شوقاقی[٣٩] ناسراون. وشەی شوقاقی لە فەرهەنگی مەساحێبدا ئاوەها مانای کراوەتەوە: عەشیرەتێ کە ڕەگەزیان کوردە و لە سەردەمی سەفەویدا لە ناوچەی نێوان موغان و سەرابدا ژیاون و وادیارە بە هۆی هات و چووی عەشیرەتەکانیتری کوردەوە ئەم

---

٣٧- بەسەرهاتەکانی مومتەحێنودەوڵە کە کتێبێکی زۆر ڕێکوپێکە، کە بە دەستی حەسەن قولیخان چاپ کراوە.

٣٨- زەرغاموسەڵتەنە باوکی زەرغامیەکانە.

٣٩- شوقاق لە کوردیدا بە مانای برین و لە عەرەبیدا بە مانای جیابوونەوە دێت.

عەشیرەتە بەدی هاتبێ وا دەردەکەوێ لە سەردەمی ئاق قوویوونلووەکانەوە لەم ناوچەدا ژیابێتن. جیمز مووریە ساڵی ١٨١٤ی زایینی ئەژماری ئەم کوردانەی بە ٥٠ هەزار بنەماڵە زانیوە کە لە نێوان تەورێز و زەنجان و ناوچەی هەشترِوود، گەرمرِوود، میانە و ئەردەبێڵدا ژیاون. بەشی زۆری پیاوپیادەکانی سوپای عەبباس میرزای نایبوسەڵتەنە لە عەشیرەتی شوقاقی بوون و لە سەرەتای سەدەی ٢٠ی زایینیدا ٤ دەستە و گرووپ لە کوردە شوقاقیەکان لە ئەرتەشی ئێراندا بوون عەشیرەتی شوقاقی تورك و شیعەن.[٤٠] لە بەناوبانگترین فەرمانرِەواکانی عەشیرەتی شوقاقی لە سەردەمی شاعەبباسدا دەبێ سەرەتا لە عەلیجان سولتان شوقاقی[٤١] سەرۆکی عەشیرەتی کوردی شوقاقی ناو ببەین کە لە ساڵی ١٠٣٧ی کۆچیدا هاتۆتە دنیاوە.[٤٢]

ئەم خانە بەناوبانگە لە رِۆژگاری دەسەڵاتدارێتی نادرشای ئەفشاردا لە هەموو شەرِەکاندا بەشداری کردووە بە تایبەت لە شەرِی ئێران و رِۆمدا بەشداری کردووە و ئازایەتییێکی زۆریشی لە خۆیەوە پیشان داوە. دەبێ ئەمازەش بکرێت عەشیرەتی شوقاقی زۆرتر بە بۆنەی سادقخانی شوقاقیەوە ناوبانگی دەرکردووە. کە دەڵێن سادقخان لە کوشتنی ئاغاموحەممەدخانی قاجاردا دەستی بووە. کوشتنی ئاغاموحەممەدخانی قاجار بنیاتنەری زنجیرەی حکوومەتی قاجار بەم شێوەیە بووە کە لە پێشدا ئاغا موحەممەدخان لە دوو کەس لە کارەکەرەکانی خۆی توورِە دەبێت و فەرمان ئەدات تاکو هەردووکیان بکوژن؛[٤٣] بەڵام سادقخانی شوقاقی داوای لێبوردن دەکات لە پاشا و پاشاش بە بۆنەی پارِانەوەی سادقخانەوە لە کوشتنی ئەو دوو کارەکەرە پەشیمان دەبێتەوە و بەڵام بەیانی ئەو شەو هەردووکیان دەکوژێ.

لێرەدا وا دەردەکەوێ کە سادق خان زۆر لەم کارەی پاشا توورِە دەبێ و رِقی بە دڵ دەگرێ و بۆیە بە سکرتێری بەندیخانەکەی گوتووە تاکۆ دیلەکان رِزگار بکات تاکو ئاغا

---

٤٠– دایرەتولمەعارف مەساحێب، بەرگی ٢، ل ١٤٨.

٤١– عالەمئارای عەبباسی، ل ١٠٨٦.

٤٢– نووسەر نووسیویەتی، لە ساڵی ١٠٣٧ی کۆچیدا ژیاوە.

٤٣– دەڵێن پاشا لە سەر قاشێك شووتی کە بۆ خۆی لە ژێر تەختەکە دانابوو کاتێ لە شەرِ دەگەرِێتەوە بینی کە کارەکەرەکانی خواردوویانە و ئەویش توورِە دەبێ و فەرمانی کوشتنیان ئەدات.

موحەمـمەدخان بکوژن.

بەڕێز مامۆستا سەعید نەفیس نووسیویەتی[٤٤] ئاغاموحەمـمەدخان لـە بـەهاری ساڵی ١٢١٢ی کۆچی مانگیدا هێز و سوپای خۆی کۆ دایەوە و لە تارانەوە ڕەوانەی ئازەربایـجان بوون و لە ڕێگەی ئەردەبێڵەوە گەیشتـنە ڕووباری ئەرەس و لەوێ چادر و خێوەتگای خۆیانیان بنیات نا و هاوکات دە هەزار سوارەی بە مەبەستی داگیـرکردنی قەڵای قەلعەپەناوە ڕەوانەی ئەوێ کرد و زۆری نەخایاند کە ئەو قەڵایە داگیـر کرا، سێ ڕۆژ پێش لە ئەوەی بڕوات بۆ شاری شووش کە لە لایەن خانەکانەوە دەعـوەت کرابـوو، شـەڕێك کەوتـە نێـوان سـادقخـانی گـورجی کارەکـەی تایبەتی ئاغا موحەمـمەدخان و خوداداد ئێسفەهانی؛ بەڵام چون پاشا بەو بۆنەوە چـەن شـەوی ڕابوردوو سادقخان نەزانستە تۆزێك ئاوی ڕژاندبووە نێو جێگاکەی ڕقی لـێ هەسـتابوو و کـاتێ ئەم دوو پیاوە یانێ سادقخـان و خـوداداد ئێسفەهانی شـەڕەکەیان پـەرەی سـەند، پاشـا خێـرا فەرمانی دا تاکو هەردووکیان سەر ببڕن و سادقخانی کورد شوقاقی کاتێ کە پاڕایەوە ئەو دوو کەسە نەکوژرێن، پاشا لە وڵامدا گوتی زۆر چـاکە ئەمـشەو نایـانکوژین، بـەڵام بـەیانی دەبـێ سەریان ببـڕین و کەچی ئەو دوو کەسە شەوی هـەینی لـە بەندیـخانەدا بـوون و دەیـانزانی کـە ئەگەر ئەمشەو ڕابـرێ دەبێ بەیانی لەشی خۆیـان بـێگیـان ببیـنن و بۆیـە لەگـەڵ سـکرتێری بەندیـخانەکەدا دەسـتیان کـرد بـە یـەك و شـەو بـە خنجـەر و شمـشێرەوە هـاتن و ئاغـا موحەمـمەدخانی قاجارپان بێگیان کرد و زۆر کەس گوتوویانەکە سادقخانی شوقاقی هانی ئەم دوو کەسەی داوە تاکو ئاغاموحەمـمەدخان بکوژن، تاقمێك گوتوویانە سادقخان لە ڕێکـەوتنی شەوی ٢١ی زیـحەججەی ساڵی ١٢١٢ی کۆچی مانگی پیلانی کوشتـنی ئاغاموحەمـمەدخانی قاجاری داڕشتووە کەچی دوای کوژرانی ئاغاموحەمـمەدخانی قاجاڕ هەمووی زێـڕ و پارەکـانی ئاغاموحەمـمەدخانی و بە تایبەت کێوی نوور و تاج مـانگی[٤٥] بـەناوبانگی نادرشـای ئەفـشار کەوتە دەستی سادقخان شوقاقی و هاوکات خۆی بە پاشای ئێران زانیوە. بەڵام زۆر بەڵگە هەیە

---

٤٤- تاریخ سیاسی و ئیجتماعی ئێران، سەعید نەفیسی، بەرگی یەك، ل ٦٩ تا ٧٤.

٤٥- ئەڵماسی تاجی مانگ بە دەستی کوردەکانی خوراسان درایە باوکی -ئاغا موحەممەدخان قاجاڕ- و هاوکات ئەویش بۆ شەڕی ئەحمەد دوڕانی چووە یارمەتیدانی ئەوانەوە.

پیشاندەری ئەوەیە کە سادقخان لە تالان کردنی ئەو زێڕانەدا دەستی نەبووە. وەك ژانگۆرە نووسەری فەڕانسەوی کە کتێبی «خواجەی تاجدار»ی نووسیوە و تەنانەت بەڕێز سەعیدی نەفیسی لە کتێبەکەی خۆی واتا مێژووی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی ئێراندا نووسیویەتی بەیانی ئەو شەوەی کە ئاغاموحەممەدخانی قاجار لە خێوەتگاکەیدا دەکوژرێت سوپاکەی تووشی سەرلێشێواوی دەبن و هەموویان سوپاکە بەجێ دەهێڵن، هاوکات سادقخان و سوپاکەی و سەرکردەکانیتری سوپاکەش هەر ئەم کارەیان کرد و بەڵام حاجی ئیبراهیم کەلانتەر کە زۆر بە ئاغا موحەممەدخانەوە نزدیك بوو هەموی زێڕ و پارە و زەریایی نوور و کەلوپەلەکانیتری کۆ دایەوە و هاوڕێی سوپاکە ڕووی کردە تاران تاکو یارمەتی باباخان جەهانبانی بدات کە بە ناوی فەتحعەلیشاوە لە شیرازدا تاجی لە سەری نا. بەڵام هەرچی بوو ئاغا موحەممەدخان کوژرا و ئەگەرچی خۆی زۆر ناپیاو بوو بەڵام دەسەڵات پەیداکردنی پاشایێك وەکو فەتحعەلیشا بۆ وڵاتی ئێران زۆر گران و نالەبارتر بوو و کەچی جێنشینەکانی ئاغاموحەممەدخان وەهایان بە سەر ئێراندا دەرهانی کە زۆربەی خاکی ئێران درایە باوەشی بێگانەکانەوە.

ئەوەی کە ڕاستی بێت سادقخانی شوقاقی بۆ هیچ کاتێ فەتحعەلیشای قاجاری بە پاشا و دەسەڵاتداری ئێران نەزانیووە و هەر بەم بۆنەوە چەن شەڕ لە نێوانیاندا ڕووی داوە. لە ئاکامدا سادقخان خۆی ئەدات بە دەستی فەتحعەلیشاوە و ئەویش سوێند دەخوات کە نایکوژێ. فەتحعەلیشا بۆ ئەوەی متمانە بدات بە سادقخان کە نایکوژێ، خوشکی سادقخانی مارە کردەووە بۆ خۆی؛ بەڵام دوای ماوەیێك بە بۆنەی ئەوەی دوژمنانی سادقخان هانی پاشای قاجاریان داوە و ئەویش ڕقی لە سادقخان هەستاوە.

نووسەری کتێبی ڕەوزەتوسەفا نووسیوویەتی: ساڵی ١٢١٣ی کۆچی مانگی کە فەتحعەلیشا بۆ سەرکوت کردنی شۆڕشی کوردەکانی خوراسان ڕوو دەکاتە ئەو ناوچەیە و هاوکات ویستوویەتی نادرمیرزای ئەفشاریش دەسگیر بکات، سادقخانی شوقاقیشی لەگەڵ خۆیدا بردووە لەبەر ئەوەی نەوەك تاکو خۆی لە خوراسان وەردەگەڕێتەوە لە ئازەربایجاندا دەست بدات بە شۆڕشەوە. بەڵام کاتێ کە سادق خان کوردەکانی خوراسانی بینی لە پەیامێکدا

داوای کرد له مەشخانی فەرمانڕەوای چناران تاکو وەك خۆی گوتوویەتی: ئیزن مەدە پاشا بڕواتە ئەو شارەوە و ئەمنیش یارمەتیت ئەدەم، هاوکات ئەڵلایارخانی قلیجی فەرمانڕەوای سەبزەوار له شوێنی هەلێك دەگەڕێ تاکو وەرگەڕێتەوە سەبزەوار.

ڕەزاقولیخانی هیدایەت نووسیوویەتی کە ئەڵلایارخان داوای یارمەتی لە سادقخان کردووە تاکو لە پاشا بپاڕێتەوە ئیزنی بدات بڕواتەوە بۆ سەبزەوار و ئەویش لە پاشا پاڕاوەتەوە و پاشاش ئیزنی گەڕانەوەی بە ئەڵلایارخان داوە. بەم شێوەیە ئەڵلایارخان گەڕایەوە نێو قەڵاکەی خۆی و پاشاش نەیتوانی وەریبگەڕێنێتەوە هەروەك چلۆن نەیتوانی کوردەکانی زافەرانلوو سەرکوت بکات؛ بەڵام پاشا بە ئەوەی زانیبوو کە سادقخانی شوقاقی بە نهێنی لەگەڵ کوردەکانی خوراساندا پێوەندی هەیە، دوای ماوەیێك کاتێ کە عەباسمیرزای نایبوسەڵتەنە لە لایەن باوکیەوە (فەتحعەلیشا) دەکرێ بە سەرۆکی حکوومەتی ئازەربایجان هەموو سەرۆکە عەشیرەتەکان دەچنە خزمەتی و فەرمانی لێ ئەبەن جگە لە سادقخان کە نەرۆیشتووە.[٤٦]

فەتحعەلیشا مۆری لە سەر قورئان دانا و سوێندی خواردبوو کە سادقخان نابێ خوێنی بڕژێت و بۆیە فەرمانی داوە تاکو لە ژوورێکی تەنگ و تاریکدا ببەسرێتەوە و ئیزن نەدرێت نان و ئاو و پێخۆری پێ بگات تاکو گیانی لە لەشی جیا ببێتەوە و کەچی هەروا بوو. سادقخان بەو شێوەیە کوژرا. بە واتای مارخامی ئینگلیزی سادقخان بە بۆنەی برسیەتییێکی زۆرەوە هەر دوو دەستی خۆی خواردبوو.

«بایبووردی» دەڵێت: سادق خان ساڵی ١٢١٥ی کۆچی مانگی کاتێ کە لە خوراسان گەڕاونەتەوە لە لایەن پاشاوە هەر دوو چاوی کوێر کراوە.[٤٧]

دەبێ ئاماژە بە ئەمەش بکرێ کوردەکانی شوقاقی تەنیا سادقخانیان گەورە نەبوو هەموویان گەورە بوون و زۆربەی هێزەکانی قاجار کوردەکانی شوقاقی بوون.

هەروەك دەزانن ساڵی ١٢٤٨ی کۆچی مانگی کاتێ کە ڕەزاقولیخانی زافەرانلوو دژ بە

---

٤٦– بڕوانە بۆ کتێبی کۆچی مێژوویی کورد، ل ٢٤٥ و تاریخ ریجال ئێران نووسراوەی مێهدی بامداد، بەرگی ٤، ل ١٥٨.

٤٧– تاریخ پەناهەندەگان ئێران، حەسەن بایبووردی.

قاجارەکان شۆڕشی کرد و بە فەرمانی فەتحعەلیشا عەبباس میرزای نایبوسەڵتەنە بۆ سەرکوت کردنی ئەوان ڕەوانەی خوراسان بوو ئەوە کوردەکانی شوقاقی بوون کە توانیان قووچان داگیر بکەن.[٤٨]

لە شەڕی هەراتدا کە ساڵی ١٢٤٥ی کۆچی ڕووی داوە و موحەممەدشای قاجاڕ خۆشی لەو شەڕەدا بەشدار بووە عەزیزخانی کورد موکری سکرتێری گشتی سوپا و ئەرتەشی ئێران بوو و کوردەکانی شادلوو و قەراچورلووی خوراسان و کوردەکانی موکری و گەڕووس و شوقاقی لەم شەڕەدا دەورێکی گرنگیان هەبووە.

نووسەری ناسێخوتەواریخ دەڵێت: عەبدولحسەین بەیگ گەڕووسی لەم شەڕەدا بە پێچەوانەی ئەوەی کە تیرێك باسکی ئەنجن ئەنجن کردەوە و هاوکات تێرێکیش سەری تلێشاندووە، بەڵام هێشتا بە شێوەیێکی ئازایانە شەڕی کردووە و هێزەکەشی هان داوە کە شەڕ بکەن و لە ئاکامیشدا نەمردووە کەچی عەلیموورادخانی گەڕووسیش لە دوو شوێنەوە برینداربوو، بەڵام گیانی سالمی دەرکرد و نەمرد.

مێهدی قولیخان سەرهەنگی شوقاقی کاتێ کە ئاڵای ئێرانی هەڵ دا، هاوڕێ لەگەڵ کوڕێکیدا شەهید کران. باقرخانی چەلیپانلووش هەروەها خوێنی ڕژا.[٤٩]

لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ناسرەدینشای قاجاڕدا دەستەیێك لە کوردەکانی شوقاقی گرنگترین و ڕازاوەترین دەستەی سوپای ئێران بوون، کاتێ کە ناسرەدین شای قاجاڕ ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی لە خوراسان گەڕایەوە دەستەی پێنجەمی شوقاقیەکان هاتنە پێشوازی پاشاوە کە زۆر ڕێکوپێك و ڕازاوە بوون، شوقاقیەکان لە سەردەمی موزەفەرشا و موحەممەدشا و ئەحمەدشای قاجاڕیشدا هەروەها بەبڕشت و زرەنگ بوون و لە کاتی مەشرووتەخوازیەکەشدا زۆر یارمەتی مەشرووتەخوازەکانیان داوە تا ڕادەیێك خەڵکی ئازەربایجان زۆر سپاسی کوردەکانیان کردووە.

---

٤٨- بڕوانە بەرگی یەکەم ل ٢٩٤.

٤٩- ناسێخوتتەوایخ قاجاڕ، چاپی سەنگی، ل ٣٧٣.

## پاڵپشتی کردنی کوردەکانی شوقاقی لە مەشرووتەخوازەکان

ساڵی ١٣٢٥ی کۆچی مانگی کاتێ کە موحەممەدعەلیشا گەیشت بەو قەناعەتەی کە دەبێ مەجلیسی شورای میللی ئێران ڕەت بکاتەوە و پووچەڵی بکاتەوە، کوردەکانی شوقاقی بە تایبەت ئەوانەی کە دانیشتووی ناوەندی ئێران بوون، دژ بەم کارە بوونەوە و بڕیاریان دا کە تا دوا دڵۆپی خوێنی خۆیان لە پێناوی سەربەخۆیی و ڕزگاری گەلانی ئێراندا هەوڵ بدەن؛ بەم بۆنەوە لە کۆبوونەوەی ڕۆژی یەکشەمەی ٢٣ی زیقەعدەی مەجلیسی شورای میللیدا لە لایەن خەڵکی ئازەربایجانەوە پەیامێك گەیشتە تاران و لەو پەیامەدا خەڵکی ئازەربایجان سوپاس و پێزانینی خۆیانیان سەبارەت بە کوردەکانی شوقاقی دەربڕیبوو و هەر لەو کۆبوونەوەدا ئەو پەیامە لە لایەن جێگری سەرۆکی مەجلیسەوە خوێندرایەوە و لەو نامەدا جگە لە سوپاس دەستەی پێنج و هەفتەمی کوردەکانی شوقاقی سوپاسی ماندوو بوونی ئەمیر نزامیش کرابوو.[٥٠]

لە خواری پەیامەکەوە نووسرابوو ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان.

لە سەردەمی دەسەڵاتی پالەویشدا زۆربەی زۆری سەرۆکەکانی ئەرتەشی ئێران لە کوردە شوقاقیەکان بوون. وەك بنەماڵەی مومتەحێنودەوڵە کە جگە لە خۆی ٤ کەس لە کوڕەکانی خۆیشی لە ئەفسەرگەلی ڕەدەباڵای ئەرتەش بوون. دەبێ ئاماژە بکرێت کە بەڕێز «مازۆر کەیوومەرس مێهدی قولی حەسنوسەڵتەنە» لە شەڕی دژ بە جەردەکانی شاری ئەراکدا شەهید کرا. (١٩١١ی زایینی)

موحەممەد عەلیخانی شوقاقی کە لە نێو ئەرتەشی فەڕەنسادا کاری دەکرد، ساڵی ١٩١٤ی زایینی لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا شەهید کرا، سەرتیپ حەسەنعەلی شوقاقی لە کاتی بەسەرهاتەکانی سەمیرۆمدا لە دەوروبەری ئێسفەهانەوە شەهید کرا. حەسەنقولیخانی شوقاقی چوارەمین کوڕی مومتەحێنودەوڵەیە کە بیرەوەریەکانی باوکی لە کتێبێکدا بە ناوی بیرەوەریەکانی مومتەحێنودەوڵە چاپ کردووە.[٥١]

---

٥٠- موزاکێرات مەجلیس سەردەمی تەقینەوەی یەکەم، ل ٤١٩.

٥١- ئیتلاعات حەفتەگی، ژمارەی ١١٤، ساڵ ١٣٢٢، بەسەرهاتەکانی مومتەحێنودەوڵە، ل ١٨.

سەرلەشکر عەزیزوڵڵا زەرغامی کە بۆ ماوەییێك سکرتێری ئاسایشی گشتی ئێران بوو و یەکێ لە ئەفسەرە ئازا و لێهاتووەکانی سەردەمی ڕەزاشای پالەوی بوو، ئەرتەشبۆد عێزەتوڵڵا زەرغامی ئامرهێزی هێزە زەوینیەکانی ئێران و پارێزگاری ئازەربایجان بوو کە یەکێ لە کوردە بەناوبانگەکانی عەشیرەتی شوقاقی بوو. ئەم عەشیرەتی شوقاقیە مەکۆی زۆربەی شاعێران و نووسەران بووە و شاعێر و نووسەری بەناوبانگی زۆری لێ هەڵکەوتووە بە تایبەت کەسانێ وەکو نەسروڵڵا فەتحی، موحەممەد فەتحی و هەروەها عەبدوسەمەد خان، ئەمیر شوقاقی و موحەممەدعەلی مەهمید کە هاوکات بە ۳ زمانی زیندووی دنیا شارەزا بوو و وەرگێڕانی زۆری هەیە لە جەماوەردا بۆ ژماردنی پیاوەتیەکانی عەشیرەتی شوقاقی دەبێ دەفتەرێکی هەرەگەورە بهێنین و هەمووی بنووسین و لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نییە.

لێرەدا چاك وایە ناوی چەن کەس لە ئەفسەرە کوردە بەناوبانگەکانی سەردەمی ناسری کە زۆربەیان کوردی شوقاقین، بهێنین وەك جەلیل‌خان، ئەسکەرخان شوقاقی کە لە کاتی گەڕانەوەی ناسرەدین‌شا لە خوراسان (ساڵی ۱۳۰۰ی کۆچی مانگی)، جێژنێکی گەورەی بەڕێ خست[٥٢]، ڕەحمەتوڵڵاخان شوقاقی، عەلیقولی‌خان شوقاقی، کازم‌خان شوقاقی، حسەینقولی‌خان سەرهەنگ، مورتزا قولی ئاغای سەرتیپ، باقرخان سەرتیپ، یووسف‌خان شوقاقی، حاجی شوکروڵڵاخان شوقاقی، بیووك‌خان شوقاقی و عیبادوڵڵاخان شوقاقی کە ئەمانە هەموو کوردی شوقاقی بوون. ئەم کەسایەتیانەی خوارەوەش کوردی عەشیرەتەکانی‌تر بوون کە بریتی بوون لە: عەلیڕەزاخان گەڕووسی عەلی‌نەقی‌خان گەڕووس، موزەفەرخان گەڕووسی، عەبدوڵڵاخان گەڕووسی، مێهدی‌قولی‌خان دەنبەڵی، ئەسەدوڵڵاخان دەنبەڵی، مەجیدخان کوردستانی، غولام‌حسەین‌خان کوڕی خوالێخۆشبوو موحەممەد عەلیخان سەقزی، مستەفا قولی‌خان کرماشانی، حاجی حەبیبوڵلاخان کرماشانی، فەرەجوڵڵاخان کرماشانی، عەبدولعەزیم بەیگ کرماشانی.[٥٣]

---

٥٢– سەفەرنامەی ناسرەدین شا بۆ خوراسان، ل ١٦٥ و ١٧٢.

٥٣– مولحەقاتی مەتلەعوشەمس، ل ١٧ تا ٢٤.

# کوردەکانی قەزوێن

سەبارەت بە کوردەکانی قەزوێن، بەڕێز دوکتۆر وەرجاوەند نووسیویەتی: «ئەلوار و ئەکراد» کە پێم وایە لە سەردەمی شاعەباسەوە بۆ ئەم ناوچەیە گوێزرابێتنەوە، لەبەر ئەوەی کە لە سەردەمی شاعەبباسدا هەموو کاتێ عەشیرەتەکان کۆچ دراون.

سەبارەت بە کۆچی ئەم عەشیرەتە تاقمێک دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاغاموحەممەدخان بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە دەبێ بڵێین ئەم عەشیرەتە کوردە لە گوندەکانی تارم، قاقڕان، دودانگە، ڕووبار، ئەلمەوت، کووهپایە، بەشاریات و پشگەڵدەڕەدا دامەزران و نیشتەجێ بوون و بۆ ماوەیێکی زۆر بە شێوەی چادرنشینی ژیانیان بردۆتە ئاکام. یەیلاخ و قشلاخی ئەم عەشیرەتانە لە ناوچەکانی قاقڕان و دەوروبەری شەقامی قەزوێن و ڕەشت و دەوروبەری کێوی ئەلبۆرز و بەشی قشلاخی ئەم ناوچەیە یانێ تارم و دەوروبەری ڕۆخانەی شاهڕوود و دەشتەکانی عەمارلوو[٥٤]دا بووە.[٥٥]

نووسەری پایەبەرز گولڕێز نووسیویەتی کە نازانێ کوردەکان کەی کۆچ دراون بۆ ناوچەی قەزوێن، تەنانەت سەرۆکی عەشیرەتەکانیش ئەمە نازانن کە کەی کۆچ دراون؛ تاقمێک دەڵێن سەردەمی نادرشا و تاقمێکیتر دەڵێن سەردەمی شاعەبباسی یەکەم و بڕێکیش دەڵێن سەردەمی ئاغا موحەممەدخانی قاجاڕ، بەڵام من ئەوە دەزانم کە ئەم کۆچە لە سەردەمی قاجاڕدا نەبووە، چون ئەگەر ئەو کاتە ببوایات سەرۆکی عەشیرەتەکان لە بیریان نەدەچووەوە.

عەشیرەتە کوردەکانی قەزوێن لە باجەلان بەهتوویی، پاپلی، چەگەنی جەلیلوەند، ڕەشوەند، غیاسوەند، کاکاوەند، کرمانی، مافی.

سەرۆکی ئەم عەشیرەتانە جگە لە عەشیرەتی کاکاوەند هەموویان لە شاری قەزوێندا

---

٥٤– سەبارەتە بە عەشیرەتی عەممارلوو لە نەیشابوور و قووچان و گیلان. لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا بە چڕوپڕی باسمان کرد.

٥٥– سەرزەوین و مەردومی قووچان، دوکتۆر پەرویز وەرجاوەند، تاران ١٣٤٩ ل ٤٥٦.

ژیاون؛ بەڵام جەماوەری عەشیرەتەکانی چەگەنی و غەیاسوەند لە هەموان زۆرترە.

عەشیرەتی چەگەنی ئەم بنەماڵە گەورانەی لێ کەوتۆتەوە: بەهادیوەند، بابایی، پاپایی[٥٦]، پیرەمەردوەند، پیرقولیوەند، پاچناری، خەرکانی، دەرۆیشوەند، کولوەند گووگیر، گوودەرزوەند، ماڵ ئەمیر، میرخواند، موختاروەند و نزامیوەند کە لە گوندەکانی ئێقباڵ و قاقڕان و تارم ئاق دووز، ئووچ تەپە، ئوزۆن دەرە، ئاك، ئورگن، تورك، ئورگن موعەلیمخانی، چەشمە غولامعەلی پاچنار، چالفووچ، چووبدەر، چۆڕە، حەسار دلیجان، خەرمان سووختە، خەرکان زاکان، زیتك، سوڵتانئاوا، شاخانی، شاریس، فەتنئاوا، قەرەداش کۆشگەك، گۆڕکەن، مەحموود ئاوای عەلەمخانی، مورتەزائاوا، مەزرەعە یەلەگونبەد، هێمەتئاوا و نەدەردا نیشتەجێن.

تاقمێك لە کوردە چەگەنیەکان لە گوندەکانی ئوزۆن دەرە، ئاك، چۆڕە، چاوکەی غولامعەلی حەسار دلیجان، خەرمان سووختە، خەرکان، زەکان، زیتك، سوڵتان ئاوا، شاریس، قەرەداش، کوشگەك (سەعید ئاوا)، گۆڕکەن، مەحموود ئاوای عەلەمخانی، مورتەزائاوا و هێمەتئاوا.

دانیشتوانی گوندەکانیتری قەزوێن هاوینان دەچنە ناوچە سەردەکانی قەزوێن کە یێلاخیان دەبێتە دەوروبەری ڕەیحان دەرە، خەرکان، چاوکەکورە و کێوەکانی مەلاسوورەی قاقزان و هەروەها بۆ قشلاخیش دەچنە ئورگن موعەلیمخانی، قەراتیکان پاچنارە، جن دەرە، خاگینەی تارم، زەڕینەخانە و دەوروبەری ڕۆخانەی شاهڕوود. چەگەنیەکان ٩٠٠ تا ١٠٠٠ بنەماڵە دەبن[٥٧]، سەرۆکی ئەم عەشیرەتە ئێستا کە ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی هەتاویە بەڕێز موحەممەد تەقی چەگەنییە کە کوڕی خوالێخۆشبوو موحەممەد ڕەزای سەرتیپە.

عەشیرەتی غەیاسوەند ئەم بنەماڵانەی لێ کەوتۆتەوە:

---

٥٦- پیم وایە (پاپلی) دروست بێت.

٥٧- چەگەنیەکان لە چۆمی شاهڕووددا خەریکی کشتوکاڵی برنج و گەنم و جۆن و لە یێلاخدا جگە لە جۆ و گەنم کاریتر ناکەن و کاری ئاژەڵداریش دەکەن، لە کتێبی جێوگرافی نیزامی ئەژماری ئەوانی بە ١٥٠٠ بنەماڵە زانیوە، دوکتۆر وەرجاوەند، ل ٤٥٦.

دەروێشوەند، کۆماسی (کیماسی)، سەڵخووری (سەرخۆری) و موحەممەدبەیگی کە ئەم عەشیرەتە لە گوندەکانی ئوسبوییین، ئەنجلیق، ئەمیرئاوا، ئەمیرئەمجەد، پەشام، تووت چاڵ، تیاندەشت، تلەجین، جرن چاك، چەلك، خرووس، خۆشگنار، داغدەشت، سەنگ چاڵە، غەیاسئاوا، قانشاربلاغ، قزقەڵا، کاکوێستان، کاوەند، کەکەجین دەرە، کەشکۆر قەرەچم، گشتەروود، گۆرد، گەنم چاڵ، گۆراندەشتی گەورە، گۆراندەشتی بچووك، مەزرەعەی زەردچەشمە، مەزرەعەی مەحموودی میانج و قاقزاندا نیشتەجێن.

دانیشتوانی ئەو گوندانەی کە ییلاخ و قشلاخ ناکەن بریتین لە: پەشام، تیاندەشت، غەیاسئاوا، قاشار بلاغ، قزقەڵا، کاکوێستان، کاکەجین دەرە، کەشکوور قەرەچم، گشتە روود، گۆرد، مەزرەعەی مەحموودی و میانج.

بەڵام دانیشتووانی گوندەکانی دیکە هەر خەریکی ییلاخ و قشلاخن بۆ ییلاخ دەچنە فەشالی و تۆلەمبەسەر و تووت چاڵ و سووختەی چنار و بۆ قشلاخیش ڕوو دەکەنە شیرین سوو، قەرەدەرە، عەمارلوو، شارلق و ئەرەسئاوا، چوارتاقی، گزوان و دەوروبەری ڕۆخانەی شاهڕوود، کاکوێستان، تووتچاڵ (ڕوودبار)، پول ئەنبو و مەلاعەلی.

جەماوەری عەشیرەتی غەیاسوەند[٥٨] ٨٥٠ تا ٩٠٠ بنەماڵە دەبن و سەرۆکی ئەم عەشیرەتانەش بریتین لە خوالێخۆشبووان حاجی خان سالار حێشمەت غەیاس نیزام کە پاش غەیاس نیزام کوڕی گەورەی بە ناوی عێزەتوڵڵا غەیاسوەند ئەمیر ئەمجەد بوو بە سەرۆکی ئەم عەشیرەتە.

## عەشیرەتی کاکاوەند

ئەم عەشیرەتە دانیشتووی گوندەکانی قاقڕانن و ییلاخ و قشلاخ ناکەن. گوندەکانیان بریتین لە ئابەکلوو، ئاربەت دەرە، باینەشا، جەرەندەق، سوولیدەرە، عاشق حەسار، قاسمئاوا،

٥٨- دەڵێن لە سەردەمی ئاغاموحەممەدخانی قاجاڕدا ٤٠٠ بنەماڵە لەم عەشیرەتە بە سەرۆکایەتی خەلەف ناوێك لە کرماشان و لوڕستانەوە گوێزراونەتەوە بۆ قەزوێن، گوڵڕێز.

قەرەکۆسەلەر، قەڵای قەرەش و حەفت سەندووق[٥٩] کە ٤٢٠ تا ٤٥٠ بنەماڵەن.

سەرۆکی ئەم عەشیرەتە لە سەرەتای مەشرووتەدا مەسیّح خانی کاکاوەند بوو کە بە فەرمانی عەلی میرزا بۆ بەرگری لە شۆڕشگێڕەکانی گیلان هاوڕێی تاقمێك سوارە و چەکدار لە ساڵی ١٣٢٨ی کۆچیدا گەیشتە قەزوێن.

ئەو شەوەی کە شۆڕشگێڕەکانی گیلان هێرشیان کردە سەر قەزوێن و ئەم سەرۆکە کوردە هەتا بەیانی بە بێوچان شەڕی کرد لەگەڵیاندا؛ بەڵام بە بۆنەی ئەوەی تیری پێ نەما خۆی دا بە دەستەوە و ماوەییێك لە بەندیخانەدا مایەوە و کەچی دوای دەست بەکارکردنی مەشرووتە ڕزگار کرا و پاش ماوەییێك کۆچی دوایی کرد و ئیلخانی کوڕی کە پیاوێکی لێهاتوو بوو، بوو بە سەرۆکی ئەم عەشیرەتە و کەچی دوای ماوەییێك ئەویش لە دنیا دەرچوو و ئێستا ئەحمەدخانی کوڕی ئیلخانی سەرۆکی ئەم عەشیرەتەیە. یەکێ لە پیاوە بەناوبانگەکانی ئەم عەشیرەتە سەرهەنگ ئەبولقاسم کاکاوەند بوو کە ماوەییێکی زۆر لە دایرەی ماڵیەی گیلاندا کاری کردووە و لە ڕاپەڕینەکەی سەید زیاددا بوو بە سکرتێری دەفتەری وەزارەتی شەڕ و دوایی چووە نێو سوپای یەکەمی ناوەندی و ساڵەهای ساڵ سەرۆکی دایرەی دارایی ئەو سوپایە بوو و ئێستا چەن ساڵێك دەبێ کە سەرۆکایەتی دایرەی ئەفسەرانی ئەرتەش و ژاندرامری بە دەستەوەیە. دەبێ ئاماژە بکرێ کە عەشیرەتی کاکاوەند بە گشتی ئایینی عەلیوڵڵاییان هەیە.

## عەشیرەتی مافی

عەشیرەتی مافی کە تاقمێکیان لە دەوروبەری ٢٠٠ تا ٢٥٠ بنەماڵەیان لە گوندەکانی باقرئاوا، حاجیتەپە، حسێنئاوای ڕۆکنی، حسێنئاوای مافی، میانپاڵان و پاپلی کورد و میانگر، پشکەڵ دەرەدا نیشتەجێن.

ئەگەرچی ئەم عەشیرەتە جەماوەرێکی زۆر نین، بەڵام پیاوگەلێکی پیاوانەی زۆریان بوو وەك خوالێخۆشبوو حسێنقولیخان نیزاموسەڵتەنەی مافی کە تا ڕادەی ئەمیر توومانی و

٥٩- زمانی خەڵکی ئەم عەشیرەتە لەکییە بەڵام ئێستا بە زمانی تورکی قسە دەکەن، وەرجاوەند، ل ٤٥٧.

سپەهبۆدی ڕۆیشتە پێشەوە و هاوکات بوو بە سکرتێری ڕاوێژگەی مەجلیس لە کرماشان.

هەروەها خوالێخۆشبوو موحەممەد حەسەن سەعدولمەلێك بوو بە ئەمیرتوومانی. خوالێخۆشبوو حەیدەرقولی بورهانودەولەی برای نیزاموسەڵتەنە و میرزا مێهدی سەعدولمەلێك کوڕی موحەممەد حەسەنخان کە لە دایرەی شارەوانی تاراندا کارمەند بوون.

هەروەها میرزاهاشم موحیت مافی بەرپرسی ڕۆژنامەی «وەتەن» کە بە نووسینی مێژووی ڕاپەڕینی مەشرووتەی ئێرانەوە خەریکە، نازانین بۆچی ئەم کتێبە چاپ نەکرا؟

هەروەها تاقمێك لە خەڵکی ئەم عەشیرەتە حەکیم و دەرمانساز و ئەفسەری ئەرتەش بوون. خوالێخۆشبوو نیزاموسەڵتەنەی مافی لە تەنشتی شەقامی تەبرێزی قەزوێندا چەند حەوشی زۆر گەورەی دروست کردووە و هەروەها گوندی نیزامئاباد هەر بە دەستی ئەم پیاوە گەورەوەیە و کوڕی خوالێخۆشبوو نیزاموسەڵتەنە کە ئێستا زیندووە مەقام «سێناتۆر»ی هەیە. عەشیرەتی مافی زۆرتر بە کاری ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریکن.[٦٠]

## عەشیرەتی ڕەشوەند[٦١]

ئەم عەشیرەتە لە گوندەکانی ڕوودباردا ژیان دەکەن و گوندەکانی ئەوان بریتین لە: تەنوورە، کیاکلایە، لاتئەندەرە، مەدان و هەرانك، کە لە جەماوەردا ٨٠ بنەماڵەن. لەم سەردەمەدا سەرۆکەکانیان برتیین لە: موحەممەد عەلیخان -سالار سەعید- و پاشان جەعفەر ڕەشوەند، کەچی ئەم سەرۆکانە زۆر لەگەڵ خەلکدا پیاوانە ڕەفتاریان نەکردووە.[٦٢]

بەڕێز گولڕێز لە لاپەڕەی ٩٣٨ی کتێبی مینوودەردا دەنووسێت: وشەی ڕەشوەند لە «ڕەشمەبەند»ەوە گیراوە RESHMA کە ڕەشمە لە زاراوەی کرمانجیدا بە شریتێکی جوان و ڕەنگامە دەڵێن کە زووتر بۆ پشتوێن بە کار دەهات.

---

٦٠- هانری فیڵد، جەماوەری عەشیرەتی ماف بە ٦٠٠ بنەماڵە زانیوە، مەردم شناسی ئێران هانری فیڵد.

٦١- نووسەر بەو بڕوایە کە عەشیرەتی ڕەشوەند دانیشتووی قەزوینن و لە عەشیرەتی ڕەشوانلووی خوراسانن، پێم وایە لە هەراتەوە گوێزرابێتنەوە.

٦٢- مینوو دەر بابولجەننەتی قەزوێن، سەیید موحەممەد عەلی گولڕێز، ل ٨٥٩.

دەڵێن ئەم عەشیرەتە لە دەوروبەری هەراتەوە هاتوونەتە قەزوین و سەرۆکەکانی ئەم عەشیرەتە زۆربەیان لە سەرکردەی سوارەکان بووگن.

یەکێ لەم سەرۆکانە ناوی بەرخۆردارخان بوو کە لە شەڕی دژ بە ئوزبەکەکاندا سەرکەوتنێکی زۆری وەدەست هێنا و جەماوەرێکی لە ئۆزبەکەکان دەسگیر کردووە کە یەکێ لەو دیلکراوانە ناوی ئەسکەندەربەیگ بووە.[٦٣] «هانری فیلد» دەنووسێت: عەشیرەتی ڕەشوەند زۆربەیان دێنشین و لە ناوچە ڕوودبار ئەلـمەوتدا ژیان دەبەنە سەر و گوندەکانیان بریتین لە: دێ دووشاو، حەسەنئاوا، شارستان میعادئاوا، دەڕەئەلحەق، چرش دەڕە، بدەشت، دزدکەسار، مەحموودئاوا، وشترخان، مەدەن، هەرانەك، سفیدەر ئاوەج و دەڕەلـمەوت.[٦٤]

ئەم عەشیرە ١٥٠ بنەماڵەیان لە دەڕەلـمەوت و ٤٠٠ بنەماڵەیان لە ڕوودبار دان. لە گوندی ئەلـمەوتدا بە زمانی تورکی و لە ڕوودباردا بە زمانی کرمانجی قسە دەکەن. دەبێ ئاماژەش بکەین کە ئەم عەشیرەتە لە دوایین ڕۆژەکانی سەدەی ١٧ی زایینیدا لە بەلخ و بوخاراوە ڕوویان کردۆتە ئەم ناوچەیە و هەروەها تاقمێکیان بەرەو ناوچەی خوراسان ڕۆیشتن.[٦٥]

## عەشیرەتی چەمووشگەزك و کەلهوڕ

مەڵبەندی ئەم عەشیرەتە «تارمە» و لە گوندەکانی ئەمیرئاوا، ئەنجلین، چەمووشگەزك (شاهوەرن) و وەرزندەدا دەدژین. ئەم عەشیرەتە ٢٥٠ بنەماڵەن. ییلاخی ئەم عەشیرەتە کێوەکانی ئەمیرئاوا و مەزرای شامدەشت و کێوەکانی زەرەند و والایشە کە سەر بە شاری ئەبهەرە، ئەم عەشیرەتە لە شاری قەزوێندا ژیان ناکەن و کەسیان لەوێدا نییە و پیاوی بەناوبانگی زۆریشیان لێ هەڵنەکەوتووە.

---

٦٣– مینوودەر، گوڵڕێز، لاپەڕەی ٩٢٨ باسی بەسەرهاتی منداڵەکانی بەرخوردارخان و منداڵەکانی ئەسکەندەرخان.

٦٤– نووسەری مینوو دەر نووسیویەتی: ڕەشوەندەکان و غەیاسوەندکان جگە لە فارسی و تاتی و کوردی، تورکیش دەزانن، لاپەڕەی ٩٤٦.

٦٥– مەردمشناسی ئێران، هانری فیڵد، وەرگێڕانی دوکتۆر عەبدوڵڵا فەڕیار، چاپی تاران ١٣٤٣، ل ٢٠٤.

## عەشیــرەتی بەهتوویی

تاقمێك لەم عەشیرەتە لە گوندی مێرکی ڕووباردا دەژین کە ٢٠ تا ٣٠ بنەماڵەن و تاقمێکی‌تریان گوندەکانی خەرقان زەهرا و دەشتبیدا دەژین. سەرۆکی بەناوبانگی ئەوان خوالێخۆشبوو ئەسەدخانی بەهتوویی بوو کە چەند ساڵی ڕابردوو لە دنیا دەرچووە و ئێستا کەس سەرۆکی ئەم عەشیرەتە نیە و ١٥٠ بنەماڵەن.

## عەشیــرەتی حەلیلوەند

خەڵکی ئەم عەشیرەیە لە قەزای قاقزاندا ژیان دەکەن و ییلاخ و قشلاخ ناکەن و گوندەکانیان بریتین لە: ئاقچەکەند، باشگڵ، قەرەباخ و یەنگجەی خوار کە ١٥٠ تا ٢٠٠ بنەماڵەن، سەرۆکی ئەم عەشیرەتە لە سەرەتای مەشرووتەدا خەسرەوخان بوو کە ژنێکی بوو زۆر ئازا و دلێر، بە ناوی «خانم خانمها» و ئەم کەڵەژنە وەکو پیاوێکی ئازا لە مەیدانی شەڕدا بەشداری کردووە، خەسرەوخان بە بۆنەی ئازایەتی ئەم ژنەوە نازناوی «کەلانتەر»ی وەدەست هانی؛ بەڵام زۆری نەخایاند کە هەر دووکیان لە دنیا دەرچوون و دوو کوڕی ئەوان بە ناو حەبیبوڵڵاخان و عەزیزوڵڵاخان نەیانتوانی جێگای بابیان بگرنەوە ئێستا جگە لە سەر هەنگ چەلیلوەند کە ئەفسەری ئەرتەشە کەسێکی بەناوبانگیان نییە.

## عەشیــرەتی یەمەنی

ئەم عەشیرەتە لە گوندی «ئالن قییە»[٦٦]دا ژیان دەکەن و ١٠٠ بنەماڵەن و سەرۆکێکی وەهایان نییە.

---

١- ALanqaya

## عەشیرەتی وەلی یاری

لە گوندی کولـجی تارمدا نیشتەجێن، ١١٠ بنەماڵەن و ییێلاخ و قشلاخ دەکەن.

## عەشیرەتی باجەلان

ئەم عەشیرەتە لە دوو گوندی ئیسماعیلئاوا و نادرئاوادا نیشتەجێن و ییێلاخ و قشلاخ دەکەن و ٤٠ تا ٤٥ بنەماڵەن و سەرۆکێکی وەهایان نییە.

## عەشیرەتی کرمانی

ئەم عەشیرەتە لە گوندی لوولەی جەردیان ماڵیئاوا (بەشاریات)دا نیشتەجێن؛ ییێلاخ و قشلاخ ناکەن و ٤٠ تا ٤٥ بنەماڵەن و سەرۆکێکی وەهایان نەبووە.

ساڵی ١٣١٠ی کۆچی هەتاوی لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕەزاشادا ٣٠٢٠ کەس لە کوردەکانی ئارارات گوێزرانەوە بۆ قەزوین و دابەش کرانە نێوان گوندەکاندا و چون ئەم کۆچ کردنە لە ڕووی عێلم و زانیاریەوە نەبوو و ئەم عەشیرەتە کوردانەش هیچ کەلوپەل و زەوینی کشتوکاڵیان نەبوو و ساڵەهای ساڵ بە سەختی ژیاون.[٦٧]

پاشان دوای شاریوەری ساڵی ١٣٢٠ی کۆچی هەتاوی هەموویان گەڕانەوە زێد و وڵاتی خۆیان. ئەم بنەماڵانە لەم عەشیرەتە دابڕ بوون و بریتی بوون لە: قەندەکانی، حەیدەرانلوو، ساکانی، قزڵباش مەردکانلوو[٦٨]، بلووکاتی، بەڵخکانی، حەکانی، خەلاجی، قادری، حوقەڵغی، شێخی، زیلانی، حسەینلوو، کەشکۆڵی، زەکی خانی، عەباس ئاغا، سەقاری، ڕەحمانی،

---

٦٧- دوژمنەنانی کورد بە درێژەی مێژوو هەوڵیان داوە کە ئەم نەتەوەیە لێك جیا بکەنەوە و کەچی کوردەکان توانیویانە کەلتوورو فەرهەنگی خۆیان بپارێزن. ڕەزاخان پالەوی جگە لەوەی کوردە موکریەکانی بۆ قەزوێن دوور خستەوە کوردەکانی خوراسانی بە تایبەت بیچرانلوو و سیکانلوو و نامانلووەکان و... هتدی بۆ گوڵپایەگان و بەندرەعەبباس دوور خستەوە بەڵام ئەوان توانیان جارێکیتر وەرگەڕێنەوە بۆ خوراسان.

٦٨- پاشماوەی مەردکانلووەکان وان لە قووچاندا.

ملچکانی، بۆرە و بەڵخکانی بووری.[٦٩]

## کوردە زیکەکان سنوورەوانی ڕۆژهەڵاتی ئێرانن

کاتێ کە بۆ مێژوویی ئێران دەڕوانین، دەزانین کە پاراستنی سنوورەکانی ئێران بە تایبەت سنوورە ڕۆژهەڵاتیەکان یانێ هەر لە بەندەرعەبباسەوە تا کرمان و سیستان و بەلووچستان و خوراسان و لەوێوە تا سەمەرقەند و بۆخارا خراوەتە ئەستۆی کوردەکان.

لە سەردەمێکدا کە پیشدادیەکان و کیانیەکان لە ئێراندا حکوومەتیان کردووە و لەبەر ئەوەی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران کە تاکو سندوپەنجاب درێژەی بوو و دوژمنانی ئێران زۆر جار لەم سنوورانەوە پەلاماری ئێرانیان داوە و کەچی ئەوە کوردەکان بوون کە توانیان بەرگری بکەن لەم پەلامارانە. پاڵەوانە پێشووەکانی ئێران بە تایبەت «نەریمان» و «سام» کە لە باوەگەورەکانی ڕۆستەم پاڵەوانی شانامە بوون و بۆ پاراستنی ئەم سنوورانە ڕەوانەی ناوچەکە کران و بە جوانی توانایی خۆیانیان پێشان داوە.

دەزانین ڕۆستەم لە شاری زابل[٧٠] هاتۆتە دنیاوە و ناوبانگی ئەو ڕۆستەم زابلی یان سیستانیە. کوردە کوولاییەکان کە ئەمڕۆ لە زابلدا دەژین و زمانی کوردیان لە بیر بردۆتەوە و پێم وایە هەر لەو کوردانەی بن کە هاوڕێی باوەگەورەکانی ڕۆستەم هاتوونەتە ئەم ناوچەیە، ئەو کوردانەی کە ئەمڕۆ لە کەلات و کوەیتە پاکستاندا دەژین و کاریگەری زۆریشیان لە سەر مێژووی ئەم ناوچەیە بووە و هەر لەو کوردە مێژوویانەن.

کێوەکانی بارزانی کرمان مەڵبەند و شوێنەواری ئاژەڵداری کوردە بارزانیەکانی پێشوو بوو کە جارێکیتر لە سەردەمی ساسانیەکاندا بە تایبەت لە سەردەمی خەسرەوپەرویزدا کە سنوورە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئێران کەوتە بەر پەلاماری خەڵکی بێگانە و لە لایەن بەهرامی چووبینەوە[٧١] سەرکوت کران. ناپیاوییەکانی خەسرەوپەرویز لەم شەڕانەدا دەبێتە هۆی تووڕە بوونی بارامەوە و

---

٦٩– مینوودەر بابولجەننەی قەزوین، سەیدعەلی گوڵڕێز، چاپ زانکۆی تاران،ساڵی ١٣٣٧، ل ٨٦١.

٧٠– ناوی پێشوی زابلستان (پاروویامیفووس)ە کە یازدەهەمین ئەیالەتی ئێران بووە، کتێبی تاوەرینە، وەرگێڕاوی ئەبووتوراب نووری، ل ٥٥٥.

٧١– یانێ بارامێ کە لە بنەماڵەی باوکی شوان بوو کە بوو بە سوپاسالاری ئەرتەشی ئێران.

دەبێ بە شەڕیان و لە ئاکامدا پاشا شکست دەخوات و بارام سەردەکەوێ و خەسرەوپەرویز ڕوو دەکاتە ڕۆم. بارام دوای ئەم سەرکەوتنە دەبێ بە پاشای ئێران؛ بەڵام زۆری نەخایاند کەخەسرەو پەرویز بە یارمەتی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە جارێکیتر بارامی کورد سەرکوت دەکات.

دوای هێرشی عەرەبەکان بۆ ئێران کە کوردەکان بە عەرەبەکانیان دەگوت: «تازیـان»[٧٢] و ئەم تازیانانە توانیان سەرانسەری وڵاتـەکانی ئێـران بـە تایبـەت ناوچـە ڕۆژهەڵاتیـەکان داگیـر بکەن؛ بەڵام دوای چەند ساڵێك خەڵكی خوراسان بە سەرۆکایەتی ئەبوموسلیم خوراسانی ئاڵای سەربەخۆیی ئێران هەڵ ئەدەن و کوردەکان بـە تایبـەت لـە شـەڕی زابدا کـە بـوو بـە هـۆی لـە ناوچوونی ئەمەوییەکانەوە دەورێکی گرنگیان هەبووە.

لە سەردەمێکدا کـە وڵاتـی ئێـران دابـەش کرابـووە نێـوان مـەغوول و سەلـجووقیەکاندا شائیسـماعیل سەفەوی لـە ناوچـەی ئازەرپادەگانـەوە هەسـتایەوە و جـارێکیتـر کوردەکـان بـە تایبەت عەشیـرەتی چەمەشگەزك بە سەرۆکایەتی ڕۆستەمبەیگ کە لە دیاربـەکر و ئەرزڕۆمـدا دەژیان، هاتنە یارمەتی پاشای لاوی ئێرانەوە و سەربەخۆیی ئێرانیان جارێکیتر بنیات نایەوە و هەر ئەم کوردانە بوون کە بۆ پاك کردنـەوەی خوراسـان لـە ئوزبەکـەکان و مەغوولـەکان هاتنـە خوراسان و کوردەکانی قەرامانلوو لە ژێر فەرمانی بەیرامخاندا زۆرتر لە هەمووان هەوڵیان داوە.

لـە سـەردەمی شاعەباسـدا کـە سەرانـسەری ناوچـە ڕۆژهەڵاتیـەکان شـڵەژابوو و گەنـجعەلیخان زیك کە لە کوردە زیکەکان بوو ڕاسپێری ئـەوێ کـرا و ئـەویش بـە هاریکـاری کوردەکانی زیك و زەنگەنە و تەکلووەوە[٧٣] توانی سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ئێران ئەهوەن بکاتەوە و زۆر کاریگەری لە سەر ئەم ناوچەیە بوو و تا ڕادەیێك کـە دوای ٤٠٠ سـاڵ زانـا و بلیمـەتێك وەکو دوکتۆر باستانی پاریزی کتێبکی خۆی بە ناوی گەنـجعەلیخانەوە دانـاوە و لـەم کتێبـەدا ئاماژە بە کوردەکانی زیك کـراوە و زۆرتـر سـەبارەت بـە ڕەنـج و تێکۆشـانی گەنـجعەلیخـان لەبواری خانووسازی و پێشخستنی ناوچەکەوە باس دەکات.

---

٧٢– تازی لە زمانی کوردیدا بە مانای بێ جل و بەرگە و تازیان یانێ بێ جل و بەرگەکان.

٧٣– کوردەکانی تەکلوو کە ئەمڕۆ تاقمێکیان لە ناوچەکانی توربەتجامدا ژیان دەکەن دەگەڕێنەوە بۆ سەر تەکلەی کوڕی هەزار ئەسپ کە بە دەستی هولاکووخان کوژراوە.

## گەنجعەلی‌خان زیك حاكمی ولاتە ڕۆژهەڵاتیەكانی ئێران

بەڕێز مامۆستا باستانی پاریزی لە نووسراوەیێكدا بە ناوی گەنجعەلی‌خان حاكمی كرماندا نووسیویەتی ئەو ڕۆژانەی كە شاعەبباس لە هەراتدا بوو، عەشیرەتەكانی خوراسان دەیانویست عەباس میرزا بە جێگەی سوڵتان موحەممەدی خودا بەندەی بابی بكەن بە پاشا و كەچی هەر ئەو كارەشیان كرد، لەم كاتەدا گەنجعەلی‌بەیگ زیك زۆر بە پاشای ئێرانەوە نزدیك بوو و بە ڕاستی زۆر ئازا و لێهاتوو بوو و بڕیار وا بوو بە فەرمانی شائیسماعیلی دووەم[٧٤] عەبباس میرزاش بكوژرێت؛[٧٥] بەڵام ئەو ڕۆژەی كە بڕیاری كوشتنی عەبباس میرزا درابوو، هەواڵی مردنی پاشا گەیشت[٧٦] (٩٨٥ی كۆچی مانگی ١٥٧٧ زایینی). لەم كاتەدا گەنجعەلی‌خان زیك و عەلیقولی‌خان شاملوو و مورشێد قولی‌خان[٧٧] نازناوی «خان»ی داوە بە گەنجعەلی‌خان. شاعەبباس هەموو كاتێ ڕێزی زۆری بۆ گەنجعەلی‌خان داناوە و پێی گوتووە «بابا گەنجعەلی‌خان» لە ساڵی ١٠٠٥ تا ١٠٣٤ی كۆچی مانگی فەرمانڕەوای كرمان بووە و دوای ئەویش عەلیمەردان‌خانی كوڕی بوو بە سەرۆكی حكوومەتی كرمان و ئەو ناوچانەی كە لە ژێر دەسەڵاتی گەنجعەلی‌خاندا بووە لە سنووری فارس تا قەندەهار درێژەی بووە و هەروەها سەرانسەری كرمان و بەلووجستان و قائێنات و سیستان لە ژێر دەسەڵاتی ئەم كەڵەپیاوەدا بوو. هاوكات شاقولی بەیگ تەملووی زیك سەرۆكی بەم و بەلووجستان بوو. گەنجعەلی‌خان لەو سەرۆكانەیە كە لە سەردەمی ئەودا زۆر كاری باش و لە بەرچاو كراوە. هەمووی ڕێگاكان دەگەیشتنەوە زەریا و باسێك لە جەردە و چەتە نەبوو. باسی ئابووری زۆر پڕهێز و بەتین بوو و هاوكات گەنجعەلی‌خان لە زۆربەی شەڕەكانی شاعەبباسدا بەشداری كردووە. وەك ئەوەی كە

---

٧٤- كە بە یارمەتی پەری خانمی خوشكی پێش لە سوڵتان موحەممەد دەسەڵاتی بە دەستەوە بووە.

٧٥- بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە بۆ كتێبی عالەمئارای عەبباسی.

٧٦- شائیسماعیل لە دەوروبەری دوو ساڵدا دەسەڵاتی بە دەستەوە بوو.

٧٧- مورشێد قولی‌خان لە سەردەمی شاعەبباس لە خوراسان بوو و دوابەدوای دەسەڵات پەیداكردنی شاعەبباس بوو بە سەدرئەعزەم و دوای ماوەیێك شاعەبباس لە ترسدا دای لە سێدارە.

ساڵی ١٠٠٦ی کۆچی مانگی (١٥٩٧ی زایینی) لە ڕێگای تەبەسەوە ڕەوانەی شەڕی ئوزبەکەکان بوو و ساڵی ١٠١١ی کۆچی بۆ سەرکوت کردنی عەبدولباقی‌خانی ئوزبەك، خۆی گەیاندەوە خوراسان. ساڵی ١٠١٣ی کۆچی لەگەڵ عوسمانیەکان شەڕی کردووە و لە ئازەربایجانەوە هەتا زەریاچەی وان دوژمنی ڕاو ناوە. دەبێ بڵێین ئەم شەڕە تا ساڵی ١٠١٦ی کۆچی درێژەی بوو و سەرکەوتنی هەر بە ئێرانیەکان بوو.

گەنجعەلی‌خان ساڵی ١٠٢٠ی کۆچی هێرشی کردە سەر بەلووجستان و قەڵای بەمپووری داگیر کرد و سەرۆکە بەلووچەکانی وەك بارمتەیەك دانا. لەم شەڕەدا ٤٠ هەزار پەز و هەزار وشتر کەوتە دەستی سوپای زیك و موکریانیەکانیش گوێزرانەوە بۆ کرمان.

ساڵی ١٠٢٥ی کۆچی مانگی جارێکی‌تر بۆ شەڕی دژ بە عوسمانیەکان ڕەوانەی گروجستان کران و لەو شەڕەدا بە دیلی گیراون و ٣٠ هەزار سەربازی کافریش کوژراون و چەندە ژنی جوان لەم شەڕەدا بە دەستی ئێرانیەکان بێ‌ناموس کران.

ساڵی ١٠٢٨ی کۆچی مانگی کاتێ کە شاعەبباس ڕەوانەی قەندەهار دەبوا، گەنجعەلی‌خانیش هاوڕێیی دەکرد. هەر لەم کاتەدا بوو کە گەنجعەلی‌خان بوو بە سەرۆکی قەندەهار. ئاسەواری زۆر جوان لە گەنجعەلی‌خان و عەلیمەردانی کوڕی بەجێ ماوە کە ئەتوانین ئاو ئەنباری کرمان، حەمام، بازاڕ و باخەکانی کرمان ناو ببەین. جا لەبەر ئەوەی بەڕێز باستانی پاریزی لە کتێبە ٥٠٣ لاپەڕەییەکەی خۆیدا هەمووی باس کردووە و ئێمە دووپاتی ناکەینەوە.

نووسەری عالەم‌ئارای عەبباسی سەبارەت بە لەدنیادەرچوونی گەنجعەلی‌خان نووسیویەتی گەنجعەلی‌خان بیگلەربەیگی قەندەهار لە کوردە زیکەکانە و دۆست و هەڤاڵی سەردەمی لاوەتی شاعەبباس بووە و کەچی ئێستاش پیاوانە هاتۆتە دەرگای شاهانەی شاعەبباسەوە و دواییش نازناوی «خان»ی و «بابا»ی پێ دراوە و ٣٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرمانیشی لە ئەستۆ گرتووە و زۆر پیاوێکی عادڵ و خەڵك دۆست بوو و کەچی سەرۆکی دارولقورئانی قەندەهاریش بوو.

ساڵی ١٠٣٤ی کۆچی کاتێ کە شەو لە بەر ئەیوانەکەوە دەنوێت، لە ناکاو لە خەودا خڕ

دەبێتە خوارێ و لاشەی ئەو پیاوە بەرزە بێ گیان دەمێنێتەوە و عەلیمەردانی کوڕی تەرمەکەی بابی لە قەندەهارەوە دەباتەوە مەشهەد و لە تەنیشتی بارەگای ئیمام ڕەزادا بە خاکی دەسپێرێ. کاتێ کە ئەم هەواڵە دەگاتە دەستی پاشا، خێرا ئەویش بەبێ وەستان عەلیمەردانی کوڕی دەکات بە حاکمی کرمان و نازناوی «بابای سانی» پێ ئەدات. بەڕێز باستانی پاریزی نووسیویەتی گەنجعەلیخان کوڕی زۆری بووە کە یەکێ لەو کوڕانەی شاڕۆخ خانە کە لە شەڕی کارتیل لە گورجستاندا کە ساڵی ١٠١٤ی کۆچی ڕووی داوە لە ئەسپ دەکەوێتە خوارەوە و دەمرێ. عەلیمەردانخان دەسەڵاتی قەندەهاریشی وەدەست هانی.

گەنجعەلیخان کەنیشکێکی بوو کە ژنی میرزا تالێب ئەردووبادی کوڕی حاتەم بەیگ ئەردووبادی و وەزیری بەناوبانگی شاعەبباس بوو. میرزا تالێب دوای مردنی حاتەم بەیگی باوکی، بوو بە وەزیر و ١٠ ساڵ لەم پۆستەدا مایەوە. کاتێ کە شاسەفی بوو بە پاشا لە دەسەڵات گرتنی عەلیمەردانخان کە ژنبرای میرزا تالێب بوو و پەرەی گرت و کەوتە ئەو بیرەی تاکو بە شێوەیێك لە ناوی ببات. بۆیە داوای لێ کرد تاکو خۆی بگەیەنێتە پاتەخت. بەڵام وادیارە خوشکەکەی ئەوهەواڵەی کە پاشا دەیەوێ بیکوژێ پێی گەیاندبوو و بۆیە ئەویش ئاوڕێکی لە ئەو قسەی پاشانە دایەوە و بەرەو ناوەند و پاتەختی ئێران نەهات.

میرزا تەقیخان مازندەرانی (سارۆتەقی) ناپیاوێکی بە تەواو مانا بوو و لەبەر ئەوەی بوو بە هۆی کوشتنی میرزا تالێب و زۆربەی خەڵکی بێ تاوانەوە و هاوکات ڕق و کینەی دژ بە عەلیمەردان خان لە دڵی پاشادا داچەقاند. بۆیە کاتێ کە پاشا داوای لە عەلیمەردان کردووە تاکو بێتەوە بۆ پاتەخت، نەهاتووە و دەڵێن تۆزێك حسێب و کتێبیماڵیاتی کرمانیش مابوو کە ناتەواو بوو و زۆر لە کوشتنی خۆیشی بە دەستی پاشا دەترسا، بۆیە قەندەهاری دا بە دەستی هندەوە و خۆیشی ڕووی کردە هێندۆستان. شاسەفی لەبەر ئەوەی کە عەلیمەردانخان نەهات بۆ کۆشکی پاشایەتی، زۆر تووڕە بوو، بۆیە سوپایێکی بۆ شەڕی دژ بە عەلیمەردانخان ڕازاندەوە و ڕەوانەی ناوچەکەی کرد.

مەلا کەماڵ نووسیویەتی بە پێی فەرمانی پاشا بڕیار وابوو کە «قولەرئاقاسی» بڕوات بۆ قەندەهار و کاروباری ئەوێ جێبەجێ بکات کەچی عەلیمەردانخان لەم کارە زۆر ترسا و خێرا

قەندەهاری دا بە دەستی هێندەوە و خۆیشی ڕۆیشت بۆ هێند. عەلیمەردانخان کاتێ کە گەیشتە لاهوور، موعتەمەدخان هاتە پێشوازیەوە و عەلیمەردان خانیش ١٠٠ ئەشرەفی کردە خەڵاتی ئەوان و هاوکات شاجەهانی هێندیش لە وڵامدا قەڵخانێك و شمشێرێك و خەڵاتییێکی زۆر و ٢٠ ئەسب و ٤ فیلی ڕازاوەی بە دیاریدا بە عەلیمەردانخان و نازناوی «ئەمیر»یشی پێ دا و هەروەها ١٠ لك ڕووپیەی پێ دا و لە ماڵی ئێعتمادودەڵەدا مایەوە و پاشان پۆستی ٧ هەزاری وەدەست هێنا.

ئەو ئێرانیانەی کە هاوڕێی عەلیمەردانخان هاتبوون بۆ هێند، بۆ جێژنی سێزدەیەمین ساڵی پاشایەتی شاجەهان شاریان چراخانی کرد و دەستیان کرد بە ئاگربازی کە خودی شاجەهان هاتە تەماشا کردنیان. دەبێ ئەوەش بڵێین کە عەلیمەردانخان کاتێ کە ڕۆیشت بۆ هێندووستان لە نێوان ئەو و قولەرئاقاسیدا بوو بە شەڕ و قولەرئاقاسی تێك شکا و دەرباز بوو. لەبەر ئەوەی عەلیمەردانخان هەڵوێستی ئەوە نەوو کە لەگەڵ ئێرانیەکاندا شەڕ بکات، دەستی لە قەندەهار هەڵگرت و ڕۆیشت بۆ هێندووستان بەڵکو شاسەفی بتوانێ ئەوێ بباتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، کەچی ئەویش توانای ئەو کارەی نەبووە.

عەلیمەردانخان بە شێوەیێکی ماقووڵانە لە هێندووستان و لە لایەن پاشاوە ڕێزی بۆ دانرا و بوو بە جێگری حکوومەتی لاهوور و کشمیر، ئەفسەرەکانی و کوڕەکانی بە تایبەت عەلیبەیگ و عەبدوڵلابەیگ و ئیسماعیل بەیگیش پۆستگەلێکی بەرچاویان وەدەست هانی. بە بۆنەی پیاوەتیەکانی عەلیمەردانخان بە تایبەت لە کاتێکدا خەڵکی لە وشکەساڵی ڕزگار کرد شاجەهان ١٠ میلیون «دام»[٧٨]ی پێ دا و خانوبەرەکەی ئێعتماد خانیشی بە دیاری پێ دا؛ ئەم ماڵە لە کەناری چۆمی جمنەدا بوو کە ئێعتمادخان بە دیاری دابووی بە پاشای هێند.

عەلیمەردانخان چ لە بواری ڕامیاری و کۆمەڵایەتیەوە و چ لە بواری نیزامیگەریەوە خزمەتی زۆری کردووە بە هێندۆستان. ئەو ڕۆژەی کە عەلیمەردانخان گەیشتە خزمەتی شاجەهان بەرگێ شاهنامەی خەتی خەڵاتی پاشا کرد کە بە خەتی مورشید شیرازی ساڵی

---

٧٨- پارەی ئەو کاتەی هێندوستان.

٩٤٢ی کۆچی مانگی نووسرابووەوە. ئەم شاهنامەیە کە یەکێ لە شاهنامە دەسنووسە بەنرخەکانی جیهانە ئێستا لە کتێبخانەی خودابەخش بانگی پووری شاری پەتنە دایە بە ژمارەی ٣٥٨٥.

عەلیمەردانخان شیعەیێکی زۆر ئایینی بوو. تا ڕادەیێك کاتێ کە لە کابلدا چەند کەسیان هێنایە خزمەتی و گوتیان لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو نەوون، خێرا هەموویانی بۆ کابل دوور خستەوە.

شمشێرێکیش کە شاعەبباسی یەکەم بە دیاری دابووی بە عەلیمەردانخان، ئەمڕۆ وا لە مۆزەی قەڵای دێهلیدا و لە سەری نووسراوە: «این شمشیر خاص از حضور عباس خلدالله ملکه و سلطان علیمردانخان سرفرازی یافت.» وێنەی زۆریش لە عەلیمەردانخان لە مۆزەکانی هێنددا دەبینرێن. بە تایبەت لە دێهلی و حەیدەرئابادda.

بەڕێز باستانی پاریزی دەنووسێت: کاتێ کە بۆ پێڕستی ئاسەوارەکانی ئەم پیاوە بەرزە دەمڕوانی لە کرمان و دەشتەکانیدا هەتاکو قەندەهار و کابل و هێندۆستان درێژەی هەیە؛ بەڵام نازانم بۆچی پیاوێکی بەرز دەبێ مێژوو وای بە سەر بهێنێ و لە ئێران دەربکرێ.

عەلیمەردانخان پیاوێکی بەسیاسەت بوو لە بواری ئابووریەوە و دەتوانین نازناوی «ئابادیخوازی» پێ بدەین کە زۆر لە نازناوی «ئازادیخوازی» جوانترە. بەڕێز باستانی پاریزی لە ئاکامدا ناوی ئەو خزمەتانە دەبات کە عەلیمەردانخان و باوکی بە ئێرانیان کردووە کە دەتوانن بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانن بۆ کتێبی «گەنجعەلیخان».

عەلیمەردانخان لە ئاکامدا ساڵی ١٠٦٦ی کۆچی مانگی لە دنیا دەرچوو و ئیبراهیمخانی کوڕی تەرمەکەی باوکی بە کەشتی هێناوە لاهوور و لەوێ لە تەنشتی دایکیدا بە خاك سپێردرا. ئەم گۆڕستانە وەك خانوەکانی ئێران بنیات نراوە.

وادیارە ئەم گۆڕستانە لە کاتی دەسەڵات پەیدا کردنی «سیکەکان»دا ساڵی ١٨٠٧ی زایینی خراپ کراوە کە دوایی لە لایەن زانکۆی لاهوورەوە دروست کرایەوە. ئەم گۆڕستانە لە تەنیشتی چاك کردنەوەی ڕێی ئاسن دایە.

عەلیمەردانخان بە واتای مەئاسیرولئومەرا چوار کوڕی بووە کە بریتیـن لە:

١- ئیبـراهیم کـە جێگـری دەسـەڵاتی بەنگالـە بـوو ٢- عەبـدوڵڵا کـە لـە سـەردەمی عالەمگیـردا نازناوی «گەنـجعەلی» وەرگرت ٣- ئیسحاق بەیگ کە پلەی هـەزار و پانسەدی وەرگرت ٤- ئیسـماعیل بەیگ کە پلەی هەشتسەدی وەرگـرت. یـانێ سـەرکردەی ٨٠ سـوارە بوو. ئەم دوو برایـە لـە شـەڕەکانی «سـمووگر»دا هـاوڕێی پاشـایان کـردووە. لـە بەڵگـەیێکی دەسنووسـدا کـە هـی پرۆفیـسۆر مەحـموود شیـروانی بـوو، سـەبارەت بـە بنەماڵـەی عەلیمەردانخانی زیك بە جـوانی بـاس کـراوە و کەچـی ئێـستاش ئـەم خێڵـە لـە هێندۆسـتاندا ماونەتەوە.

شاردەن نووسیوویەتی: یەکێ لە کوڕەکانی عەلیمـەردانخـان بـە نـاوی عـەلیبـەیگ لـە ئێسفەهاندا کۆشکێکی هـەبووە کـە زۆر گـەورە بـوو و بـاخێکی زۆر ڕازاوەش دەوری گرتبـوو. گرنگتـرین ئاسـەواری عەلیمـەردانخـان دوای ئاوئـەنباری کرمـان و بـاخی کابـل و قەنـدەهار، باخێکی گەورەیە کە لە عالەمدا لفـی نییە و ئێستاش لـە لاهـوور دایـە. نادرشـا لـەم باخـەدا بڕیارنامەی نێوان خۆی و موحەمـمەدشای هێندۆستانی ئیمزا کردووە (سالّی ١١٥٢ك).

عەلیمەردانخان توانیبووی بەشی زۆری مـاڵ و دارابیەکـەی خـۆی لـە قەنـدەهاروە بباتـە لاهوور. عەلیمەردانخان دواییـن کوڕی سەرۆکی قەندەهار بوو کە لە باوکیەوە پـارەی زۆری بـۆ بەجێما و کاتێ کە بە شاجەهان نزدیـك بـووەوە لـە سـالی ١٠٣٧ی کۆچـی مـانگیدا تـەواوی کەلوپەلی ماڵەکەی لە زێڕ بوو و چەند یەغانی پڕ لە زێڕی لەلابوو و دوایی کۆشکێکی گەورەی لە جەهانئاباددا بنیات نا. ڕۆژێکیان کە پاشا لەگەڵ پاشازادەکاندا دەڕوات بۆ ئەوێ بۆ دیداری عەلیمەردانخان و هاوکات ژنەکەی عەلیمەردانخان چەن یەغانی پڕ لە زێڕ بەو کـچە شـازادانە پیـشان ئـەدات و دەڵـێ بـەم بۆنـەوە مێردەکـەم پـارە لـە پاشـاوە ناگرێـت کـە خۆمـان زۆر دەوڵەمەندین. بەڕێز پاریزی نووسیویەتی داستانی قەنـدەهار و پـەنابردنی عەلیمـەردانخـان بـە پاشای هێند سەرەتای دەستپێکردنی سەربەخۆیی ئەفغانستان دابیـن دەکات.

بنەماڵەی گەنـجعەلیخان جگە لە کرمان لە قاینیشدا ژیان دەکەن کـە بـە «گەنـجی» ناسراون. منداڵەکانی گەنـجعەلیخان دوای گرتنی هەرات بۆ ماوەیێکی زۆر لـە ئەفغانـستان و

لە ناوچەی «نك دەر»دا نیشتەجێ بوون و لەوێشەوە دەچنە «سەربێشە» کە لە ٦٠ کیلۆمەتری باشووری ڕۆژهەڵاتی بیرجەندەوەیە کەچی مزگەوت و حەمامی سەربێشە بە دەستی ئەوان بنیات نراوە.

منداڵەکانیتری گەنجعەلیخان جگە لە کرمان و قاین و ئەفغانستان و هێندۆستان لە یەزد و ئێسفەهاندا ژیان دەکەن و زۆربەیان بە «گەنجی» و «گەنجعەلیخانی» ناسراون.

لە خوراسانیشدا بە تایبەت لە بەشی چەگەنی گوندێك هەیە بە ناوی زیك؛ بەڵام خەڵکەکەی وەك چەگەنیەکان بە تورکی قسە دەکەن. بەڕێز ڕەشید یاسمی نووسیویەتی: یەکێ لە ٧ بنەماڵەی مێژووی سەردەمی ئەشکانیەکان و ساسانیەکان زیك بووە و لە کتێبی «ئەسمانی یووستی»دا ناوی گشت پیاوەکانی عەشیرەتی زیك هاتووە. هەروەها سەبارەت بە گەنجعەلی زیك نووسراوە کە وێنەی ئەم پیاوە لە کۆشکی چل ستوونی ئێسفەهاندا هەیە.

بە پێی ئەمانەی کە گوترا، کوردە زیکەکان لە هێند و ئەفغانستان و خوراسان و یەزد و کرمان و... دا دەبینرێن. جگە لە زیکەکانی چەگەنی کە بە کوردی و تورکی قسە دەکەن، بەشەکانیتریان زمان و کولتووری خۆیانیان لە بیر چۆتەوە وەك چلۆن زۆربەی عەشیرەتە کوردەکان تووشی ئەم دەردە بوون.

جگە لە شەڕەکان لە مێژوودا کە ئەژماری کوردەکانی کەم کردۆتەوە تێکەڵ بوونیان لەگەڵ قەومەکانیتری داروسێدا وەکو فارس و تورك و عەرەب و پەشتوو و هێندی کاریگەری زۆری بووە لەمەڕ کەم بوونەوەیان و زمان و کولتووری کوردی لە زۆر شوێندا کەوتووەتە مەترسیەوە. هیوادارم کوردەکان بۆ پاراستنی زمانی نەتەوایەتی خۆیان هەوڵ و تەقالا بدەن و ئاوڕ لە زمانی بێگانە نەدەنەوە.

## کوردەکانی خوراسان لە شەرەفنامەدا

سەرنج بۆ کتێبی پڕنرخ و بەکەڵکی شەرەفنامە ڕابکێشین و بزانین سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان چی نووسیوە. جا لێرەدا لەبەر ئەوەی شایەت زۆر کەس بۆیان نەلوێت

شەرەفنامە بخوێنەوە، منیش بە چاکم زانی ئاوڕێك لە شەرەفنامە بدەمەوە و بزانم سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان چی نووسیوە.

ئەمیر شەرفەدین کە خۆی یەکێ لە پیاوەگەورە کوردەکانی سەردەمی شاعەبباسی سەفەوی بوو، بە هەموو کۆسپ و تەنگیەکانی کورد شارەزا بووە و هەروەها عەشیرەتە کوردەکانی بە جوانی ناسیوە و لەم بارەوە ئاوەهای فەرمووە: کوردەکان ژیانیان پڕ لە هەوراز و لێژییە و دەبێ بڵێم کورد عەشیرەتێکی قانعە و زۆربەی ئەم خەڵکە نانیان لە گاوڕەس دابین دەکەن و بۆ وەدەست هێنانی نانی گەندم سەری کۆڕنش بۆ فەرمانڕەواکان دانانەوێنن.

هەروەها سەبارەت بە ناوچەی کوردستان نووسیویە کوردەکانی کوردستان کە برتیین لە: کوردەکانی شەبانکار، شاپووری فارس (بەختیاری) لوڕستان.

لە شیعرێکی کوردیدا ئاوەها باسی کردووە:

کوردە دەزانی لە کۆ ساکنە خزمان تۆ

گۆ گرە بۆ تۆ بڵێم مەسکەن قەومان تۆ

کێوی توڕۆس و عومقی حەوزە ئەسکەندەروون

غەربیە تا بەحری ڕەش سەرحەد مەیدان تۆ

بەحری ڕەش و ئەردەهان ئاوی ئاراسە بزان

حەد شومالە ئەمە کۆ چۆبی جەولان تۆ

ئەڵوەند و کول ئوروومیە تا سەری ئاوی ئاراس

سەرحەدی ڕۆژهەڵاتە جۆگە و کەیوان تۆ

ئەهواز و کێوی حەمرین و ژنکاروودی نووسەیبین

بۆ جنووب، ڕەوزەیی ڕزوان تۆ

داخلێ ئەم حدوودە دوازدە وڵایەت هەیە

دەڵێن دوازدە ملیۆنە نفووس کوردان تۆ

خاجی درۆیە ئەسڵەن نفووسیان نەنووسرا

دەکاتە بیست ملیۆن نەنووسرێ قەومان تۆ

سەبارەت بە دابەشبوونی عەشیرەتە کوردەکان دەنووسێ: عەشیرەتە کوردەکان چوار بەشن و زمان و فەرهەنگیان جیاوازە کە بریتین لە کرمانج، لوڕ، کەلهوڕ و گۆران.

کوردستانی گەورە لە بنەڕەتدا لە تەنیشتی زەریای هورمز کە پاڵی داوەتە زەریای هێندەوە و بە هێڵێکی ڕاستەوخۆ دێت تاکو دەگات بە ناوچەی مەلاتیە. شارێك لە خەربووتی کوردستانی ڕۆژهەڵات و مەرعەشدا (باکووری حەڵەب) و ناوچەکانی فارس و عێراقی عەجەم و ئازەربایجان و ئەرمەنی بچووك و ئەرمەنی گەورە و ئەرمەنستان دەگرێتەوە و لە باشوورەوە دەگات بە عێراقی عەرەب و مووسڵ و دیاربەکر.

ئەم عەشیرەتە زۆر پەرژ و بڵاون و لە ڕۆژهەڵاتەوە تا دوایین شوێنی ڕۆژئاوا دەبینرێن و زۆربەیان ئاوا لێهاتوو و دادەوەر و دلێرن.

وەك چلۆن دەڵێ «من تفكر فی العواقب لم یشجع» لە زۆربەی بادنیاییەکاندا بەبێ ئەوەی لە داهاتوو بیر کەنەوە، کاریان کردووە.

شەرەفخان پاشان سەبارەت بە کورد دەڵێت: وشەی کورد لە ئازایەتی و تواناییەوە گیراوە لەبەر ئەوەی بە درێژی مێژوو ئەگەر بۆ پیاوی ئازا و دلێر بڕوانین هەمووی هەر پاڵەوانە کوردەکانن کە ئەدرەوشنەوە وەك ڕۆستەمی زاڵ کە لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی کەیقوباددا ژیاوە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی لە سیستاندا هاتۆتە دنیاوە نازناوی بە «ڕۆستەمی زابولی» دەرکردووە، هەروەها فیردەوسی دەڵێت: ڕۆستەم کورد لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی بەهرامی چووبیندا لە تورکستان و خوراساندا ژیاوە کە پاشاکانی کرت و غوور (ئەفغانستانی ئەمرۆژی) دەگەڕێنەوە سەر ئەم کەڵە پیاوە (بەهرام هەر کوردە). هەروەها گورگین میلاد کە لە ئازایەتیدا زۆر بەناوبانگ بووە و بنەماڵەکەی لە دوای مردنی خۆی دەسەڵاتی «لار»یان بە دەستەوە گرتووە کەچی ئەویش هەر کورد بووە.

ماسی زەریای مەحەببەت و پڵنگی کوێستانی چەوساوەیی (فەرهاد) کە لە سەردەمی خەسرەوپەرویزدا ژیاوە لە عەشیرەتە کوردە کەلهوڕیەکانە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی عەشیرەتی کورد یەکیەتی خۆیانیان نەپاراستووە و لە نێو ئەم نەتەوەدا ئاغەبەگ و ژێردەستە و فەرمانفەر

بیّمانا بوو، قەت زۆریان قەبووڵ نەکردووە. لە ڕووی ڕەحم و بەزەیی خوداوە ئەم عەشیرەتە منداڵی زۆریان بووە و ئەگەر شەڕی ناوەخۆ لە نێوانیاندا ڕووی نەدایات جەماوەری کورد ئەوەندە زۆر دەبووەوە کە متمانەت ببێ ئێران تووشی نەداری دەبوا.

بەتلیسی باسی ئەیالەتە کوردەکانی ئاوەها داناوە: ١- باسی فەرمانڕەواکانی دیاربەکر و جزیرە ٢- باسی فەرمانڕەواکانی دینەوەر و شارەزوور (حەسنەوییە) ٣- باسی فەرمانڕەواکانی فەزلەوییە (لوڕ) ٤- باسی ناوچە لوڕی بچووك ٥- باسی فەرمانڕەوا و حاکمەکانی میسر و شام کە پێیان دەگوترێ «ئال ئەیووب».

باوەگەورەی پاشاکانی میسر «شادی کوڕی مەروانە» کە لە ڕەگەزی کوردەکانی ڕەوەندی دوێنێی ئازەربایجانە کە ئێستا ڕووخاوە و لە گوندێکیتر بە ناوی «کڕنی چغرسەعد»دا دەژین لە سەردەمی سوڵتان مەسعوود سەلجووقیدا یەکێ لە خێڵی مەسعوود بە ناوی شادی، «راکتواڵ قەڵای تەکریتی» بنیات نا، لەبەر ئەوەی شادی لەوێدا لە دنیا دەرچوو نەجمەددین ئەیووبی کوڕی بوو بە جێگری. نەجمەددین ئەیووب ڕۆژی هاوڕێی براکەی خۆی بە ناوی ئەسەدەدین شێرکۆ دەکەونە ڕێ، لە ناکاو ژنێك لە حاڵێکدا کە دەگرییێت پێیان دەگات و دەڵێت پیاوێك ئازاری داوم کەچی ئەسەدەدین ئەو کابرایە پەیدا دەکات و بە شەللاخ لێی ئەدات و دەیکوژێ و کاتێ نەجمەددین ئەیووب کابرا بە مردوویی دەبینێ، وا بە چاك دەزانێ کە بەسەرهاتەکە بگەڕێنێتەوە بۆ سوڵتان مەسعوود. کاتێ سوڵتان مەسعوود بەم بەسەرهاتە دەزانێ دەڵێ ئەمن و ئەو کابرایەی کە کوژراوە نێوانمان زۆر خۆش بوو ئەگەر ئێوە ببینم متمانەم بە خۆم نییە، خوێنتان ئەڕژێنم. جا لەبەر ئەوەی کە نەوەك خوێنتان بڕژێ تکاتان لێ دەکەم لەم وڵاتە بڕۆنە دەرەوە، کەچی ئەم دوو برایە دەشتی خودا دەگرنە بەر و دەچنە مووسڵ و نەجمەددین ئەیووب دەبێ بە سەرۆکی شاری بەعلەبەك و خەڵکی ئەو ناوچەیە زۆر لە دادوەری نەجمەددین خۆشیان دێت و زۆریان خۆش ئەوێت.

دوای ماوەیێك سەلاحەددین یووسف ئەیووبی کوڕی نەجمەددین دەبێ بە وەزیری میسر و پاشان ساڵی ٥٦٧ی کۆچی مانگی دەبێ بە پاشای میسر و دەسەڵاتی سەرانسەری شام و میسر و لوبنان و فلستین و عەرەبستان و یەمەن و لیبی و بەشێکی زۆری ئافریقا

هەتا ئانتاکیەی ڕۆم لە دەست دەگرێ.

سەلاحەددین سەرۆکی بەناوبانگترین ئیمپراتووری ئیسلامی لە سەدەی شەشەمی کۆچی مانگیدا بووە. لە ڕاستیدا قارەمانی شەڕە سەلیبیەکانە کە ئەو سەرکەوتنە گەورەترین و مێژووییترین سەرکەوتنی جیهانی ئیسلامە و نازناوی «سەلاحەدین سەیفولئیسلامی» لەم ڕۆژەوە پێی درا و پاشان توانی زنجیرەی ئالی ئەیووب لە میسردا دابمەزرێنێ کە ساڵهای ساڵ بنەماڵەکەی توانیان لەوێ حکوومەت بکەن.

دەوری سەلاحەدین لە گرتنەوەی بەیتولموقەددەسدا زۆر لە بەرچاو و دیارە ئەم کەڵەکوردە توانی دوایی بهێنێت بە دەسەڵاتی چەند سەدەیی مەسێحیەکان کەچی لەم چەند ساڵەی ڕابوردووەدا کە دەسەڵاتی بەیتولموقەددەس کەوتۆتە دەستی یەهوودیەکان، سەرانسەری موسڵمانەکانی دنیا توانای بەربەرەکانێیان نییە. فلستینیەکان ساڵەهای ساڵە دەربەدەر و ئاوارەن و کەچی لە خوایانە پیاوێکی‌تر وەك سەلاحەددین ئەیووبی وەرگەڕێتەوە و ڕزگاریان بکات.

بەڵام بە واتای حەبیب یەغمایی ئێمەی موسڵمان بە ئایینی خۆمان بووینە کافر و ئەم سەرشۆڕیەش بە باڵاماندا بڕاوە.

بەتلیسی ناوی ئەو فەرمانڕەوا و سەرۆکە کوردانەی کە بە شێوەیێکی ڕەسمی فەرمانڕەواییان نەکردووە ئاوەها هێناوە:

١- فەرمانڕەواکانی ئەردەڵان

٢- فەمانڕەواکانی حەکاری (شنبۆ)

٣- فەرمانڕەواکانی عەمادوویە (بەهادینان) کە بە سەر کوردەکانی مزووری، زێباریدا حکوومەتیان دەکرد. یەکێ لە گرنگترین ناوچەکانی عێمادییە، زاخۆیە و دوو عەشیرەتیش لەوێدا هەن یانێ سەندی و سلێمانی. خەڵك بە زاخۆ دەڵێن ناوچەی سەندیان کە زۆربەی پیاوگەورە و بەناوبانگەکانی کوردستان لەوێوە هەستاون و خەڵکی ئەم ناوچانە لە ژێر فەرمانی عێمادییەدا نەبوون، ئێستا یووسفبەیگ ناوێك کە لە بنەماڵەی حاکمەکانی زاخۆیە هەر ماوە و لە خزمەتی حاکمەکانی جەزیرە و ئامێد و دیاربەکر دایە.

٤- سەبارەت بە فەرمانڕەواکانی جەزیرە کە خۆی دەبێ بە سێ بەشەوە:

١) جەزیرە (دیاربەکر و ئامێد)

٢) ئەمیـرانی کوورکیل

٣) ئەمیـرانی فنیك، کە ئەمانیش خۆیان دەبن بە ٤ عەشیـرەتەوە:

١) بـجنووی ٢) شوقاقی ٣) میـران ٤) گوینە.

٥- سـەبارەت بـە ئەمیـــر و حاکمـەکانی حەسـنیکفا (مەلـەکان) کـە خۆیـان سـێزدە عەشیـرەتی جیاوازن:

١) ئاشتی ٢) مەحلەبی ٣) مێهرانی ٤) بـجنووی ٥) شوقاقی ٦) ئوستۆرکی ٧) کوردلی کەبیـر ٨) کوردلی سەغیـر ٩) ڕەشان ١٠) کیشکی ١١) جلکی ١٢) خەندەقی ١٣) سووهانی ١٤) بیدیان.

ناوچە بەناوبانگـەکانی حەسـنیکفا شارۆچـکەی ئەسـعەرد و ناوچـەی بەشیـــری و تـوورو دیگەرنەرزەنە و لە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانی حەزۆ دان و دەڵێن جـەماوەرێکی ١٢ هـەزار کەسیـن...

بەتلیـسی سـەبارەت بـە ئـەو فـەرمانڕەوا کوردانـەی کـە داوای پاشـایەتیان نـەکردووە دەنووسێت:

ئەم دەستەیە دەبن بە نۆ بەشەوە:

١- فەرمانڕەواکانی عەشیـرەتی چەمەشگەزك کە خـۆی دابـەش دەبێ بـە سـێ بەشـەوە (کوردەکانی ئێستای خوراسان) کە بریتیـن لە:

فەرمانڕەواکانی مەجنگەرد (ناوچەییێك لە نێوان ئەرزڕۆم و قارسدا)

فەرمانڕەواکانی پەرتەك (لە ناوچەییێك دان لە تەنشتی بەشی باکووری چۆمی فوراتەوە کە ١٢ کیلۆمەتر لە خەرپووت دوورە.

## فەرمانڕەواکانی سەقمان

... سی‌ودوو قەڵا و هەروەها شازدە ناوچە بە دەستی چەمەشگەزکیەکانەوەیە... و زۆربەی خەڵکی ئەم عەشیرەتە خەریکی کاری ئاژەڵدارین و پیاوی هەرەگەورەیان زۆرە و تا نزیکی هەزار بنەماڵەیان وان لە خزمەتی پاشاکاندا و لە لایەن ئەوانەوە سەرۆکایەتی بڕێك ناوچەیان پێ سپێردراوە. ئەو ناوچانەی لە کوردستان کە بە دەستی ئەم عەشیرەتە کوردەوەیە ئەوەندە بەرپان و زۆرە کە کاتێ ناوی کوردستان دێت، بێگانەکان وا ئەزانن کوردستان هەر ناوچەی چەمەشگەزکیەکانە، دەبێ ئەمەش بلێین مەلکیش کە یەکێ لە پاشاکانی سەلجووقی بوو، سی‌ودوو قەڵا و شازدە ناوچەی داوەتە دەستی ئەم عەشیرەتەوە و بووەتەوە موڵکیان و کەچی جێگرەکانیشی دوای خۆی هەر زۆر ڕێزیان بۆ ئەم عەشیرەتە داناوە و تەنانەت ئەم عەشیرەتە لە سەردەمی دەسەڵات چەنگیزخان و تەیموورلەنگ و شاڕۆخ میرزا قەرایووسفیشدا هەر جێگای ڕێز و حورمەت بوون؛ بەڵام کاتێ کە حەسەنبەیگ بایندەوری بوو بە پاشای ئێران و پەیمانی یەکیەتی لەگەڵ قەراقوویووونلووەکاندا بەست، ئەم عەشیرەتە کوردە کەوتنە بەر شاڵاوی ڕق و کینەی پاشای ئێرانەوە و بۆ ئەم مەبەستەش پاشای ئەو کاتەی ئێران فەرمانی دا بە عەشیرەتی خەربەندەلوو کە پاشماوەی ئاققوویونلووەکان بوون تاکو بڕۆن و ناوچە و وڵاتی کوردە چەمەشگەزکیەکان داگیر بکەن کەچی خێڵی ئاق قوویوونلووەکانیش بە فەرمانی پاشایان کرد و وڵاتی کوردانیان بە زۆر لە دەستی ئەوان دەرهانی کە سەرۆکی ئەو کاتەی کوردەکان ئەمیر شێخ حەسەن بوو.

ئەمیر شێخ حەسەن لاوێکی ئازا و دلێر بوو و زۆریش پیاوێکی پیاوانە و دەستێکی بدەیشی بووە و کاتێ کە تەمەنی دەگاتە سەردەمی لاوەتی، کاری دەبێتە شەڕ و بەربەرەکانێ دژ بە دوژمنانی و بۆ ئەم مەبەستەش تاقمێك لە کوڕە دلێرە کوردەکانی کۆ دایەوە دەوری خۆی و لە ژێر ئاڵای کوردستاندا دژ بە عەشیرەتی خەربەندەلوو شەڕی کردووە و لە ئاکامدا توانی ئەو عەشیرەتە زاڵمە لە نێو خاکی کوردستان بکاتە دەرەوە و بەم شێوەیە دەسەڵاتی خۆی درێژە

پێ دایەوە و بەڵام دوای مردنی ئەمیر شێخ حەسەن، سوهراببەیگ بوو بە جێگری بابی و بۆ ماوەیێکی زۆر حکوومەتی کرد و دوای مردنی ئەویش کوڕە گەورەکەی واتا حاجی ڕۆستەم بەیگ بوو بە فرەمانڕەوا و هاوکات شائیسماعیل سەفەوی بوو بە پاشای ئێران و نوورعەلی خەڵیفەی نارد تاکو وڵاتی عەشیرەتی چەمەشگەزك داگیر بکات. حاجی ڕۆستەم بەیگ بە بێ‌شەڕوپێکدادان تەواوی ناوچەکەی داوە بە دەستی دەسەڵاتی ئەو کاتەی ئێران واتە سەفەویەکان و خۆیشی هاوکات هاتە دەرباری ئەوان و لە لایەن پاشاوە ڕێزی زۆری بۆ دانرا و بەشێکی زۆری لە وڵاتی عێراقدا بە عەشیرەتەکەی خۆی، بەڵام نوورعەلی خەڵیفە ناپیاوی زۆری لە خۆیەوە نواند و زۆربەی زۆری لەو کوردانە کوشت و ئەم کارەی بوو بە هۆی ناڕەزایەتی عەشیرەتی چەمەشگەزك و بۆیە زۆربەی زۆریان چەکیان دژ بە نوورعەلی کرد بە شانا. هەواڵی ئەم بەسەرهاتەشیان نارد بۆ حاجی ڕۆستەم کە لە عێراق و ئێسفەهاندا بوو، هاوکات شائیسماعیل سەفەوی بە مەبەستی شەڕی دژ بە سولڵتان سەلیمی عوسمانی بە سوپاییکی عێراقی و فارسی و ئازەربایجانیەوە ڕووی کردە چاڵدوڕان. حاجی ڕۆستەم بەیگ لەم شەڕەدا هاوڕێیی پاشای کردووە. دوای شکستی شائیسماعیل لەم شەڕەدا سولڵتان سەلیم دەیەویست تەبریز داگیر بکات و لە کاتێکدا کە بە ڕێوە بوو و ئاهەنگی تەبرێزی کردبوو، حاجی ڕۆستەم لە یامدا کە سەر بە ناوچەی مەرەندە، گەیشتە خزمەتی و داوای لێ کرد تاکو لێی خۆش ببێت؛ بەڵام سولڵتان سەلیم، حاجی ڕۆستەم و کوڕەزاگێکی و چل نەفەر لە هاوڕێیەکانی کوشت. دوای ئەم کارەساتە پیرحسەین‌بەیگی کوڕی حاجی ڕۆستەم بە بێ‌ئەوەی لە سولڵتان سەلیم ترسابێ، هاتە خزمەتی. سولڵتان سەلیمیش بە بۆنەی ئازایی و نەترسی ئەم کوڕەوە، خێرا کردی بە سەرۆکی عەشیرەتی چەمەشگەزك. پیر حسەین‌بەیگ خێرا لە ئاماسیەوە چووە مەیدانی نوورعەلی خەڵیفەی نوێنەری پاشای سەفەویەوە و ئەو کابرایەی شکست دا و سەری نوورعەلیشی لە لەشی جیا کردەوە. لەم پیرحسەین‌بەیگە ١٦ کوڕ بەجێما کە بریتی بوون لە: خالێدبەیگ، موحەممەدی‌بەیگ، ڕۆستەم‌بەیگ، یووسفبەیگ، پیلیتن بەیگ، کەیقوبادبەیگ، بەهلوولبەیگ، موحسێن‌بەیگ، یەعقووببەیگ، فەرۆخشادبەیگ،

عەلیبەیگ، کلابیبەیگ، کەیخۆسرەوبەیگ، کەیکاووس بەیگ، پەرویزبەیگ و پایانبەیگ.

دوابەدوای مردنی پیرحسەینبەیگ چەمەشگەزك لەبەر ئەوەی کوڕەکانی یەکیەتی خۆیانیان نەپاراست، ناوچەکەیان دابەش بوو لە نێوانیاندا و بوو بە چەند ناوچەوە (سنجاق)[٧٩].

کەچی بە پێی یاسای سنجاقەوە ناوچەی مەجنگەرد درا بە موحەممەدی بەیگی کوڕە گەورەی پیرحسەینبەیگ کە لە لایەن پاشای عوسمانیەوە کرا بە سەرۆکی ئەم ناوچەیە و هەروەها ڕۆستەمبەیگ بوو بە سەرۆکی پەرتەك و کەیخۆسرەوبەیگ بوو بە حاکمی سەقمان. (١٠٠٥ی کۆچی مانگی)

٢- ئەو سەرۆکە کوردانەی کە داوای پاشایەتیان نەکردووە. سەرۆکە مەرداسییەکان: ئەم عەشیرەتە لەبەر ئەوەی لە قەڵاییێکدا بە ناوی مەرداس ژیاون، ئەم ناوەیان پێ دراوە و خۆیان دەبنە سێ تەوەرەوە:

**سەرۆکەکانی ئەکیل (بەلدووقانی)** کە ئەم ناوە واتا «بەلدووقانی» ناوی یەکێ لە سەرکردەکانیانە.

**سەرۆکەکانی پالۆ** کە کوردەکانی پالووکانلووی خوراسان هەر لەم کوردانەن. ئەم عەشیرەتە لە کوردستانی عێراقدا لە ٩٥ کیلۆمەتری دیاربەکرەوە یانێ لە تەنیشتی فورات دان. لە بەناوبانگترین سەرۆکەکانیان ئەتوانین جەمشیدبەیگ ناو ببەین. ئەم پیاوە هەموو ساڵێك سێ هەزار سەر بزنی سێ ساڵانی گل داوەتەوە بۆ خۆی و خەریکی کڕین و فرۆشی ئەو بزنانە بووە و هەروەها لە کاتی فرۆشتنی ئەم بزنانەدا ٣ هەزار نالّی ئەسپیشی بەستۆتە ملی ئەم بزنانەوە و ئەوانەشی لە حەلەبدا فرۆشتووە و هەموو کاتێ دە هەزار سەرپەزی بەخێو کردووە و کشتوکاڵی باشیشی هەبووە و هاوکات لە کوردستاندا هیچ سەرۆکێك وەك ئەو

---

٧٩- سنجەق گوندێکە لە سنووری قووشخانەی باکووری شیروان کە یادگارێکە لەم سنجەقانە. کوردەکانی ئەوێ بە زمانی تورکی قسان دەکەن، خەڵکێکی تێکۆشەرن، من «نووسەر» ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی بووم بە میوانی ئەم کوردانە و بۆم دەرکەوت ئەم کوردە تورك زمانە جلوبەرگ کوردیانە چەندێ میواننەوازن، بەڵام نازانم بۆچی تورکی قسان دەکەن.

دەوڵەمەند نەبووە. ناوبراو لە پالۆدا قەڵا و قوتابخانەی دروست کردبوو و ئاوی خواردنیشی لە چاوکەیێکی نزیکی پالۆوە هێنابووە نێو شارەوە بۆ خواردنەوەی خەڵکەکەی. ئەم زاتە ٦٠ ساڵ حکوومەتی کرد و لە تەمەنی ١٠٠ ساڵاندا لە دنیا دەرچوو.

**٣- ئەمیرانی چەرمووک (چەرمیک):** چەرمیک ناوچەیێکی کەسکایی و جوانە کە لە کوردستانی تورکیە و لە ٥٠ کیلۆمەتری باکووری دیاربەکرەوەیە.

سەبارەت بە ئەمیرەکانی ساسوون حەزو ئەم ئەمیرانە لە بنەماڵەی پاشاکانی ئەکحاسیرەن ساسانی و هەروەها بنەئامۆزای فەرمانڕەواکانی بەدلیسن.

**٤- کوردە ساسوونیەکان**[٨٠]: لە ڕەگەزی عەشیرەتی گەورەی ڕۆژکین و هەروەها کە بەدلیسی ئەڵێت سەرۆکایەتی ناوچەی سیوورکیان بە دەستەوە بووە. سیوورک ناوچەیێکی کوردنشینە کە لە نێوان دیاربەکر و ئۆرفە دایە و باخی تریێ زۆر لەو ناوچەدا دەبینرێ و لە سەردەمی سوڵتان سلێمانخانی ئیمپراتووری عوسمانی (سلێمان قانوونی) ناوچەکانی حەزووی ساسوون و سیوورك هەر لە ژێر دەسەڵاتی ئەو سەرۆکە کوردانەدا بووە.

**٥- حاکمەکانی خیزان:** سەبارەت بە ناوی «خیزان» گوتراوە کە ئەم کوردانە بەیانیان زوو هەستاون و نوێژی بەیانیان نەفەوتاوە و لە کوردستاندا بە پیاو چاك و ژیر ناسراون و چون بەیانیان زوو هەستاون ئەم ناوەیان پێیانەوە ناوە.

کەچی بیروڕایەکیتریشی لەم بارەوە هەیە و ئەویش ئەوەیە کە «خێزان» بە مانای «منداڵانە» چون کاتێ کە «بانیقەڵا» لە حەج گەڕاوەتەوە و کوردەکان ئیزنیان نەداوە بێتە نێو قەڵاکەیانەوە و ئەویش بۆ ئەوەی بچووکیان بکاتەوە پێیانی گوتووە «خێزان» و کەچی ئەم ناوەیان هەر لەسەر مایەوە.

«خیزان» ناوچەیێکی کوێستانیە و پڕە لە دارودرەخت و لە نزیکی دیاربەکرەوەیە و سێ سەرۆك و سەرکردەی هەبووە بە ناوانی: ئەمیرانی خیزان، ئەمیرانی مەکس -کە لە ١٠٠

---

٨٠- کوردەکانی «ساسوون» لە وڵاتی مووشدا ناوچەیەکەی خۆشیان بە دەستەوەیە.

کیلۆمەتری وانەوەن، ئەمیرانی ئەسبایرد.

**٦- حاکمەکانی کلیس:** ئەم خێڵە دەڵێن لە ڕەگەزی حەزرەتی عەبباسن؛ یەکێ بەناوبانگترین حاکمەکانیان «قاسمبەیگ»ە. وادیارە کوردەکانی قاسمانلوویی خوراسان لەم کوردانەن. لەبەر ئەوەی قاسمبەیگ بە دەستی سوڵتان سەلیمخانی ئیمپراتووری عوسمانی بە شێوەیێکی ناپیاوانە کوژراوە و بۆیە عەشیرەتەکە هەر بە ناوی خۆیەوە ماونەتەوە.

کوردەکانی کلیس ناوبانگیان بە ئەوە دەرکردووە کە دژی دەسەڵاتی عوسمانی وەستاون و هەروەها ئەم کوردانە بوون کە کاتێ سوڵتان سەلیمخان ویستوویەتی ئێران داگیر بکات، لە تاریکی شەودا ڕۆیشتوون و شمشێرەکەیان دزیوە کە هەموان لەم کارە سەریان سوڕماوە.

**٧- ئەمیرەکانی شیروان:** ئەو سەرۆك و سەرکردانەی شیروان یەك حکوومەت و دوو دەسەڵاتیان دروست کردووە و لە سەردەمی ئەمیرشا موحەممەدی کوڕی ئەمیرئەبداڵدا هەموویان لە ژێر فەرمانی شائیسماعیلی سەفەویدا بوون و کەچی شائیسماعیلیش جگە لە شاموحەممەد و عەلیبەیگ ساسوونی هەموو کوردەکانی ئەم عەشیرەتەی خستە بەندیخانەوە.

کوردەکانی شیروان و ئەخلات لە سەردەمی شاتەهماسبدا دەستیان دا بە شۆڕشەوە کە بوو بە هۆی پەلاماردانیانەوە لە لایەن پاشای سەفەویەوە. دو سەرکردەی شیروان بریتین لە «کڕنی» و «ئیروان».[٨١]

**٨- ئەمیرەکانی زەرقی:** زەرق قەڵایێکە کە لە ناوچەی ئەسعەرد دایە؛ سەرۆکەکانی ئەم عەشیرەتە ٤ دەستەن: «**دەرزین**» دەرزین قەڵایێکە لە کوردستانی تورکیەدا. حاکمەکانی دەرزین دوای شەڕی چاڵدوڕان چوونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانیەوە. «**کوردەکان**»:

---

٨١- بەردی قەبرێك کە درێژتر لە یەك مەترە و چوار دەوری بە خەتی نەستەعلیق نووسراوە و دەڵێن تایبەتە بە بەردی قەبری یەکێ لە پیاوە گەورەکانی قاسمانلوو. ئەم بەردە لە قەبرسانی «لوقـ[illegible] سەرەخس» دایە و وا دەردەکەوێ ئەم پیاوە لەوێ نێژراوە.

ئەمانەش دوای شەڕی چالدوڕان خۆیانیان دا بە دەستی سولتان سەلیمی عوسمانیەوە. **عەتاق:** ئاتاق لە ناوچەکانی دیاربەکرە؛ ساڵی ٩١٣ی کۆچی مانگی کاتێ کە شائیسماعیل زاڵ بوو بە سەر دیاربەکردا، دەسەڵاتی ئاتاقی لە کوردەکان وەرگرتەوە و دای بە قاجاڕەکان و ئەم کارە بوو بە هۆی پەرەسەندنی ڕق و کینەی کوردەکانەوە و لە دڵیاندا هەر مایەوە و ئەم ڕق و کینەیە دوای شکستی سەفەوییەکان لە شەڕی چالدوڕاندا خۆی نواند و کوردەکان لەم کاتەدا بە قاجاڕەکانیان گوت: دەبێ ئاتاق چۆڵ بکەن؛ بەڵام ئەوان ئاوڕیان لەم داخوازەیە نەدایەوە و کوردەکانیش شەوانە لە دیواری قەڵاکە سەرکەوتن و هەموو قاجاڕەکانیان کوشت و ئاتاقیان گرتەوە دەست و چوونە ژێر دەسەڵاتی سولتان سەلیمەوە.

**ئەمیرەکانی تەرجیل:** تەرجیل دوو قەڵا دەگرێتە بەر کە لە نزدیکی ئامێدەوەیە و ئەو دوو قەڵایە یەکیان تەرجیلە و ئەوی‌تریان دارعینە و ئەم کوردانە بە ١١ پشت دەگەنەوە ئیمام باقر(٤). کوردستان پەنای بنەماڵەی حەزرەت عەلی بووە و زۆربەی عەشیرەتە کوردەکان لە خێڵی حەزرەت عەلییان کردۆتە سەرۆکی عەشیرەتەکەی خۆیان و زۆر ڕێزیان بۆیان داناوە.

٩- **ئەمیرەکانی سوێدی:** ئەم کوردانە دەگەنەوە بەرمەکیەکان؛ کاتێ کە بەرمەکیەکان شکستیان خواردووە، تاقمێك لە پاشازادەکان بە بۆنەی ئەوەی دیلی دەستی هاروونەڕەشید نەبن، هاتوونەتە کوردستان و پەنایان هێناوەتە کوردەکان و ئەوانیش ڕێزی زۆریان بۆیان داناوە.

تاقمێك لە کوردە سوێدیەکان وان لە خوراساندا و لە گوندێك بە ناوی سویدانلوودا ژیان دەبەنە سەر. «سیولدی» لە بنەڕەتدا «سویدی» و «سیودی» بووە.

ناسرەدین‌شای قاجاڕ کاتێك کە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی لە ڕێگەی بجنووردەوە ڕۆیشتووە بۆ مەشهەد لە گوندی ڕەزمەقانەوە (ڕەزمەکان مەکان زەڕ، جێگای تری) تێپەڕیوە ناوی عەشیرەتی «سویدانلوو»ی هێناوە و دەڵێت بەهەر شێوەیێك بوو گەیشتینە ڕەزمەقان کە وەقفی بارەگای ئیمام ڕەزایە. عەشیرەتی سویدانلوو و زەعفەرانلوو لەم دێیەدا ڕەشماڵیان هەڵداوە. هەروەها کاتێ دەگاتە گوندی تەناسووان، دەڵێت: تاقمێك لە عەشیرەتی سویدانلوو لە

نزدیکی ئەم دێیەوە ڕەشماڵیان هەڵداوە و هەموویان مەڕومالێکی زۆریان هەیە و هێشتا سەعاتونیوێکی مابوو هەوا تاریك بکات، گەیشتینە شیروان.[٨٢]

٩- فەرمانڕەواکانی سلێمانی کە دەبنە دوو بەشەوە:

١- فەرمانڕەواکانی قولب: قولب لە ناوچەکانی بەدلیسە

٢- فەرمانڕەواکانی میافارقین: میافارقین قەڵاییێکە کە لە ٧٠ کیلۆمەتری باکووری ڕۆژهەڵاتی دیاربەکرەوەیە، فەرمانڕواکانی میافارقین لەو فەرمانڕەوا کوردانەن کە داوای پاشایەتیان نەکردووە و خۆیان دەبنە دوازدە بەشەوە:

١) فەرمانڕوەواکانی سەهران

٢) فەرمانڕەواکانی بابان، فەرمانڕەواکانی بابان ئاژەڵی زۆریان هەبووە

٣) فەرمانڕەواکانی موکری، ئەم کوردانە ئاوڕیان لە شائیسماعیل نەدایەوە و دژ بە ئەو وەستان و شەڕیان کرد و بوون بە هەڤاڵی سولتان سەلیم عوسمانی جارێکیتر لە سەردەمی شاتەهماسبدا ئەم کوردانە بوون بە هەڤاڵی دەوڵەتی سەفەوی و هەروەها کاتێ کە لە سەردەمی سولتان محەممەددا دەوڵەتی سەفەوی ئەو هەیبەت و هێزە پێشوەی نەمابوو بۆ جاری دووەم فەرمانڕەوا موکریەکان هاوڕێ لەگەڵ خەڵکی کوردستان و لوڕستان و ئەردەڵاندا لە ڕێکەوتی ٩٩١ی کۆچی مانگیدا پشتیان لە سەفەوییەکان هەڵکرد و ڕوویان کردووە عوسمانیەکان کە سەردەمی دەسەڵاتی مورادخان بوو و هاوکات ١٠٠٠سەر ئەسپی شاتەهماسبیان لە ناوچەی قەراجیقدا تاڵان کرد.

٤) فەرمانڕەواکانی برادۆست: فەرمانڕەواکانی برادۆست لە عەشیرەتی گۆران بوون کە لە سەرەتادا فەرمانفەرمای شائیسماعیل بوون و لە سەردەمی سولتان موحەممەددا ئەمانیش چوونە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان. ٥) فەرمانڕەواکانی مەحموودی: ناوەندی فەرمانڕەوایی ئەم عەشیرەتە «سەرایی» بوو کە لە ٩٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی زەریای وانەوەیە. ٦) فەرمانڕەواکانی دەنبەڵی: ئەم عەشیرەتە لە سەردەمی شاتەهماسبدا دەسەڵاتی خوویان بە

---

٨٢- سەفەرنامەی ناسرەدینشا،ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی.

دەستەوە بوو، لەم سەردەمەدا سەرۆکی ئەم عەشیرەتە حاجی‌بەیگ بوو کە لە لایەن شاتەهماسبەوە نازناوی «سوڵتان»ی پیّ دراوە و ناوی بوو بە «حاجی‌سوڵتان» کە هەر لە ناوچەی وانەوە تا خوویی لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو. دەڵێن ڕۆژێك تاقمێك لە کوردەکانی دەنبەڵی دەچنە خوویی و لە دووکانێکی هەڵوافرۆشیدا تا توانیان هەڵوایان خوارد و کاتیّ کابرای هەڵوافرۆش داوای پارەی حەڵواکەی کرد، هەموویان سەریان سوڕماو گوتیان مەگەر بۆ حەڵواش پارە وەردەگرن. کاتیّ کوردەکان بینیان کابرای حەڵوافرۆش زۆر سوورە لەسەر پارەی حەڵوا کە گوتیان پاشا ئەم شارەی بە حەڵواکەیەوە پێمان بەخشیوە و لەم ڕۆژوە ئەم قسەیە کەوتە نێو کوردەکان کە شاربزیم هەڵوابزیم یانیّ: شاماڵیب ئیمەس، حەڵوا ماڵی ئیمەس. هەروەها دەڵێن کاتیّ کە کوردەکانی دەنبەڵی لە مزگەوتی جامیعەی خووی دا بۆ نوێژی هەینی کۆبوونەوە و کاتیّ کە مامۆستا ناوی ١٢ ئیمامی دەهێنا، گەیشتە ناوی ئیمام جافر سادق کوردەکان تووڕە بوون و گوتیان کە بۆچی لەم نوێژەدا ناوی حاجی‌بەیگ و براکانی نەهێناوە، بەڵام ناوی جافربەیگی برای بچووکی هێناوە، کەچی هەموویان مزگەوتیان بەجیّ هێشت و گوتیان هەتاکو مامۆستا ناوی حاجی‌بەیگ و براکانی پێش جافربەیگ نەهێنیّ و ناوی نەبات، ئێمە نوێژی هەینی ناکەین. ٧) فەرمانڕواکانی زرزا ٨) فەمانڕەاکانی ئوستوونی ٩) فەرمانڕەواکانی تاسنی ١٠) فەرمانڕەواکانی کەلهوڕ: خۆیان دەبنە سیّ بەشەوە: ١- فەرمانڕەواکانی پڵنگان ٢- فەرمانڕەواکانیّ دەرەتەنگ ٣- فەرمانڕەواکانی ماهیدەشت لە دەوروبەری خانەقین و مووسڵ دایە.

فەرمانڕەواکانی کەلهوڕ کە خۆیان لە بنەماڵەی گوودەرز پاڵەوانی بەناوبانگی شانامە دائەنێن و لە سەردەمی کیانیەکاندا ڕۆهامی کوڕی گیوو حکوومەتی بابلی لە ناوچەی دوو ڕووباردا بە دەستەوە بوو و بە فەرمانی بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیار، لە میسر و شام و بەیتولموقەددەسدا ئیسرائیلیەکانیان شکست دا و بڕێك لە مێژوونووسەکان دەڵێن ئەم ڕۆهامە هەر ئەو بەختوننەسرەیە.

کەلهوڕ لە عەشیرەتی گۆرانن.

دەستەی سێیەم: ئەم ئەمیرانە ئەوانەن کە کوردن و داوای پاشایەتیان نەکردووە و دەبنە

چوار بەشەوە: سیامەنسوور، چەگەنی، زەنگەنە و پازووکی. وادیارە ئەم کوردانە لە بنەڕەتدا سێ برا بوون لە ناوچەی لوڕستان و بە واتایێکیتر ئەمانە لە گۆران و ئەردەڵانیەکانن کە بۆ هاوکاری پاشاکانی ئێران زێد و وڵاتی خۆیان بەجێهێشت و زۆریش قازانجیان کرد.

ناوی عەشیرەتەکانیتری کوردی ئێران بەم شێوەیە: لەك، زەند، ڕووزبەهان، متیلج، حەسیری شەهرەزوولی (شەهرەزوور) مەزیار، کلانی، ئەمینلوو، مەملووی، کەج، کەڕانی، زەکتی، گلەگیر، پازووکی، هی[٨٣]، چەمەشگەزك، عەرەبگیرلوو[٨٤] و ئەند، کە پیاوماقووڵ و گەورەی زۆریان تێدا بووە، هەروەها ٢٤ گرووپیتری کورد لە قەراباغی[٨٥] ئێراندا پێیان دەڵێن «ئیگرۆمی دوورت»[٨٦]. لە سەردەمی شاتەهماسبدا، ئەحمەدبەیگ پەرتاڵ ئوغلی لەم ناوچەدا سیهەزار سوارکاری کوردی چەکداری لە ژێر دەسەڵاتدا بوو. عەشیرەتێکیتری کورد لە خوراساندا هەن کە پێیان دەگوترێ «ڕاکێل»[٨٧] کە لە سەردەمی شاتەهماسبدا شەمسەدین بەیك دەبێتە سەرۆکیان.

زۆر عەشیرەتی کوردی نەناسراویش لە ئێراندا هەن کە ناتوانین لێرەدا ناویان ببەین: ١- فەرمانڕەواکانی سیامەنسوور: ساڵی ٩٦٠ی کۆچی مانگی شاتەهماسب، خەلیلبەیگی سیامەنسوری کردۆتە سەرۆکی هەموو کوردەکان و ناوچەکانی سوڵتانیە و زەنجان و ئەبهەر و زەڕینکەمەر و ناوچەکانی نێوان ئازەربایجان و فارسی خستە ژێر دەسەڵاتی خەلیلبەیگ و فەرمانی دا تاکو سیهەزار کوردیان کۆ دایەوە و هەموویانی دابەش کردە ناوچەکانی نێوان

---

٨٣- کوردەکانی هیوەدانلووی خوراسان هەر لەم عەشیرەتەن کە Heya گۆڕاوە بە hewa و پاشگری ANLOی گرتووە و بووەتە HEWanlo و جارێکیتر گۆڕدراوە و بووەتە هیوەدانلوو.

٨٤- کوردەکانی عەرەبگیرلو هاوکات لە کەلات و دەرەگەزدا بوون.

٨٥- موحەممەدخان قەراباغی یەکێ لە ئەفسەرە بەناوبانگەکانی شەڕی چاڵدوڕان بوو و یەکەمین کەسێ بوو کە خۆی گەیاندە تەبریز و هەواڵی هێرشی عوسمانیەکانی هانی.

٨٦- ئیگرۆمی دوورت ناوێکی تورکییە و فارسیەکەی دەبێتە ٢٤ و واتا ٢٤ عەشیرەتی کوردی کە لە ناوچەی قەراباغ و شیروان و ئیرواندا دەژین و ئەمینزەکی ناوی ئەم ٢٤ عەشیرەتەی نووسیوە و جەماوەریشیانی بە ٣٠ هەزار کەس زانیوە. (بڕوانە کتێبی کورد و کوردستان لاپەڕەی ٣٢٩)

٨٧- گیل عەشیرەتێکن کە ئێستا لە دەوروبەری شیرواندا هەن و پێیان دەگوترێ گیلیەکان و لە گوندی «گیلیان»دا ژیان دەکەن.

شەقامی قەزوێن-تەبرێز تاکو هۆشیاری ڕێگا و شەقامەکان بن.

دوای سێ ساڵ کاتێ کە شاتەهماسب لە ئەودەسەلاتەی کە خەلیلبەیگ وەدەستی هێنابوو دەترسا، دەسەلاتی ئەو ناوچانەی لێ وەرگرتەوە و کردی بە دەسەلاتداری تاران و دواییش بوو بە بەرپرسی شەڕی دژ بە مەغوول و ئوزبەکەکان لە خوراساندا، خەلیلبەیگ زۆر بە جوانی توانی لە خوراساندا شەڕ بکات و ناوچەکە ئەهوەن بکاتەوە، دوای مردنی خەلیلبەیگ دەوڵەتیاری کوڕی بە فەرمانی سوڵتان موحەممەدی سەفەوی بوو بە جێگری و نازناوی «خان»ی پێ درا، دوای ماوەیێك بە بۆنەی بارودۆخی شلەژاو و نالەباری پاشاکانی سەفەویەوە، کوردەکانی موکری و کوردستان و... هتد لە حکومەتی ئێران پشتیان هەلکرد و ڕوویان کردە دەسەلاتی عوسمانی.

کاتێ کە تورکەکانی عوسمانی هێرشیان هێنا بۆ ئێران، ناوچە ڕۆژئاواییەکانی ئێران لەوەدا بوو کە داگیر بکرێ، کەچی بەم بۆنەوە سوڵتان موحەممەد، دەوڵەتیارخانی لە خوراسانەوە هێنایەوە و کردی بە فەرمانڕەوای ئازەربایجان. دەوڵەتیارخان لە ناوچەی ئازەربایجاندا پەی بە بێدەسەلاتی سوڵتان موحەممەد برد و زانی کە توانای پاراستنی سەربەخۆیی ئێرانی نییە، بۆیە لە کەرشەبدا قەلاییێکی بنیاتنا و ڕووی لە پاشای ئێران هەڵچەرخاند.

سوڵتان موحەممەد مورشیدی قولیخان شاملووی بە ٦ هەزار سوارەوە نارد بۆ سەرکوت کردنی دەوڵەتیارخان و کەچی سوپای پاشا لە ناوچەی ئەنگووراندا گەمارۆی دەوڵەتیاریان دا، بە هاتنی شەو دەوڵەتیار هێرشی کردە سەر سوپاکە و تا هاتنی بەیانی هەموویانی تەفروتوونا کرد. دەڵێن لەم شەڕەدا دایکی پیری دەوڵەتیار بە سواری ئەسپێك کە زینی نەبوو سوپای دوژمنی ڕاو دەنا و دەیگوت «هەی بەنەقارە هەی بەنەقارە» یانێ: بە دەوڵ و شەیپوور و نەقارە ئەم هەلاتوانە دەسگیر بکەن و کەچی بەم شێوەیە توانیان «حەفت میرلوو» دەسگیر بکەن.

سوپاکەی پاشا کە دەرباز بوون و هەلاتن ڕوویان کردە شاری گیلان و پەنایان بردە ئەحمەدخانی گیلانی، هاوکات شاعەبباس دەسەلاتی لە باوکی وەرگرت و خۆی بوو بە پاشای ئێرانو ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتیاریش خۆی دا بە دەستەوە و ڕۆیشت بۆ خزمەتی

پاشای سەفەوی؛ بەڵام شاعەبباس ناپیاوانە زۆربەی سەرۆکەکانی عەشیرەتی سیامەنسووری شەهید کرد و ماڵ و کەلوپەلەکەیانی تاڵان کرد.

٢- سەبارەت بە فەرمانڕەواکانی چەگەنی کە دوایی باسی لێ دەکرێ.

٣- فەرمانڕەواکانی زەنگەنە ئەم عەشیرەتەش لە سەردەمی شائیسامعیل سەفەویدا دەسەڵاتی زۆریان وەدەست هانیبوو عەشیرەتی زەنگەنە[88] زۆرتر لە کرماشان و فارسدا هەن و تاقمێکیشیان لە خوراسان دان و سەبارەت بەم عەشیرەتە دەبێ کتێبێکی جیاواز بنووسرێت

٤- فەرمانڕەواکانی پازووکی:[89] وادیارە فەرمانڕەواکانی پازووکی لە ڕەگەزی عەشیرەتی سویدی بن و قاقمێك دەڵێن کوردی ئێران نین؛ بەڵام وەك دەزانین لە سەردەمی پاشا تورکەکاندا (ئاققوویونلووەکان و قەراقوویونلووەکان و سەفەوییەکان)دا زۆرتر دەسەڵاتی کێفی و ئەرجیس و عەدڵجەواز و ئەلشگەرد بە دەستی ئەم کوردانەوە بوو.

سەرۆکە پازووکیەکان سەردەمێ فەرمانبەری شائیسماعیل سەفەوی بوون و دوای شەڕی چاڵدوڕان دەچنە ژێر دەسەڵاتی سوڵتان سەلیمەوە و دواییش دوو دەسەڵاتی ئێران و تورکیە شەقیان تێیان هەڵداوە و وەك تۆپی پێ شەق پیادراو بوون. لە بەناوبانگترین سەرۆکەکانی پازووکی ئەتوانین ناوی خالیدبەیگ بهێنین کە ئەم زاتە لە یەکێ لە شەڕەکانی ئێران و عوسمانیدا ئازایەتی زۆری نواند و دەستێکی لەم شەڕەدا لە دەست دا و بە فەرمانی شائیسماعیل دەستێکی لە زێڕ بۆ دروست کرا و لە دواییدا نازناوی چولاق خالێدی پێدا.

سەبارەت بە فەرمانڕەواکانی بەدلیس وێژراوە: بەدلیس ناوی ناوچەیێکە کە بەدلیس ناوێك دروستی کردووە (لە سەرکردەکانی ئەسکەندەر ڕۆمی) و دوای گرتنی ئێران و شکستی

---

٨٨- تاقمێك لە کوردەکانی زەنگەنە لە ئازەربایجانی ڕۆژئاواییدا دەژین لە تەنیشتی ڕووباری ئەرەسەوە، لە گۆڤاری ڕەزمدا نووسراوە: دوای هێرشی مەغوول تاقمێك کوردەکانی زەنگەنە شامەنسووری و جێگای ڕوویان کردۆتە قەراباغ لە باکووری ئازەربایجانی ڕۆژئاوا دەسەڵاتیان وەدەست هانی. گۆڤاری ڕەزمئارا ١٣٢٧ نووسراوەی موهەندیس کەریم گوودەرزی و هەروەها مەردووخ لە کتێبی مێژوویی خۆیدا باسی کردووە.

٨٩- بڕوانە بەرگی یەکەم ئەم کتێبە کە باسی مەجنوونخان پازووکی دەکات کە چلۆن توانی لە دیواری قەڵای تاران سەرکەوێ و ئەو شارە داگیر بکات، کەچی ئاغاموحەممەدخانی ناپیاو لە ترسدا چاوی ئەم کوردەی کوێر کرد.

داریووش سێیەم بنیات نراوە، هەروەها کانییێکیش هەیە کە شەرەفخان دەڵێ: ئەسکەندەری ڕۆمی هەر کاتێ لەوێوە ڕۆیشتووە لە ڕووباری ئەو کانیەدا وچانی داوە و پێیان گوتووە چۆمی ئەسکەندەر. ئەسکەندەر لە بنیاتنانی قەڵای بەدلیسدا فەرمانی داوە بە ئامرهێزەکەی خۆی تاکو قەڵاییێك دروست بکات کە ئەگەر هاتوو ئەسکەندەرێکیتر دەسەڵاتی پەیدا کرد، توانای داگیرکردنی ئەوێی نەبێت. بەدلیس، شارۆچکەیەکە لە نێوان ئازەربایجان و دیاربەکردا.

ئەمیرشەرەفخان بەدلیسی هەر لەم بەدلیسەدا هاتۆتە دنیا و کوڕ لە دوای کوڕ، لەوێ حکوومەتیان کردووە و خۆیانیان لە بنەماڵەی ساسانیەکان زانیوە و گوتوویانە ئێمە لە بنەماڵەی قوبادی باوکی نەوشیروانین.

کوردەکانی ڕۆژکی: دەڵێن عەشیرەتی ڕۆژکی جەماوەرێکن لە ٢٤ عەشیرەتی کورد کە لە یەك ڕۆژدا کۆیان بەستووە و لە ناوچەی «تاب» کە سەر بە خویتەیە دابەش بوون بە دوو دەستەوە، بۆیە پێیان دەگوترێ ڕۆژکی و ڕۆزکی. لەم ٢٤ عەشیرەتە بە ١٢ گروپیانیان گوتووە «بولباسی» و بە ئەو دوازدەکەیتریان گوتووە «قوالیسی». بۆڵبیس و قوالیس دوو گوندە لە ناوچەی حەکاریدا و دەڵێن دوو عەشیرەتن لە هۆزی بابان.

## دەوری کوردەکانی چەگەنی لە مێژووی ئێراندا

کوردەکانی چەگەنی کە ئەمڕۆ زۆربەیان وان لە خوراساندا وەك کوردە شادلووەکان بە زمانی تورکی قسان دەکەن و مێژوو سەبارەت بەم قەومە بە باشی باس دەکات و هاوکات لە ئازاترین نەتەوە و عەشیرەتەکانی ئێرانن.

نووسەری شەرەفنامە لەم بارەوە دەفەرمێ ئەم عەشیرەتە لە ئازایی و لێهاتوویدا لە کوردەکانیتر بەناوبانگترن؛ بەڵام ئەم عەشیرەتە پەرژوبڵاو بووە و دابەش بوون لە نێو خاکی ئێران و عێراقدا و دەستیان داوە بە دزی و چەتەیی و جەردەگەریەوە و بۆیە خەڵکی ناوچەکە بە دەستیانەوە وەڕەز بوون و پەنایان بردە شاتەهماسب و داوای یارمەتیان لێ کرد.

شاتەهماسب چەند جار تاقمێك لە سەرۆکی ئەم عەشیرەتەی بانگ کرد و داوای کرد

لێیان کە دوایی بەم کارەی خۆیان بهێنیـن؛ بەڵام بێ‌قازانج بوو، کەچی بەم بۆنەوە شاتەهماسب فەرمانی داوە تاکو چەگەنیەکان لـە ئێـران بکەنـە دەرەوە؛ بـەڵام چـون جـارێکی‌تـر نافـەرمانی پاشایان کرد و خاکی ئێرانیان بەجێ‌نەدەهێشت، پاشای سەفەوی فەرمانی دا کە لە هـەر کـوێ یەکێ لە عەشیرەتی چەگەنیتان[٩٠] بیـنی، خێرا سەریان ببڕن و کەلوپەلەکەشیان تـاڵان بکـەن تاکو ئێران لەم جەردانە پاك ببێتەوە. بە پێی ئەم فەرمانەوە کە لە لایـەن شاتەهماسبەوە درا، کاری چەگەنیەکان سـەخت بـووەوە و کەوتنـە نێـو زەریـای دەربـەدەری، بۆیـە ٥٠٠ کـەس لـە گەورەکانی چەگەنی پێکەوە پەیمانیان بەست تـاکو عەشیـرەتی چـەگەنی لـە ئازەربایـجان و عێراقدا کۆ بدەنەوە و لە ڕێی خوراسانەوە ڕوو بکەنە هێند، کەچی ئەم کارەیان کرد و کاتێ کە گەیشتـنە خوراسان، بارودۆخی ناوچەکەیان زۆر ناڕێکوپێك دییەوە، لەبەر ئەوەی کە ئەم بەشەی لە ئێران لە لایەن ئوزبەك و مەغوولەکانەوە هێرشی کرابووە سەر و بەرەو وێران بوون دەڕۆیـشت و کوردەکان بە بینینی ئەم کارەساتە زۆر تووڕە بوون و ئازایەتی خۆیـان پیـشان دا و هێرشـیان کردە سەر مەغوولەکان و بە شێوەیێکی نالەبار تێکیانیـان شـکاند و لـە خوراسـان کردیانیانـە دەرەوە و دوایـی نامـەیێکیان نووسـی بـۆ شاتەهماسـب و بـە نامەبـەرێکی توندوتیـژ ڕەوانـەی شاتەهماسبیان کرد و ڕایانگەیاند کە وڵاتی خوراسان کە بەشێکە لە خاکی دەسەڵاتدارێتی تۆ و ئێمە، لە بێگانەکانـمان وەرگرتۆتەوە و بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئێمە بەرەو هێندۆسـتان تـەڕۆین، داواکارین تاکو پیاوێك وەکو فەرماندەی خوراسان بەرێ بکەی بۆ ناوچـەکە، کوردەکـان ڕوویـان کردە هەرات و هاوکات «قەزاقخان[٩١] تەکلوو» فەرمانڕەوای هەرات بوو و لەبەر ئەوەی زۆر لـە شاتەهماسب ئەترسا، پێشوازییێکی زۆر گەرمی لە کوردەکان کرد و پەنایانی دا تاکو بـۆ کـاتی

---

٩٠- چەگەنی بە ڕانێکی مەڕ و بزن دەڵێن کە ئەم ڕانە هی گوندێکە. وا دیارە هەر بەم بۆنەوە ئەم ناوەیـان پێ دراوە. ئەم عەشیـرەتە مەڕی زۆریان هەبووە. دوابەدوای چوونیان بۆ خوراسـان بـە پێچەوانەی ئـەوەی کە حکوومەتی مەشهەدیان بە دەستەوە بوو، بەڵام ڕوویان کردە ناوچەی سەر وڵایەت. کوردەکانی چەگەنی خوراسان لە کوردەکانی چەمەشگەزك نین.

٩١- ئەم کوردانە دەگەڕێنەوە سەر تەکەی کوڕی هـەزار سـەفی فـەرمانڕەوای کوردەکانی لوڕسـتان کە بـە دەستی هۆلاکۆخان کوژرا، تـەکلووی تورکمـەن لـە «تەکـە»وە گیراوە کـە دەگەڕێتـەوە سـەر عەشیـرەتە تورکمانەکان.

خۆی لەم هێزە کەڵك وەرگرێ تا بە تایبەت نەوەك شاتەهماسب هێرشی بۆ ببات. دوای ماوەیێك کاتێ کە قەزاقخان بە دەستی مەعسوومبەیگ سەفەوی کوژرا، عەشیرەتی چەگەنی ڕوویان کردە گورجستان (غورجستان) و لەم کاتەدا بوو کە نامەیێکیان بۆ شاتەهماسب نووسی تاکو لەبەر ئەوەی ئوزبەکەکانیان لە ئێران کردۆتە دەرەوە ڕێگای ئەوان بداتەوە کە بێنەوە ئێران و ئەویش دەیزانی خێڵێکی زۆر بەهێزوتوانان و بۆیە ڕێگایانی داوە و هاتنە خاکی ئێرانەوە و بەشێك لە ناوچەی خوراسانیش درا بە دەستیانەوە.

ساڵی ١٠٠١ی کۆچی مانگی کاتێ کە عەبدولموئمێن خانی کوڕی عەبدوڵڵاخان ئوزبەك بۆ داگیرکردنی قەڵای قووچان هاوڕێ لەگەڵ ٣٠ هەزار سەربازدا هێرشی کردە سەر بوداقخان و گەمارۆی دا و هاوکات شاتەهماسبیش ڕۆیشتە یارمەتیەوە، کاتێ کە سوپای ئوزبەك لەو قەڵایەدا شکستی خوارد، شاعەبباس زۆر ڕێزی دانا بۆ بوداقخان و کردی بە ئەمیرولئومەرای خوراسان.[٩٢]

ئەمینزەکی بەیگ نووسیویەتی: چەگەنیەکان لە نێوان سلێمانی و مەراغەدا یەیلاخ و قشلاخیان کردووە و ٣٠٠ بنەماڵە لەم عەشیرەتە کۆچەری و چاروادار بوون.[٩٣]

## دژایەتی بوداقخان چەگەنی ئەمیرولئومەرای خوراسان و شاعەبباس

ئوغلاق بوداقخان چەگەنی یەکێ لە بەناوبانگترین ئەمیرەکانی ئێران لە سەردەمی سەفەویدا کە ساڵەهای ساڵ دوای شاتەهماسب ناوچەی خوراسانی لە شەڕی بێگانە پاراستووە و هەروەها توانی بۆ پاراستنی خوراسان ئوزبەکەکان تەفروتوونا بکات. دوای مردنی شاتەهماسب کوڕەکەی شائیسماعیل کە سوڵتان موحەممەدی خودابەندە بوو، بوو بە پاشای ئێران و ناوبراو بە دەسەڵات پەیداکردنی خۆی تاقمێك لە سەرۆکەکانی بێدەسەڵات کرد و تاقمێکیتری کرد بە خاوەن دەسەڵاتی ناوچەکانی ئێران وەك، قووچان و بڕێك لە ناوچەی خوراسانی دا بە دەستی

---

٩٢- شەرەفنامەی بەدلیسی چاپی میسر، موحەممەد عەبباسی، لاپەڕەی ٤٢٠.

٩٣- کورد و کوردستان، موحەممەد ئەمین زەکی، لاپەڕەی ٣٣٨.

بوداقخانەوە[٩٤] (یانیٚ دەسەلاٚتی لیٚ وەرنەگیرایەوە.)

لە کۆتایی حکوومەتی سولتّان موحەمەددا کە بارودۆخی ئیّران شلّەژابوو سەرۆك و دەسەلاّتدارەکانی ئیّران بە تایبەت بوداقخان و ئیسماعیلقولیخان چەگەنی و گەنجعەلیخان زیك هەولّیان دا تاکو شاعەبباس کە لەم سەردەمەدا وەکو جیّگریّك بوو و لە هەرات دابوو، بە جیّگای باوکی بیکەن بە پاشای ئیّران و ناوبراوان ئەم کارەشیان کرد و توانیان سالّی ٩٨٩ی کۆچی مانگی لە خوراساندا شاعەباسیان کرد بە پاشا و سولتّان موحەمەدیش بیٚدەسەلاّت کرا.

لەم سەردەمەدا عەلیقولیخانی شاملوو بیگلەربەیگی خوراسان بوو کە لە داروسەلتّەنەی هەرات دابوو و شاعەبباسیش لە ژیّر دەستی ئەودا بوو و هاوکات مورشیّدقولیخانی ئوستاجلووش فەرمانڕەوای مەشهەد بوو.

دوای ماوەییّك مورشیّد قولی خان بۆ ئەوەی بارودۆخی خۆی لە خوراساندا بە هیّزتر بکات کچەکەی بوداقخانی چەگەنی کە لە ئەمیر و سەرۆکە بەناوبانگەکانی خوراسان بوو، کرد بە ژنی خۆی و دوایی هاوڕیّی عەلیقولیخان وەستا و لە شەڕیّکدا کە لە نیّوانیاندا بەڕیٚ کەوت، عەلیقولیخان شکستی خوارد و شاعەبباس هاتە ژیّر فەرمانی مورشیّدقولی خانەوە و گویّزرایەوە مەشهەد. دوای ماوەییّك کاتیٚ کە مورشیدقولیخان شاعەبباسی لەگەلّ خۆی خست و لە ڕیّگای یەزد و کرمانەوە بەرەو ناوەندی ئیّران کەوتە ڕیٚ تاکو شاعەبباس بکات بە دەسەلاّتداری ئیّران و هاوکات ئیبراهیم بەیگی برای کرد بە دەسەلاّتداری مەشهەد و بوداقخانی چەگەنی فەرمانڕەوای قووچانیشی کرد بە جیّگری. سالّی ٩٩٧ی کۆچی مانگی کاتیٚ کە شاعەبباس دووەمین سالّی دەسەلاّتداریّتی خۆی جیّژن دەگرت، لە ڕیّگای فیرووزکۆ و دامغانەوە ڕۆیشت بۆ خوراسان، کاتیٚ کە لە مورشیّدقولیخان ترسی پەیدا کرد کە لەم کاتەدا زۆر بە دەسەلاّت بوو، لە کاتی خەودا خویّنی ڕژاند و عەشیرەتی ئوستاجلوو سەرلیٚشیّواو بوون و فەرمانڕەواکانی ئەم عەشیرەتە بە تایبەت ئیبراهیمخانی برای مورشیّد قولیخان کە

٩٤- عالەم ئارای عەبباسی، لاپەڕە ٢٢٧، ٢٧٧، ٢٩٥، ٣٦٤.

فەرمانڕەوای مەشهەد بوو بێ دەسەڵات کرا.

شاعەبباس لە ڕێگای ئێسفەراینەوە ڕۆیشت بۆ مەشهەد و بوداقخانی چەگەنی ڕۆیشتە پێشوازیەوە. نووسەری عالەمئارای عەبباسی نووسیویەتی پاشا زۆر بە ڕووی مێهرەبانیەوە لەگەڵ بوداقخاندا بەرخوردی کرد و کردی بە جێگری سوڵتان حەسەن کوڕی خۆی (کوڕی پاشا) و هەروەها دەسەڵاتی مەشهەدیش خرایە ئەستۆی و دەسەڵاتی قووچان لە نێوان حەسەنعەلی سوڵتان و حسەینعەلی سوڵتانی کوڕیدا دابەش کرا.[٩٥]

شاعەبباس لە مەشهەددا بەشی زۆری فەرمانڕەواکانی قەزڵباش بە تایبەت شاملوو و ئوستاجلووی بێدەسەڵات کرد. ئوغلان بوداقخان چەگەنی هاوڕێ لەگەڵ مورشیدقولیخاندا خزم بوون و بۆیە شاعەبباس وای بە چاك زانی کە ئوغلانبوداقخانیش لە ناو ببات؛ بۆ ئەم مەبەستە پاشا، سوڵتان حەسەن میرزای کوڕی لە مەشهەدەوە بردە قووچان؛ بەڵام شاعەبباس بە بۆنەی زۆر شتەوە نەیتوانی هێرش بباتە سەر ئەم پیاوە کوردە و هاوکات دەسەڵاتی مەشهەدی دا بە دەستی ئومەت خانی ئوستاجلووەوە و خۆی بە سوپاییێکەوە ڕووی کردە هەرات.

شاعەبباس لە هەراتدا بوو کە هەواڵی هێرشی عوسمانیەکانی پێ گەیشت و لە ڕێی ناچاریەوە ڕووی کردە ڕۆژئاوای ئێران و بوداقخانیش لەم هەلەی کە ڕەخسابوو. بە جوانی کەڵکی وەرگرت و سوڵتان حەسەن میرزای کرد بە پاشا و لە قووچاندا ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵاتی پەرەی دەگرت و لەم کاتەدا تەواوی شۆڕشگێڕەکانی ئێران ڕوویان کردە قووچان. بوداقخان دەیەویست مەشهەد داگیر بکات و بەڵام لەم کاتەدا کۆسپێکیتر کەوتە بەر پێی بوداقخان و ئەوەش هێرشی ئوزبەکەکان بوو بۆ سەر خوراسان کەچی لەم کاتەدا مەشهەد بە ماوەی ٤ مانگ گەمارۆ درابوو و زۆربەی خەڵکی مەشهەد کوژران.

ئەو ژن و منداڵانەی کە دیل کرابوون، دابەش کرانە نێو سوپاکەی مەغوولدا و ڕاسپێری ماوەرائونەهر کران. شاعەبباس لە ترسی عەبدولموئمێنخان لە دەوروبەری تاران خۆی دا لە نەخۆشی و نەهاتە یارمەتی خەڵکی خوراسانەوە ئەو زوڵم و زۆرانەی کە لەم سەردەمەدا

---

٩٥- عالەمئارای عەبباسی، لاپەڕەی ٤٠٢.

مەغوولەکان کردیان، دەستکەمێکی لە هێرشی یەکەمی مەغوولەکان نەبوو.

کاتێ کە ئوزبەکیەکان شاری مەشهەدیان گەمارۆ دا، ئومەتخان ئوستاجلووی فەرمانڕەوای مەشهەد نامەیێکی ڕەوانەی قووچان کرد و داوای یارمەتی لە بوداقخان کرد تاکو هاوکات لە پشتەوە هێرش بکاتە سەر سوپای ئوزبەك تاكو بتوانن ئەم ئوزبەکە ناپیاوانە لەناو ببەن. بوداقخان هاوڕێ لەگەڵ ئەبوومسلیمخانی چاوشلوو[٩٦] و ئیمام قولیخانی قاجاڕ و مەحموودخانی سووفی ئوغلی ئوستاجلوو و فەرمانڕەواکانیتری ناوچەکە وڵامی ئەرێنیان داوە بە ئومەتخان و کەچی لەم کاتەدا هەواڵێکی ناخەزیان بیست و ئەوەش هێرشی نوور موحەممەدخانی ئوزبەك بۆ سەر نسا و ئبیورد و باغباد بوو.

بوداقخانی چەگەنی وای بیر دەکردەوە کە ناوبراو دەیەوێ قووچان داگیر بکات و خۆی بگەیەنێتە سوپای عەبدولموئمێنخانی ئوزبەك بۆیە ڕۆیشتە مەیدانی شەڕەوە و ناوبراوی شکست دا.

سوپای خەبووشان لە شەڕی دژ بە نوورموحەممەدخاندا سەرەتا سەرکەوتنێکی زۆریان وەدەست هانی و زۆربەی زۆری مەغوولەکانیان کوشت و زۆربەشیان دەرباز بوون؛ بەڵام جارێکیتر سوپای ئێران تووشی هەڵە دەبێت و خێرا دەست دەکات بە کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگی.

نوور موحەممەدخان کە خەریك بوو دەرباز دەبوو، ئەم ڕاستیەی بۆ ڕوون بووە کە ئەتوانێ لەم حاڵەدا جارێکیتر هێرش بکاتە سەر ئێران و بۆیە گەڕایەوە و هێرشی کردە سەر قووچان و کاتێ سپای ئێران ویستی دژ بە دوژمنانی شەڕ بکات، لە چوار لاوە گەمارۆ درابوون و چییان پێ نەکرا و زۆربەیان کوژران و بەشێکیان بە دیلی گیران.[٩٧]

بوداقخان بەرەو قووچان ڕای کرد و ئەم بەسەرهاتەی لە نامەیێکدا نووسی و دای بە

---

٩٦– چاوشلوو ناوی یەکێ لە عەشیرەتەکانی خوراسانە کە لە سەردەمی سەفەویدا ڕوویان کردە ئەم ناوچەیە و ئێستاش هەر لە گوندێکدا بەم ناوەوە لە ناوچەی دەرەگەزدا ژیان دەکەن و هاوکات تاقمێکیان لە دەوروبەری شیرواندا دەژین. تاقمێك لە مێژوونووسەکان «چاپشلوویان» نووسیوە، بەڵام کتێبە مێژووییەکان «چاوشلوویان» نووسیوە کە ناوچەکەیان قەفقازی سۆڤیەتە.

٩٧– عێشق و سەڵتەنەت، نووسراوەی بیگلەری.

حسەینعەلیخانی کوڕی تاکو بیبات بۆ شاعەبباس.[٩٨] ناوبراو لەم نامەدا لەو هەڵانەی کە پێش ئێستا تووشی ببوو، پەشیمان ببوەوە و داوای لێبووردنی کردبوو تاکو ئومەتخان و خەڵکی خوراسان لەم ڕەنج و زەحمەتە ڕزگار بکرێ، بەڵام پاشا ئەوەندە لە عەبدولموئمێنخان ترسابوو کە نەیوێرا بێتە یارمەتی خەڵکی خوراسانەوە. بە ماوەی ٦ ساڵ نە تەنیا خوراسان بەڵکو تەواوی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئێران کەوتە بەر پەلاماری مەغوولەکان و ئەم نەتەوە بێبەزەییە جارێکیتر تا سنووری دامغان و سمنان و خوار و وەرامین هاتنە پێشەوە و تەنانەت بڕێك لە سپاکەی تاکو ئەرانی سەر بە ناوچەی کاشان ڕۆیشتنە پێشەوە. لەم ئاڵوگۆڕەدا شاعەلیخان سەرۆکی عەشیرەتی کوردی چەمەشگەزك کە لە خوار و وەرامیندا بوو، هاتە یارمەتی ئێرانیەکانەوە و مەغوولەکانی شکستدا و بە یارمەتی فەرهادخانی قارەمانلوو ڕێگای ڕۆیشتنی پاشای بۆ خوراسان لە دوژمن پاك کردەوە و پاشاش توانی بەم شێوەیە لە ڕێکەوتی ١٠٠٤ی کۆچی مانگیدا بڕوات بۆ خوراسان شاعەبباس کاتێ کە گەیشتە ئێسفەراین، بوداقخانی چەگەنی کرد بە دەسەڵاتداری ئەوێ و داوای کرد تاکو جارێکیتر شاری مەشهەد کە بە بۆنەی هێرشی مەغوولەکانەوە ئاڕۆفتە و وێران کرابوو، سەرلەنوێ بنیات بنرێتەوە، ساڵی ١٠٠٧ی کۆچی کە دوانزەیەمین ساڵی پاشایەتی شاعەبباس بوو، ئوزبەکەکان شکستیان خوارد. شاعەبباس دوای ئەوەی کە ڕووی کردە خوراسان بۆ جاری دووەم بوداقخان چەگەنی بوو بە سەرۆکی حکوومەتی مەشهەد.

هەروەها بڕیار درا بوداقخان نوور موحەممەدخانی ئوزبەك بکاتەوە خاوەن دەسەڵاتی ئوزبەکستان. ئەم نوور موحەممەدخانی ئوزبەکە کە دوای سەرکەوتنی لە شەڕی دژ بە بوداقخانی چەگەنی، خۆیشی لە شەڕێکیتردا لە عەبدولموئمێنخانی ئوزبەك شکستی خوارد و پەنای بردە شاعەبباس.

بوداقخان لە ڕێکەوتی مانگی زیحەججەی ساڵی ١٠٠٧ی کۆچی مانگیدا هێرشی کردە سەر ئێبیورد و نسا و ئەو ناوچانەشی لە هێزەکانی عەبدولموئمێنخان وەرگرتەوە و دایە

---

٩٨- حسەین عەلی سوڵتان وەك بارمتەیێك لە بارەگای شاعەبباسدا مایەوە و ساڵی ٩٩٩ی کۆچی مانگی بە تاوانی چاوحیزی کوژرا.

دەستی نوور موحەممەدخانەوە. بوداقخان لە ماوەرائوننەهردا سەرکەوتنێکی زۆری وەدەست هێنا و هاوکات فەرمانڕەوای مەرو کە خالۆزای عەبدولموئمینخانی ئوزبەك بوو بە دەستی بوداقخان دەسگیر کرا. بوداقخان دوابەدوای ئەم کارەساتە گەڕایەوە بۆ نێو ئوردووەکەی شاعەبباس.

بوداقخان تا ساڵی ۱۰۱۲ی کۆچی مانگی بە وتەی نووسەری عالەمئارای عەبباسی دەسەڵاتدارێکی بێچوونوچرای خوراسان بوو و هاوکات کوڕەکانیشی خاوەن دەسەڵات بوون. هەر لەم ساڵەدا کە شاعەبباس لە خوراسان دەگەڕایەوە. کاتێ کە بینی نەزەرعەلیخانی شاملوو توانای پاراستنی سنوورەکانی مەرو و مارووچاقی نییە، دەسەڵاتی ئەو ناوچانەی لێ وەرگرتەوە. یووسف عەلیخان کوڕی بوداقخان چەگەنی فەرمانڕەوای مەشهەد کرایە دەسەڵاتداری ئەو ناوچەیە و بەیرامعەلی برای[99] کە لە ساڵی ۱۰۰۶ی کۆچیدا فەرمانڕەوای بەستام بوو، بوو بە جێگری یووسفخان و مێحرابخانیش دەسەڵاتی مەشهەدی گرتە ئەستۆی خۆی.[100]

بوداقخان چەگەنی لەم ڕۆژە بە دواوە دەبێتە هاوڕێی شاعەبباس. شاعەبباس لە بوونی بوداقخان لە خوراسان ئەترسا؛ چون هەموو کوڕەکانی لە ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێراندا خاوەن دەسەڵات بوون. عەشیرەتی چەگەنی زۆر عەشیرەتێکی پڕهێزوتوانا بوون و لەم سەردەمەدا ئەگەر بوداقخان ویستی ئەوە ببوایات بە جوانی ئەیتوانی سەربەخۆ بێت و لە ئێران جیا ببێتەوە، ئەگەرچی پاشا لەم سەردەمەدا زۆر لە بوداقخان ئەترسا، بەڵام زانی بە بێبوداقخان توانای پاراستنی ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێرانی نەبوو و بۆیە دەسەڵاتی بەلخ و هەراتی دایەوە دەستی.

---

۹۹- بەیرامعەلی چەگەنی کە دوای کوژرانی حەسەنعەلیخان بە دەستی ئوزبەکەکان لە بەستامدا ساڵی ۱۰۰۶ی کۆچیدا بوو بە حاکمی ئەو شارە و ساڵی ۱۰۱۲ی کۆچی ناوچەی مەروی وەدەست هانی و دوایین ساڵەکانی حکوومەتیشی دەسەڵاتی شارەکانی دیلمان و گیلانیش کەوتە دەستی.

۱۰۰- عالەمئارای عەبباسی، لاپەڕەی ٦٣٠.

## پیاوەگەورەکانی عەشیرەتی چەگەنی

کوردەکانی چەگەنی جێگاییێکی تایبەتیان لە مێژووی ئێراندا هەیە و لە باسە نیزامی و ڕامیاری و فەرهەنگیەکاندا دەورێکی هەرەبەرزیان هەبووە کوردەکانی چەگەنی لە ئازەربایجان و قەزوین و فارس و تاران و خوراساندا پەرژوبڵاون و ناوەندی ئەم کوردانەش خوراسانە، کوردەکانی چەگەنی و شادیلوو لە عەشیرەتی چەمەشگەزك نین چون چەگەنیەکان بەر لە عەشیرەتی چەمەشگەزك هاتوونەتە خوراسان.[١٠١]

ناودارانێ لەم عەشیرەتە کە نووسەری عالەمئارای عەباسی ناویانی بردووە بریتین لە:

ئەحمەدسوڵتان چەگەنی، بەیرامعەلی سوڵتان چەگەنی، زونمەر سوڵتان چەگەنی، عەلی شاسوڵتان چەگەنی، شاوێردی سوڵتان جەلال ئوغڵی چگەنی، سەفەر قولیبەیگ چەگەنی کە لە شەڕی دژ بە ئەمیرخان برادۆست و داگیرکردنی قەڵای زەمرەمدا دەورێکی گرنگی هەبووە عەلیخان چەگەنی قوتبەدین ئاغای چەگەنی کە باڵوێزی شاعەبباس بوو، مەحموود خەڵیفەی چەگەنی یەکێ لە سەرۆکەکانی سەردەمی شاتەهماسب بوو لە قەراباغی ئازەربایجاندا، مورادخان سوڵتان چینی چەگەنی.

ئەمیرەکانیتری چەگەنی سەردەمی سوڵتان موحەممەد سەفەوی و شاعەبباس کوڕی بریتین لە سەفی قولیخان چەگەنی کوتوال و پارێزەری قەڵای ئەلەموت کە بەناوبانگترین بەندیخانەی ئەو کاتەی ئێران بوو و دیلەسیاسیەکان لەم بەندیخانەدا بوون بەڕێز مەسروور لەم بارەوە دەڵێت.

---

١٠١– دەتوانین ناوی ئەم سەرۆکە کوردانەش کە لە عالەمئارادا هاتوون، بینووسین: ئیبراهیم قارەمانلوو، ئێسفەندیاربەیگ عەرەبگیرلوو، ئەلوەند سوڵتان قارەمانلوو، بەیرامخان قەرەمانلوو (والی بەلّخ)، پیریبەیگ قەرامانلوو، حێسامبەیگ قەرامانلوو، حەقوێردی سوڵتان عەرەبگیرلوو، ڕۆستەمخان قارەمانلوو، عەلیبەیگ زاخۆری، عەلیبەیگ زەنگەنە، عەلیخان شادی تەکلوو، قەرامانبەیگ قەرامانلوو، کەماڵ بەیگ عەرەبگیرلوو، موحەممەدقولی بەیگ عەرەبگیرلوو، سەردار مەحموود چەمەشگەزکی، یەعقووببەیگ قەرمانلوو و یووسفبەیگ چەمەشگەزك و... هتد.

سەفی قولی‌خان چەگەنی بە فەرمانی سوڵتان موحەممەد سفەوی کوتوال و پارێزەری قەڵای ئەلمەوت زۆر پڕهێزوتوانا و جگە لە پاشا لە ژێر فەرمانی کەس‌تردا نەبوو.

لە سەردمێکدا کە عەباس میرزا لە خوراساندا بوو بە پاشا، بۆ بردنە پێشەوەی کاری خۆی پێویست بوو چەند کەس لە دیل‌کراوەکان ڕزگار بکات بۆیە خۆی لە خوراسانەوە هاتە قەڵای ئەلمەوت و زۆر هەوڵی دا تاکو سەفی قولی‌خان ڕازی بکات؛ بەڵام ڕووی نەدا و هاوکات سەفی قولی‌خان خەنجەری لە کەمەر دەرهانی و دای بە پاشای نوێی ئێران و گوتی من لە کاری خۆمدا غەدرم نەکردووە ئەگەر زۆرم لێ بکەی دەبێ لە پێشدا سەرم ببڕی و جا هەر کارێك دەکەی لە خزمەت دام.

شاعەبباس کە لەگەڵ وەزیران و دەرباریەکانی خۆیدا لە مپەرێکیان لە بەر پێ نەمابوو، گەڕایەوە.[١٠٢] ئەگەرچی شاعەبباس دڵی لە کوتوال کورد ئێشابوو، بەڵام لە دڵیەوە دەیگوت ئەگەر من ١٠٠ کەس لەم پیاوەگەورانەم ببوایات دەمتوانی سەرانسەری ئێران داگیر کەم.

کوردەکانی چەگەنی کە ئەمڕۆ لە بەشی چەگەنی قووچان دان،[١٠٣] دەورێکی زۆریان هەیە لە بواری نیزامی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتووری ئێراندا و ئێمەش سێ کەس کە زۆر ڕەنجیان داوە لەم بوارەدا ناویانمان هانیوە و یەك لە دوای یەك باسیان دەکەین.

## ئەرەس موحەممەد یەکەتاز ئەتەك

ئەرەس موحەممەد کە تورکمانەکان پێی دەڵێن ئاراز موحەممەد، لە عەشیرەتی کوردی چەگەنیە. ئەرەس موحەممەد کوڕی شاموحەممەدی پاڵەوانە و لە بنەماڵەی «ئوغرلوو میەتیخان»ە بە پێی بەروارێك کە لە سەر بەردی قەبرەکەی ئەرەس موحەممەدەوەیە وادیارە

---

١٠٢– دە نەفەر قزڵباش، حسەین مەسروور.

١٠٣– کوردەکانی چەگەنی کە دانیشتووی قەزوینن و بە تورکی قسە دەکەن و لە سەردەمی شاعەبباسدا سەربازی ناوبراو بوون و سەرۆکیشیان نەسرەتولمەلێك و سەرهەنگ سادق بوو.

ساڵی ١٣٠١ی کۆچی مانگی کۆچی دوایی کردووە[١٠٤] ئەمن (نووسەر) کە خۆم لەم عەشیرەتەم بەسەرهاتی ئاراس موحەممەدم لە زمانی بابم و مامۆکانمەوە بیستووە کە مەلا ڕەمەزانی مامۆم ساڵێك دوای لە دنیا دەرچوونی ئاراس موحەممەد هاتۆتە دنیاوە ساڵی ١٣٦٣ی کۆچی هەتاوی لە حاڵێکدا ١٠٢ ساڵی تەمەن بوو لە دنیا دەرچوو.

هەروەها عەلی کوڕی عەبباس کە سەد ساڵی تەمەن بوو زۆرم سەبارەت بەم کەڵە پیاوە کوردەوە بیستووە و ئەمن هەر لە منداڵیەوە گوێم شل دەکرد بۆ پیرەمێردەکان و ئەوەی کە سەبارەت بە ئاراس موحەممەد دەینووسم هەر ئەو باسانەیە کە بۆمیان گێڕاوەتەوە.

عەشیرەتی ئوغرلوو و میەتیخان کە لە بنەماڵەی مێهدینە و زۆربەیان خوێندەوارن و تەنانەت زۆربەی ژنەکانیان قورئانیان خوێندووە. دەڵێن ئەم عەشیرەتە پیاوەکانیان یان شاعیر و یان مەلا بووگن وە یان پاڵەوان و شەڕکەر.

لێرەدا باسی یەکێ لە کوڕەکانی ئەم عەشیرەتە دەکەین کە ئەگەرچی دایکی لە تورکمانەکان بوو بەڵام دژ بە ئەوان وەستاوە و شەڕی کردووە، ئەم زاتە ناوی ئەرەس موحەممەد بوو و دەبێ بۆ ئەوەی جوانتر بیناسین تۆزێك وەرگەڕێینە دواوە.

مەحەببەت خانی کەیکانلووی کوڕی حاتەمبەیگ[١٠٥] بیچرانلوو کە هاوچەرخی شارۆخی کوڕەزای نادرشای ئەفشار بوو. حاتەمبەیگ کە دوایی پێیان گوت «حاتەمخان» و داروودەستەی نادری زۆر ڕێزیان بۆی داناوە و کەچی بۆ ئەوەی نادرشا ببێ بە پاشا حەوڵ و تێکۆشانی زۆری هەبووە و بۆیە موحەببەتخانی کوڕیشی لە کاتی پاشایەتی شارۆخدا زۆر پیاوێکی بەدەسەڵات بوو. هەر کاتێ مەحەببەتخان لە باکووری قووچانەوە دەهات بۆ مەشهەد، شارۆخ میرزا بە بینینی کوڕێکی کەڵەگەت وەکو موحەببەتخان دەگەشایەوە و ئەگەرچی لە دڵەوە زۆر نیگەران دەبوو کە بۆچی خۆی وەها نییە. جارێکیان کە موحەببەتخان هات بۆ مەشهەد بینی شارۆخ

---

١٠٤– گۆڕی شاموحەممەد و موحەممەدی کوڕی لە گۆڕستانی قەڵای بیگلەر دایە، ساڵی ١٣٦٢ی کۆچی هەتاوی کە شەقامی نووغازی نوێ و کۆن دەکێشرا هەمووی لە ناوچوو و بوو بە ژێرەوە.

١٠٥– بۆ ناسینی حاتەمبەیگ بڕوانە بۆ کتێبی «نادر شێرەپیاوی ئەتەك»، ئەبوولفەزل قاسمی، لاپەڕەی ٨٥ و ئەم کتێبەی ئێمەش. ناوبراو کوڕی موحەممەدبەیگی پێکهێنەری نووغاز بوو. (ساڵی ١١٣٠ی کۆچی مانگی)

زۆر حەزی لێیە باڵا و هەیکەلێکی وەکو ئەوی ببێت و هاوکات لاوێکی بینی و پرسی ئەتۆ کیت. لاو لە وڵامدا گوتی: ناوی من مێهدیە و لە کوردەکانی چەگەنیم و لە هۆزەکەم تۆراوم و دەشتی خودام گرتوەتە بەر.

مێهدی هەموو بەسەرهاتەکانی بۆی گوت و ئەگەرچی زۆر لەو ژیانەی کە وەکو ژیانی دیلی و بەندی بوو وەڕەز بوو، دەیەویست کاری خۆی ڕێك و پێك بکات و لەم ئاوارەیی و دەربەدەرییە دەر بێت و بڕواتەوە نێو عەشیرەتەکەی. مەحببەتخان کە زێڕی بە جوانی دەشناسی و ئەم کوڕەش وەکو زێڕ وەهابوو وای بە چاك زانی بیپارێزێت و ئیزن نەدات وەرگەڕێتەوە و پێی گوت پێویست ناکات کە تۆ وەرگەڕێتەوە بۆ نێو هۆزەکەت و هەر ئێستا لەگەڵ مندا دێیت بۆ نێو عەشیرەتی کەیکانلوو. مێهدی زۆر بەم پێشنیارە گەشایەوە و هاوڕێ لەگەڵ مەحەببەتخاندا ڕۆیشت[١٠٦]. جارێکیان مێهدی سواری ئەسپێك دەبێت و ڕوو دەکاتە کانی و ئاوێك کە ئوزبەکان دوایی لە سەر ئەم کانیە بارەگای ئیمامزادەییەکیان دروست کرد، هاوکات چاوی بە کچێکی زۆر جوان دەکەوێت و بیری لە میشکی پەڕاندووە. مێهدی بە دڵێکی پڕ لە عەشقەوە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ماڵ و داوای کردووە لە مەحەببەتخان تاکۆ ئەو کچەی بۆ خوازمێنی بکات. مەحەببەتخان کە چاوەڕوانی ئاوەها داخوازییەك نەبوو، سەرەتا وای زانی کە مێهدی شێت بووە. بەڵام دوای ماوەییەك بۆی دەرکەوت کە ئەوینی ئەو کچە لە دڵی دایە. ئەگەرچی مەحەببەتخان زۆر تکای لێکرد تاکو کچێ لە کچەکانی کەیکانلوو بخوازێ و لەم ژنە قەرەجە پەشیمان ببێتەوە، بەڵام نەکرا. مێهدی دەڵێت ئەمن هەر ئەو کچەم دەوێت و بۆیە ئەو کچەی بۆ خوازمێنی دەکرێت و دەبێ بە ژنی و لە ئاکامدا دوو کوڕیشی لێ دەبێت بە ناوی ئووغرلوو و مەحەببەت. ئەگەرچی ناوی باوکی مێهدیش هەر ئووغرلوو[١٠٧] و دوای ماوەییەك مەحببەتخان کەیکانلوو لە دنیا دەردەچێ (١١٧٥ی کۆچی مانگی) و هاوکات مێهدی کوڕێکی دەبێت و بە ڕێزی باوکیەوە ناوی دەنێت مەحەببەتخان ئەم دوو برایە زۆر ئازا و دلێر و لێهاتوو بوون.

---

١٠٦- قەڵای ئووغاز کە بە قەڵای موحەممەدبەیگ ناوبانگی دەرکردووە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ کۆنەقەڵا کە لە بوومەلەرزەی مانگی گوڵانی ساڵی ١٣٠٨ی کۆچی هەتاوی هەمووی ئەم قەڵایە بە تەواوی ڕووخاوە.

١٠٧- شایەت ئەم ناوە دەگەڕێتەوە سەر ئووغرلوو سوڵتان چەگەنی، لاپەڕەی ٥١٤ عالەمئارای عەبباسی.

مەحەببەتخانی میەتـخان سێ کوڕی لێ بەجێ ماوە[١٠٨] کە ناویان موحەمـمەد سادق و مێسر و شاموحەمـمەد بوو، ئەگەرچی شاموحەمـمەد زۆر پاڵـەوانێکی بـەهێز و توانـا بـوو و کاتێ کە پاڵی بە داری چنارەوە داوە خستوویەتیە لەرزە.

ناوی شاموحەمـمەد لە پاڵەوانیدا گەیشتە تورکمەنستان. تورکمەنەکان ویـستوویانە ئـەم پاڵەوانە بدزن و بیبەنەوە بۆ تورکمەنستان و ژنێکی بۆ مارە بکەن تاکو لەوێ و لە کاتی خۆیـدا هێرش بکەنە سەر کوردەکانی خوراسان و لەم هەموو هێزە و توانایە کەڵك وەرگرن.[١٠٩]

کەچی ئەم کارەش کراوە و دوو کەس لە تورکمانەکان وەکوو بازرگان دەچنە ئۆغـاز و لـە شاموحەمـمەد دەپاڕێنەوە تاکو هاوڕێی ئەوان بڕوات بۆ ئەتەك، چونکە کلێلی بەخاوی[١١٠] پـای ئەسپەکانیان ون بووە و ئێستا خۆیان توانای کردنەوەی ئەو بەخاوانـەیان نییـە و تکاکـاران کـە بڕوات بۆیانی بکاتەوە.

شاموحەمـمەد کە پیاوێکی ساوێلکە بوو خێرا هاوڕێیانی کرد و لەگەڵ ئەوان ڕۆیشتـن بۆ ئەتەك، کاتێ کە شاموحەمـمەد گەیشتە نزیکی ئەسپەکانەوە و چاوی بە چەند تورکمەن کەوت کە لە نزیکی ئەسپەکانەوە بوون و هەر ئەو کاتـەی کـە شاموحەمـمەد بەخاوەکـەی بـڕی ئـەو تورکمانانە خۆیانیان ڕماندە مل شاموحەمـمەددا و بەستیانەوە و بردیـان بـۆ تـووران و لەوێـدا کچێکیان لە ڕەگەزی تورکمانە گەورەکان بۆی مارە کـرد و شاموحەمـمەد بـوو بـە زاوا و لـەم ژنەی کوڕێکی بوو بـە نـاوی «ئـەرەس موحەمـمەد»[١١١] یـان بـە واتـای تورکمانـەکان «ئـاراز

١٠٨– ئووغرلووش هەر سێ کوڕی هەبووە بە ناوی عەلی و ئاغاموحەممەد و ئاغابالی.

١٠٩– ئەم بیروباوەڕە لە کۆمەڵگای ئێران و ڕۆم لەو سەردەمەدا هەر باو بووە وەك کاتێ کـە ئەفراسیاب، سۆرابی کوڕی ڕۆستەم دەکات بە زاوا و بورزوو لە سۆراب دێتە دنیا و دوایی هێرش دەهێنێتە سەر ئێران و بە گورز لە ڕۆستەم ئەدات بە بیانووی تۆڵەکردنەوەی باوکی.

١١٠– «بەخاوی» کە بە کوردی پێی دەڵێن: «سەندەف» و لە ئاسن دروست کراوە.

١١١– ئەرەس ناوی ڕووبارێکە لە ئازەربایجاندا کە لەم سەردەمەدا بەشێك لـە سنووری ئێران بـوو، لەبـەر ئەوەی دەوری زۆری لە باری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی خەڵکی ناوچەکەدا بووە خـەڵکی ناوچـەکە نـاوی زۆربەی منداڵەکانیان بەو ناوەوە دەنا. وەك: ئەرەسخان شیـروانی. کاتێ کە نادرشا لە گورجستانەوە هات بۆ دەشتی موغان لـە ئەمبـەری ئەرەسـەوە تـاجی بـە سـەر نـاوە و هاوکـات ژنـە گورجیـە دیلیـەکان لـەوێ منداڵیان بووە و ناوی تەواوی کوڕەکان بوو بە «ئەرەس».

موحەمـمەد ))، ئاراز موحەمـمەد هەر وەکو سوهراب ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورەتر دەبوا. هەر وەك چلۆن لە تورکمەنستاندا گەورە و بەناوبانگ بوو و توانیبووی لـە زۆرانـدا هـەموو حەریفـەکانی بدات بە عـەرزدا، بەڵام هێشتا بۆ هیچ شەڕێك نەڕۆیشتبوو. گەورەکانی تورکمەن دەیانئەویست بۆ ئەرەز موحەمـمەدیش هەر وەکو باوکی ژنێك بهێنن و کەچی هەر ئەو کـارەش کـرا و بـەڵام یەکێ لە لاوە تورکمانەکان زۆر ڕقی هەستا لە ئەرەز موحەمـمەد. وای هـات بـە خەیاڵدا کـە بیکوژێ، ناو براو بۆ گەیشتـن بەم مەبەستە ڕۆژێکیان کە ئاراز موحەمـمەد دەڕوات بـۆ جفت کردن بە سواری لە پشتی سەرەوە هێرش دەکاتە سەری و ئارازیش هـیچ هـەوڵ نابێـت تـا ئـەو کابرا نزدیك دەبێتەوە و چاوەڕوان بوو کە کاتێ ئـاراز سـەری گـەرم دەبێـت هێرشی بـۆ ببـات، کەچی ئاراز زۆر بە جوانی ئەو تورکمانەی لە ژێر چاودێریدا بوو و کاتێ کە ئاراز پەلامار درا لە لایـەن ئـەو تورکمانـەوە بـەبێ هـیچ مـاتـڵ بـوونێ مەچـەك کـابرای تورکمـەنی گـرت و خێـرا خەنـجەرەکەی دەرهانی و شەر دەستی پـێ کـرد و زۆری نەخایانـد کـە بـوو بـە هـۆی بـێ گیـان مانەوەی لاشەی تورکمانەکەوە، ئاراز گۆڕێکی بۆی هەڵقەند و لاشـەکەی نایـە خـاك و دەسـتی کرد بە کارەکەی خۆی و ئێوارە گەڕایەوە بۆ ماڵ. کـاتێ کـە تورکمانـەکان لـە شـوێن ئـەو لاوە تورکمەنەدا دەگەڕان، بۆیان دەرکەوت کە تا نزدیکی مەزراکەی ئاراز هـاتووە و لـەوێ بـەولاوە ئیتـر هیچ شوێن و ئاسەوارێکی نەمابوو، بـەم بۆنـەوە دەیانویـست هێـرش بکەنـە سـەر مـاڵی شاموحەمـمەد و تۆڵەی ئەم لاوەی لـێ بکەنـەوە، بـەڵام گـەورە پیـاوانی تورکمـان ئیزنـی ئـەم کارەیان پێیان نەدا. شاموحەمـمەد دوای ئەم کارەساتە بە ئارازی کوڕی گوت چاك وایە تۆ لێرە نەمێنیتەوە و چاك وایە بڕۆیتەوە بۆ ئێـران و هـەتا نێـو عەشیـرەتی ئۆغـازی لـە کوردسـتانی خوراسان مەوەستە، کاتێ کـە گەیـشتیتە ئـەوێ بڕۆ بـۆ خزمـەت مامۆکانـت و بیـر لـە مـن مەکەوە، ئەگەر توانیم دێم بە دواتدا.

دوابیـن ڕۆژەکانی مانگی خەزەڵوەر بوو کە ئووغازیەکان وەکو تەواوی گوندنشینەکان کار و ئیشی کشتوکاڵیان گەیاندبووە ئاکام و ئێـستا نۆبـەی پـشوو بـوو. لاوەکـان ئەسـپسواری و

شمشێربازیان دەکرد و منداڵەکان کایەی (خیریپیری)[١١٢] و بە ساڵەچووەکانیش کڵاوی بۆخاراییان لە سەر نابوو لە کۆڵانێکی بەرپاندا وەستابوون. گوێبیستی داستان و بەسەرهاتی سیاوەش بوون کە چلۆن بە دەستی ئەفراسیاب کوژرا و ئەم داستانەش لە لایەن مەلا حەسەن قولیخانی کوڕەزای ئووغلۆوە دەخوێنرایەوە و کاتێ ئەم شیعرەی دەخوێندەوە.

نه توران بمانم نه افراسیاب ز خون شهر توران کنم رِود آب

مگر کین آن شهریار جوان بخواهم از آن ترک تیره رِوان

چو فردا برآید بلند آفتاب من و گرز میدان افراسیاب

چنانش بکوبم به گرز گران که پولاد کوبند آهنگران

هێشتا کە دوایی بەم شیعرە نەهانیبوو کە بانگ و هاواری « ئەلئەمان هات، ئەلئەمان هات»[١١٣]ی ژن و منداڵە کوردەکان لە دەشت و دەردا دەنگی ئەدایەوە، هەمووی خەڵك لە جێگای خۆیان هەستانەوە و مەلاحەسەن قولی کە شانامەی هەر لە نێو دەستدا بوو وەستابوو و هاوکات چاویان بە لاوێکی وەکو تورکمەن کەوت کە بە سواری ئەسپێك دەهات، ئەو لاوە زۆر ڕێکوپێك و ڕازاوە بوو و هەموو کەرەستە و ئامێری شەڕیشی پێ بوو و سوهراب ئاسا هاتە نێو عەشیرەتی ئۆغازەوە و کاتێ کە گەیشتە نێو خەڵکەکەوە بە تورکی سڵاوێکی کرد و خەڵکیش چاوەڕوانی سەعادەت قولیخانی سەرکەردە بوون تاکو بزانن چلۆن وڵام ئەداتەوە کەچی ئەویش لە وڵامدا گوتی: «عەلەیکەسسەلام قارداش، خۆش گەلدین»

هاوکات ئاراز لە ئەسپەکەی هاتە خوارێ و بۆ خەڵکەکەی ڕوانی و ئامۆزاکەی خۆی یانی مەلاحەسەن قولی ناسی، بەڵام ئەترسا کە ئەو نەبێت، بۆیە بۆ دووەم جار بۆ خەڵکەکەی ڕوانی و ئەمجارە باوەشی کرد بە مەلا حەسەن قولیخاندا و مەلاحەسەنیش نەیدەزانی ئەمە کێیە و بۆچی کاری وەها دەکات و ئاراز کە زانی هەموان سەریان لەم کارە سوڕماوە، خێرا خۆی بە خەڵکەکە ناساند و گوتی: ئەمن کوڕی شاموحەمەدم.

---

١١٢- «خیری پیری» لە کایە بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیە بوو.

١١٣- ئەمە دروشمێك بوو کە لە نێوان کوردەکان و تورکمانەکاندا باو بووە و هەر کات هێرشیان دەبردە سەر یەکتر، بۆ پاراستنی خۆیان ئەم هاوارەیان دەکرد.

به بیستنی ئەم قسەیە، خەڵکی قەڵاکە بە تایبەت ئووغرلوو میەتیخانی بە گریانەوە دەیانگوت شاموحەممەد، شاموحەممەد: چون ئەوان شاموحەممەدیان ساڵەهای ساڵ بوو ون کردبوو و وایان دەزانی کوژراوە.

ئاراز ڕاستیەکەی بۆیان درکاند و گوتی: شاموحەممەد زیندووە و سڵاو و ڕێزی بۆ هەموان هەیە.

به بیستنی ئەم قسەیە هەموان کردیان بە جێژن و سەعادەت قولیخان بانگی کرد لە مووسیقارەکان تاکو بیکەن بە شایی و جێژن و هەڵپەڕکێ.

بە ساڵاچووەکان گوتیان: ئازار موحەممەد کوڕێکی ڕێکوپێکی ئووغرلووە و چاك وایە ناوەکەی بگۆڕین و بیکەن بە ئووغرلوو. ئارازیش سپاسی ئەوانی کرد و گوتی ئەمن زۆرم سەبارەت بە ئازایەتی ئووغرلوو بیستووە و کەچی هێشتا خۆم لەو ڕادەیەدا نابینم کە ناوم ئووغرلوو بێت و هەر ئەم ناوەم بێت چاکترە و ئەگەر ئەمن بڕیارم وابێت وەکو ئەو بم بەم ناوەشەوە هەر دەکرێ.

سەعادەت قولیخان زۆر لە کوڕە لاوەکانی ئووغرلوو میەتیخان ئەترسا و ئێستاش کە پاڵەوانێکی وەکو ئاراز گەڕاوەتەوە ئەو ترسەی سەعادەت قولیخان زۆرتر پەرەی سەند و بیری لەوە دەکردەوە کە چی بکات و چی نەکات، بەهاری ساڵی دوایی سەعادەت قولیخان بۆ بینینی ناوچە سنووریەکانی بیچرانلوو و جریستان ڕەوانەی ئەو ناوچەیە دەبێت و هاوکات چاوی بە تاقمێك لە تورکمانەکان دەکەوێت کە خەریکی جەردەگەرین و ڕەشماڵی کوردەکانی بیچرانلوویان تاڵان کردووە و ژن و منداڵەکانیشیان دیل کردووە و هاوکات زانی ئەم جەردانە بە فەرمانی چ کەسێك ئەم کارەیان کردووە و بۆیە بە ئارازی ڕاگەیاند و گوتی ئەگەر ئەو کابرایە بکوژی، کاری ئەم دز و چەتەگەلە تەواوە و ئەوەندەی لە بێ زۆری ئەو کابرایە گوت بۆ ئاراز کە ئەویش نەترسانە پەلاماری ئەو تورکمانەی دا و تورکمانەکان کاتێ ئەمەیان بینی، دیلەکانیان بەجێهێشت و خۆیان بەرەو دوا هەڵیان کردەوە. بەڵام سەرۆکەکەیان پیاوێکی مەغروور بوو و بۆ شەڕی تەنێ بە تەنێ گەڕایەوە و زۆر کەڵەگەت و زل بوو و کاتێ ئاراز چاوی بەو کابرایە

کەوت، سەری سورِما و زانی ئەگەر خێرایی خۆی کەم کاتەوە، دەکوژرێت؛ بۆیە خێرا خۆی خستە سەر ئەسپی تورکمانەکە و هەر دووکیان پێکەوە دران بە عەرزدا و ئاراز خێرا بە خەنجەر زکی کابرای هەڵدڕی و کاتێ کابرا لەشی بێگیان مایەوە، ئاراس ئەو کاتە زانی چ کارێکی پڕ لە مەترسی کردووە و ئەگەر هۆشیار نەبوایات دەبوای خۆی بە جێگای ئەو کابرایە گیانی بێڕۆح بمایاتەوە[١١٤] کەچی هەر ڕانەوەستا و سەری کابرای لە لەشی جیا کردەوە و بردی بۆ سەعادەت قولیخان و هاوکات خراپەشی پێی دەگوت. سەعادەت قولیخان بە دیتنی ئەم کارەساتە هەرای کرد و خۆی شاردەوە و لەم کاتەدا ئاراز موحەممەد بۆی دەرکەوت کە سەعادت قولیخان[١١٥] ویستوویەتی بکوژرێت و بۆیە بوون بە دوژمنی یەکتر. سەعادەت قولیخان زانی سەرناکەوێت و بۆیە پەنای بردە ئەمیر حسەینخان شوجاعودەوڵە و داوای یارمەتی کرد. ئاراز موحەممەدیش پەنای بردە ئەبولحەسەنخان کوڕ شوجاعودەوڵە کە دژ بە باوکی وەستا بوو. کەچی ناوبراوان بە ماوەی دوو ساڵ ڕۆژگاری ئەمیر حسەینخان و سەعادەت قولیخانیان خراپ کردبوو. ئاراز موحەممەد دوایی هاوڕێ لەگەڵ لاوەکانی ئووغرلوودا بە

---

١١٤– وابزانم ئاراز دوابەدوای بینینی ئەم کەڵەپیاوە کە بە دەستی ئاراز کوژرابوو ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

به روز جوانی هلاک آمدش      سر تا جور روی خاک آمدش

: لە ڕۆژگاری جوانیدا مرد و لەو خاکەدا نێژرا

که بر کند این کوه جنگی زجای      که افکند شیر ژیان را ز جای

: کەسێ کە ئەم کێوەی خاو کردبووە و شێری مەزنی دابوو بە عەرزدا.

که کند این پسندیده دندان پیل      که افکند در موج دریای نیل

: کەچی زلهێزەیێکی وەهای کوشت و خستیە دەریای نیلەوە.

١١٥– سەعادەتقولی چەند جار دەستی دابوو بە کوشتن و بڕینی عەشیرەتی ئووغرلوو میەیتخانیەکانەوە. شاموحەممەدی کوڕی ئاراز دەیەویست بڕوات بۆ تاران تاکو شکایەت بکات و کەچی سەعادەتقولی بەم ئاکارەی زانی و چەند کەسی نارد کەلەبچەی بکەن، کەلەبچە کرا و ڕەگی پای بڕا. ئووغرلووەکان دوایی ڕوویان کردە «بێوارە» و دوای ماوەیێك گەڕانەوە و چەند ساڵێك لە ئۆغاز مانەوە و لە ئاکامدا شاموحەممەد چی پێ نەکرا و ڕووی کردە «نەوخەندان»ی دەرەگەز و بنەماڵەکەی هەر ئێستەش لەوێدا ماونەتەوە. تاقمێك لەم عەشیرەتە هەر لە ئووغاز ماونەتەوە و دژ بە خانەکان شۆڕشیان کردووە.

تایبەت حەسەنخان و حسەینخان [١١٦] و حەزرەتقولی و مەلاحەسەنقولی بەرەو خێوە ڕۆیشتن و باب و دایك و برا و خۆشکەکانیانی لە تورکمەنستانەوە هێنا بۆ ئووغاز. ئەو کاتانەی کە شەڕی نێوان کورد و تورکمەن لە ناوچە سنوورییەکانی ئێراندا هەر نەدەبڕایەوە، ئاراز موحەممەد توانی زۆربەی زۆری دوژمەن تێك بشکێنێ و سەری زۆربەی تورکمانەکانی بڕی و بردی بۆ تاران. ئەو کاتە ڕەسم و یاسا وابوو کە ئەگەر هەر کەس سەری تورکمانێکی بردبایات بۆ قووچان خەلاتی وەردەگرت. هاوکات ئەبولحەسەنخان کوڕی ئەمیر حسەینخان بە فەرمانی ناسرەدینشا لە تاراندا کوژرا، ئاراز موحەممەدیش بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەم بەسەرهاتە بێت، سەری تورکمانەکان دەبات بۆ تاران و بۆ هەر سەرێ ١٠ تمەن وەردەگرێت.

جارێك پەلاماری تاقمێك تورکمان ئەدات و ١٧ کەس لە تورکمانەکان کە لە قەلاکەدا پەنایان گرتبوو تاکو دژ بە ئەو شەڕ بکەن و کەچی ئاراز لە بۆرجەکەوە دەڕواتە سەر و هەموویان سەردەبڕێ و لەم شەڕەدا تەنیا میرزاخان بەیگ یارمەتی داوە و سەرەکانی بۆی کۆ کردبووەوە و خستبوویە نێو پاشکوییێکەوە. ئاراز لەم شەڕەدا بریندار دەکرێت، بەڵام وەهای کرد بە تورکمانەکان کە ئەوەندە ترسابوون نەیانوێرا لەوێ بمێننەوە و هەڕایان کرد. ئێستا پیاوێکی گەورە وەکو ئەم زاتە پاکە لە گۆڕخانەی قەدیمی قەڵای بیگلەردا نێژراوە. ناوبراو دوو برای هەبووە بە ناوی «ئادینە نیاز» و «سەفەر نیاز».[١١٧]

## پاڵەوانئەحمەد وەفاداری چەگەنی

پاڵەوانئەحمەد وەفادار کە ساڵەهای ساڵ لە مەیدانی زۆرانی ئێران و جیهاندا خۆی نواندووە، یەکێ لە قارەمانە هەرەگەورەکانی ئێرانە کە زۆربەی زۆری گۆڤارەکان ناوی ناوبراویان

---

١١٦– حسەینخان لەو سوارە بەناوبانگانە بوو کە چەند جار بۆ بردنی سەری تورکمانەکان بۆ تاران بە فەرمانی ئەمیر حسەینخان ڕەوانەی ئەوێ بووە و جارێك بە دەستی تورکمانەکان دیل دەکرێ، بەڵام ئازایەتی ئەنوێنێ و خۆی ڕزگار دەکات و دەرباز دەبێ.

١١٧– منداڵانی ئادینەنیاز و سەفەرنیاز ئێستە لە گوندی «تەوەر» سەر بە ناوچەی بجنوورد دان، تەوەر لە پەنای کێوی سالووك دایە.

لەبەر کردووە، ئەوەندە نووسیوویانە. وەفادار باوکی لە کوردە چەگەنیەکانی خوراسانە و دایکی لە کوردەکانی مامیانلووی دەرەگەزە. ناوبراو ساڵی ١٣٠٦ی کۆچی هەتاوی لە دەرەگەزدا هاتۆتە دنیاوە و هەر لەو ڕۆژانەدا کە شیری دەخوارد دیار بوو کە پاڵەوانێکی زۆردار دەبێت.

وەفادار ساڵی ١٣٢٧ی کوچیٚ هەتاوی کە ٢١ ساڵ تەمەنی بوو عەلی پاڵەوانی مەشایخی دا بە عەرزدا و بەم شێوەیە خۆی بە هەموان ناساند و هەر لەم ساڵەدا ڕۆیشت بۆ سەربازی و سەروان سەفدەری کە خۆیشی پاڵەوان بوو زانی ئەم سەربازە زۆر بەهێزە و وای بە چاك زانی تاکو کاریٚ بکات ئەم پاڵەوانە نەشکێتەوە و لە زۆربەی بەربەرەکانیەکاندا بەشدار بووە و سەرکەوتنیشی وەدەست هێناوە. وەفادار بە شکستدانی کەربەلایی ئیبراهیم ڕەوانەی کێبەرکێیەکانی گشتی ئێران بوو و ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی هەتاوی بوو بە قارەمانی ئێران لە زۆرانی ئازاد و فەرهەنگی و باستانیدا. ساڵی ١٣٢٩ی کۆچی بۆ جاری دووەم بوو بە قارەمانی ئێران و بازووبەندی پاڵەوانێتی لە لایەن ڕەزاشاوە پێی درا و ساڵی ١٣٣٠ی کۆچی هەتاوی لە هەموو خولەکاندا سەرکەوت و بۆ جاری سێیەم پاشا بازووبەندی پاڵەوانی پیٚ دا. ناوبراو ساڵی ١٣٣١ی کۆچی هەتاوی توانی خوالێخۆشبووان: تەختی، زەندی و تەیموری شکست بدات، دەڵێن کاتیٚ کە پاشا بازووبەندەکەی پێی داوە ڕووی کردووە لە پاڵەوانەکان و گوتوویەتی: ئێوە چی دەکەن کە هەموو ساڵی وەفادار ئەم بازووبەندە دەباتەوە خوراسان.[118] وەفادار بازووبەندەکەی خۆی دا بە موزەی بارەگای ئیمام ڕەزا و ئێستاش هەر لەویٚ دایە.[119] ئەم کوردە پاڵەوانە خۆی دەڵێت: زۆرتر لە دوو هەزار کەس لە خەڵکی پاتەختی ئێران «پاڵەوان تەختی»یان هاوڕێیی دەکرد و بە سەڵوات و سلامەوە هێنایانە مەیدانەوە تاکو بەم شێوەیە لایەنی ڕۆحی تەختی پتەو بکەن و بازووبەندی پاڵەوانی وەدەست بکەویٚ؛ بەڵام ئەمن کەسم نەبوو کە چەپڵەم بۆ لیٚ بدات و بۆیە پشتم لەو جەماوەرە هەڵکرد و ڕووم کردە خوراسان و بە ئیمامڕەزام گوت تۆ ئیزن مەدە کە من لەم بەربەرەکانیەدا شکست بخۆم و ئێستا ئەمن کەسیترم نییە و دوای ماوەیێك بەربەرەکانیٚ دەستی پیٚ کرد و ئەمن سەرکەوتنم وەدەست

---

١١٨- ئیتلاعات حەفتەگی، ژمارە ٥٨١، ساڵ ١٣٣١ و گۆڤاری ڕادیۆ ئێران، ژمارە ٦٧، ساڵ ١٣٤١.

١١٩- گۆڤار و تەفریحات سالم، دایرەی تەربیەت بەدەنی، نەورۆز ١٣٤٥.

هانی و دەبوای لەو بەربەرەکانییەدا تەنیا حەریف زەربە بکرێت و ماوەکەش ٨٠ دەقێقە بوو.

لە دەقێقەی بیست و یەکەمدا تەختیم بەرز کردەوە و زەربەم کرد و بۆیە هەمووی خەڵك ڕژانە مەیدانەوە و سەڵەواتیان بۆ دیداری من دەرنارد وەفادار هەر لەم ساڵەدا لە بەربەرەکانێکانی ١٩٥١ی هێلسینکیدا لە وڵاتی فەنلاند بەڕێوە دەچوو دوای سەرکەوتن بە سەر مەحرەم جانداشی تورك و قارەمانی ژاپۆنیدا بوو بە تواناترین پاڵەوانی دنیا کەچی هەر لەم ساڵەدا وەفادار چووە مەیدانی قارەمانی ١٦٠ کیلۆیی ڕووسیەوە بەڵام ئەو ڕووسیە ئەوەندە زل و گەورە بوو کە لە ئاکامدا وەفادار شکستی خوارد و هەروەها ساڵ ١٩٢٥ی زایینی بۆ جاری دووەم هەر لەم پاڵەوانە ڕووسیە شکستی خوارد.

ساڵی ١٩٤٥ لە بەربەرەکانێکانی ژاپۆندا توانی پاڵەوانەکانی تورکیە و ئاڵمانی شکست بدا و سێیەم جار ڕووسیەکە زاڵ بوو بە سەریدا لەم ساڵەدا کاتێ کە ژاپۆنیەکان بینیان پاڵەوانە ڕووسیەکە زۆر کەڵەگەت و زلترە لە وەفادار، هەموویان چەپڵەیان بۆ وەفادار لێ ئەدا و بۆیە لە ناو کاشیەکانیاندا وێنەی بەڕێز وەفاداریان لێ دابوو.

وەفادار ساڵەکانی دوایی جارێك لە هێلسینکی فەنلاندا پلەی سێیەمی وەدەست هێنا، ناوبراو دوو دیپلۆمی زۆرانی لە وڵاتی فەنلاندا وەدەست هانی.

وەفادار ئێستاش هەر کە پیر بووە زۆر بەهێز و توانایە و کاتێ کە ساڵی ١٣٦٢ی کۆچی هەتاوی هاوڕێ لەگەڵ بەڕێز «شەیخۆ» لە کوردەکان مامیانلوودا ڕۆیشتن بۆ وەرزشگای ڕائاهەنی مەشهەد بە جوانی بۆم دەرکەوت کە کەسی‌تر لە ئێراندا نییە کە وەکو بەڕێز وەفادار توانا بێت. وەفادار هەر وەکو تەواوی کوردەکانی خوراسان شیعەیە و زۆر ئایین و مەزهەبیان خۆش ئەوێ و زۆر ئاشقی حەزرەت عەلییە.

گۆڤاری ئیتلاعات حەفتەگی ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی هەتاوی بە بۆنەی بەربەرەکانیەکانی تۆکیوی یابانەوە نووسیویەتی:

وەفادار هەر وەکو پاڵەوانەکانی مێژوو کاتێ کە زۆران دەگرێ بەرز دەڵێ «یاعەلی» کاتێ کە زەندی لەگەڵ حەریفە فەنلاندیەکەدا دەستی کرد بە بەربەرەکانێ، وەفادار بەرز هاواری دەکرد «یاعەلی ئیزن مەدە کە ئێمەی موسوڵمان شکست بخۆین».

پاڵەوانگەلێکی وەکو وەفادار ئەگەر لە وڵاتێکیتردا بوایات زۆر ڕێز و حورمەتی دەگیرا، بەڵام ئەگەرچی ڕێز و حۆمەتی بۆ دانەنرا، ڕژێمی پاڵەوی دژ بە مافەکانی ئەو پاڵەوانە وەستان.

وەفادار زۆر پیاوێکی پیاوانە بوو و خۆی دەڵێت دوای شەهید بوونی خوالێخۆشبوو تەختی قەت نوێژێکم نەکردووە کە دوعام بۆ تەختی نەناردبێ.

## ٣- پرۆفیێسۆر سادقی چەگەنی

ڕۆژی ٢٣ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٦٣ی کۆچی هەتاوی کاتێ کە بەشێك لەم کتێبەم لە ژێر چاپدا بوو، هەلێکم بۆ ڕەخسا تاکو بەڕێز حەسەن سادقی باوکی پرۆفیێسۆر سادقی ببینم و چەند پرسیارێکیان لێ بکەم.

بەڕێز سادقی بە پیاوەتییێکی زۆرەوە ئیزنی دا تاکو بیانبینم و سەبارەت بە قووچان و چەگەنە باسمان دەست پێکرد و ناوبراو فەرموی یەکەمین کەسێك کە لە قووچاندا قوتابخانەی نەتەوەیی دروست کرد و واتا لەو کاتەدا لە مەشهەد قوتابخانە نەبوو، پیاوێکی ڕووسی بوو. ناوی ئەم کەسایەتیە «بەخشعەلیخان» بوو کە خۆی بەڵگەی دیپلۆمی عێشقئابادی بوو، بەخشعەلیخان هاوڕێی براکەی کە ئەویش هەر مامۆستا بوو زۆر پیاوەتیان نواند و بە ماوەی سێ ساڵ لە ڕێگای عێلم و زانیاری ئەم خەلکەدا ڕەنجیان داوە و هاوکات ١١٠ قوتابی دەرسمان دەخوێند. دەرسەکانمان زۆر سەخت بوو و مامۆستای ناوبراو زۆر حەزی لە وەرزش بوو و بۆیە ئێمەش زۆر وەرزشمان دەکرد و هەروەها لە حەکیمیدا دەستێکی باڵای بوو و ناخۆشەکانی بە عەشقەوە دەرمان دەکرد و پارەی لێیان وەرنەدەگرت و خەلکی قووچان ئەم پیاوەیان زۆر خۆش ئەویست و بۆیە بەرپرسی دایرەی فەرهەنگی خوراسان لەم کارە زۆر دەترسا و فەرمانی دا تاکو بەخشعەلی لەوێ نەمێنێ و بڕوات بۆ مەشهەد کەچی بەخشعەلی بە بۆنەی ئەوەی زۆر دڵی بە لای قووچانەوە بوو ئاوڕێکی لەو فەرمانە نەدایەوە و نەڕۆیشت بۆ مەشهەد. مامۆستایەك کە لە مەشهەدەوە نێردرابوو بۆ قووچان زۆر تووڕە و قەرەچی بوو بەم بۆنەوە منداڵەکان زۆر تووڕە بوون و دژ بەم مامۆستایە لە شەقامەکانی

قووچاندا دەستیان کرد بە ڕێپێوان و هەموو مێز و سەندەڵیەکانیان شکاند و ڕۆیشتن بۆ دارولخەلافە و هاوکات حاکمی خوراسان یەکێ لە ناپیاوەکانی قاجاڕ بوو و بە بینینی ئێمە فەرمانی دا بە دارودەستەکەی تاکو هێرش بهێننە سەرمان؛ بەڵام هەڵویستی ئێمە لەوە پڕهێزتر بوو کە ئەوان بتوانن ڕاومان بنێن و بەرپرسی دایرەی فەرهەنگی خوراسان لە ڕێی ناچاریەوە مەلاییکی ئاینی بە ناوی سەدری زەنجانی کرد بە جێگری ئەو مامۆستایە و ڕاسپێری قووچانی کرد، سەدری زەنجانی پیاوێکی خوێندەوار و زیرەك بوو و دوایی توانی قوتابخانەی سەرەتایی قووچانیش بخاتە ڕێ و هاوکات براکەشی مامۆستای قورئان و خەت بوو.

ئەو قوتابخانەی کە بەخشعەلی دروستی کردبوو ناویان نابوو قوتابخانەی «ئەحمەدی قووچان» و مەبەست لە ئەحمەدی هەر ئەحمەدشا بوو. دوای ئەم کارەساتە بەخشعەلی بە زۆر بەرەو عیشقئاباد گەڕایەوە و دوایی ڕووسەکان بەو بیانووەی کە جاشی ئێرانە، تیرۆریان کرد.

دووەمین قوتابخانەی کە لە قووچاندا بنیات نرا، قوتابخانەی سەرەتایی «مێهرداد قووچان» بوو کە پێشتر ئەو خانووە بە دەستی ماژوور ئیسماعیلخانەوە بە فەرمانی کولوونێل پسیان بنیات نرابوو و ئەمن هەر لەوێدا دەرسم خوێندووە.

باوکم میرزا حسەین سادقی کوڕی حەسەنبەیگی کوڕی ئاغا ئیبراهیم چەگەنی بوو خەتێکی زۆر جوانی بوو و شیعری جوانی دەخوێندەوە و خۆیشی شیعری دەگوت و هەروەها خۆی بە دەستی خۆی سێ قورئانی نووسیوەتەوە کە وەرگیڕانەکەی بە خەتی نەستەعلیق نووسراوە ئێمە لە چەگەنەی خوارەوە کە ناوەندی ناوچەکەیە نیشتەجێ بووین.[۱۲۰] حسەینی کوڕم (پرۆفێسور سادقی) لە ساڵی ۱۳۰۸ی کۆچی هەتاوی لە چەگەنە هاتە دنیا و هەتا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی لە چەگەنەدا دەرسی خوێند و دوایی بۆ خوێندنی پۆلی شەشەم ڕوو دەکاتە قووچان و لەوێ سیکل دەگرێت و دوایی لە مەشهەددا دیپلۆم وەردەگرێت و پاشان لە زانکۆی

---

۱۲۰– بەڕێز حەسەن سادقی کە خۆی لە خوێندەوارەکانی ئازا و لێهاتووی خوراسان بوو و بە تایبەت لە بواری ساماندان بە بارودۆخی کەلتووری چەگەنەدا دەوری زۆری هەبووە و تا ساڵی ۱۳۳۷ی کۆچی هەتاوی هەر ئەو دەورەی هەبووە و لە ناوچەی چەگەنەدا ۳۰ قوتابخانەی سەرەتایی و یەك قوتابخانەی دواناوەندی خستۆتە ڕێ و بۆ خەڵکی ئێران بە تایبەت بۆ خەڵکی ناوچەی چەگەنە زۆر هەوڵی داوە.

تاران و کۆلێجی پزشکی ئەم زانکۆیەدا وەردەگیردرێت و ساڵی ١٣٢٩ی کۆچی هەتاوی بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕاسپێری هەندەران دەکرێت و دوکتۆرای پزیشکی لە هەندەران وەرگرت و ئەم جارەش هەر خۆی بە نەخوێندەوار دەزانێت و بۆ وەرگرتنی پسپۆڕی ڕەوانەی ئەمریکا دەبێت. ناوبراو ٤ ساڵ لە فیلادلفیای ئامریکادا پسپۆڕی خوێند و بوو بە جەرراحی گشتی و جارێکیتر بە ماوەی ٣ ساڵ دەرسی خوێند و بوو بە پسپۆڕی دڵ. کە دواییسن بڕوانامەی دوکتۆرای خۆی لە سانفرانسیسکۆدا وەرگرت و لەوێوە ڕەوانەی سوویسرا دەبێت و دەبێ بە جێگری پسپۆڕی یەکەمی دڵ لە لووزان؛ بەڵام لەبەر ئەوەی دڵی بە لای ئێرانەوە بوو، ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی گەڕایەوە ئێران و بە ماوەی ساڵێك لە مەشهەد خزمەتی بە خەڵك کرد. بە بۆنەی نەبوونی کەرەستەی پزیشکیەوە گەڕایەوە بۆ هەندران و لە سویسرادا بوو بە سەرۆکی بەشی دڵ و هەروەها بوو بە مامۆستای زانکۆ و هاوکات لە نامەیێکدا کە بۆ پاشای ئێرانی نووسیبوو نیگەرانی خۆی سەبارەت بەم نالەباریەی کە لە ئێراندا بوو، دەربڕیبوو.

دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕینی گەلانی ئێرانی ساڵی ١٣٥٧ی کۆچی هەتاوی کە بۆ دەرمانی ئیمام خومەینی هاتەوە ئێران، ئیمام خومەینی بە بەڕێز دوکتۆر زەڕگەری وەزیری بێهداری فەرموو تاکو کارێك بکەن دوکتۆر سادقی وەرگەڕێتەوە ئێران؛ بەڵام ناوبراو لە وڵامدا گوتبووی چونکە پێویستم بە کەرەستەی پزیشکی هەیە و لە ئێراندا نییە ناتوانم وەرگەڕێمەوە. لە سەردەمێکدا کە بەڕێز ئەحمەدزادە پارێزگاری خوراسان بوو تاقمێك لە پزیشکەکانی مەشهەدی ڕەوانەی وڵاتی سویسرا کرد تاکو بتوانن بەو ڕایە بگەن کە بەشی دڵی نەخۆشخانەی خوراسان بخەنە ڕێ. ئەگەرچی ئەم چەند پزیشکە بە بۆنەی بڕێك تەنگی و چەڵەمەوە نەگەیشتن بە مەبەستەکە، بەڵام پرۆفێسور هەر خەریك بوو بۆ سەربەرزی گەلەکەی ڕەنجی ئەکێشا و نەخۆشە ئێرانیەکانی دەرمان دەکرد. دوای ماوەیێك دەوڵەت و خەڵکی سویسرا لەم کارەی سادقی وەڕەز بوون و گوتیان نەخۆشخانەکانی سوویس بووەتە نەخۆشخانەی ئێرانیەکان و بۆیە بڕیار درا هەمووساڵی زۆرتر لە ٥٠ کەسی ئێرانی نەچنە نەخۆشخانەکانی سویسراوە. لە بەڕێز حەسەن سادقی پرسیارمان کرد کە تۆ چەند کوڕت هەیە و ئەویش لە وڵامدا گوتی منداڵەکانم

بریتیـن لە: حسەین سادقی، عەلی سادقی کـە دوکتـۆرای فـیزیك و ئـەتۆمی هەیـە، حـەبیب سادقی کە پسپۆڕی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە و بە ماوەی ٤ساڵ لە مەراکێشدا بوو و ئێستاش لە کانادایە، مەحـموود سادقی کە ئێستا لـە ئەلـجەزایر دایـە، موحـسێن سـادقی کـە پـسپۆڕی کۆمپیوتێرە و لە سویسرایە، موحەمـمەدرەزا سادقی کە بڕوانامەی باڵای دوکتـۆرای پیێـە لـە بواری دەروونناسیدا و ئێستا مامۆستای زانکۆی مەشهەدە، پەروین سـادقی بـۆ کالووریووسی ئەدەبیاتی هەیە، بەتوول سادقی کە خێزانی دوکتۆر مەلەکییە.

ناوچەی چەگەنی زۆرتر لە سەد گوندە و زۆربەیان بە تورکی قسان دەکەن، ئـەو گوندانـەی کە بە کوردی قسان دەکەن و زۆربەشیان تۆپکانلوون بریتیـن لـە: کەلاتەمـەلوو، مەشـکانلوو، گوڵشەنئاباد، خەلانلوو و ئابڕوونی دەهەنەشوور.

چەگەنی ژوور: بیشئاقاج، بوورسەڵان[121]، حەسـەنئـاوا، سـوڵتانمەیـدان، سـاقیبـەیگ، نووسرا، خواجەئاباد، یەنگجە، ئاقایە، بشکەن، سـوولە، عێـشقئـاوا، کێوسـەخت، بیـدخان، قزڵئاقوور، بابابەهلوول، حاجیئاباد، گوڵبیـن، وانیچکان، قـزڵقـەڵا، زێـك[122]، شـێخمـستەفا، قەهقەهە، خاییسەك، تالبی، ئەمیـرئاوا، تیـران، کەڵاتەمەیدان سووختانلوو و... هتد.

## فەلسەفەی ڕاگوێزانی کورد بۆ خوراسان

لە بەرگی یەکەمدا گوتـمان کە خێڵی سەفەوی کاتێ کە لە ئێراندا هاتنە ڕووی کـار، بـۆ بەربەرەکانێی دژ بە ئیمپراتووری عوسـمانی خۆیانیان بە خـاوەن دەسـەڵاتی سەرانـسەری ئێـران دەزانی و هەروەها مەزهەبی شیعەیان دژ بـە سـونی لـە ئێرانـدا ڕەسـمی کـردەوە و هاوکـات دەسەڵاتی دراوسێ هـەموو سـونی بـوون زۆر کـارێکی ئاسـایی نـەبوو بۆیـە ئێـران لـە هـەموو شوێنێکەوە بە تایبـەت لـە بـاکوور و ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوای ئێرانـەوە کەوتـە بـەر پـەلاماری دراوسێکان بە تایبەت دەسەڵاتی عوسـمانی و ئوزبەکەکان.

---

١٢١– وا دیارە لە کوردەکانی بووزلان بێ. بووزلانەکان لە تەنیشتی شیـرواندا هەن.

١٢٢– وا بزانم پاشماوەی کوردەکانی زیکن کە لە نێوان چەگەنیەکاندا ماونەتەوە و بە تورکی قسە دەکەن.

شائسماعیل یەکەمین کەسێکە کە بە پشتیوانی کوردەکانی قارەمانلووە بە سەرۆکایەتی بەیرامبەیگ قارەمانلوو و لە خوراساندا دژ بە ئوزبەکەکان وەستا و دوای مردنی ئەو شاتەهماسبی کوڕی کوردەکانی زەنگەنە و چەگەنی و زیك و کەلهوڕی نارده یارمەتی هێزەکانی خوراسان و لە ئاکام و دوارۆژەکانی پاشایەتی سوڵتان موحەممەدی سەفەوی و لە سەرەتای حکوومەتی شاعەبباسدا ئوزبەکەکان پەلامارەکانیان پەرەی سەند و خوراسانیان بە تەواوی خاپوور و وێران کرد و کەچی شاعەبباس زاوری نەدەکرد لە ناوچەی ڕەی زۆرتر بڕواتە پێشەوە و لە ئاکامدا شارەکانی مەشهەد و ڕادەکان و سەبزەوار و نەیشابوور و ئێسفەراین لە لایەن ئوزبەکەکانەوە داگیر دەکرا کە ئەم بەسەرهاتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٠٠٠ی کۆچی مانگی کە هاوکات بوو لەگەڵ پێنجەمین ساڵەهاتی پاشایەتی شاعەبباس.

ئێسفەراین لەو شارانەیە کە وەك مەشهەد لە بەرانبەر هێرشی ئوزبەکەکانەوە وەستا. ئەبوموسلێمخان چاوشلوو فەرمانڕەوای ئێسفەراین هاوڕێ لەگەڵ تاقمێك لە سەربازەکانی ئوستاجلوو و کورد و... هتددا کە لەو قەڵایەدا بوون بۆ پاراستنی قەڵاکە زۆر هەوڵیان دا و هەروەها عەبدولموئمێنخان بۆ داگیرکردنی قەڵای ئێسفەراین هەوڵی زۆری داوە و چوار مانگ قەڵاکەی گەمارۆ داوە و هاوکات چەند جار هێرش کرایە سەر قەڵاکە و بەڵام ئەوانەی کە لە ناو قەڵاکەدا مابوونەوە زۆر ئازایانە شەڕیان کرد و زۆربەی زۆریان لە ئوزبەکەکان لە قەڵاکە سەرکەوتن و زۆریان لە ژن و منداڵی خەڵکی قەڵاکە کوشت ئەبوموسلێمخان هاوڕێی چەند لاوی بەئەمەك کە پێکەوە شەڕیان دەکرد ئەو بورجەی کە خۆیان دەیانپاراست نەیاندا بە دەستەوە و سێ ڕۆژان لە ئوزبەکەکانیان دەکوشت و دوای سێ ڕۆژ ئیتر ئوزبەکەکان ورەیان لێ بڕا. بەڵام بە داخەوە چەکەکانیان بەبێ تیر مایەوە و ئوزبەکیەکان کاتێ بەم بەسەرهاتەیان زانی، هێرشیان کرد و قەڵایان داگیر کرد و ئەو شێرە پیاوانەیان بە خەنجەری ئەستەم بێگیان کرد کەچەڵ قوباد کەلهوڕ کە لەو شەڕەدا لە ناو قەڵاکەدا بەند کرابوو[١٢٣] و هاوکات کە

١٢٣– کەچەڵ قوباد کەلهوڕ یەکێ لە ئەفسەرە بەناوبانگەکانی سەردەمی سوڵتان موحەممەد و شاعەبباس بوو و لە شەڕەکانی ئازەربایجاندا دژ بە ڕوومیەکان ئازایەتی زۆری پیشان داوە و شاعەبباس ڕێزی زۆری بۆی داناوە.

ئوزبەکیەکان هێرش دەکەنە سەر قەڵاکە و دەیگرن، بەڵام یەکێ لە ئوزبەکیەکان دڵی نایەت ئەم پیاوە بکوژێت و لە شەوی تاریکدا ڕەوانەی عێراقی دەکات.[١٢٤] (عێراقی عەجەم قەزوێن و... هتد.)

هاوکات خەڵکی ئێران لە شوێنێکەوە دیل دەکرێن و ناموس و حەیایان پێشێل دەکرێ. شاعەبباسی گەورە بەبێ ئەوەی نیگەرانی باسەکە بێت هەر خەریکی خۆشی خۆیە.

ساڵی ١٠٠١ی کۆچی هەتاوی فەرهادخان قارەمانلووی سوپاسالاری شاعەبباس، گیلان و مازندەران داگیر دەکات و کاتێ کە دەگاتە سنوورەکانی خوراسان سوپای شاعەبباس تاکو نزدیکی بەستام هاتبوونە پێشەوە بەڵام چون نامەی پڕ لە مەترسی عەبدولموئمێن گەیشتە دەستی و لە ترسی گیانی خۆیدا ڕووی کردە قەزوین. هاوکات لەگەڵ پێنجەمین ساڵی پاشایەتی شاعەبباسدا فەرهادخان کورد قارەمانلوو و زۆڵفەقاری برای دواییان هێنا بە شۆڕشەکە و فەرهادخان ڕۆیشت تاکو سەرکوتیان بکات زولفەقارخان کورد قارەمانلوو برای فەرهادخانی سوپاسالاری ئێران بە هێزێکی ٤ هەزار کەسیەوە لە قەزوێنەوە ڕوویان کردە خوراسان و هاوکات فەرهادخان قارەمانلووش بە هێزێکەوە بڕواتە نێو ئەو سوپایە.

شاعەباس دوابەدوای دیتنی قیتاوقیت بوونی سوپاییێکی ٢٠ هەزار کەسی، خێرا خۆی نامەییێکی نووسی بۆ عەبدولموئمێنخانی ئوزبەك و قوتبەدینئاغا چەگەنی بردی بۆ سەرۆکی ئوزبەکی و مەبەستی پاشا لەم نامەیە ترساندنی ئەوان بوو و هەوڵی ئەدا کە ئەوەندە ئوزبەکەکان لێیان بترسین تاکو دەرباز کردنی. بەڵام ناوبراو هیچ کە نەترسا کەچی قوتبەدینخانی چەگەنی کوشت. شاعەبباس بە بیستنی ئەم هەواڵە فەرمانی دا بە زولفەقارخان قارەمانی قارەمانلوو تاکو بڕوات و بەستام بگرێت. ناوبراو ڕۆیشت بۆ قەزوێن و شەڕ دەستی پێ کرد و کوردەکان سەرکەوتن.

سوپای ئێران لە جاجەرمەوە ڕۆیشت بۆ سەنخاست و لەوێشەوە دەیەویست بڕوات بۆ ئەیرە (ئیرەج) و فەریمان. ئوزبەکەکان کە شکستیان خواردبوو زۆریان بۆ عەبدولموئمێن هێنا

---

١٢٤- عالەمئارای عەبباسی، ئەسکەندەربەیگ تورکمان، بە پێشەکی ئیرەج ئەفشارەوە، لاپەڕەی ٤٤٦.

تاکو بەرەو مەشهەد بڕوات. شاعەبباس گەیشتە شاری ئێسفەراین و حکوومەتی ئەوێی دا بە دەستی بوداقخانی کوردی چەگەنیەوە کە بۆ دروست کردنەوەی ئەو شارە هەوڵی زۆری داوە. شاعەبباس نەیوێرا بە دوای عەبدولموئمێندا بڕوات بۆ خوراسان و بۆیە ڕووی کردە ئەستەرئاباد و عەبدولموئمێن بە بیستنی ئەم هەواڵە لە مەشهەدەوە ڕووی کردە ئێسفەراین و زۆربەی زۆری لە خەڵکی ناوچەکەی کوشت.

کاتێ شاعەبباس گەیشتە قەزوین و هەواڵی مردنی سولتان مورادخانی ئیمپراتۆری عوسمانی پێ گەیشت، خێرا زولفەقارخانی قارەمانلووی بۆ سەرەخۆشی نارد بۆ دەرباری عوسمانی. ساڵی ١٠٠٥ کۆچی مانگی ئوزبەکەکان پەلامارێکی گرنگیان کردە سەر خوراسان و هەتا یەزد ڕۆیشتنە پێشەوە، بەڵام لەوێ بە دەستی هێزەکانی ئەفشار تێکشکان و گەڕانەوە. لە سەرەتای ساڵی ١٠٠٦ی کۆچی مانگیدا جەماوەرێکی زۆر لە ئوزبەکەکان لە دوو لاوە هێرشیان هێنا سەر وڵاتی ئێران بە تایبەت بەستام و دامغان بە یەکجارە کەوتە بەر پەلاماری ئەم ناپیاوانەوە و هاوکات حسێنخان[١٢٥] چەگەنی بەرنگاریان بووە و زۆربەی زۆری لە ئوزبەکەکان کوشت. بە داخەوە حەسەنعلیخان و میرزاعەلی عەرەب شەهید کران و ئوزبەکەکان ڕێگای دامغانیان گرتە بەر و هەتا خواریان بە دەستەوە گرت و هێرشەکەیان تاکو ئاران و بیدگوڵ و کاشان و بادیە گەیشت، خەڵکی دارۆغەی سمنانیش بە بۆنەی حەسەنعلیخانەوە ناو ڕێیان پێیان نەگرت. بەڵام شاعەلیخان سەرۆکی عەشیرەتی کورد چەمەشگەزك کاتێ ئاگاداری ئەم کارە دەبێ، بە هێزێکی کوردانەوە دەکەوێتە دوای ئەم ئوزبەکیانە و لە ناوچەی بادیەدا پێیان گەیشت و شەڕ دەستی پێ کرد و چەند کەسی لە ئوزبەکەکان کوشت و ئوزبەکیەکان زانیان توانای بەربەرەکانیان نییە، چاکترین ڕێیان بە هەڵاتن زانی و هەموویان هەڵاتن و شاعەلیخان[١٢٦] تەنانەت کەلوپەل و کەرەستەی شەڕ کە لە ئوزبەکیەکان بەجێ مابوو ناردیەوە. ئەم باسە وڵامێکە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن شاعەبباس

---

١٢٥– حەسن عەلیخان دروستە، نە حسێنخان.

١٢٦– شاعەلی لە کاتی مانەوەیدا لە خواردا پلەی «سوڵتانی» بوو نە «خانی». کەچی دوای سەرکەوتنی لە شەڕی دژ بە ئوزبەکەکاندا بوو بە «خان».

کوردەکانی چەمەشگەزکی بۆ خوراسان دوور خستۆتەوە و وشەی دوور خستنەوە قەت دروست نییە و کورد ئەوەندە ژێر چەپووکە نەبوو کە بە زۆر دوور بخرێنەوە بۆ خوراسان، چون لەم سەردەمەدا کوردەکان بە هێز و تواناترین سوپای ئێران بوون. کەسێ وەکو بەرات بەهادوور جریستانی کە لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا سەبارەت بە ئەو باسمان کرد هەتاکو ئەو ڕۆژەی کە بێ گیان، لاشەکەی مایەوە هەر خەنجەرەکەی بە دەستیەوە بوو و تەنانەت لە کاتێ دەست بە ئاویشدا سەرەتا خنجەرەکەی هەڵگرتووە و کاتێ لێیان پرسیوە کە تورکمانەکان ئێستا هێرش ناهێنن تۆ بۆچیتە ئەم خنجەرە، گوتویەتی ئەگەر لەم کاتەدا دوژمن هێرشی کرد من پێی بڵێم تۆ ڕاوستە تاکو چەکەکەم هەڵدەگرم.

بەرات بەهادور بە خەڵکی جریستان کە لە ناوچە سنووریەکانی ئێران و ڕووسیەدا بوون گوتبووی: چەکی ئێوە وەکو نامووس و شەرەفتانە و بۆ هیچ کاتێ لێی دوور مەبنەوە. بەڵێ ئازیزان ئاوەها پیاوانێ بوون کە ئەم ئاو و خاکەیان لە دەستی بێگانە دەرهانی. کاتێ کە دەبینن شاعەبباس ناوێرێ تەنانەت ڕوو بکاتە ئوزبەکەکان و کەچی لە هەمان کاتدا کوڕە کوردێکی وەکو شاعەلیخان دژ بە ئوزبەکەکان دەوەستێ و شکستیان ئەدات و تەنانەت بۆ هیچ کاتێ ئەو ئوزبەکانە ناوێرن هێرش بهێنن، کەچی ئوزبەکەکان دوو جار لە لایەن کوردەکانەوە هێرش کرایە سەریان کە بریتی بوون لە کوردەکانی قارەمانلوو، چەمەشگەزك. کوردەکانی چەمەشگەزك کە ئەم سەردەمە لە مەهابادەوە کۆچ درابوون بۆ خوراسان و لە ناوچەی خواردا نیشتەجێ کرابوون.

شاعەلیخان ئەو پیاوە ئازا و دلێرە کە بە یەك ئیشارەتی ئەو ٤٥ هەزار بنەماڵەی کورد چەکیان هەڵدەگرت و وەك بڵێی ئەم فەرمانە، فەرمانی خودا بوویێت بۆچی مەگەر شاعەبباس توانای کاری ئاوەهای هەبووە کە بتوانێ ئەم کوردە ئازایانە بە زۆر لە مەهابادەوە کۆچ بدات بۆ خوراسان؟ مەگەر دوور خستنەوەی کوردەکان کارێکی شۆخی بوو؟

کوردەکان بە مەیلی خۆیان لە ناوچەی ئازربایجان و مەهابادەوە بە بۆنەی زەوینی چاکی کشتوکاڵی دەوروبەری تاران کە ئەو کاتە پێی دەگوترا ڕەی هاتنە ئەوێ. لەبەر ئەوەی ناوچەکانی ئازەربایجان و کوردستان بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری جوان نەبوون و هەروەها تورکەکانیش پەلاماری ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئێرانیان دابوو و ئەم دوو خاڵە بوو بە هۆی کۆچی

کوردەکانەوە، هەر لە سەردەمی سوڵتان موحەممەدی خودابەندەدا ناوچەکانی قەفقازی باشووری واتا شارەکانی قەرەباغ، شیروان، گەنجە و نەخجەوان و ڕووباری ئەرەس کە ناوەندی ییلاخ و قشلاخی کوردەکان بوو، دوای چەند شەڕ و پێکدادان کەوتە دەستی تورکەکانی عوسمانی و بەو بۆنەوە کوردەکان و قاجارەکان و ئوستاجلووەکان و ئەفشارەکان ئەو ناوچەیان بەجێهێشت و خۆیانیان گەیاندە ناوچەی ئازەربایجان و جگە لەم بنەماڵە و عەشیرەتانەی کە ناو بران، کوردەکانی لوبنان و سووریە و عێراق و تورکیەش بە بۆنەی ئەوەی زۆر دڵیان بە لای ئێرانەوە بوو ناوچەکانی خۆیانیان بەجێهێشت و بەرەو ئازەربایجان گەڕانەوە و کەچی کۆبوونەوەی ئەو هەموو هێزە کوردیە لەو ناوچەدا کە هەموویان ئاژەڵدار بوون تۆزێك گران تەواو دەبوا و دەبوو بە هۆی شەڕ و پێکدادانیانەوە.

شاعەبباس کە خۆی پیاوێکی زیرەك و بەسیاسەت بوو، خێرا بۆی دەردەکەوت کە کۆبوونەوەی ئەم هەموو عەشیرەتە کوردە لە ئازەربایجاندا زۆر پڕ خەتەرە و کەوتە بیری ئەوەی تاکو کارێك بکات ئەم کۆبوونەوە تێك بدات و بۆیە وای بە چاك زانی تاکو سەرۆکەکانی چەمەشگەزك دڵخۆش بکات کە ڕوو بکەنە خوار و وەرامین، بەو بیانوەی کە ئەو ناوچانە بۆ ئاژڵداری زۆر لەبارن، بەڵام کوردەکان دوای دوو سێ ساڵ کە لە خواردا مانەوە و لە هەمان کاتدا دەیانبینی کە ئوزبەکەکان خوراسانیان داوەتە بەر پەلاماری خۆیان و ژن و منداڵەکانی ئێران بە دیلی دەگرن و زوڵم و زۆر دەکەن، نەیانتوانی خۆیان ڕابگرن و بۆیە هێرشیان کردە سەر ئوزبەکەکان و ئوزبەکەکانیان لە ئێران کردە دەرەوە و دوابەدوای ئەم بەسەرهاتە بە شاعەبباسیان ڕاگەیاند کە بۆ پاراستنی خوراسان دەیانەوێ ڕوو بکەنە ئەو ناوچانە. کەچی هەروەهاش بوو و کۆچی مێژوویی کوردەکان بۆ خوراسان دەستی پێکرد و خۆیانیان گەیاندە شاری نسا (شاری مێژوویی و گرنگی سەردەمی ئەشکانیەکان) و بوون بە سنوورەوانی چالاکی خاکی ئێران. عەشیرەتی گەورەی کورد بەرەو خوراسان دەڕۆیشت و هاوکات شار و شارۆچکەکان دەهاتە ژێر دەسەڵاتیان و یەکەمین شارێك کە کوردەکان لە دەستی بێگانەیان گرتەوە شاری «بەستام» بوو و دوایی بەیرامعەلی سوڵتان چەگەنی برای حەسەن عەلیخان چەگەنی فەرمانڕەوای پێشووی بەستام بوو بە سەرۆکی دەسەڵاتی ئەو شارە.

کوردەکان، خوراسانیان گرت و بە ئەمری شاعەبباس فەرهادخان قارەمانلوو کوژرا. مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٠٠٦ی کۆچی مانگی کۆچی مێژوویی کوردەکان لە خوارەوە بەرەو خوراسان دەستی پێکرد.

شاعەبباس بە بۆنەی ئەوەی زۆر مازندەرانی بە لاوە جوان بوو و دەسەڵاتی مازندەوان و ئەستەرئاباد بە دەستی فەرهادخانەوە بوو و شاعەبباس هاوڕێی فەرهادخان بەرەو مازندەران ڕۆیشت، ئەڵڵاوێردیخان سەرکردەی فارس و گەنجعەلیخان کرمان دەبوای لە یەزدەوە برۆن بۆ خوراسان. زولفەقارخان قارەمانلوو بیگلەربەیگی ئازەربایجان هاوڕێی دە (١٠) هەزار سەرباز گەیشتنە بەستام. هەمووی ئەم سەرکردانە جگە لە ئەڵڵاوێردیخان کورد بوون.

شاعەبباس دوای چەند ڕۆژ کە لە مازندەراندا مایەوە ڕووی کردە بەستام و سوپای ئێرانی ڕێکوپێك کرد.

فەرهادخان قارەمانلووش حکوومەتی مازندەران و ئەستەرئابادیدا بە دەستی یەکێتر لە پیاوە گەورەکانی قارەمانلوو و خۆی هاوڕێ لەگەڵ پاشا ڕووی کردە بەستام. شاعەبباس فەرمانی دا بە فەرهادخان قارەمانلوو و زۆلفەقارخانی برای بیگلەربەیگی ئازەربایجان تاکو ببن بە پێشەنگی شەڕەکە تاکو ناوچەکە لە هێزەکانی ئوزبەك پاك بکەنەوە. شاعەبباس نامەیێکی نووسی بۆ عەبدولموئمێنخانی ئوزبەك و پێی ڕاگەیاند تاکو بە بێشەڕ خوراسان پاك بکاتەوە و هەروەها نامەیێکی نووسی بۆ ڕۆحوڵڵابەیگ پەساوڵ تاکو کارێ بکات زولقەدر و عەبدولموئمێن لە مەشهەد پێکەوە باس و لێدوان بکەن.

فەرهادخان قارەمانلوو دوای هاتنی بۆ خوراسان پەیامی نارد بۆ گوند و لادیەکان کە ئێمە بە سوپایەکی گەورەوە هاتووینەتە هاناتانەوە و ئێوەش لە سەرتانە کە دوژمن لە زێد و وڵاتی خۆتان بکەنە دەرەوە و بە پێی ئەم پەیامە شارەکانی سەبزەوار، نەیشابوور و کاشمەر و ئێسفەراین یەك لە دوای یەك دژ بە ئوزبەکەکان وەستان و لە شاری خۆیان دەریانیان کرد. لە مەشهەددا فەرهادخان زانی کە عەبدولموئمێنخان بە دەستی هاوڕێیەکانی خۆی کوژراوە ئەویش خێرا ئەم پەیامەی بە پاشای ئێران ڕاگەیاند و مزگێنی گرتنەوەی مەشهەدیشی ڕەوانەی پاشای سەفەوی کرد. ئەم هەواڵە شادی هێنەرە لە ڕێگای شەقان و جۆربەددا گەیشتە پاشا و

ئەویش سەجدەی شوکری برد و ڕووی کردە مەشهەد و ڕۆژی ٢٤ی زیحەججەی ١٠٠٦ی کۆچی مانگی گەیشتە ڕووباری تووس.

فەرهادخانی قارەمانلوو و زولفەقارخان و بوداقخان کورد چەگەنی و گەورە پیاوەکانی‌تری خوراسان هاتنە پێشوازیەوە و ڕۆژی دوایی پاشا بەرەو هەرات ڕۆیشت. پاشا، قازی سوڵتانی - کە یەکێ لە سەیدەکانی توربەت حەیدەرییەوە بوو- کرد بە سکرتێر و بەرپرسی بارەگای ئیمام ڕەزا. بوداقخان چەگەنی و شاهقولی سوڵتان بەیات فەرمان دران تاکو هاوڕێ لەگەڵ موحەممەدخان ئوزبەك بەرەو نسا و ئبیورد و مەروو بڕۆن و دەسەڵاتی ئەو ناوچانە لە خێڵی ئوزبەك وەربگرنەوە و بیدەن بە دەستی نوورموحەممەدخانی ئوزبەکەوە کە سەر بە سەفەویەکان بوو.

لەم سەردەمەدا سوپای فارس و کرمان گەیشتنە خوراسان. شاعەبباس وەزیری باڵای خۆی واتا حاتەمبەیگی هاوڕێ لەگەڵ شاعەلی[١٢٧] سوڵتان سەرۆکی عەشیرەتی کوردی چەمەشگەزك بەرەو هەرات نارد و خودی پاشا ڕۆژی یەکشەممەی سەرەتای مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ١٠٠٧ی کۆچی مانگی بەرەو ئیلغار هات و لە ڕێگای هاتنیدا فەرهادخان قارەمانلوو و ئەڵڵاوێردی خان و گەنجعەلی‌خان زیك حاکمی کرمان بوون بە هاوڕێی پاشا. پاشا و دارودەستەکەی ڕێگایەکی ١٠ ڕۆژەیان لە ماوەی ٤ ڕۆژدا بڕی و ڕۆژی پێنجشەممە، پێنجەمی مانگی موحەڕڕەمی هەمان ساڵ لە پردی سالار کە لە چوار فرسەخی هەراتەوەیە گەیشتنە هێزی دوژمن و بەیانی ڕۆژی شەشەم شەڕ دەستی پێکرد.

سوپای ئوزبەك کە زۆرتر لە ٢٠ هەزار کەس بوون دژ بە سوپای ئێران شەڕیان دەست پێکرد. سەرجەمی سوپای ئێران لەم شەڕەدا ١٤ هەزار کەس بوو. شاعەبباس فەرهادخان قارەمانلوو و زولفەقارخانی هاوڕێ لەگەڵ پێنج هەزار سەربازدا نارده مەیدانی شەڕانخێزەوە.

هێرشی ئێرانیەکان ئەوەندە توندوتیژ بوو کە دوای ماوەیێکی کورت سوپای دوژمن لە ناوچوو. دوای دەربازبوونی ئوزبەکەکان، هێزەکانی فەرهادخان بە جێگای ئەوەی بکەونە دوای

---

١٢٧- شاعەلی‌خان یان شاعەلی سوڵتان سەرکردەی عەشیرەتی چەمەشگەزك و سکرتێری کوردەکانی خوراسان.

دوژمن، دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستکەوتی شەڕ و هاوکات هێرشی دووبارەی دوژمنیان لە بیر بردەوە کەچی لەناکاو سەردین موحەممەدخان ئوزبەك کە جێگری عەبدولموئمینخان بوو پەلاماری سوپای فەرهادی داوە. فەرهادخان کە هاوڕێی تاقمێك لە سەربازەکانی بە دوای دوژمن کەوتبوو ناکاو لە دواوە هێرش کرا سەریان. باقی سولتان کە یەکێ لە سەرۆکەکانی ئوزبەك بوو، کاتێ ئەم کارەساتەی بینی، خێرا گەڕایەوە و ئەویش هاتە یارمەتی ئوزبەکەکانەوە و گەمارۆی فەرهادخان درا و سپای ئێران زۆر شکستێکی نالەباریان خوارد. فەرهادخان خۆی هاوڕێ لەگەڵ چەند سەربازدا هەر خەریکی شەڕ بوون و کەچی بریندار بوو. هەڵاتن باشترین کار بوو بۆ فەرهادخان. کاتێ پاشای سەفەوی زانی کە فەرهادخان تێك شکاوە، فەرمانی دا بە ئەڵلاوێردیخان تاکو بڕوات بۆ شەڕی دژ بە ئوزبەکەکان و هاوکات سوپای جەوانغاز و برانغاز چوونە مەیدانەوە و لە ئاکامدا سوپای ئوزبەك شکستی خوارد. دینموحەممەدخان کە شکستی سوپای ئوزبەکی بینی، هاوڕێ لەگەڵ ١٠٠٠ کەسدا لە دەستی چەپی خۆی و دەستی ڕاستی پاشاوە هێرشی هانی و لەم کاتەدا هێزەکانی هاوڕێی پاشا ٢٠٠ کەس بوون و یەکێ لە سەرۆکەکانی هاوڕێی پاشا سولتانعەلی چەگەنی بوو و ئەم دووسەد کەسە پیاوانە لە بەرانبەر ئەم هێزە هەزار کەسیەوە وەستان.

ئەم شەڕە سەخت و نالەبارە هەتاکو ئێوارە درێژەی بوو و هەر دوو لا پیاوانە شەڕیان کرد و لە ئاکامدا ئێرانیەکان سەرکەوتن و دینموحەممەدخان بریندار کرا و هەڵات. شاعەبباس بەرەو هەرات ڕۆیشت و خۆی گەیاندە کاروانسەرای هەرات.

حاتەمبەیەگ وەزیری پاشا و شاعەلیخان سەرۆکی عەشیرەتی چەمەشگەزك هاوڕێ لەگەڵ سوپایێکی گەورە گەیشتنە کارێزی باخەرز و شاهوێردیخان بایبردلوو لە لایەن پاشاوە هات و مزگێنی ئەو سەرکەوتنەی پێیان ڕاگەیاند. ئەو هێزە بە خێراییێکی زۆرەوە خۆی گەیاندە هەرات و لە سەر شەقامی هەراتدا خۆیانیان گەیاندە شاعەبباس و خەڵکی هەرات و عەشیرەتەکانی هەزارەجات و قەبچاق و تەیمووری و تاهێری و جەمشیدی خۆیانیان گەیاندە خزمەتی پاشا.

شاعەبباس بە بۆنەی بڕیارێك کە دابووی بە فەرهادخان قارەمانلوو، کرا بە سەرۆکی

حکوومەتی هەرات و نووسەری عالەمئارای عەبباسی دەنووسێت:

لەبەر ئەوەی لە عێراقدا بڕیار درابوو فەرهادخان بکرێت بە سەرۆکی هەرات. دەبێ ئەمەش بلێین کە پاشا بە بۆنەی ئەو شکستەی کە فەرهادخان لە شەڕی دژ بە ئوزبەکەکاندا تووشی ببوو بەو بڕیارەی کە دابووی پابەند بوو قارەمانلووەکان لەو شارەدا نیشتەجێ بوون بەڵام هەر لەم کاتەدا فەرهادخان کوژرا و حسەینخان شاملوو بە جێگای فەرهادخان بوو بە سەرۆکی حکوومەتی خوراسان و هەرات. مەبەستمان لە گوتنی ئەم باسانە کە کودەکان چلۆن هاتنە خوراسان و شاعەبباس لەبەرچی هێرشی کردە هەرات و هەروەها بەسەرهاتی شەڕی ئێران و خێڵی ئوزبەك ئەوە بوو تاکو ئەوەتان پێی ڕابگەیێن کە لەبەر چی شاعەبباس فەرهادخانی کوشتووە. چاك دەزانین کە لە شەڕی هەراتدا فەرهادخان زۆر هەوڵی داوە و بەڵام بە داخەوە هێزەکانی ناپیاوییان کردووە و مەیدانی شەڕیان بەجێهێشت و دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگیەوە و بۆیە پاشای سەفەوی ڕقی لێهەستا و کوشتی. دەی چلۆن دەکرێ پیاوێکی وەکو فەرهادخان کە بۆ سەربەخۆیی ئێران ئەوەندە ڕەنجی دابێ و ئێستا بە بێسووچ و بە بێتاوان و لە جیاتی دەستخۆشانە دەبێ بدرێ لە سیدارەی ڕق و کینەی پاشای سەفەوی جا ئەو پاشای کە خودی فەرهادخان و هاوڕێبە کوردەکانی بۆ ئەوەی بیکەن بە پاشا ڕەنج و تەقەلای زۆریان داوە و ڕەنجی زۆریان کێشاوە.

شاعەبباس پیاوێکی بە سیاسەت و زانا بوو و هەر کام لە ئامرهێزەکانی تۆزێك دەسەڵاتیان پەرەی بسەندایات، خێرا خوێنیانی دەڕژاند و تەنانەت بە کوڕەکەی خۆیشی ڕەحمی نەکردووە. فەرهادخان قارەمانلوو کە دوای خودی پاشا یەکەمین دەسەڵاتدار بوو، بوو بە هۆی ئەوەی کە پاشا زۆر لێی بترسێ و دوای ماوەییێك خوێنی برژێنێ و کەچی پاشا ئەوەی کردۆتە بیانوو کە فەرهادخان لە شەڕی هەراتدا شکستی خوارد و ڕاستیەکە شتێکیتر بوو و وەك چلۆن ئەمیرکەبیر کە دەیزانی بۆچی دەکوژرێ، فەرهادخانیش ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوتبوو.

نووسەری عالەمئارای عەبباسی ئەم ڕاستیەی درکاندووە و دەقی باسەکەی ئێمە دەگێڕێتەوە و دەڵێ جگە لەوە فەرهادخان لەو شەڕەدا شکستی خوارد و پاشا زۆر ئاڵۆز بوو بە

دەستیەوە؛ بەڵام پاشا هەر بە ڕووی گەش و خۆشەوە ڕووی لێی کردووە و پاشان کردی بە سەرۆکی هەرات و خوراسان بەڵام دوای ماوەیێك تووشی هەڵە دەبێ و پاشا پێی دەزانی و دەیخاتە بەر شاڵاوی ڕقی خۆیەوە و ئەیدا لە سێدارە و ئەڵاویردیخان بە جێگای ئەو دەکرێ بە سەرۆکی حکوومەتی خوراسان و هەرات.

هەروەها نووسەری عالەمئارا دەڵێت: ئەو کاتەی کە ئەڵلاوێردیخان خەنجەرەکەی دەرهانبیوو کە فەرهادخان بکوژێت، فەرهادخان هەر ئەوەندە دەڵێت کە کاری ئێمەش تەواوە «بیلەمی ئولدی»[١٢٨] کەچی زولفەقارخانی برای فەرهادخانیش بۆ کوشتنی براکەی حازر دەبێ و دوایی دەڵێ لەبەر ئەوەی براکەم کاری خەتای کردبوو، دەبوای بکوژرایات و بۆیە خۆم ڕازی بووم بۆ کوشتنی[١٢٩] ناپیاوانێ وەکو زولفەقارخان کە توانای دیتنی براییێکی ئازا وەکو فەرهادخانیان نەبێ، ئاوەها کارێك دەکەن و خۆزگە زولفەقارخان بە جێگای فەرهادخان بکوژرایات. ئەم شێت و لێوە کوردە نەیدەزانی ڕۆژێك نۆرەی خۆیشی دەگات و وەك فەرهادخانی برای دەکەوێتە بەر ڕق و کینەی پاشاوە، هەروەهاش بوو ئەم بەسەرهاتە دەڵێ بەسەرهاتی تەیموورتاشی کوردی سەردەمی ڕەزاشایە. تەیموورتاش کە یەکێ لە وەزیرە بەناوبانگەکانی ڕەزاشا بوو شەوێکیان ڕەزاشا زۆر ڕێزی بۆی داناوە و کاتێك تەیموو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ بە کیژە لاوەکەی خۆی دەڵێ من دەزانم ئەم هەموو ڕێزەی کە پاشا بۆ منی دانا هەمووی بەو بۆنەوە بوو تاکو ڕێگای کوشتنم بدۆزێتەوە و کەچی هەروەهاش بوو و بەیانی ئەو شەوە تەیموورتاش دەستگیر دەکرێ و دەکوژرێ.[١٣٠]

وەلیخان قەرامانلووش هەر بە شێوەیێکی وەها لە لایەن ڕەزاشا تیرۆر کرا. ناپیاوە خۆبەزلزانەکانی زەمەن هەر بۆ ئەوەی خۆیان زل بکەن، پیاوەکانی بەر پایانیان داوەتە بەر شەق و زللەی کوشتن و ناپیاوی.

---

١٢٨– زمانی تورکی لەو سەردەمەدا باو بوو و زمانی یەکەمی وڵاتی ئێران بوو و هەموان دەبوای بەو زمانە قسەیان بکردبایات.

١٢٩– عالەمئارای عەبباسی، لاپەڕەی ٥٧٦.

١٣٠– یادداشتەکانی دوکتۆر قاسم غەنی، ژیانی من، لاپەڕەی ١٦٠.

## نیشتەجێ بوونی کوردەکانی چەمەشگەزك لە خوراساندا

دوای گرتنی هەرات بە فەرمانی شاعەبباس کە کوردەکانی چەمەشگەزك بۆ ئەم مەبەستە هەوڵی زۆریان داوە و کەچی دوایی وڵاتە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئێران دابەش کرا نێوان سوپا و عەشیرەتەکاندا و بە تایبەت حکوومەتی سیستان و کرمان خرایە ئەستۆی گەنجعەلیخانی زیك.

کوردەکانی چەگەنی مەشهەد و باشووری خوراسان چووە ژێر دەسەڵاتیانەوە و هاوکات باکووری خوراسان کەوتە دەستی کوردەکانی چەمەشگەزك کە تا سنووری خوارەزمیان بە دەستەوە بوو، لە هەمان کاتدا شاعەلیخان سەرۆکی ئەم عەشیرەتە بووە کە پێشتر پێیان دەگوت «شاعەلی سوڵتان» ساڵی ١٠١١ی کۆچی مانگی بە هاتنی شاعەبباس بۆ خوراسان حکوومەتی ناوچەکە بە شێوەی ڕەسمی خرایە ئەستۆی شاعەلی سوڵتان. لە برێ شوێندا نووسراوە شاقولی سوڵتان کە هەڵەیە.[131] لەم ڕۆژە بە دواوە سەرانسەری خوراسان دەکەوێتە دەستی کوردەکانی چەمەشگەزك و شادیلوو کە هەر لە گونبەدکاووس تا مەرو و لە سەبزەوار تا نسا دەگرێتە بەر و ئەم ناوچانە تا سەردەمی ناسرەدینشا هەر بە دەستی ئەم کوردانەوە بووە؛ بەڵام دوابەدوای ڕێکەوتنامەی ١٢٩٩ی ئاخاڵ ناوچە باکووریەکانی خوراسان دەکەوێتە دەستی ڕووسیە و کوردەکان دەبێ پاشەکشێ بکەن.

## بواری ڕامیاری و نیزامی و کۆمەڵایەتی عەشیرەتی زافەرانلوو

عەشیرەتی مەزنی زافەرانلوو کە گەورەترین و ڕێکوپێکترین عەشیرەت و هۆزی خوراسانە لە سەردەمی سەفەویدا دابەش دەکرێت بە ٣٢ عەشیرەتەوە سەرکردەی ئەم عەشیرەتە کە پێی گوتراوە «ئیلخان» و هاوکات نوێنەری حکوومەتی ناوەندی ئێران بووە لە خوراساندا پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی ئەم عەشیرەتە

١٣١- عالەمئارای عەبباسی، بەرگی ٢، لاپەڕەی ٦٣١.

بووە، لە ڕۆژی تەنگانەدا سەرۆکی چەمەشگەزك واتـا «ئێلخـانی» هـەمووی سـەرکردەی ٣٢ عەشیـرەتە کوردەکەی کۆ دەکردەوە سەبارەت بە تەنگی و چەڵەمەکان باس و لێدوانیان دەبوو، سـەرکردەی کوردەکـانی خوراسـان لـە هـەر سـەردەمێکدا نازنـاوێکی بـۆ دانـراوە وەك، میـرچەمەشگەزك وەکێڵوڵئەکراد و خان. «خـان» نازناوێکـە کـە لـە سـوڵتان گـەورەتر بـووە و پاشاکانی سەفەوی لە نامەکانیاندا «عالیجان» یان بە جێگای «خان» وەکار هێناوە.

لە سەردەمی نادرشادا سامبەیگ وەکێڵوڵئەکراد پێی گوتراوە «بیگلەربەیگی خوراسان» و سێیەمیـن کەس بووە لە دەسەڵاتدا و واتا دوای نادر و ئیبـراهیمخانی برای لە هەموو کەس بە دەسەڵاتتـر بووە.

لە سەردەمی قاجاڕدا ئەم ناوە دەکرێتەوە «ئیلخانی» کە ئەمیـر گوونـەخان زافـەرانلوو و دوایی بنەماڵەکەی واتا: ڕەزاقولیخان، سامخان، ئەمیـر حـسەینخـان و هـەموو سـەرکردەکانی شادلوو ئەم نازناوەیان وەدەست هێناوە.

ئیلخانی زافـەرانلوو سـەرکردەی ٣٢ «ئیلبـەیگ» بـوو و هـەر ئیلبـەیگ کـە سـکرتێری عەشیـــرەتەکەی خـۆی بـوو، چـەند «بـەیگ»ی لـە ژێـر دەسـەڵاتدا بـووە و هـەر «بـەیگ» سەرکردایەتی «هۆزی» خۆی لە ئەستۆ بووە کە بریتی بوو لـە چەند گونـد یـان چـەند گونـد و قەسەبچەیەك. بچووکتـرین عـەشیـرەت هەزار بنەماڵە بووە.[١٣٢] بڕێ لـە عـەشیـرەتەکان وەکـو: کـــەیکانلوو، شـــێخکانلوو، قارەمـــانلوو، کـــەیوانلوو، سووفـــیانلوو و تووپکـــانلوو، لـــە عەشیـرەتەکانیتر گەورەتر بوون و تاقمێك لەم عەشێرەتانە ٥ هەزار بنەماڵە بوون.

هەر عـەشیـرەتێك لە چەند «تووپـەڕ» و هـە «تووپـەڕ» لـە چـەند بنەمالـە پێکهـاتووە. «بنەماڵە» بنەمای ئەسڵی عـەشیـرەتە.

ماڵیاتەکان بەم شـێوەیە بـووە لـەو سـەر دەمـەدا: سـامان پـارەیی[١٣٣]، چـووپانپـارەیی، شاخپارەیی، گاینپارەیی و تۆتۆنچیخەر و... هتد.

---

١٣٢– عـەرەب بـۆ دابـەش کردنـی عەشیـرەت بـەم شـێوەیە کـاری کـردووە: «شـەعب»، «قەبیلـە»، «عەمارەت»، «بەتن»، «فەخز»، «فەسیلەت».

١٣٣– لە کتێبەکەدا «پوول» نووسراوە کە وەرگێڕ کردوویەتی بە «پارە».

هەر «تووپەڕ» لە لایەن پیاوێکی بەساڵاچووەوە ئیدارە دەکرا و چەند تووپەڕ «قێخا» یان بەیگێکی بوو.

تووپەڕ بە چەند بنەماڵە دەگوترێ کە پشت بە پشت هەموویان دەگەنەوە یەك کەس. لێرەدا عەشیرەتی کەیکانلوو دەخەینە بەر لێکوڵینەوە.

١- عەشیرەتی مەزنی زەعفەرانلوو.

٢- عەشیرەتی کەیکانلوو: کە خۆی لە سەردەمی ئەمیر حسەینخاندا دەبێتە سێ عەشیرەتەوە: سیووکانلوو، بیچرانلوو و کەیکانلوو

٣- عەشیرەتی سیووکانلوو: سەعادەت قولیخان قوبادی کە ئیلبەیگی ئەم عەشیرەتە بوو و لە ساڵی ١٣١٤ی کۆچی هەتاویدا کوژرا و قادر قولیخان قوبادی بوو بە جێگری. ئەم عەشیرەتە ناوەندیان گوندی ئووغازی نۆی بوو. ئووغازی نۆی بە دەستی موحەممەدبەیگ بنیات نراوە و ئەم تووپەڕانەی کە ناویان دەبرێ، لەوێدا ژیاون.

١- بەگان (بنەماڵەی بەگ و خانەکان)

٢- ئوولیکان

٣- کانیمەشکان: ناسراو بە کالەمەشکان

٤- تورکان: ئەو تورکانەن کە لە ئووغاز و کۆنە ئووغازدا نیشتەجێن

٥- کورمانجان: بنەماڵەی حسەین ئووغان

٦- ئووغرلوو: میەیتخانیان (نووسەر لەم عەشیرەتەیە)

٧- میەیسگەران بەڕێز حەسەن موقەدەم ئووغازی مامۆستای بلیمەتی زانکۆی هێزی هەوایی و بنەماڵەی ڕاستگۆ و غولامی و ئەکبەری لەم عەشیرەتەن.

٨- فەرڕاشاتان: بنەماڵەکانی تەیمووری، کەربەلایی خالق و قزلقانیەکان لەم عەشیرەتەن.

٩- دەودانلوو: تەقیزادەکان لەم عەشیرەتەن و هەروەها بنەماڵەی ڕەحمانی کە دانیشتووی تورك و خەتابن.

١٠- ڕازقیانیەکان کە ئیسفەهانین

ئەمانەی کە ناومان برد هەموویان تووپەڕن و لە لایەن ڕیش سپییێکەوە ئیدارە کراوە و کەچی ئەویش فەرمانبەری «خان» بووە.

عەشیرەتی سیووکانلوو[١٣٤] کە هەر کامیان بەگێکن بریتین لە:

١- کووم کیلانلوو: خەڵکی چەپانلوو، قەڵای سەما، خاکستەرکەلات، قووچقەڵا خوودکانلوو، خۆکان و باجگیران کە گەورەترین عەشیرەتی سیووکانلووە و زۆرتر لە ٥٠٠ بنەماڵەن.

٢- شوکرانلوو: گوندی شوکرانلوو کە بەڕێز ئەمین زەکی‌بەیگ مەڵبەندی ئەوانی بە «مووش» کە لە کوردستانی تورکیە دایە زانیوە و لە گوندی «ئوزدەك»دا نیشتەجێن.

٣- ئوولاشلوو: گوندی ئوولاشلوو کە لە گوندی ئوولاشی کوردستانی تورکیەوە گیراوە.

٤- بووانلوو: گوندەکانی بووانلوو و قەرچیغە.

٥- سەفکانلوو: گوندێکی ئاڕۆفتە بە ناوی سەفکانلوو کە خەڵکەکەی ئەو گوندە ڕوویان کردە ئووغاز و شوێنگەلێکی دیکە. بنەماڵەکانی «کەدخودا» و «بیگلەر» لەم عەشیرەتەن.

٦- حەمزەکانلوو: لە دوو گوندی حەمزەکانلوودا نیشتەجێن.

٧- زوورتانلوو: گوندی زوورتانلوو

٨- بێوارە: گوندی بێوارە کە تاقمێکیان خۆیان بە «سووکی» و تاقمێکی‌تر خۆیان بە «بیچری» دەزانن.

٩- خۆراسکانلوو: گوندی خۆراسکانلوو کە دەگەڕێتەوە بۆ خۆراسکانی سەر بە کوردستانی عێراق.

١٠- زاخوورانلوو: گوندی ڕووخاوی زاخووران (زاکووران)

١١- شەرکانلوو: گوندی «شەرکان» سەر بە ناوچەی بیچرانلووە.

هەروەها خەڵکی گوندەکانی: کۆنە ئووغار دووربادام، ئیمامقولی، شارەك، قەڵای وەلوو، قزلقان، چواربورج، بیرزنیل، بەیگ، قەڵاجووغ و تەرك و خەتاب کە هەموویان سیووکانلوون.

---

١٣٤– جگە لە کوومکیلانلوو و بیوارە (بیارە) هەموویان نیوە عەشیرەتێکن.

کەچی بۆمان دەرکەوت کە عەشیرەتی سیووکانلوو لە ١١ عەشیرەت و چەند تووپەڕ پێك هاتووە کە لە چەند گوندی جۆراوجۆردا ژیاون و تاقمێکیان ئێستاش هەر بە شێوەی ڕەشماڵی ژیان دەکەن[١٣٥] و هەر کام لە عەشیرەتەکانی‌تری زەعفەرانلوو ئاوەها سازمانێکیان هەیە و لە داهاتوودا ئەگەر بتوانم بە جوانی شی دەکەمەوە. ئەمەش بڵێم جارێکیان لە ڕێکەوتی ١٣٦٣/٢/٥ی کۆچی هەتاویدا تووپەڕی کورمانجانم دا بەر لێکۆڵینەوە کە هەموویان لە ٧ پشتدا دەگەیشتنەوە پیاوێك بە ناوی حسەین ئووغان و لە چوار کوڕی ناوبراو ٤٧٠ کەس ئێستا خەریکی ژیانی دنیان کە ئەو کوڕانە بریتین لە:

١- کەربەلایی ئاڵخان (حاجی‌ئاقاخان کە حاجی‌زادەکان لەو بنەماڵەن وکەرەبلایی ئەمیرخان کە مەنسووری و شوجاعیەکان لە منداڵەکانی ناوبراون و هەروەها ئیلبەگی و عەلیموحەممەد هەر کوڕی ئەون و لەم سەردەمەدا ٦٠ کەس منداڵی لێ کەوتۆتەوە.

٢- حاجی میسر: کە منداڵەکانی بە میسرزادە و سەعادەتمەند و ڕەسوولی ناوبراون و ١٧٦ کەسن.

٣- عالیشان: کە منداڵەکانی بە شەهبازی و مەحموودی ناسراون و ٥٢ کەسن.

٤- دەوڵخان: کە منداڵەکانی بە دەوڵزادە و ئیسماعیلی و مەزاهێری دەناسرێن و ٧٥ کەسن.

## کرمانج خوراسان لە ڕوانگەی ئیوانۆفەوە

ئیوانۆف زانا و بلیمەت و کۆمەڵناسی بەناوبانگی ڕووسی کە ڕەنجی زۆری بۆ ناساندنی مافە ڕەواکانی کورد کێشاوە لە باسێکی زانستی و لێکۆڵینەوەی دا بە سەر دێڕی «ڕەگەزناسی کورد»ەوە کە جگە لە باسی بەشێك لە مێژوو و کۆمەڵناسی و بارودۆخی کوردستانی خوراسان زۆربەی زۆری گۆرانی و هەڵبەستە کوردیەکانی نووسیوەتەوە و لە مردنی هەمیشەیی ئەو

---

١٣٥- لە ئووغازدا تاقمێك لە عەشیرەتەکانی کانی‌مشکان، کورمانجان، بووانلووەکان، نیوەی ئوولاشلووەکان و چەند بنەماڵەیێك لە کۆنە ئووغازیەکان هەر نیوەکۆچەرین و هاوکات زووتانلووەکان و بێوارەلووەکان نیوەکۆچەرییان هەیە.

ئاسەوارە نەتەوەییانە بەرگری کردووە.[١٣٦] ناوبراو باسەکەی خۆی ئاوەها دەست پێ دەکات:

زۆر گرنگە کە ئێمە بتوانین بڵێین عەشیرەتە کوردەکان پێش سەدەی شانزەی زایینی لە خوراساندا ژیاون[١٣٧] ئەگەرچی وشەی «کرت» لە ناوچەکانی خوراساندا زۆر بەکارهاتووە و تەنانەت زنجیرە حکوومەتێك هەر بەم ناوە لە باکووری هەرات و لە ساڵەکانی ٦٤١ تا ٧٩١ی کۆچی هەتاوی لەوێدا پاشایەتیان کردووە و خاوەن دەسەڵات بوون.

بە بێشك کورد یان کرت هەر ئەو عەشیرەتە کوردانەن کە ئەمڕۆش لەوێ دان و ئەگەر زووتر کورد لەم ناوچەدا بووبێت، لەگەڵ فارسەکاندا تێکەڵ بوون و کوردایەتی خۆیانیان لە بیر بردەوە. کاتێ کە لە سەردەمی سەفەویەکاندا ئەم بیرە بەدیهات کە دەبێ لە سنوورەکانی باکووری خوراسان پاسداری بکرێ و لە هێرشی ئوزبەك و تورکمانەکان بەرگری بکرێت و جا لەبەر ئەوەی هێزێك نەبوو ئەم کارە بکات، پاشای ئێران وای بە چاك زانی وەك ڕووسیەکان چییان کرد لە بەرانبەر قەزاقەکانەوە، ئەوانیش هەروا بکەن و لە نیوەی سەدەی شانزدەی زایینیدا چەند عەشیرەتی کوردی لە کوردستانەوە کۆچ درانە سنوورەکانی باکووری ئێران و لە سەرەتای سەدەی ١٧ی زایینیدا گرووپێکی‌تر لە کوردەکان گوێزرانەوە ئەو ناوچەیە. تاقمێك لەم کوردانە وەکو عەشیرەتەکانی کەیوانلوو و شادیلوو هێشتا هەر لەو سنوورانەدا ماونەتەوە و کەچی تاقمێکی‌تریان وەکو کوردەکانی عەمارلوو لە سەدەی ١٨ی زایینیدا و لە سەردەمی

---

١٣٦- جگە لەم هەڵبەستانە لە دوای مردنی «سەردار ئێوەزە» و «جەجووخان» و «قارەمانخان» چەند هەڵبەستی جوان بە زمانی کرمانجی هەیە، وەك:

سەنگەرمەشتن، سەنگەرمەشتن قاجار هاتن ڕوونەنشتن
خان و بەگی مەوان کوشتن سەروەدراو، سەروەدراو
ژەعێشقێ تەبوو مەزراو من ماڵ تۆنەجان لەگراو

١٣٧- لە سەردەمی تەیمووری لەنگدا کوردەکانی خوراسان هەر چادرنشین بوون، کلاویخور لە سەفەرنامەکەیدا دەڵێت ڕۆژی ٢٢ی ژوونیەی ١٤٠٤ی زایینی گەیشتمە جاجەرم و ڕۆژی ٢٤ی ئەو مانگە گەیشتمە ئێسفەراین و ڕۆژی ٢٦م گەیشتمە نەیشابوور کە لە دەشتی نەیشابووردا ٤٠٠ چادرم بینی هی کوردەکان بوو و جگە لە مەڕ، لە دەوروبەری ٢٠ هەزار وشتریان هەبوو و هەر ساڵ ٣ هەزار وشتر و ١٥ هەزار مەڕیان وەك ماڵیە ئەدا بە ئەمیر تەیموور.

سەفەرنامەی کلاویخو، وەرگێڕانی مەسعوود ڕەجەبنیا، لاپەڕەی ١٨٩.

دەسەڵاتداریێتی نادرشادا کۆچ دران بۆ خوراسان.[١٣٨] بەڵام ئێستا هیچ پێوەندییێك نییە لە نێوانی کوردەکانی خوراسان و کوردستاندا و کوردەکانی خوراسان بە داخەوە بەرەو ڕەگەزی تورك بوون نزدیك دەبنەوە، کوردەکان لە خوراساندا ڕەگەزی کوردی خۆیانیان نەپاراستووە، ئێستاش لەبەر ئەوەی هەمووی کوردەکانی خوراسان وەکو یەك قسە دەکەن و هیچ جیاوازییێك نیە لە نێوان زاراوەکانیدا، زۆر گرنگە کە عەشیرەتە کوردەکان بە پێی زمان لێك جیا بکرێتەوە؛ چون هەموو عەشیرەتەکان لە شارە جۆربەجۆرەکانی خوراساندا پەرژوبڵاون و تەنانەت بڕێك لە کوردەکان ئەوەندە بە تورکەوە نزیکن و تێکەڵاو بوون کە ئێستا ئێمە بە جوانی ناتوانین لێکیان جیا بکەینەوە. ئێمە تا ڕادەییێك توانیمان پێڕستێك لە عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان بهێنینە دەست و بۆتانی بنووسین کە هەموویان بە زمانی کوردی قسە دەکەن. لەم پێڕستەدا ناوی عەشیرەت و ناوچەکەیان هاتووە.

چوار عەشیرەتی کوردی لە هەموان ڕیشەدارترن کە بریتین لە: عەمارلوو[١٣٩]، زەعفەرانلوو، شادلوو و کەیوانلوو. بەڵام ئێمە کوردەکانی خوراسانمان کردۆتە ٢١ عەشیرەتەوە:

١- میلانلوو: لە قۆشخانە و باکووری ئێسفەراین و جووەین و باکووری نەیشابووردا نیشتەجێن.

٢- باجگیرانلوو: عەشیرەتێکی بچووکە کە لە دەوروبەری باجگیراندا ژیان دەکەن.

٣- ئووقازلوو: لە ئووقاچ ئووغازدا هەن، لە سەر هێڵی سنووری ئێران و ڕووسیە.

---

١٣٨- تورکەکان وشەی کوردیان بە «کورت» دەخوێندەوە و بۆیە ناوبانگی «ئالکورت»یان پێ درا. زۆربەی مێژوونووسان لەسەر ئەو باوەڕەن کە کورد هەر ئەو سوپای بەهرام چووبینە بن کە بە فەرمانی هورموزی کوڕی ئەنووشیروان ڕۆیشتنە شەڕی دژ بە ساوەشاوە کە هێرشی هێنابووە سەر خوارسان. بەڵام لەبەر ئەوەی هورموز ناپیاوانە وڵامی پیاوەتی بارامی دایەوە، بارام پاشایەتی لێ وەرگرت و دژ بە خەسرەو کوڕی شەڕی کرد و لە ئاکامدا شکستی دا و خۆی بۆ ماوەیێك دەسەڵاتداری سەرانسەری ئێران بوو و دوایی قەیسەری ڕۆم یارمەتی خەسرەو پەرویزی دا و توانیان بارام تێك بشکێنن. (بڕوانە بۆ شانامەی فێردەوسی)

١٣٩- عەممارلوو پێش لە نادرشا هەر لە خوراساندا بوون و کەچی دوای دەسەڵات پەیدا کردنی نادر، تاقمێکیان بۆ گیلان دوور خستەوە و لە لاهیجاندا دایانیبەزاند و ئەو ناوچەیە ناو نرا عەمارلوو. (بڕوانە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە)

٤- هوولانلوو، هیوەدانلوو: لە نزیکی قووچان و دەرەگەزدا نیشتەجێن.

٥- قاسمانلوو: لە نزیکی نووخ و دیزواندا نیشتەجێن.

٦- شادلوو: لە بوجنوورد دان و زۆربەیان بە تورکی قسە دەکەن.

٧- زەعفەرانلوو: ئەم عەشیرەتە زۆرتر لە شیرواندا نیشتەجێ بوون و بەشی کەمیان بە کوردی قسە دەکەن. مەردۆخ لە لاپەڕەی ٩٣ی کتێبەکەیدا دەڵێت: زافەرانلی یان زافەرانلوو کە عەشیرەتێکە لە عەشیرەتەکانی حەسەنانلوو کە شاعەبباس کۆچیانی داوە بۆ خوراسان.

٨- کوڕانلوو: لە باکووری قووچان دان، گوندی کوڕان کە نیوەی تورك و نیوەی کوردە.

٩- مشکانلوو: لە نزیکی مشکان و دەروبەری قووچان دان. لە نێوان مشکانلوو و کالمیشی دەوروبەری سەبزەوار و کاڵ مشکانی ئووغاز و کانی مشکانی سنەدا دەبێ پێوەندییەك هەبێت.

١٠- بورجی: ئەم عەشیرەتە لە نزیکی ڕادکانەوەن. لە ڕادەکاندا بورجێکی بەناوبانگ هەیە و من (نووسەر) پێم وایە لەبەر ئەو بوورجە پێیان دەڵێن «بورجی»» بورجێکیتر هەر وەکو ئەم بورجە و بە ناوی ڕادەکان لە ٢٤ کیلۆمەتری «کورد کووی» گورگان دایە کە ساڵی ٤٠٧ی کۆچی بنیات نراوە و ٣٥ مەتر بەرزە.

١١- کەیوانلوو: لە جوەین و باکووری نەیشابوور دان

١٢- مزدەکانلوو، مەزداکانلوو[١٤٠]: ئەم عەشیرەتە لە ناوچەی باکووری نەیشابوور و دەوروبەری قووچان دان.

هەمووی ئەم عەشیرەتانەی کە ناومان برد، یان ڕەشماڵنشین و یان گوندنشینن و ئەم عەشیرەتانەی خوارەوە زۆرتر چادرنشینن.

١٣- ڕەشوانلوو: لە خاکستەر، لایین و کەلات دان.

١٤- بڕوانلوو: لە نزدیکی کاخەك دان و هاوینان دەچنە کەلات... گۆڤاری خوێندنیەکانی ساڵی ١٣٢٦ی کۆچی هەتاوی لە ژمارەی ٧٠دا دەنووسێت ژنێ کە ١٩ ساڵ لە حەمامێکی

---

١٤٠- لە «مەزدا» و «ئەهوورامەزدا» وەرگیراوە کە پێم وایە «موژدەگانلوو»ش هەر ئەم «مەزداکانلوو»ە بێت.

ژنانەدا لە بەروانلووی بوجنووردا کاری کردووە و ژنەکانی ئارایشت داوە و شوشتوویانیەتەوە، پیاو بوو و خۆی دا بە دەستی پۆلیسەوە.

١٥- هووفشانلوو[١٤١]: زستان لە دەرەگەز و هاوین لە چوومی قووچان دان.

١٦- بەدوانلوو[١٤٢]: زستان لە دەرەگەز و هاوین لە چوومی قووچان دان.

١٧- جافکانلوو: زستان لە چەمخاڵە دەمێننەوە و هاوین لە کێوی دەوڵەت و لە کوردە جافەکانی کوردستانی عێراقن.

١٨- قەهرەمانلوو: لە ناوچە باکووریەکانی نەیشابوور دان.

١٩- وڕانلوو: عەشیرەتێکی بچووکن لە دەوروبەری نەیشابوور.

٢٠- تووپکانلوو: لە ناوچەی باکووری نەیشابوور و جوەین دان و زستانان دەچنە هەراوی تەقی.

٢١- عەمارلوو: لە باکووری ڕۆژئاوایی نەیشابوور و لە دەوروبەری گوندی مارۆسك (مارۆش)دا نیشتەجێن.

ئەم دابەشکردنە بەم شێوە نامێنێتەوە، لەبەر ئەوەی وشکە ساڵی ساڵی ١٩١٦، ١٩١٧ی زایینی بوو بە هۆی لەناوچوونی زۆربەی مەڕی مەڕدارەکان و نەخۆشینی تیفووس، زۆربەی خەڵکی ئەم عەشیرەتانەی کوشت.

ئەم خاڵە زۆر گرنگە کە پیاوێکی کوردی خوراسانی لە ڕووی هەیکەڵەوە زۆر جیاوازە لەگەڵ براکوردەکانیدا لە ڕۆژئاوای ئێراندا. (کاریگەری سروشت) کوردەکانی خوراسان باڵابەرز و زۆردارن؛ بەڵام وەك کوردەکانی ڕۆژئاوا جوانیان نییە. کوردەکانی خوراسان زۆر شێوەی لوڕەکان ئەدەن. کوردەکان زۆربەیان لە ڕەگەزێکی پیاوانە و لە ناخۆشی بە دوورن؛ جگە لە تاقمێکیان کە لە شاردا دەژین و تووشی ئێعتیاد بوون. عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان زۆر پێکەوە نزیکن و دوژمنایەتی بە دەگمەن هەیە لە نێوان ئەم کوردانەدا بە تایبەت ئەو کوردانەی کە ڕەشماڵنشینن، هەروەها زاراوەکانیان زۆر لە یەك دوور نین و ژن و ژنخوازیان زۆرتر لەگەڵ کوردەکان دایە.

---

١٤١- گۆڕدراوەی «گووەشانلوو» و «گاوەستیانلوو»ە.

١٤٢- وابزانم «مادوانلووی» دروست بێت.

زمانی کوردی خوراسان زمانی کرمانجی ژوور (باکوور)ە کە یەکێ لە بەشە گەورەکانی زمانی کوردییە و پێوەندییێکی زۆری لەگەڵ زاراوەی موکریدا هەیە، بەڵام تۆزێك لەگەڵ زمانی کوردیدا جیاوازی پەیدا کردووە. زمانی کوردی خوراسان کەوتۆتە بەر کاریگەری زمانی فارسی خوراسان.

وشە کوردیەکان لە ناوچەکانی خوراساندا جۆربەجۆرە؛ وەك چلۆن لە باشووری خوراساندا لەگەڵ فارسی تێکەڵاوە، لە باکووردا لەگەڵ تورکمانی تێکەڵە. عەشیرەتەکانی شادیلوو و چەگەنی تورکی قسە دەکەن، زۆربەی عەشیرەتە کوردەکان نەخوێندەوارن و دەبێ ئەمەش بڵێین کە بە داخەوە لە باکووری خوراساندا زمانی تورکی لە کوردی جوانتر و ڕەوانترە لە لای کوردەکانەوە.

## عەشیرەتە بەناوبانگەکانی زەعفەرانلوو

کوردەکانی خوراسان زەعفەرانلوو کە لە شارەکانی ئیسفەراین، نەیشابوور، شیروان، قووچان، دەرەگەز، کەلات، چناران و مەشهەددا نیشتەجێن و لە سەردەمی سەلجووقیەکاندا کە لە کوردستانی تورکیە و عێراقدا ژیانیان دەکرد، پێیان دەگوترا «چەمەشگەزك». لە دواییین ڕۆژەکانی دەسەڵاتی سەفەوییەکاندا و هەروەها لە سەردەمی دەسەڵاتی نادری ئەفشاردا چەمەشگەزك بوو بە زەعفەرانلوو. لە بەرگی یەکەمدا زۆر لەم بارەوە دواوین، لێرەدا کورتەیێك باس دەکەین و دەبێ بڵێم لە بەرگی یەکەمدا گوتمان «تیکتانلوو» عەشیرەتە کەچی بەڕێز غوڵامحسەین ڕەحیمیان و بڕێك لە زانایان فەرموویان تیکتانلوو عەشیرەت نەبووە و لقێکە لە عەشیرەتی بادلانلوو؛ بەڵام بنیکلوو عەشیرەتە و ئێستا کورتە ئاماژەیێك دەکەین بەو عەشیرەتانە.

١- ئیزانلوو: ئەم عەشیرەتە بە واتای «مەسعوود کەیهان» نووسەری کتێبی «جیوگرافی ئێران» لە دەوروبەری ١٢٠٠ بنەماڵەن و لە خوار و وەرامین و دەوروبەری شیروان و گوندەکانی بادامڵوو، قزڵحەسار، شوورەك، کەڵاتە، ئاودەرە، عەبدئاوادا نیشتەجێن.

**٢- باچیانلوو:** (باج+ی نیسبەت+ئەلف و نوون نیشانەی کۆ+لوو) کە پاشگرێکی تورکیە. لێرەدا دەردەکەوێ کە ئەسڵی ناوی ئەم عەشیرەتە «باج»ە و بە بێ‌شك جێناوێکی باش بووە کە بۆ ئەم عەشیرەتە تەرخان کراوە، بەڵام نازانین بە مانای «باج» بووە یان «باش» کە لە تورکیدا بە سەر دەڵێن «باش» و باشقانلوویشیان پێ گوتراوە. باشقانلوو یانێ «خوێن بەسەر». ناسرەدین‌شای قاجار لە سەفەرنامەکەیدا ئەم عەشیرەتەی بە «باشقانلوو» ناو بردووە و گوتوویەتی ئەم عەشیرەتە بەشێکی هەرە گەورە لە عەشیرەتی گەورەی کوردی شوکاك کە لە ئازەربایجانی ڕۆژئاواییدا ژیان دەکەن.

تاقمێکیش پێیان دەڵێن «باجوانلوو، باچاوانلوو و باشکانلوو» زۆربەی ئەم عەشیرەتە لە گوندی دەوڵەتخانەدا نیشتەجێن.

خوالێخۆشبوو محەممەدعەلی سەحرایی قارەمانی بەناوبانگی زۆرانی نەتەوەیی ئێران هەر لەم عەشیرەتەیە و لە گوندی دەوڵەتخانەدا هاتۆتە دنیاوە کە لە بەرگی ٤٤دا زۆرتر شی دەکەینەوە و هەروەها بەشێکی زۆر لە سەحراییەکان کە لە عەشیرەتی باچوانلوون و ٤٠٠ بنەماڵەن و لە گوندی باباچەشمەی ئێسفەراینداا ژیان دەکەن و لە دەوری ٥٠ بنەماڵەشیان لە ئاشخانەی بوجنووردا دەژین. لە بەناوبانگترینیان عەبباسعەلی قووچانیە.[١٤٣] باچیانلووەکانی ئێسفەراین لە گوندەکانی قەرەجا، مەنگەلی، نەسرئاوا، حەساری، دەهنەشوور، دەهنەشیرین و دۆڵچادا نیشتەجێن و خەریکی کاری ئاژەڵدارین[١٤٤] و زستانان لە مراوەتەپە و هاوینان لە کێوی شاجەهاندا دەژین، بەشێکی‌تری بامانلووەکان لە کوردستانی عێراقدا دەژین کە خوالێخۆشبوو مەردۆخ نووسیویەتی: باشمانلیەکان لە نێوان مەلازگەرد و ئەلشگەرد دان. بەسەرهاتی دڵتەزێنی پەلاماری تورکەکان بۆ سەر کوردەکانی باچیانلوو کە لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی مانگیدا ڕووی دا و بوو بە هۆی کوژرانی تاقمێك لە پیاوانی ئەو عەشیرەتە و کەچی یەکێ لەو هۆکارانەی کە بوو بە هۆی ڕاپەڕینی مەشرووتییەت و یەکەمین دادگای ئێران هەر ئەم

---

١٤٣- سپاس بۆ بەڕێز مێهدی جیهانی و حاج موحەممەد ڕەوشەنی کە زانینی زۆریان پێ دام. سەبارەت بە زانیاری زۆرتر بڕوانە بۆ گۆڤاری هونەر و مەردوم، ساڵی ١٣٤٨ی کۆچی هەتاوی، نووسراوەی پوورکەریم.

١٤٤- تاریخ کورد و کوردستان، مەردۆخ.

پەلامارەی تورکەکان بوو بۆ سەر کوردەکان.

**٣- بادلانلوو:** بادلان کە لەم ساڵانەدا خۆیانیان کردۆتە بەهادۆرانلوو. خوالێخۆشبوو مەردۆخ دەفەرمێ بادەلی کە ١٠٠٠ بنەماڵەن و لە «ئەلەشگەرد» و «یووزغا» دان و ٧٠٠ بنەماڵەی‌تریان لە «زارا» دان و هەمووی ئەم عەشیرەتە شیعەن. فەرمانڕەواکانی «بادلوو»[١٤٥] لە سەردەمی نادردا زۆر پڕهێز و توانا بوون.

ناسرەدین‌شا لەم بارەوە نووسیویەتی ئەم عەشیرەتە لە ناوچەی قووچان و چناراندا ژیان دەکەن. عەشیرەتی بادلوو خەڵکێکی کەڵەگەت و بەهێزن.[١٤٦]

جگە لەم ناوچانەی کە ناو برا، بادلووەکان لە دەرەگەز، کەلات، قووچان، کەلاتەگوڵ، عەلاقەجونبان و دەوروبەری گەندابدا نیشتەجێن.

دوایین سەرۆکی ئەم عەشیرەتە کە بوو بە سەرۆکی کوردەکانی زەعفەرانلووش، خوالێخۆشبوو تاج موحەممەدخان بەهادۆری ناسراو بە سەتووتولمەلێك بوو. ناوبراو لە شەڕێکدا یارمەتی کولونێل موحەممەدتەقی‌خان پسیانی داوە.[١٤٧]

**٤- بریانلوو:** بریانلوو (بژیکانلوو): ئەم عەشیرەتە لە مەشهەد و کەلات و گوندەکانی دەوروبەریدا ژیان دەکەن و هەروەها تاقمێکیان لە ناوچەی کەلات و سەرەخسدا ڕەشماڵنشین و مەڕدارن. مەڵبەندی بریوانلووەکان کوردستانی عێراق بوو.

**٥- بیچرانلوو:** بیچرانلووەکان لە ئازایەتی و توانابیدا زۆر بەناوبانگن و ساڵەهای ساڵ سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێرانیان پاراستووە. بیچرانلوو، سیورکانلوو و کەیکانلوو تا سەردەمی ئەمیرحسەین‌خان هەر یەك عەشیرەت بوون کە پێیان دەگوترا (کەیکانلوو) و ناسرەدین‌شا ئەم

---

١٤٥- دەبێ بزانین کە «بادلێ» ناوچەیێك بووە کە پێم وایە ئەم عەشیرەتەش سەر بە ئەو ناوچەیەن کە کوردەکان «ا» و «ن»ی کۆیان خستۆتە سەری.

١٤٦- سەفەرنامەی ناسرەدین‌شا بۆ خوراسان، ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی، ل ١٦٠.

١٤٧- بادلانلووەکان لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی نادرشادا زۆر بەهێز و شکۆ بوون، بەڵام لە سەرەتای کاری نادردا دژ بە ئەو وەستان و بە پێی واتاکانی شاهوێردی‌خان شەیخوانلوو ساڵی ١١٣٧ی کۆچی مانگی پاشایەتی مەلك مەحموود سیستانی لە مەشهەددا قەبووڵ دەکەن و موحەممەدکازم هەر ئەم باسەی هێناوە و بە جوانی ئاماژەی پێ کردووە. (موحەممەد کازم، بەرگی ١، ل٩٣)

عەشیـرەتەی لە بەناوبانگترین عەشیـرەتە کوردەکان زانیوە.

هێشتا بەڵگەکانی عەشیـرەتی بیچرانلوو و سیوورکانلوو (سیوکانلوو سەیف کانلوو) هەر بە ناوی (کەیکانلوو)ەیە و سەرکردایەتی ئەم عەشیـرەتە مەزنە بە دەستی سیووکانلووکانەوەیە. ئەمیـر حسەین‌خان شوجاعوددەولە ساڵی ١٣١٠ی کۆچی مـانگی عەشیـرەتی کـەیکانلووی دابـەش کـردە نێـوان عەشیـرەتەکانی بیـچرانلوو و سـیووکانلوو و هاوکـات تاقمێـك لـە کەیکانلووەکان لە باکووری ڕۆژئاوایی بجنوورد و تاقمێکیان لە باکووری قووچاندا بـە شـێوەی جیاواز ژیان دەکەن. دواییـن سەرکردەی عەشیرەتی بیچرانلوو، عەلی خان‌بەیگ بیچرانلوو بـوو کـە لـە تەمـەنی ٩٥ سـاڵیدا و لـە سـاڵی ١٣٦٢ی کۆچی هـەتاوی کۆچی دوایـی کـردووە، بیـچرانلووەکان لـە شیــروان و گونـدی قەڵعەحەسـەن، قەڵعەبـەیگ، تووراںلـوو، کەلاتـەباڵی، قەڵعەنەقد، قەلعەدوولوو، گرووگانلوو، قوولانلـوو، بـەردەر، هۆنامـە، زینـدانلوو، قاڵتـمانلوو، کورکانلوو، دووئاو، بورج زولفەقار، خەلاجلوو، لووجەلی، بیك، قەرەچەشـمە، پووستیـن دووز و مەمەدوورانلوودا ژیان دەکەن و تاقمێکیشیان ڕەشماڵنشینن.[١٤٨]

هاوکات «ئەلـخاس» کە یەکێ لە عەشیـرەتەکانی بیچرانلوویە لـە کوردسـتانی سـووریە دایە و ئەمڕۆ لە گوندی سنووری جریستاندا نیشتەجێن.

بیچرانلووەکان وەك گوتـمان لە کوردەکانی سووریەن و لەبەر ئەوەی لـە ناوچـەی شـامەوە هـاتوون پێیـان دەگـوترێ «شـامالی» و «شـاملوو» فـەرمانڕەواکانی بیـچرانلوو زۆر بـە سەفەویەکانەوە نزدیـك بـوون و دەسـەڵاتی زۆریـان وەدەسـت هێنـابوو. بـە تایبـەت کـاتێ کـە شاعەبباسی دووەم بە پێی ڕاپۆرتی ناپیاوەکانی دەورویەریەوە وەزیری ژیر و زانای خۆی -میرزا موحەمـەد تەقی‌خانی ئێعتـمادولدەولە- (سارۆتەقی) شەهید کرد و ماڵ و کەلوپەلەکەی دزی و دوای ئەم ڕووداوە «ئاناخان» دایکی شاعەبباس فەرمان ئەدات بـە یـەکێ لـە سـەرکردەکانی

---

١٤٨- پیم وایە تاقمێك لە ئەم عەشیـرەتانە و گوندەکانیان لە عەشیرەتی بیچرانلوو نەبن، بەڵام لە مێژەوە هەر سەریەم عەشیـرەتە بوون. بە تایبەت نامانلووەکان کە لە بەرگی یەکەمدا باسـی ئـەوانمان کـرد، بـەڵام وەك دەزانـن عەشیــرەت نـین و کەچـی لـە ژێـر چـاوەدێری عەشیــرەتی بیـچرانلوودا بـوون و قەرەچەشمەییەکانیش هەر لە عەشیرەتی کووپانلوون. کورد و کوردستان، ئـەمین زەکـی بـەیگ و کـورد و کوردستان مەردۆخ، بەرگی ١، ل ٧٧. چەند مەقالە، نەسرولڵا فەلسەفی، ل ١٧٣.

بیچرانلوو تاکو تۆڵەی ئەم وەزیرە لە شاعەبباس بکاتەوە. شەهید بوونی سارۆتەقی لە ڕێکەوتی ٢٠ی شەعبانی ١٠٥٥دا ڕووی داوە.

حاجی سلێمان بیچرانلوو کە یەکێ لە پیاوە گەورەکانی دەرەگەز بوو و لە سەردەمی لاوەتی نادردا ژیاوە و کاتێ کە نادر دوژمنی دەوری دەگرێ، ناوبراو دەچێتە یارمەتیەوە و کاتێ کە نادر بریندار دەکرێ، دەیهێنێتە مالّی خۆیان و فەرمان ئەدات بە یەکێ لە حەکیمە بەناوبانگەکانی مەرو تاکو نادر دەرمان بکات. بەڕێز ئەبولفەزل قاسمی لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی: باسی نادرقولی لە ئێبیورددا باسێکی زۆر نالەبار و سەخت بوو و نادر چووبووە مالّی حاجی سلێمان بیچرانلوو و ئەم مالّە جێگای ئومێد و ئارەزووی بێپەناکان بوو و هەمووی هەڤالّەکانی گرووپگرووپ دەڕۆیشتنە چاوپێکەوتنی. دیارە کەسێ کە بتوانێت دوژمنی فەرمانڕەوای ئبیورد لە مالّی خۆیدا جێگە بدات، دەبێ پیاوێکی شێرانە بێت و ئەم پیاوە کەسێك نییە جگە لە سلێمانخان بیچرانلوو.

ئەم زاتە دوابەدوای سارێژبوونی برینەکانی نادر ڕەوانەی دەستگردی دەکات و بە هەڤالّی خۆی واتا میرزا نوورولّلای کوردی شەیخوانلوو ڕاسپێر دەکات تاکو هوشیاری نادر بێت. ئەم میرزا نوورولّلاخانی شەیخوانلووە زۆر یارمەتی نادری داوە و کەچی ئەم میرزا نوورلّلاخانە هەر بەم بۆنەوە بە دەستی حاکمی دەستگرد تیرۆر دەکرێت.

یەکێتر لەو سەرۆکە کوردانەی کە یارمەتی نادری داوە، «حاتەمبەیگ بیچرانلوو»ە لە باوەگەورەی قوبادییەکانە و هەروەها ئەتوانین بە حاجیخان بەیگ حەمزەکانلوو، ئێلیاسبەیگ مامیانلوو، خەسرەوخان قارەمانلوو ئاماژە بکەین کە توانیوویانە یارمەتی نادر بدەن. حاجی سلێمان بیچرانلوو بە دەستی دوژمنانی نادر تیرۆر دەکرێ.

**٦- پالووکانلوو:** لە عەشیرەتەکانی کرمانج زەعفەرانلووی خوراسانەوە دەگەڕێنەوە بۆ سەر «پالوو» کە پالوو ناوچەیێکە لە کوردستانی عێراقدا و بەدلیسی لە شەرەفنامەدا ئەم کوردانەی لە کوردەکانی ڕووژکی زانیوە.

پالکانلووەکانی خوراسان لە ئازایەتی و پیاوەتیدا زۆر بەناوبانگن و لە ناوەندی باجگیران و شاری دەرەگەزدا ژیان دەکەن. ناوچەی ئەم کوردانە لە ٩٥ کیلۆمەتری دیاربەکر و لە نزیکی

ڕوودی فوراتەوە بووە.

خوالێخۆش بوو مەردۆخ نووسیویەتی «باڵکان» لە گوندی باڵکانی کوردستانی عێراقەوە گیراوە. باڵکان ١٢٠٠ بنەماڵەن کە لە باکووری ڕەواندووزی هەولێر دان و لە جەماوەردا ٦٠ بنەماڵەن و هاوکات ٣٠٠ بنەماڵەشیان سەر بە عەشیرەتی زەرزان. دووگوندی پاڵکانلووی ژوور و خوار لە ناوچەی سنووری جریستانی باجگیراندا هەن. دوو گوندی پاڵکانلووی خوار و ژوور کە لە شاری دەرەگەزدا بوو هەر ملکی کوردەکانی پاڵکان بوون.

**٧- پەڵەوانلوو:** «پەلوولان» کە زووتر لە ناوچەی نێوان ئیمامقولی و بادام و باجگیران و ئووغازدا دەژیان و خەریکی کاری ئاژەڵداری بوون کە ییلاخیان هەر لەم ناوچەدا بووە و قشلاخیشیان لە دەوروبەری عێشقئاباد و نسادا بووە.

پەهلەوانلووەکان بە بۆنەی بەلگەییکەوە کە بۆ ئێوەی خوێنەرم هێناوە، ساڵی ١٢٢٦ی کۆچی مانگی یانێ ١٧٨ ساڵی ڕابۆردوو زەوینەکانی خۆیانیان فرۆشت بە موحەمەدیبەیگ کەیکلانلوو (ئیلبەیگی کەیکانلوو) و خەڵکی کۆنە ئووغاز و تازە ئووغاز و پێم وایە هەر لەو ناوچەوە کۆچیان کردووە و ئێستا لە شارەکانی قووچان و مەشهەد و بجنوورد و شیرواندا پەرژ و بڵاو بوونەتەوە.

نووسەری مەتلەعوشەمس کە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی کاتێ کە هاوڕێی ناسرەدینشاە لە ڕێگای بجنووردەوە دەڕۆیشتن بۆ شیروان و لە ڕێگادا لە قەڵای مووساخانی نزدیکی گەیلیان «گەیلیەکان» گەیشتنە کوردەکانی پەهلەوانلوو. کوردەکانی پاڵەوانلوو کە یەکێ لە عەشیرەتەکانی زەعفەرانلوو بوون و ٥٠ بنەماڵەن.

**٨- توپکانلوو:** ناسراو بە «توپان» کە «کۆی توپە» و «تروپ» لە زمانی کرمانجیدا بە مانای جەماوەرێکی درەخت بە کار دێت و «توپ» لێرەدا بە مانای چەند عەشیرەتێکە و هەر ئێستاش ئەم عەشیرەتە یەکێکە لە عەشیرەتە بەرپانەکانی کرمانجی خوراسان کە لە جوەین، ئێسفەراین، سەبزەوار و شیروان، قووچان، دەرەگەز، مەشهەد، باکووری نەیشابوور و زنجیرە کێوەکانی بینالوودا دەژین و تاقمێکیان بە شێوەی کۆچەری ژیان دەکەن و تاقمێکیشیان لە شاری مەشهەددا دەژین، بە تایبەت لە گەڕەکی ئاو و بەرقی ئەم شارەدا دەژین.

«ئیوانووف» لەم بارەوە دەڵێت: تووپکانلووەکان لە ناوچەکانی جوەین و نەیشابووردا دەژین و زستانانەش دەگەڕێنەوە بۆ دەشتی تەقی.

بەشی ڕۆژهەڵاتی دابەش دەبێ بە ئەو گرووپانەی کە لە دەوروبەری نەیشابوور و ئەخلومەد و بینالود و دەرەگەزدا دەژین. ئەم کوردانە لە کێوەکانی بینالود، کلیدر و محەممەدبەیگەوە هاتوون و لە تەنیشتی ڕووخانەی کەشفڕوودەوە بەرەو سەرەخس دەچنە پێشەوە.

ئەم عەشیرەتە لە مانگی سەرماوەز و بەفرانباردا دەچنە دەوروبەری کەشفڕوود و بەرەو سەرەخس دەچنە پێشەوە و هەروەها زستانیش ڕوو دەکەنە دەوروبەری «میامی» کە لە ٦٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی مەشهەدەوەیە و بەشێکیتری ئەم عەشیرەتە لە نیوەی دووەمی بەفرانباردا دەکەونە ڕێ و لە مزدوورانەوە دەچنە شالوولەی گاز و بەرەو «چەکودەر» دەچنە پێشەوە و لەوێ مەڕەکانیان دەزایێن.

هەروەها ئاوی خواردنەوەش هەر لە موزدوورانەوە دەبرێ. ئەگەرچی لە بواری ئاوەوە زۆر لە زەحمەت دان؛ بەڵام زۆر پاك و خاوێنن و لە شوشتنی لەش و جلوبەرگدا زۆر هەوڵ ئەدەن، تاقمێکیتریان ڕوو دەکاتە ئاق دەربەندی سەرەخس و بە هاتنی بەهار لەو ڕێگەوە کە ڕۆیشتوون، دەگەڕێنەوە تاکو دەگەنە بینالود و نەیشابوور و هاوکات مەڕەکانیشیان کە بۆ فرۆشتن تەرخان کراوە، لە مەشهەد دەیانفرۆشن.

بەشی ڕۆژئاوایی تایبەتە بە ئەو گرووپە لە عەشیرەتی تووپان کە لە دەوروبەری قووچان و شیروان و ئیسفەرایندا هەن. ئەم گرووپە هاوینان لە کێوەکانی شاجەهان و ئووغازدا دەمێننەوە و لە سەرەتای پووشپەڕدا لە کێو دێنە خوارەوە و مەڕەکانیان لە ناو مەزراکاندا دەلەوەڕێنن و بە دەم لەوەڕ هێمنهێمن بەرەو ڕۆژئاوا دەگەڕێنەوە تاکو دەگەنە چوومی ئەترەك، لە سەرەتای گەلاوێژدا لە دەوروبەری شیروان و بجنووردا دەمێننەوە و دوایی ڕوو دەکەنە مراوەتەپە و لە دوایین ڕۆژەکانی ڕەزبەردا لە کەناری ئەترەکدا پەرژ و بڵاو دەبنەوە و وەك کوردەکانیتری خوراسان دوای ئەوە مەڕەکانیان زایی و بەرخەکانیان تۆزێك دێنە خۆیان، ڕۆژی یەکەمی بەهار

بە بۆنەی ئەم ڕەحم و بەرزەی خواوە بە پێوانەی دوو یان سێ کیلۆمەتری بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕۆن و پاشان وەرزی گەڕانەوە دەست پێ دەکات و ڕۆژبەڕۆژ دێنە پێشەوە، تا ڕادەیێك کە دواییـن ڕۆژەکانی خاکەلێوەو سەرەتای گوڵان دەگەنە شیـروان و هەر گروپێك دەڕواتە کوێستانی خۆی. زۆربەی تووپکانووەکانی بەشی ڕۆژئاوایی کە بە بێ‌مەزرا ماونەتەوە لە ڕێی ناچـاریەوە هـەموو ساڵێ پارەییێکی زۆر دەدەن بە گوندنشینەکانی دەوروبەری قووچان و شیـروان.

تاڵتـرین کاتی ژیانی ئەم کۆچەریانە کاتێکە کە ییلاخ دەکەن و بەرەو دەوروبەری قووچان دەچن و کەچی مەڕ و وشتـر و ئەسپەکانیان تووشی برسیەتی و سەختی دەبن. ژنـان و پیـاوانی تووپکانلوو زۆر کەڵەگەتن و ڕوومەتێکی پانیان هەیە و ناو توێڵ پان و چاو و برۆ ڕەشـن و زۆر خۆش ڕوون و هەموو کاتێ بزەی کەنینیان دێت. ژنانی تووپکانلوو لە جل پۆشـینی جوانـدا لـە هەموو کوردەکان بەناوبانگتـرن.

عەشیـرەتەکانی تووپکانلوو برتییـن لە:

١- کـەرەکانلوو: کـە لـە «کەریکـە»وە هـاتووە و وەك بزانـم پێوەنـدییان هـەبێ لەگـەڵ کوردەکانی لوبنان و کەرەکدا.

٢- کاڵمیشی: ئەم عەشیـرەتە لە دەوروبەری کەلیدر و سەبزەوار دان و کتێبە مەزنەکـەی بەڕێز دەوڵەتئابادی بە ناوی «کلیدر» سەبارەت بەم کوردانەیە.

٣- فەرهادخانیەکان: دەگەڕێنەوە سەر فەرهادخانی تووپکانلوو واتا ئەو پیاوەی کە ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی هاوڕێ لەگەڵ وەلیـخان قەرامانلوودا دەیانویست ڕزاشا بکوژن. ئەم عەشیـرەتە لە دەوروبەری هەزار بنەماڵەن و زۆرتر لە گونـدی «بـەهار» لـە نزیکـی بیـرکبـاش مەحەلـەدا دەژین، فەرهادخان لە سەردەمی ڕەزاشادا خۆی ماڵیەی خەڵکی وەرگرتووە بۆ خۆی.

٤- لەتیفیەکان: کە ٢٠٠ بنەماڵەن و ١٠ ڕانی مەڕیان هەیە.

٥- تورابییەکان: ٤٠٠ بنەماڵەن و ١١ ڕانی مەڕیان هەیە.

٦- شیـرقازییەکان: ٣٠٠ بنەماڵەن و ٦ ڕانی مەڕیان هەیە.

٧- ئاغا موحەمـمەدخانیەکان: ٥٠٠ بنەماڵەن و ١٥ ڕانی مەڕیان هەیە.

٨- سـمکانیەکان: ٣٠٠ بنەماڵەن و ١٠ ڕانی مەڕیان هەیە.

٩- زەینەڵیەکان: ٣٠٠ بنەماڵەن و ١٠ ڕانی مەڕیان هەیە.

توویکانووەکان لە سەرانسەری خوراساندا پەرژوبلاو بوونەتەوە و زۆرتر لە ٥٠٠٠ بنەماڵەن و ١٤٥ ڕان مەڕیان هەیە. زۆربەی تووپکانلووەکان لە زستاندا دەچنە مراوەتەپە و هاوینانیش ڕوو دەکەنە شاجەهان و ئالاداغ و تاقمێکیتریان کە زستان دەچنە سەرەخس، هاوینان لە دەوروبەری ئابروان و کچی بار و گاومێشیندا نیشتەجێ دەبن.

**٩- جەلالی:** لە بەناوبانگترین عەشیرەتەکانی کوردن. بەشی زۆری ئەم عەشیرەتە هاتوونەتە خوراسان و بە بۆنەی ئازایەتیەوە لە سنووری ئێران و خوارەزمدا لە باکووری شیرواندا نیشتەجێن. سەبارەت بە کوردەکانی جەلالی دەبێت کتێبێکی جیاواز بنووسین، تاکو بزانین لە دەورانی ئەم ٤٠٠ ساڵەدا چییان بە سەردا هاتووە و هاوکات توانیویانە کولتوور و زمان و یاسای خۆیان بە تایبەت لە ولاتی سۆڤیەتدا بپارێزن، لێکۆڵینەوەی زۆری دەوێ.

زۆرتر لە ٩٠ ساڵە کوردەکانی جەلالی لە سۆڤیەتدا ماونەتەوە و ناوەندی ئەم کوردانە لەوێ شاری عێشقئاباد و فیرووزەیە کە ڕوومیەکان ساڵی ١٢٩٩ و ١٣١١ی کۆچی هەتاوی لە ئێرانیان دابڕ کرد کە لە جێگای خۆیدا باسی فیرووزە و شەڕی جەلالیەکانی دژ بە ڕووسیەکان دەکرێ.[١٤٩]

وەك چلۆن جەلالیەکان دەڵێن و مێژووش شایەتی لە سەری داوە، ئەم کوردانە لە ناوچەکانی باکووری سووریە و شام و حەڵەبەوە هاتوونەتە دیاربەکر و ناوچەی چەمەشگەزك و جا لەبەر ئەوەی نەیانئەتوانی بچنە ژێر فەرمانی عوسمانیەکانەوە لە ڕێی ناچارییەوە ڕێگای ئێرانیان گرتە بەر و لە سەردەمی شاعەبباسی سەفەویدا ئەم کۆچە ڕووی داوە، شاعەبباس حاتەمخان ئەردوویادی ناردۆتە پێشوازیانەوە و سەرۆکەکانی جەلالی هان دران تاکو بڕۆن بۆ ئێسفەهان و دوایی فەرمانیان پێ درا تاکو ڕوو بکەنە ناوچەی موکریان و بە هاوکاری

---

١٤٩- بەڕێز حەسەن جاف لە نووسراوەکەی خۆیدا دەڵێت: عەشیرەتی جەلالی یەکێ لە عەشیرەتە کۆنەکانی کوردە کە ئێستا پێیان دەگوترێ «گەلالی» و عەشیرەتی گەورەی جافن، لە ڕابوردوودا عەشیرەتی جەلالی لە ناوچەی «دانترك» و «نەهاوەند» لە نزدیکی شارەزووردا هەبوون.
«بررسی‌های تاریخی» وەرگێڕاو لە سوبحولئەعشای قەلقەشەندی، ژمارەی ٢، ساڵی ١٣٥٧، ل٢٩٠.

ئەمیـرخانی برادۆسـت (لـەپزێـڕین) هێـرش ببەنـە سـەر عوسـمانیەکان و کوردسـتان لـە عوسمانیەکان وەربگرنەوە و کوردەکان بە تەواوی بهێننە ژێر دەسەڵاتی ئێران؛ بەڵام بە داخەوە دوو دەسەڵاتی ئێران و عوسمانی کە هەر کام ئەوی‌تری بە کافر دەناسی و هاوکات کوردەکانی ڕۆژهەڵات سونی بوون و وەك عوسمانیەکان ڕقیان بـوو لـە سـەفەویەکان و سـەفەویەکانیان بـە موسڵمان نەدەزانی و ئەگەر ئەمیـرخانی برادۆست ئیزنی ئەو شەڕەی بدایات بـە جەلالیـەکان، دەبوای کورد، تووشی شەڕی براکوژی ببوایات و بۆیە لەگەڵ جەلالیەکاندا هاوکاری کردووە و لە قەڵای دمدمدا دژ بە پاشا و دەسەڵاتی وەستا.

نووسەری عالەم‌ئارای عەبباسی سەبارەت بە وشەی «جەلالی» گوتوویەتی هەر کـەس دژ بە ئیمپراتوورەکانی عوسمانی بووە، پێی دەگوترا «جەلالی» [١٥٠] کەچی لێرەدا دەردەکەوێ کە کوردەکان بوون توانیان ببـن بە لەمپەرێك بۆ پاراستنی ئێران لە پەلاماری تورکەکان.

ئەگەر جەلالیەکان کورد نەبوایان چی دەبوا؟ مەسعوودی کە ٧٠٠ سـاڵ پـێش نووسـەری عالەم‌ئارای عەبباسی ژیاوە لە کتێبی «مورەویــجوززەهەب»دا دەڵـێ کوردەکـانی جـەلالی لـە بەرێزترین عەشیـرەتەکان بوون و شەرەفەدین بەدلیسی و هەموو مێژوونووسەکان شایەتی ئەدەن کـە جەلالیـەکان کـوردن، لـە سەرانـسەری مێـژوودا هـەوڵ دراوە تـاکو عەشیــرەتە کوردەکـان ڕەگەزیان ون بێت و بکرێن بە تورك و عەرەب و فارس و... هتد.

بەڵام ئەم ناپیاوانە قەت نەیانتوانیوە کاری وەها بکەن؛ شۆڕشی کوردەکـانی جـەلالی لـە سووریە بە تایبەت لە ناوچەی حەڵبدا، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئیمپراتووری عوسـمانی کـە دژ بـە ئەورووپاییـەکان شـەڕی دەکـرد، ئاگربـەس بکـات و هێزەکـانی خـۆی بـە سـەرۆکایەتی مورادپاشاوە ڕاسپێری حەڵەب بکات. هاوکات جەلالیەکان لە حەڵەبەوە تاکو ئـەرزڕۆم لـە ژێـر دەسەڵاتیاندا بووە.

---

١٥٠– نووسەر وای زانیوە کە هەمووی شۆڕشگێڕەکان کورد نەبوون و کەچی لە لات و نووباش بوون. بـەڵام ئێمە دەڵێین متمانەمان هەیە کە ئەم شۆڕشگێڕانە تورك نەبوون لەبەر ئەوەی تورك دژایـەتی لەگـەڵ خۆیـدا ناکات و عەرەبیش نەبوون و جگە لە کورد کەس کاری وەها ناکـات و توانـای کـاری وەهاشـی نییـە کـە لـە بەرانبەر دەسەڵاتی عوسمانیەوە بووەستێ.

نووسەری عالەمئارای عەبباسی دەڵێت: هەر لە حەمـاوە[١٥١] تا ئەرزڕۆم ناوچـەیێکە کـە بە دەستی جەلالیەکانەوە بوو و کاتێ شۆڕشیان کرد، دەسەڵاتی عوسـمانی وای بـە چـاك زانـی دوژمنی ناوەخۆ دەبێ پێش دوژمنی دەرەوە سـەرکوت بکـرێ و بۆیـە لەگـەڵ ئەورووپاییەکانـدا ئاگربەسیان کرد.

کوردەکانی جەلالی ساڵەهای ساڵ دژ بە عوسمانیەکان شەڕیان کرد و هەر لەو شەڕانە لە حەڵبەوە گەیشتـنە ئەرزڕۆم و سووریە کە لە ژێر دەسەڵاتی عوسـمانیدا بوو و لەوێشەوە چوونە ئیـروان و ئەمیـر گوونـەخانی قاجـارِ هاتـە پێشوازیانەوە و دوای ماوەیێـك پاشـای سـەفەوی حاتەمبەیگی سەدر ئەعزەمی نارده پێشوازیانەوە و هاوکات جەلالیـەکانی گواسـتەوە تـەبرێز و سەرۆکەکانی ئەو عەشیـرەتە بە تایبەت کوردحەیـدەر و حەسـەن کـەدخودا و... هتـدی لەگـەڵ خۆی هێنا ئێسفەهان و لەوێ خەڵاتی زۆریان وەرگرت و دوایی وەك گوتـمان ئـەوانی ڕاسپێری موکریان کرد تاکو دژ بە عوسـمانیەکان بووەستـن و شـەڕ بکـەن. کوردەکـانی جـەلالی دوایـی هاوڕێ لەگەڵ عەشیـرەتی چەمەشگەزکدا هاتن بۆ خوراسان و لەوێ مانەوە.[١٥٢]

**١٠- حەمزەکانلووەکان:** ئەمن (نووسەر) بەو باوەڕەم کە ئەم عەشیـرەتە لە «حـەزو»ەوە هاتبێ. «حەزو» ناوچەیێکە لە کوردستانی تورکیەدا و یان دەبێ حەزوانلوو بوویێت کـە دوایـی بووە بە «حەمزوانلوو» و «حەمزەکانلوو». سەرۆکی بەناوبانگی حەمزەکانلووەکان حاجیخـانی حەمزەکانلووی قارەمانی شەڕی هەراتە کە لە ئـامرهێزە بەناوبانگـەکانی سـەردەمی نادرشـای ئەفشارە. ئەم عەشیـرەتە لە بـجنوورد و قووچان و گوڵمەکاندا ژیـان دەکـەن. ناسـرەدینشـا لـە سەفەرنامەکەیدا دەڵێت لە پەنای کێوی شارۆچکەی شاندیز و گوڵمەکاندا کـە مـەزرای دەسـتی چەپ تایبـەتی عەشیـرەتی حـەمزەکانلو بـوو و ئـەم مەزرایانـەش بـریتی بـوون لـە کەڵاتـەی شابەندە، چەنگکەلاغ. هاوکات گوڵمەکان و کەڵاتەی حەبەشی تایبەتە بە کوردەکانی پیزکـی.

---

١٥١- شاری «حەما» لە سووریە دایە و ئێستاش ناوەندی شۆڕشی کوردەکانی ئەو وڵاتەیە. ئەم شۆڕشە لە ژێر ناوی ئیخوانولموسلمیندا پەرەی سەند، کە شاری حەما گەمارۆ درا و شۆڕشگێڕەکان سـەرکوت کـران. «نگاهی به تاریخ و فرهنگ کردستان»، عومەر فاررووقی، ل٧٣

١٥٢- عالەمئارای عەبباسی، لاپەڕەی ٧٦٦.

کەلاّتەحەسەن، سەیدئاوا چەقوورئەولەنگ، چەهچەهە، ئووچ دەفتەر، محەمەدئاوا، شەمسئاوا، ئاودووش کەن، چواربورج، کەلاّتەی بادلوو، قەهقەهە و هەتاکو دەگاتە کال دیوین[١٥٣] تایبەتە بە عەشیرەتی پیزکی. وێرانەکانی شاری تووس لە دەستی چەپی ئێمەوەیە (ناسرشا) و هەر وەکو وێرانەی شاری ڕەی وایە: ئەم ناوچەیە زۆرتر ملکی کوردەکانی بادلوو و هەمزەکانلووە.[١٥٤]

نووسەری مەتلەعوشەمس دەڵێت: لە ناوچەی گوڵمەکاندا کە لە ٨ فرسەخی مەشهەدەوەیە و ١٤ گوندی لە ژێر دەسەلاّت دایە و هاوکات دوو عەشیرەت لەوێ نیشتەجێن کە بە یەکیان دەگوترێ «تاجیك» و هەموویان بە فارسی قسە دەکەن و لە شارۆچکەی گوڵڕێزدا دەژین. عەشیرەتێکیتر کە کوردی حەمزەکانلوون و لە بەشەکانیتری ئەو ناوچەیەدا دەژین.[١٥٥]

**١١- ڕەشوانلوو**[١٥٦] ڕەشوانلووەکان لە ئازاترین کوردەکانی خوراسانن کە زۆربەیان لە گوندە ناوەندی و سنووریەکانی جریستان و قۆشخانەدا دەژین. شەڕی ئەمان دژ بە نادر یەکێ لە کارە قارەمانانەکانیانە.[١٥٧] نووسەری عالەمئارای نادری جەماوەری ڕەشوانلووەکانی بە ٢٠ هەزار بنەماڵە زانیوە. ئەمین زەکیبەیگ دەفەرمێ: ڕەشوان ٧٠ بنەماڵەی کۆچەرین کە لە باشووری ئەرزڕۆمی کوردستانی تورکیەوە هاتوون.

«ئیوانۆف» دەڵێت: ڕەشوانلووەکان لە گوندەکانی خاکستەر، لاین و کاخەکدا چادرنشینی دەکەن.

---

١٥٣- «دیوین» یان «دوین» لە قەلاّ بەناوبانگەکانی کوردەکانی شادیلوویە کە بە پێی هێرشە بێئەمانەکانی عوسمانیەوە هەمووی خاپوور کراوە و دوایی بوو بە گوندی کرنیچغری سەعد. «شەرەفنامە» لاپەڕەی ٨٣ و کورد و کوردستان، ئەمین زەکی، ل ٢٢٧.

١٥٤- سەفەرنامەی ناسرەدینشا بۆ خوراسان، ل ١٦٣.

١٥٥- مەتلەعوشەمس، بەرگی ٢، ل ٢٧٩.

١٥٦- فەرهەنگ جیوگرافی ئێران سەبارەت بە ڕەشوانلووەکان دەڵێت: ڕەشوانلووەکان چوار بەشن: ڕەشوانلوو گوندێکە سەر بە ناوچەی جریستانی قووچان، ڕەشوانلوو گوندێکە سەر بە بۆجنوورد.

١٥٧- ڕەشوانلوو گوندێکی بچووکە سەر بە ناوچەی بۆجنوود، ڕەشوانلوو گوندێکە سەر بە مایوانی قووچان.

«مەردۆخ» دەڵێت: ڕەشوان ٧٠ بنەماڵەییێکن کە ڕەشماڵنشینن و لە باشووری ئەرزڕۆمدا دەژین.

ڕەشوەند کە ٥٠ بنەماڵەییێکن و لە دەوروبەری قەزویندا ژیان دەکەن و هەمیسان ڕەشەوەند کە چەند بنەماڵەییێکن و لە ئازەربایجاندا دەژین.

ئەگەرچی ئیوانۆف لە ناوچەی کەلات و خاکستەر و لایندا ناوی ڕەشوانلووەکان دەهێنێ لە عەقڵەوە نزدیك نیە کە ئەم کوردانە بۆ جاری دووەم هاتبێتنەوە بۆ قۆشخانە و وادیارە کوردەکانی ئەو ناوچانە تاقمێکیان ڕەشوانلوو بن. خەڵکی گوندەکانی ئەمروودەگ، توولفوور و دەرمیان هەر ڕەشوانلوون.

لە قۆچخانەدا ڕەشوانلووەکان لەم گوندانەدا دەبینرێن: قووپووز، کاکەلی، باخ، ئەمیرخان، قولەکی خوار و ژوور، دەدەخان، جەنگا، حەڵواچەشمە، قەڵای عەلی، حەسار، پیران، سەنجەك (سەنجەق)[١٥٨] چۆرچۆری ئیزمان، تەفتازان، یەنگیقەڵا.

**١٢- ڕووتکانلوو:** ڕووتان کۆی «ڕووتە». ئەم عەشیرەتە لە زیرەکترین و هاوکات چەوساوەدیوترین هۆزە کوردەکانی خوراسانن، تاقمێکیان ڕەشماڵنشینن کە لە نێوان قووچان و مراوەتەپەدا لە هاتوچوون دان و هاوینان لە کێوەکانی ئووغاز دەژین و تاقمێکیان لە شیروان دەمێننەوە، «ڕووت» بە مانای بێجلوبەرگە و ڕووتان بە مانای بێجلوبرگەکانە. کاتێ بۆ ژیانی ئەم عەشیرەتە بێچارەیە دەڕوانین، ژیانی مرۆڤەکانی سەردەمی حەجەر (بەرد) دێتەوە بیرمان. ئەگەر ئەم عەشیرەتە هەر ئەو عەشیرەتی ئیلەڕووتە بن کە مەردۆخ ناویان لێ ئەبات، لە عەشیرەتی جاف جیا بوونەتەوە. مەردۆخ، ل ٧٧، بەرگی ١

**١٣- زەیدانلوو:** بەدلیسی لە شەرەفنامەدا زەیدانلووەکانی لە عەشیرەتی گەورەی

---

١٥٨- نووسەری کتێبی دیاربەکرییە لە لاپەڕەی ٢٣٦دا دەنووسێت: سەنجەك ناوچەییێکە لە کوردستانی تورکیەدا. بەدلیسی لە شەرەفنامەدا زۆر ناوی سەنجەق و سەنجەکی هێناوە، سەنجەق بەو ناوچە کوردنشینانەی دەڵێن کە لە لایەن دەسەڵاتی تورکیەوە پییان دراوە. دوای هاتنی کوردەکان بۆ خوراسان ناوەکانی ناوچە پێشوەکانیان نایە سەر ئەم ناوچە نوێیانەدا، بەڵام خەڵکی ڕەشوانلووی قۆشخانە کە ٥٠٠ ساڵ لەگەڵ تورکەکانی سەلجووقیدا ژیاون زمانیان بوو بە تورکی و ئێستاش کوردی و تورکی قسە دەکەن. موحەممەد کازم زۆر باسی شەڕی نێوان ڕەشوانلووەکانی دژ بە نادر کردووە.

ڕۆژکی زانیوە و هەروەها مەڵبەندی ژیانیان حەکاری کوردستانی تورکیەیە، ئەم عەشیرەتە زۆر دەستێکی بدەیان هەیە و هاوکات میوان پەزێرن و دابەش دەبن بە ٢٤ بەشەوە، لەم ٢٤ بەشە ٥ بەشیان واتا قەیسانی[١٥٩] و بایکی و مولکی و زووقەیسی و زەیدانی هەر لە عەشیرەتە مێژووییەکانی ناوچەی بەدلیسن.[١٦٠]

لە خوراسان ئەم عەشیرەتە لە گوندی زەیدانلووی قووچان و زەیدانلووی دەرەگەزدا نیشتەجێن و وابزانم سوورناکان و قووچیەکان و خومارتاشیەکان هەر لەم زەیدانلووگەلە بن. دەڵێن جارێك ٢ هەزار وشتری زەیدانلوو کەرەستە و پێداویستی قووچانیان دەبرد بۆ باژگیران و لەوێشەوە بۆ ڕووسیە بەڕێیان دەکرد.

سکرتێری کوردەکانی زیدانلووی دەرەگەز هەر ئەو ئیسماعیل کورتە بەناوبانگەیە کە دوابەدوای خۆی بنەماڵەکەی و منداڵەکانی سەرۆکایەتی ئەم عەشیرەتەیان گرتۆتە ئەستۆ.

گوندی زەیدانلووی قووچان کە لە باکووری ئەم شارەوەیە لە گوندە خۆشەکانی ناوچەکەیە و زۆرتر لە هەزار کەس جەماوەری هەیە و زۆرتر خەریکی کاری کشتوکاڵی گەنموجۆن. زۆربەی زەیدانلووەکان ئێستا لە لایین و دەوروبەری کەلاتدا ژیان دەکەن.

**١٤- سیل سپێرانلوو:** ئەم ناوە کە ناوی گوندێکی سنووری جریستانی سەر بە ناوچەی باجگیرانە. (بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە بۆ بەرگی یەکەم) ئەم عەشیرەتە زۆرتر لە سنووردا دەبینرێن. کوردەکانی سیل سێپرانلوو زۆر شاعەبباسیان خۆش ویستووە و پێیان گوتراوە «شاهیسوون». هەر بەم بۆنەوە دژ بە ئەمیرخان برادۆست لە قەڵای دمدمدا شەڕیان کردووە، سەربازەکانی چەگەنی لە ژێر فەرمانی سوڵتان چەگەنی و خەلیل سوڵتانی سیل سێپرانلوو و کوردەکانی جەلالی و بوانی «بووانلوەکان» و گەنجعەلیخان زیك فەرمانڕەوای قەندەهار کە هەموویان کورد بوون و دژ بە ئەمیرخان وەستان و بوون بە هۆی لەناوچوونی ئەو شێرە کوردەوە، ساڵی ١٠١٢ی کۆچی مانگی کوردەکانی سیل سێپرانلوو لە ناوچەی کوردستانی تورکیەدا ڕوومیەکانیان شکست دا و هەروەك بڵێی ناوچەکەت گزگ دابێت لە ڕوومیەکان پاك کرایەوە و بۆیە پێیان گوتراوە «سیل سپوور».

---

١٥٩- وا بزانم کوردەکانی قەیسئاباد ڕادەکان لەم عەشیرەتەن.

١٦٠- شەرەفنامەی بەدلیسی، تاریخی موفەسەلی کوردستان، ل ٤٧٤، ٢٦٥.

نووسەری عالەمئارای عەبباسی دەڵێت: ئەم کوردانە لەو ڕۆژە بە دواوە ئەم ناوە تورکیەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە. شاهیسوونەکان کە دوو هەزار بنەماڵە بوون ڕوویان کردە بارەگای شاعەبباس و کاتێ گەیشتنە بارەگای شاعەبباس ئەویش زۆر بە ڕوویێکی خۆش و گەشەوە ڕۆیشتۆتە پێشوازیانەوە و لە ناوچەکانی ڕەی و ساوە و خوار و فیرووزەدا مانەوە و یەیلاخ و قشلاخیان دەکرد و هاوکات ڕوویان دەکردە عێراقی عەجەم.[١٦١]

نووسەری مەتلەعوشەمس هاوکات لە کەلبعەلیخان سیل سێپرانلووی فەرمانڕەوای مەشهەد ناو دەبات کە لە پیاوەگەورەکانی بارەگای شاسلێمانی سەفەوی بوو و ناوی ناوبراو لەسەر کەتیبەی ساڵی ١٠٩١ی کۆچی مانگیدا لە سەر کاروانسەرای شاهوێردیخاندا هەڵکەنراوە.[١٦٢]

**١٥- سیووکانلوو:** ئەم عەشیرەتە لە ناوچەی سیوورك یان «سوورك»ەوە کە لە ناوچەی کوردستانی تورکیە دایە،[١٦٣] هاتوون. کوردەکانی خوراسان لە بەناوبانگترین پارێزەرەکانی زمان و کولتوور و بەڵگەکانی ئاویستا و زەردەشتن. زۆربەی زۆری خاڵە گرنگەکانی زمانی ئاویستایان لەبەر کردووە، بە تایبەت پیتی «ڤـ» کە کورد زۆر بە کاری دەهێنێ لە زمانەکانیتردا نابینرێ. سەعادەت قولیخان لە نامەیێکدا کە بۆ سیاووشی کوڕی نووسیوە و بەم شێوەیە نامەکەی ئیمزا کردووە.

---

١٦١- عالەمئارای عەبباسی، ل ٦٤٨، ٧٨٢.

١٦٢- مەتلەعوششەمس، بەرگی ٢، ل٢٦٣.

١٦٣- سوورك، ناوچەیێکە لە نێوان دیاربەکر و ئورفەدا کە ترێی زۆری هەیە. بە ئەم ناوچەیە دەڵێن سێو و بە خەڵکەکەشی دەڵێن سێوی.

## سەعادەت قولی سیڤکانلوو

مەردۆخ دەڵێت: سیڤکانی ٥٠٠ بنەماڵەن کە لە بەشی باکووری خالکانیەوەن.[١٦٤] زۆربەی شەڕەکانی ئێران و ڕۆم لە سەر کوردەکانی سیوورك ڕووی داوە، لەبەر ئەوەی ئەم کوردانە زۆرتر سەر بە ئێران بوون و ئیمپراتووری عوسمانی زۆر ڕقی بوو لەم بەسەرهاتە و دەیەویست کارێك بکات ئەم کوردانە وەرەز بکات تاکو بچنە ژێر دەسەڵاتی خۆی. سیوورك لە عەشیرەتی چەمەشگەزك بوو و سکرتێری ئەم عەشیرەتەش ڕۆستەمبەیگ چەمەشگەزك بوو و کە پێکەوە چوونە یارمەتی شائیسماعیلی سەفەویەوە و دژ بە تورکە عوسمانیەکان شەڕیان کرد و هاوکات کوردەکانی چەمەشگەزك زۆر دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە.

دوای ڕۆیشتن بۆ خوراسان کە بە سەرۆکایەتی شاعەلی سوڵتانی چەمەشگەزك ڕووی دا، هەر عەشیرەتێ لە عەشیرەتە کورمانجەکانی لە ناوچەیێك دا دەمایەوە وەك چلۆن بەسەرهاتی بیچرانلووەکانمان باس کرد. بیچرانلووەکان، سیوورکانلووەکان و کەیکانلووەکان هەموویان بوون بە یەك عەشیرەت لە ژێر ناوی «کەیکانلوو»دا و کەچی ئەمانە لە سەرانسەری ناوچە سنووریەکانی ئێران و خوارەزمدا مانەوە کە ئەمڕۆ هەر لە ئاشخانەی بجنوورد و جرسیتان لە باکووری شیروانەوە تا دەرەگەز دەبینرێن.

ناسرەدینشا لە سەفەرنامەکەی خۆی بۆ خوراسان دەنووسێت: کەیکانلووەکان لە بەناوبانگترین عەشیرەتەکانی زافەرانلوون و جەماوەرێکی ٥ هەزار بنەماڵەیین کە بە بۆنەی ئازایەتیانەوە بوونەتە سنوورەوانی ئێران.

سەرۆکی ئەم عەشیرەتە بە پێی بەڵگەکانەوە فەرمانڕەواکانی سیووکانلوو، قویادییەکان بوون و لە سەرانسەری مێژوودا خزمەتی زۆریان کردووە و ناوبانگی بیچرلوو، کەیکانلوو و سیووکانلوویان پێ دراوە.

---

١٦٤- تاریخ کورد و کوردستان، مەردۆخ، ل ٩٧٠ و هەروەها چەند جار ناوی سپیکانلوو کە پێم وایە گۆڕدراوی سینکانلوو بێت و کە لە عەشیرەتی گەورەی حەسەنانلووە و لە کوردستانی تورکیە دان باس کراوە.

بەناوبانگترین سکرتێری ئەم عەشیرەتە «حاتەمبەیگ بیچرانلوو»یە کە لە جێژنی زماوەندی نادر لەگەڵ کچەکەی سامبەیگدا ئەوکچەی هێنا بۆ نادر و هاوکات نازناوی «خان»ی لە لایەن نادرەوە پێ درا.

بەڕێز قادرقولیخان قوبادی کە لە بنەماڵەی حاتەمبەیگە، دەڵێت: وابزانم حاتەمخان کوڕی قوبادسوڵتان بووە و ئەم قوبادسوڵتانەش بووەتە هۆی ئەوەی کە نازناوی «قوباد»ی بۆ ئێمە بمێنێتەوە و ئێمە دەگەڕێینەوە سەر قوباد شەهریاری پادشای ساسانی باوکی ئەنووشیروان.

نووسەر دەڵێت: ئەم عەشیرەتە یان لە ڕەگەزی تورکەکانی سەلجووقین کە حکوومەتیان کردووە بە سەر کوردەکانی سیوورك و دیاربەکردا کە نووسەری شەرەفنامەش ئاماژەی پێ کردووە وە یان هەر ئەو بیروڕای خۆیانە دروستە.

ناوی سەرۆکەکانیتری کەیکانلوو کە دوای حاتەمبەیگ هاتوون بە پێی بەڵگەکانەوە بریتین لە: محەببەتخان کەیکانلووی کوڕ حاتەمخان، محەممەدیبەیگ کەیکانلوو کوڕی محەببەتخان کەیکانلووی کە گوندی تازە ئووغازی لە ساڵی ١١٣٠ی کۆچی مانگیدا بنیات ناوە، حاتەمخانی دووەم کوڕی محەممەدبەیگ، محەممەدی کەیکانلووی کوڕی حاتەمبەیگ (بەڵگەی ساڵی ١٢٢٦ی کۆچی مانگی)، محەممەد حەسەنبەیگ کەیکانلوو کوڕی محەممەدبەیگ (بەڵگەی ١٢٤٥ی کۆچی مانگی)، سەعادەت قولیخان کەیکانلووی کوڕی محەممەد حەسەنبەیگ (بەڵگەی ساڵی ١٢٨٥ی کۆچی مانگی) کە لە شەڕی ئاق دەربەندی سەرەخسدا لە ساڵی ١٢٧٩ی کۆچی مانگیدا بەشداریان کردووە. وادیارە بە ئیشارەتی ئەمیر حسەینخانی شوجاعودەوڵە ئەم سەعادەت قولیخانە توانیوویەتی قودرەتوڵلائاقای ڕەوشەنی تیرۆر کردبێ. حاتەمبەیگ کەیکانلووی سێیەم کوڕی سەعادەت قولیخان، محەممەد حسەینخان شێخولخەوانین سیووکانلووی کوڕی حاتەمخان (لەدنیادەرچووی ١٣١٠ی کۆچی هەتاوی کە زۆر بە سیاسەت بوو)، سەعادەت قولیخان سیووکانلوو کوڕی محەممەد حسەینخان (لەدنیادەرچووی ساڵی ١٣١٤ی کۆچی هەتاوی کە پیاوێکی ڕووناکبیر بوو)، قادر قولیخان قوبادی سیووکانلووی برای سەعادەت قولیخان کە ئێستاش هەر زیندووە و دواییین

بزووتنەوەی ئەوان ڕاپەڕینی خەرمانانی ١٣٢٠ی کۆچی هەتاوی بە سەرۆکایەتی فەرەجوڵڵاخان بیچرانلوو بوو کەچی دوای شکستی کوردەکان، هەموویان پەرژ و بڵاو کرانەوە، عەشیرەتەکانی سیووکانلوو لەم گوندانەدا کە لە دەرەگەزەوە تا شیروان لە بەر دەگرێ بەم شێوەیە: ئووغازی کۆن، ئووغازی نوێ، ئوولاشلوو، بوودانلوو، شەرکانلوو، چەپانلوو، شەکرانلوو، خودکانلوو (خووکانلوو)، سەفکانلوو، زوورتانلوو، زاخوورانلوو، خوراسکانلوو (خەرسکانلوو)، بێوارە (بیارە)، دووربادام، ئیماقولی، شارك، قەلای سەفا، باجگیران، قەرچغە، قەلعەولوو، قزلقان، بیرزەینەڵ بەیگ، چوار بورج، قەڵاجۆق و دەودانلووەکانی خەتاب کە لە باکووری ڕۆژئاوایی شیرواندا نیشتەجێن.

جێگای یێلاخ و قشلاخیان لە نێوان سیساب و باکووری شیروان دایە. سیووکانلووەکان کە نووسەر هەر لەم عەشیرەتەیە لە شارەکانی باکووری خوراسان و تاراندا پەرژوبڵاون و زۆرتر بە کاری ئیداری و کولتووریەوە خۆیان ماندوو دەکەن.

تاقمێك لە سیووکانلووەکان لە کوردستانی تورکیەدا ماونەتەوە، بەڕێز غولامحەسەین ڕەحیمیان دەفەرمێ، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا تاقمێك لە ئەفسەرە کوردەکانی سیووکانلوو کە لە ژێر دەسەڵاتی تورکیەدا بوون لە لایەن ڕووسیەکانەوە دیل کران و لە سیبریدا خرانە بەندیخانەوە و دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕینی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩١٧ی زایینیدا لە بەندیخانە هەڕایان کرد و بە پێی ئەو نەخشەیەی کە لە بەر دەست دایە دەزانین کە کوردەکانی سیووکانلوو لە ناوچەی باجگیراندا نیشتەجێ بوون و باوکی من پەنایانی دا و زۆر ڕێزی بۆ ئەم کوردە دەرچوانە لە بەندیخانەی ڕووسیەکان دانا.

ناوبراوان گوتیان کە لە تورکیەشدا قویادییەکان، سەرکردەی سیووکانلووەکانن. نووسەری «دیار بەکریە» دەنووسێت: «سوورك» یان «سووك». ناوچەیێکە لە نێوان قەرامیل و سیواسدا.[١٦٥]

ئەمین زەکیبەیگ ژمارەی سپیکانلووەکانی تورکیەی بە ٣٠٠ بنەماڵە زانیووە.[١٦٦]

---

١٦٥– دیاربەکرییە، ئەبووبەکر تێهرانی، ل٤٧ و ١٨٦.

١٦٦– م.کەندالٚ مێژوونووسی فەرانسەوی، جەماوەری کوردەکانی تورکیەی بە ٨/٥ میلیۆن کەس زانیوە.

سەبارەت بە شوکرانلووەکان دەڵێت: شوکورلییەکان لە دەوروبەری مووشدا دەژین. دەبێ ئەمەش بڵێین کە سپیکانلووەکان هەر ئەو سیووکانلووانەن کە لە کوردستانی تورکیە و بە تایبەت لە دیاربەکر دان «مووش» بەشێکە لەم ناوچە. شوکورلییەکان کە ئێمە پێیان دەڵێین شوکرانلوو ئێستا سەر بە عەشیرەتی سیووکانلوون. ئەمین زەکی جارێکی‌تر لە ژێر ناوی «سیف‌کانی» یان «سیف‌کانلوو»دا نووسیویەتی: سیف‌کانی ٥٠٠ بنەماڵەی نیوە کۆچەرن و لە خالکانی سەر بە کوردستانی عێراقدا ژیان دەکەن.

**١٦- شەرانلوو:** ناسراو بە قەرامانی شەران کە هێشتا تاقمێکیان لە باکووری قووچاندا هەر چادرنشین و ٢٠ ڕانی مەڕیان هەیە.

شەرانلوو کە پێم وایە هەر شەروانلوو و شروانلوون و شیروان ناوی یەکێ لە عەشیرەتە بەناوبانگەکانی کورد بووە کە سەرەتا لە لوڕستاندا هاتوچۆیان کردووە و هاوکات لەوێ شارۆچکەییێکیان بە ناوی شیروان بنیاتناوە، دوایی مەڕدارەکان ڕوویان کردۆتە کوردستانی عێراق و لەوێش گوندێکیان بە ناوی شیروان بنیات ناوە و لەوێشەوە ڕوویان کردە قەفقاز شارەکانی شیروان و ئیروان بە دەستی ئەم کوردانە بنیات نراوە و دوای هاتنیان بۆ خوراسان شاری شیروانیان بنیات نا کە دوای قەراخانی کوڕی شاعەلی ناوەندی عەشیرەتەکە لە شیروانەوە برایە قووچان. (بڕوانە بەرگی یەکەم، لاپەڕەی ٥٣). شەڕوانلووەکان کە زۆربەیان چادرنشین و تاقمێکیان لە گوندی شەڕانلوودا دەژین. کەڵەزانا مەردۆخ دەڵێت: شیروان کە ١٥٠٠ بنەماڵەییکن و لە ناوچەی هەولێردا دەژین شیروانی کە خۆی عەشیرەتێکە لە عەشیرەتە کوردەکانی عێراق. وادیارە هەر لە عەشیرەتی شیروان بن کە خۆیشیان دوو بەشن: ١- کرنی ٢- ئیروانی

ویلیام ئیگلتوون لە باسێکدا کە ساڵی ١٩٠٦ی زایینی هێناویەتی، دەڵێت: جەماوەری شیروان لە کوردستانی عێراقدا کە لە ڕووباری زابدا بوون ٨٠٠ بنەماڵە بوون.

شیروان خوراسان لە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگیدا بە واتای سەنیعوددەولە ١٥٠٠ بنەماڵەن و هەموو ساڵێك چادرنشینە کوردەکان دەست لە چادرنشینی هەڵدەگرن.

زۆربەی شەروانلووەکان خەریکی چادرنشینین و تاقمێکیان لە کەلاتەی شاموحەممەد لە

باکووری قووچاندا نیشتەجێن.

**١٧- شێخ ئەمیـرانلوو (شێخ ئەمیـریان):** کە لە دوو گوندی بـاکووری شیـروان و لـە نزدیکی سنووری ئێران و سۆڤیەتدا دەژین. وادیارە لەبەر ئەوە پێی دەڵێن شـێخ ئەمیـرانلوو، چونکە ئەم عەشیـرەیە دەگەڕێنەوە سەر «شێخ حەسەنبەیگ» لە سەرۆکەکانی چەمەشگەزك و فەرمانڕەوای کوردەکانی خوراسان کە سـەرۆکایەتی عەشیـرەتی چەمەشـگەزکی بـە دەستەوە بووە. (بەرگی ١، ل٥٠٦)

ئەگەرچی شێخ ئەمیـرییەکان لە ناو کوردەکاندا بە ساویلکە ناوبانگیان دەرکردەووە، بەڵام لە سەرانسەری مێژوودا کەڵەپیاوانێکی زۆریان لێ کەوتۆتەوە کە بنەماڵەکانی شوجاعوددەوڵە، ڕەوشەنی و نگـەهبان لـە شیـرواندا کـە سـەرۆکی بەشـی بـاکووری خوراسـان بـوون هـەر لـەم عەشیـرەتەیە.

بەناوبانگتـرین پیاوی ئەم عەشیـرەتە لەم سەردەمەدا بەڕێز دوکتۆر موزەففەری حـەکیمی بەناوبانگی نێونەتەوەیی بوو کە لە مەشهەددا کاری کردووە.

**١٨- شێخکانلوو:** لە گەورەترین عەشیـرەتە کوردەکـانی خوراسـانن کـە لـە شـارەکانی قووچان، مەشـهەد، چـناران، دەرەگـەز، کـەلات و ئیـسفەراییندا دەژیـن و خـەریکی کاروبـاری کـشتوکاڵن و هاوکـات مەڕداریـشن. تاقمێـك لـە شێخکانلووەکان لـە خـووی و هـەروەها لـە کوردستانی تورکیەشدا دەبینرێن. کوردەکانی شـێخکانلووی خوراسـان لـە چـناران و کـەلات و قووچان و مەشهەددا دەژین و لە کاتی ڕووخـانی سـەفەویەکاندا و بـۆ پاشـایەتی نـادر هـەوڵی زۆریان دا، هاوکات بۆ لەناوبردنیـشی خۆیانیـان مانـدوو کـردووە بـە تایبـەت شـاهوێردیخـان شەیـخوانلوو سلێمانبەیگ و قووجەخان و شوکربەیگی برای ژنەکەی نادر، لەو کەسانەن کە ئەم هەوڵـەیان داوە. ژن و کەنیـشکە کـوردە شەیــخوانلووەکان لـە شـەڕەکانی ئێـران و ڕۆمـدا لـە سەردەمی شاتەهماسبدا بەشداریان کردووە و یارمەتی مێردەکانیان داوە. مەردۆخ نووسیویەتی ناوی ئەم عەشیـرەتە لە وشەی «شێخەکان»ەوە هاتووە کە لە وڵاتی تورکیـە، لـە نێـوان شـاری بەدلیس و مووش دان و خۆیانیان لەگەڵ عەشیـرەتی جبـرانلوو کە دوو هەزار بنەماڵەن تێکـەڵ کردووە.

ئەمیـن زەکی‌بەیگ شوێنی ژیانی شێخکانلووەکانی لە کوردستانی عێراقدا و لـە نزیکـی کەرکووکدا نووسیوە و گوتوویەتی ٦٠٠ بنەماڵەن و سەر بە عەشیـرەتی بارزانن.

**١٩- سووفـیانلوو:** لە عەشیـرەتە بەناوبانگەکانی کوردی کرمانـجی خوراسـانن کـە لـە مەشهەد و کەلات و دەرەگەزدا دەژین. هەروەها ئەم عەشیـرەتە لە سەردەمی سەفەویەکانیشدا هەر بوون. وادیارە ئەم عەشیـرەتە لەبەر ئەوەی زۆر خۆیانیان بە شائیسماعیل سـەفەوی نزیـك کردۆتەوە، بۆیە ئەم ناوەیان لە سەر نراوە و هەروەها لەبەر ئەوەی کە زۆربـەیان لـە کوردسـتانی سووفیان (سووفـیانلووەکانی خوراسان) لە سەردەمی نادرشای ئەفشاردا دەسـەڵاتی زۆریـان بـە دەستەوە بووە و هاوکات نادرشـایش ڕێـزی زۆری بۆیـان دانـاوە و کـار و ئیـشی گرنگـی زۆری خستۆتە ئەستۆیان. ئەم کوردانە یارمەتی زۆری دوکتۆر موسەددیقیان داوە. دوایـی زۆرتـر لـەم بارەوە ئەدوێیـن.

**٢٠- عەمـــارلوو:** مـن وا ئەزانـم عەمـــارلوو هەڵەیـە و «ئامـارلوو» دروسـتە. کوردەکانی خوراسان بەم عەشیـرەتە دەڵـێن «ئامـاران» کـە بـە مانـای ئـەنبار و پێداویـستی زەخیـرە کراوە. وا بیـر دەکەمەوە کە ئەم کوردانە لە شاری ئەنباری نزیکی مەداینـەوە هـاتوون کە لە سەردەمی ساسانیەکاندا پارێزەری ئەوێ بـوون. دوای ئـەوە موسـڵمانەکان ئـەم شـارەیان داگیـر کردووە، ئەم کوردانە گەڕانەوە کوردستان (بـاکووری مـەداین) و دوایـی هـەر بـەو نـاوە ناوبانگیان دەرکردووە و لەبەر ئەوەی کوردەکان خۆیـان بـە ئـەنبار دەڵـێن ئامـار، بۆیـە پێیـان گوتراوە «ئاماران» یانێ کەسانێ کە لە «ئامار»دا دەژین و دوایی بوو بە ئامارلوو، ئێستا ئەم عەشیـرەتە لە شارەکانی نەیشابوور، قووچان و عەمـارلووی گیلان و قەزوین‌دا دەژین.

مامۆستا مەردۆخ دەفەرمێ: عەمـارلوو دوو هەزار بنەماڵەن کە لە باشووری گیلان واتا لە نێوان ڕوودبار و قەزویندا دەژین و خۆیان بوونەتە چەند لقەوە کە بریتیـن لـە قوبەقـەرانلوو، شەمکانلوو، بەشکانلوو، بەهادۆرلوو و شاهکولانلوو.

ئەمیـن زەکی سەبارەت بەم عەشیـرەتە دەڵێ: ئەنبارلوو و ئامارلوو و ئەمنیش پێم وایـە ئەمە دروستە.

**٢١- قاچکانلوو:** تاقمێك گوتوویانە قووچان هەر لەم نـاوەوە گیـراوە و قووچـان وڵاتـی

عەشیرەتی قاچکانلووەکانە کە قاچکانلو لە بنەڕەتدا قووچ قوویوونلوو بووە؛ بەڵام دەبێ بڵێین لەبەر ئەوەی «قوو» بە مانای مەڕی نێرە و «قوویوون» بە مانای مەڕی مێیە، پێداویستی بە ئەوە ناکات کە بڵێین قووچ میشلوو کە ماناکەی دەبێتە «نێرمێرلوو» و ئەگەر بڵێین «قاشقوویوونلو» بوویێت دروستترە لەبەر ئەوەی «قاش» بە مانای مەڕی سپی کە دەوری ملی ڕەش بێت.

قاچکانلووەکان کە گوندێك بەم ناوە لە باکووری قوراندا دەژین و ژنەکانیان جلوبەرگی کوردی دەپۆشن. جلوبەرگەکانیان زۆر جوان و ڕازاوەیە. تاقمێك لەم عەشیرەتە لە گوندی دیزاوەند و جەعفەرئاوای قووچاندا دەژین و تاقمێکیتریان لە گوندەکانی دەرەگەزدا بە تایبەت لە شەمسیخاندا دەژین. لە دەوری ۲۰۰ بنەماڵەی قاچکانلووەکان هەر کۆچەرن. زستان لە دەرەگەز و سەرەخس و مراوەتەپە و هاوینان لە کێوی هەزار مەسجد و ناوچەی داش و کانی ساردا دەمێننەوە، سەرۆکی ئەم عەشیرەتە ئەحمەد قاچکانلوو حاجی محەمەد ڕەحیم قاچکانلوو بوون و هەروەها مویاشرییەکان و حەیدەربەیگ و حاجیمەلا موحسێن و حاجی محەمەد ڕەحیم سەحراگەرد لە پیاوە گەرەکانی ئەم عەشیرەتەن. (سپاسی بەڕێز ئاروین قاچکانلوو دەکەم.)

**۲۲- قەراچوورلوو:** قەراچلوورلوو یان قەراچۆڵلوو یەکێ لە بەناوبانگترین عەشیرەتەکانی زەعفەرانلوون کە ناوچەی ناوەندی ئەوان باکووری دیاربەکرە و هەروەها ڕۆژهەڵاتی چۆمی وان لە کوردستانی تورکیە[١٦٧]دا و زۆرتر لە قەڵای قەرەچوولانی کوردستانی تورکیەدا مانەوە و دەڵێن ئێستا حکوومەتی تورکیە لەوێ سەدێکی دروست کردووە.

گرنگایەتی کوردەکانی قەراچوورلوو کە لە دلێرترین و ئازاترین کوردەکانی خوراسانن کە ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا بە جوانی باسی شەڕ و بەرەکانیەکانی ئەم عەشیرەتە و نادرمان کرد و هاوکات گوتمان کاتێ کە نادر لە دەشت و هەراوی قەپچاق گەڕایەوە، لە سەر ڕێگای شیروان- بجنووردا شەڕێکی گرنگیان بە نادر فرۆشت. ئەم شەڕانەی قەراچلووەکان بە

---

١٦٧- نادرنامە، قەدوسی، ل ٢٢٩.

سەرۆکایەتی نەجەفقولی سوڵتانی قەراچوورلوو دەستی پێکرد کەچی لە ئاکامدا نادر توانی بە هێزی ئاگری تۆپخانەی، کوردەکان شکست بدات و نەجەفسوڵتان لە ڕێی ناچاریەوە ئاگربەسی کرد.[١٦٨]

کاتێ نەجەف سوڵتان و نادر دەستیان دا بە باسەوە، نەجەف سوڵتان گوتی: لە مێژەوە کە نزیکی ٣٠٠ ساڵ دەبێت هۆزی کورد لەم ناوچەدا ژیان دەکەن و ئەم ڕاستیە وەکو ڕۆژی ڕۆشن وایە و خۆتان چاك دەزانن کە هەموان لە هێزی شمشێری ئێمە دەترسن و بە خۆیان ئیزن نادەن هێرش بهێننە ئەم ناوچەیە؛ بەڵام ئەمڕۆ کە جەماوەری کوردی زەعفەرانلوو و کەیوانلوو لە خزمەتی بەڕێزت دان، حەزیان لە ئەوە نییە کە ئێمە ئازایەتی و توانایی زۆرمان ببێت. لەم ڕۆژە بە دواوە نادر هەر خەریکی دڵداریدانەوەی نەجەفقولیخان و کوردەکانی قەراچوورلوو بوو و ئەوانیش ئازایەتی زۆریان لە خۆیانەوە پیشان دا بە تایبەت لە شەڕەکانی ئێران و ڕووم و هێرشی نادر بۆ هێند و هەرات. دوای ڕۆژگاری نادر و کوژرانی زۆربەی زۆری سەرکردەکانی ئەم عەشیرەتە لە شەڕەکانی سەردەمی نادردا، ئەم کوردانەش گوڵوولەیان کەوتە لێژی لەبەر ئەوەی ئیتر نادر نەماوە و هاوکات نەجەف سوڵتان و ڕۆستەمبەیگ قەراچوورلوو، شەهبازەك و موحەممەدڕەزاخان قەراچوولوو و موحەممەدخان قەراچوولوو و... هتد هیچیان پێ ناکرێ.

ڕاپۆرتی زۆرمان لەم عەشیرەتە لە سەردەمی دوای نادرەوە بە دەستەوە نییە، هەتا دەگاتە سەردەمی ڕەزاشا، کەچی لە سەردەمی مەشرووتەدا جارێکیتر حسەنقولیخان قەراچوورلوو خۆی پیشان ئەدا و دژ بە تورکمانە جەردەکان دەوەستێ (لە بەرگی سێیەمدا زۆرتر باس دەکرێت) حسەین قولیخان کە باوکی بەڕێز خانلەرخانی قەراچوورلووە، بە دەستی ئەمیرجان موحەممەدخان قاجار دەکوژرێت. دەبێ بڵێین ئەمە فەرمانێك بوو لە لایەن ڕەزاشاوە کە بوو بە هۆی کوژرانی حسەین قولیخان و ٢٧ کەس لە هەڤاڵانیەوە حسەین قولیخان کوری حاجی موحەممەد عەلیخان کوڕی مورتەزا قولیخان ناسراو بە «خاننایب»ە و ئەویش کوڕی سەبزعەلیخان قەراچوورلووە کە حکومەتی سملقان و شووغان و بەشێك لە

---

١٦٨– کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان.

گووگڵان بە دەستیانەوە بوو و من وائەزانم هەر ئەو سەبز عەلیخانە بێت کە قاتڵی موحەممەد حەسەنخانی باوکی ئاغاموحەممەدخانی قاجارە و نووسەری «خواجەی تاجدار» زۆر جار ناوی ئەم کەسایەتیەی هێناوە. کوردەکانی قەراچوورلوو هەموویان لە ڕەشماڵ و چادر بوونەتەوە و لە دەوروبەری بجنوورد-ئالاداغ، بە تایبەت لە شووغان و سملقان و تویزار و ئێسفەراین و قووڕی مەیداندا خەریکی کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین و ناوەندی ئەم کوردانەش گوندی «کریك»ە کە لە سەر ڕێگای تاران- بجنوورد دایە. کوردەکانی قەراچوورلوو لە نێوان ناوچەی قشلاخ و یێلاخی کوردستانی خوراساندا دەژین. تاقمێك لە قەراچوورلووەکان لە خوار وەرامین و دەماوەند و مەشهەد دان و تاقمێکیتریان لە دەرەگەز دەبینرێن. ناسرەدینشا لە سەفەرنامەکەیدا نووسیوویەتی ڕۆژی یەکشەممە ٤ی زیحەجەی ١٣٠٠ دەبێ بڕوین بۆ پاوەی خوار هاوکات کە نزدیکی شوێنەکە بووینەوە، نزدیکی ٤٠٠ سوارەی ئووسانلوو و قەراچوورلوو و هەداوەند کە هەموویان لە خواردا نیشتەجێن، هاوڕێی سەرکردەکانیان هاتنە پێشوازیمەوە. سەیفوڵڵاخان سەرکردەی ئووسانلووەکان، سەفەر عەلیخان سەرکردەی قەراچوورلووەکان، ڕەحیمخان سەرکردەی هەداوەند بوو و هەموویان هاتنە خزمەتم. هاوکات ناسرەدینشا ناوی دوو گوند دەبات کە هی قەراچوورلووەکانە بە ناوی «حسەینئاوا» و «عەلیئاوا»[١٦٩].

**٢٣- قەرامانلوو:** قەرامان ناوچەیەکە لە کوردستانی تورکیە و لە ڕۆژهەڵاتی زەریاچەی وان دان و لە نزدیکی سیواس و زەریای ڕەشەوەیە، دوای ئەوەی عوسمانیەکان دەسەڵاتێکی زۆریان وەدەست هانی، پاشازادەکانی قەرامانلوو لەسەر دەسەڵات گیرانەیەك و ئەو دەستەی لەم پاشازادانە کە شکستیان خوارد دەرباز بوون و پەنایان بردە سوڵتان موحەممەد ئیمپراتووری عوسمانی و هاوکات ئەویش کەوتە بیری داگیرکردنی ناوچەی قەرامانلوو، لەم سەردەمەشدا دەسەڵاتێکی یەکدەست و بەهێز لە ئێراندا نەبوو تاکو بیبێتە لەمپەری دراوسێیە دەسەڵاتدارەکانی وەکو عوسمانی. ساڵی ٨٧٣ی کۆچی مانگی یەکێ لە فەمانڕەواکانی

١٦٩- سەفەرنامەی ناسرەدینشا بۆ خوراسان بە خەتی میرزا ڕەزا کەلهۆڕ، ل ٢٧٢ و ٢٦٧.

قەرامانلوو پەنای بردە ئۆزونحەسەن ئاققوویوونلوو و داوای یارمەتی لێ کرد، بەڵام ناوبراو لەبەر ئەوەی توانای بەربەرکانێی لە بەرانبەر ئیمپراتۆری عوسمانیەوە نەبوو، وڵامی نەرێنی دایەوە. هەر بۆیە قەرامانلووەکان لە ئێران بڕان و ڕوویان کردە سوپای ڕۆم و کەچی ساڵی ٨٧٧ی کۆچی مانگی لە شەڕێکدا کە لە نێوان ئوزۆنحەسەن و عوسمانیەکاندا ڕووی دا. قەرامانلووکان یارمەتی عوسمانیەکانیان دا و بوون بە هۆی شکستی ئوزۆن حەسەنەوە.[١٧٠] بە دەسەڵات پەیداکردنی سەفەوییەکان، سەرۆکی قەرامانلووەکان پیاوێك بوو بە ناوی بەیرامبەیگ قەرامانی کە دوایی شائیسماعیل خوشکی خۆی بۆ مارە کرد. بەیرامبەیگ توانی خوراسان لە ژێر چەپۆکی ئوزبەکەکان دەربهێنێ و سنوورەکانی خوراسانی ڕۆشن کردەوە و تەنانەت توانی هەرات و بەڵخیش داگیر بکات، لە ئاکامدا ساڵی ٩٦٧ی شەهید کرا. بۆ ئاماژە بە پیاوە ناودارەکانی ئەم عەشیرەتە ئەتوانین ناوی زولفەقارخان قەرامانلوو، فەرهادخان قەرمانلوو، ڕۆستەمخان قەرامانلوو و قارەمانبەیگ قەرمانلوو ناو ببەین کە لە سەردەمی شاعەبباسی یەکەمدا دەسەڵاتی زۆریان بە دەستەوە بوو" بەڵام بە داخەوە لە ئاکامدا بە فەرمانی پاشا کوژران، لەبەر ئەوەی پاشا زۆر لێیان دەترسا.

مایوانلوو، ئیگانلوو، قاسمانلوو، شادکانلوو و هەشت مرخییەکان لە عەشیرەتەکانی قەرامانلوون.

نووسەری مێژووی قزڵباش نووسیویەتی: ئەمیر قەرامان لە سەردەمی قەرایووفدا لە هەموو سەرۆکە کوردەکان گەورەتر بوو و ناوبراو لە شەڕی سوڵتان ئیبراهیمی پاشای شیرواندا پیاوەتی زۆری پیشان دابوو[١٧١] و هاوکات ناوی پیری قەرامان بەیرامبەیگ و یارئەحمەدبەیگ قەرامانلووش دەهێنێ.[١٧٢]

قەرمانلووەکانی خوراسان زۆر ئازا و بلیمەت بوون. بەڕێز ئەبولفەزڵ قاسمی، ناوی

---

١٧٠- ئەحسەنو تەواریخ ڕوملوو، لاپەڕەی ٤٧٢ و کتێبی دیاربەکرییە، نووسراوی تارانی، لاپەڕەی ٥٨٢ و ٤١.

١٧١- بڕوانە کتێبی عالەم ئارای سەفەویدا، شاپوور گورجی، لاپەڕەی ٣٦٢ تا ٣٩٠ و تاریخ قزلباشان، لاپەڕەی ٣٧ و عالەمئارای عەبباسی بەرگی ١ و لاپەڕەی ٤١.

١٧٢- تاریخ قزڵباشان، بە تێکوشانی میرهاشم موحەدیسەوە، ل ٣٧.

خەسرەوخان سەرۆکی عەشیرەتی قەرامانلوو دەهێنێ و دەڵێ ناوبراو یەکێ لە ئەو کەسانەی بوو کە پاڵپشتی لە نادرەوە کرد، تاکو بوو بە پادشا.[١٧٣] دواییـن سەرۆکی عەشیـرەتی قـەرامانلوو کە زۆر لێهاتوو بوو، پیاوێك بـە نـاو وەلیخـان قەرمانلوویـە کـە تـوانی جـەجووخان بکـوژێ و هاوکات بە بۆنەی ئازایەتی ئەم پیاوەوە بوو کە کوردەکانی خوراسـان توانیـان زاڵ بـن بـە سـەر کولونێل موحەمەد تەقیخانی پسیاندا. (بڕوانە بەرگی ٤)

عەشیـرەتی قەرمانلوو لە پەنای کێوی شاجەهاندا دەژیان. (بڕوانە بەرگی یەکەم)

نووسـەری کتـێبی مێـژووی قزلبـاش بـە هەڵـە نووسـیوویەتی قـەرامانلوو لـە تورکـە سەلجووقەکانی ئاقوویوونلوون. کەچی ئێمە بە جوانی دەزانیـن کە ئەم عەشیـرەتە کـوردێکی خاوێنن" بەڵام ناوچەی قەرامان لە ژێر دەسەڵاتی پیاوێکی تورکدابوو، ئەم عەشیـرەتە کاتێ کە لە کوردستانی تورکیەوە بە مەبەستی یارمەتی شائیسماعیل ڕوویان کردە ئێران، ئەو ناوچەیەی کە پێیان درا هەر بە ناوی قەرمان ناونرا.[١٧٤]

**٢٤- کایانلوو:** کە پێیان دەگوترێ کاوانلوو، تاقمێك بەم باوەڕەن کە کاوانلوو پاشماوەی ئەو کوردانەن کە بە یارمەتی کاوەی ئاهەنگەر توانیان دژ بـە زەححـاك بووەستــن و بیکـوژن. هاوکات فەریدوونیان کرد بە پاشا، کە دوایی خۆیانیان کردووە بە کاوەیی و ئەم ناوەش بووەتـە کـاوانی خوالێخۆشـبوو. دێهخـودا بـۆ لێکدانـەوەی «کـاوانی» نووسـیوویەتی دەگەڕێتـەوە بـۆ «کاویان» و درەفشی کاویان کە دەگەڕێتەوە سەر کاوە.

**٢٥- کووخ بـەنیکلوو:** کـە مێژوونووسـەکان بـە تایبـەت موحەمـمەدکازم لـە کتـێبی عالەمئارای نادریدا ناوی کەهبەنیکلووی نووسیوە" بەڵام کووخ بەنیکلوو دروستە.

هەر وەك کە لە لاپەڕەی ٤٩٧ی بەرگی یەکەمدا باسمان کرد ناوچەی ناوبراو بریتی بوون لە کوڕان و ئسپیچر، تیکتانلوو، زیدانلوو، دەولەتـخانە و شەیـخکانلوو.

---

١٧٣- بڕوانە کتێبی نادرشیرمەرد ئەتەك، ئەبولفەزڵ قاسمی، ل ١٧٢.

١٧٤- لەبەر ئەوە ئەم عەشیرەتە بە قەرامانبوو ناسراون چۆن پێش ئەوەی زنجیرەی عوسمانی دەسـەڵات پەیدا بکەن و فەرمانڕەوای ئەو ناوچە بن، قەرمانەکان فەرمانڕەوای ئەوێ بوون کە قەرامان نـاوی پیـاوێکی تورك بوو و لە خوراساندا ناوەندی قەرمانەکان گوندی کەواکییە.

بەو بۆنەوە ئەم ناوەی پەیدا کردووە کە کۆخ لە بەرانبەری کاخەوەیە و تاقمێك لە خەڵك بە کۆخنشین[175] دەڵێن کلووخنشین یانێ خەڵکی فەقیر و هەژار، کە لە بەرانبەری چارواداروەیە سەرۆکایەتی کۆخ بەنیکلووەکان لەم ساڵانەدا لە ئەستۆی ڕەوشەنیەکاندابوو.[176]

موحەممەد ئیبراهیمخان ڕەوشەنی بەر لە ئەوەی ببێت بە سەرۆکی عەشیرەتی زەعفەرانلوو، سەرۆکی کووخ بەنیکلووەکان بووە و دوای ئەو ئەسلانخانی ئامووزای بوو بە سەرۆك و زۆربەی کاتیش هەر لە قووچان دەمایەوە.

دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە خرابووە ئەستۆی سەعادەت قولیخان ئووغازی کە لاوێکی ئازا و لێهاتوو بوو سەردەمێ کە کولونێل موحەممەدتەقیخان پسیان هێرشی کردە سەر قووچان، سەعادەت قولیخان خۆی گەیاندە زەعفەرانلووەکان و یارمەتیانی داوە.

**کەیکانلوو:** وەك گوتمان کەیکانلوو، یەکێ لە عەشیرەتە گەورەکانی کوردی زەعفەرانلوو کە لە سەرانسەری سنوورەکانی باکوری خوراسان واتا لە ئاشخانەی بجنوورد تاکو دەرەگەز و قووچان ژیاون و ناسرەدینشا لە سەفەرنامەکەی خۆیدا باسی کەیکانلووەکان دەکات و دەڵێ ئەم عەشیرەتە کوردە ٥ هەزار بنەماڵە پێك دەهێنن. کەیکانەکان پێشتر هاوینان لە باکووری ئازەربایجان و ڕۆژئاوای قەفقازدا بوون و زستانیش دەڕۆیشتن بۆ ناوچە گەرمەکانی کوردستانی تورکیە، مەسعوودی لە مورەوێجوزەهەبدا دەڵێت: الکیکان ببلاد آذربایجان.

ئەمینزەکیبەیگ لە کتێبی کورد و کوردستاندا نووسیویەتی: کەیکی (کەیکیە) نیمەکۆچەرین و ١٢٠٠ بنەماڵەن و لە ناوچەی قەرەچەداغدا دەژین.

دەبێ بڵێین ئەمانە پاشماوەی کەیکانلووەکانن کە لەوێ ماونەتەوە، نووسەر بەو باوڕەیە کە کەیکان دەگەڕێتەوە سەر «کی» و «کیە». خەڵکی کیە لە عەشیرەتی گەورەی «مووشکی»ن. بەڕێز ئێحسان نووری لەم بارەوە دەنووسێت: ساڵی ١١٥٠ی پێش زایین عەشیرەتی مووشکی دەسەڵاتی زۆریان هەبووە و ناوچەکانی کوردستانی باکووری

---

١٧٥- کەلاوەنشین

١٧٦- مورەوێجوزەهەب، چاپ سەنگی، ئەلئەزهەر، مسێر، بەرگی ١ ل ٢١٤، بەڕێز ئەبوالقاسم پایەندە نووسیوەیەتی کە یکان کە هەڵەیە و هەروەها نووسەری مێژووی بروجردیش هەڵەکەی دووپات کردۆتەوە.

ئازەربایجانیان لە ژێر دەسەڵاتدا بووە و ساڵی ١١٠٠ی پێش زایین «قوباد» و «کیە» و «کەلیکا»یان داگیر کردووە. لە پێشدا بە قوباد و کیە گوتراوە «کوپووت» و «کیە» یان «کات پتوو».[١٧٧] بەڵام ئەمڕۆژ کەیکانلووەکان لێك دابڕاون و دابەش بوون بە بیچرانلوو و سیووکانلووەکانلووەوە، تاقمێکیشان لە خۆرئاوای بجنووردا واتا لە نزدیکی قووچان و لە ئینچەی کەیکانلوودا دەژین.

**٢٦- کەیوانلوو:** لە بەناوبانگترین عەشیرەکانی زەعفەرانلوون کە لە ناوچەی چناران و ڕادەکان و دەرەگەزدا دەژین. بەڕێز ئەبولفەزل قاسمی کاتێ باسی ڕێوڕەسمی چۆخەی کوردەکانی خوراسانی کردووە ناوی کازمبەیگی کەیکانلووی ڕادەکانی هێناوە کە زۆر پاڵپشتی پەرەپێدانی ئەم یاریە بوو.[١٧٨] حێسامولسەڵتەنەی مامۆی ناسرەدین‌شا کاتێ کە لە قووچانەوە ڕوو دەکاتەوە مەشهەد لە ڕادەکاندا وچانێك دەدات و خانلەرخان کەیوانلوو هاتە پێشوازیەوە و زۆر ڕێزی خۆی و هاوڕێیەکانی دەگرێت.[١٧٩]

سەروان جی.سی.نی. پیە -ئەفسەری دەنگوباسی ئینگلیز- کە ساڵی ١٢٩١ی کۆچی مانگی هاتبووە خوراسان تاکو لەمەڕ دژایەتی کوردەکان و تورکمانەکان لێکۆڵینەوەی ببێ، هاوکات باسی هەژاری و نەداری و بێدەسەڵاتی خەڵکی ئێران دەکات. ناوبراو کاتێ کە ڕووی کردەوە ڕادەکان و ژیانی خۆشی کوردەکانی بینی، زۆر سەری سوڕما. هەموو گوندەکانی ئەو ناوچەیە بە تایبەت «تویل» و «یووسفئاوا»ی لە ژێر چاودێریدابوو کە خەڵکی ناوچەکە زۆر لە خۆشی و کۆکی و ئارامشدا بوون و هاوکات زەوینەکانیشیان پڕ لە کەسکایی و سەوزی بوو و ئاژەڵەکانیان زۆر چاخ و پڕ گۆشت بوون.

سەبارەت بە هەیکەڵی کوردەکانی کەیوانلوو دەڵێت: هەمووی خەڵکەکە جلوبەرگێکی جوانیان هەبوو و پیاوەکانیان کورتەباڵا بوون و ئێسقانەکانیان زۆر بەهێز و پڕزۆر بوون و چاوی خەڵکەکەش شین بوو.[١٨٠]

---

١٧٧- تاریخ ریشەی نیژادی کورد، ئیحسان نووری ، ل ١٩.

١٧٨- نادرف شێر مەرد ئەتەك، ئەبولفەزڵ قاسمی.

١٧٩- سەفەر نامەی ناسرەدین شا بۆ خوراسان ساڵی ٢٨٤ ی کۆچی مانگی.

١٨٠- جیوگرافیای تارێخی خواراسان، تاهێری، ل ١٠٤.

نووسەریش دەڵێت ئەمنیش بۆم دەرکەوت کە ئەم کوردانە زۆربەیان چاویان شینە کە جوانییێکی زۆری پێیان داوە. کەیوانلووەکان بە تەواوی دەستیان لە کۆچ هەڵگرتووە و خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین، ناوەندی کەیوانلووەکان گوندی ڕادەکانە کە پێش پەلاماری چەنگیزخان مەغوول زۆر پڕڕەونەق بوو. سەرۆکی عەشیرەتی کەیوانلوو لە سەردەمی نادرشادا، خودا بەخشی کەیوانلوو بووە.[181]

تورسانلوو و گوارشکانلوو و میانلوو هەر لە عەشیرەتی کەیوانلوون.

**٢٧- گولیانلوو**[182]: وا بزانم ئەم ناوە دەچێتەوە سەر وشەی گولانڕوود کە ناوی ناوچەیێکە لە لوڕستاندا و شەرەفخان لە شەرفنامەدا ئاماژەی پێ کردووە لەم سەردەمەدا یەکێ لە گرنگترین عەشیرەتە کۆچەریەکانی کرمانجی خوراسانن کە هاوینان دەچنە کێوەکانی ئالاداغ لە دەوروبەری شووغاندا و زستانان ڕوو دەکەنە «بەر ڕۆژی» مراوەتەپە کە لە ڕووباری ئەترەك و لە نزیکی ئایتەیموور و ئاقەمیشەوە خەریکی کاری ئاژەڵدارین، بەناوبانگترین پیاوەکانی ئەم عەشیرەتە بریتین لە حاجی ئاقاخان و شاهڕەزاخان کە ئاژەڵێکی زۆریان هەبووە. لە سەردەمی دەسەلاتداریێتی خێڵی پالەویدا زەوینەکانی ئەم عەشیرەتە داگیر کرا و ئەم عەشیرەتەش بە تەواوی لێك پچڕا و هەر دەستەیێکیان ڕوویان کردە ناوچەیەك، بە تایبەت ئاقاخان ڕووی کردە کێوەکانی ئووغاز و چەند ماوەیێك لە کێوی پەتلەگاهدا مایەوە، بەلام دوای سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی ئێران جارێکیتر گولیانەکان گەڕانەوە ناوچەکەی خۆیان و ئێستاش هەر لەوێ ماونەتەوە و مەڕومالی زۆریان هەیە.

گولیەکان خەڵکێکی ئازا و لێهاتوون کە ناوبراوان لە ڕۆژگاری ڕابردوودا هاوڕێ لەگەڵ قەراچوورلووەکان لە شەڕەکاندا بەشداریان کردووە. گولیەکان تا سەردەمێ کە پێوەندی یەکیەتیان بەستبوو، تەنانەت سەیدرەشیدی یاغی و جەردەی بەناوبانگ توانای ئەوەی نەبوو پارەیان لێ وەربگرێ، بەلام بە بۆنەی جیاوازییێکەوە کە کەوتە نێوانی ئەم دوو عەشیرەتە و سەید ڕەشید چووە یارمەتی تاقمێك لە گولیەکانەوە و پێکەوە ئەو بەشەکەیان بە خراپترین

١٨١- نادر نامە، ل ٤٢٨.

١٨٢- پیم وایە گوولیانلوو دروست بێت.

شێوە تێکشکاند و هاوکات ژن و منداڵەکانیان دەیل کران و زۆر ئازار دران. بەڕاستی نازانم بۆچی وایە و ئێمەی کورد تاکەی لە باوەشی دوژمندا دژی یەك بووەستین. دەبێ بڵێین هەر ئەم گۆلیگەلە جارێکیتر لە دۆڵی بجنووردا کەوتبوونە بەر پەلاماری بووانلووەکان و ئوولاشلووەکان.

**٢٨- موژدەگانلوو:** کە پێیان دەگوترێ مەزداکانلوو، یەکێ لە عەشیرەتە بەناوبانگەکانی کوردستانی خوراسانن و لەگەڵ ئامارلووەکانی نەیشابوور لە جولگەی مارووسکدا دەژین. موژدەگانلوو زۆر یارمەتی نادرشای ئەفشاریان داوە.

مەسعوودی لە مورەوەجوززەهەبدا باسی کوردەکانی مەزدانکان ناوچەی جەبال دەکات کە دەتوانین بڵێین هەر لەم کوردانەن.

**٢٩- میلانلوو:** لە لاپەڕەی ٥٢٠ی بەرگی یەکەمدا کورتەیەك باسی ئەم عەشیرەتەمان کرد و گوتمان کە زیلان و میلان دوو برا بوون و هەرکام سەرۆکی عەشیرەتی خۆیان بوون.

کوردەکانی سیوورکانلوو بە کێویکی زۆر بالآبەرز لە نێوان باژگیران و ئووغاز دەڵێن زیلان. تاقمێك لە میلانووەکان لە دووگوندی میلانلووی ژوور و میلانلووی خواردا دەژین کە لە یەك فرسەخی سنووری نێوان ئێران و سۆڤیەت دایە و دوایین سەرۆکیان مێسرخان جریستانی بوو. زۆربەی ئەم عەشیرەتەش لە ئێسفەراین و لە پەنای کێوی شاجەهاندا دەژین کە نووسەری مەتلەعوشەمس دەڵێت: عەشیرەتی میلانلووی کورد کە هەزار بنەماڵەن و لە عەشیرەتی مەزنی زافەرانلوون و لە کێوەکانی شاهجەهاندا دەژین و چەند قەڵاییکیان هەیە کە بریتین لە: دەوڵەتئاوا، قاسمئاوا، پەرتان، عەباسئاوا، نەوشیروان، ئەردەغان و بیدواز.

سەرکردایەتی عەشیرەتی میلانلووی ئێسفەراین لە ئەستۆی فەرمانڕەواکانی ڕەوشەنیەوە بوو کە دوایین سەرکردە موحەممەد ئیبراهیمخان ڕەوشەنی (موزەفەروسەڵتەنە) بوو. (بڕوانە بەرگی سێیەم) بەڕێز حاجی موحەممەد ڕەوشەنی کوڕی موزەفەروسەڵتەنە لە نامەییکدا کە بۆ

نووسەری نووسیوە[١٨٣] دەڵێ: ٢٤ بەش لە میلانلووەکان کە لە عەشیرەتی زەعفەرانلوون بریتین لە: ١- **قانیانلوو** کە لە گەڵیانی شیروان و سورخ قەلاوزەورامدا دەژین ٢- **پەهلەوانلوو** کە لە سورخقەلا و حەسارگلیان دان ٣- **مەلوانلووەکان** کە لە گوندی دەرپەچین و زۆربەشیان لە باجگیران دان ٤- **حسەینانلوو** کە لە سەرچەشمە دان ٥- **شێخ ئەمیرلوو** کە لە ئەردەغان و کەلاتەجاتی خواری جولگەی ئێسفەراین دان ٦- **حەسنانلوو** کە لە حەسەنئاوا دان و حەسەنانلووەکان عەشیرەتێکی هەرەگەورەن کە خوالێخۆشبوو مەردۆخ دەڵێت: عەشیرەتی زافەرانلوو لەم عەشیرەتە جیا بوونەتەوە، کە ئەم قسە هەڵەیە و هاوکات زانیارییێکی سەبارەت بە کوردەکانی زافەرانلووی خوراسان نەبووە. هاوکات دەڵێت: حەسنانلوو کە حەسنانیەشیان پێ دەوترێ لە دەوروبەری ٣ هەزار بنەماڵەن و لە سنووری تورکیە و عێراق و ئێران و کێوەکانی دەوروبەری بەتلیس و ناوچەی کرکاردا ژیاون و هەشت لقن کە بریتین لە تلیە (دتلینەیشابورر) باکیە، حەیدەرانلوو، خوراسانلوو و خوراسکانلوو کە ئێستا لە گوندی ئووغازی قووچان دان و بە هەڵە گوندەکەیانیان بە خەرسکانلوو ناو بردووە، پسکیانلوو جویرانلوو، زیلانوو و ئودمانلوو کە ئەم سێ بەشە ئێستا لە سنووری بەتلیس دان و هەروەها لە لاپەڕەی ٩٥دا نووسیووەتی: سپیکانلی لە دەوری ٣ هەزار بنەماڵەن و لە باکووری زەریاچەی وان دان و لە لاپەڕەی ٩٧دا نووسیوویەتی: سەیفکانی ٥٠٠ بنەماڵەن کە لە بەشی ژووروو خاڵکانیدا دەژین. وادیارە سپیکانلی، سپیکانلوو، سەیفکان هەر ئەو سیووکانلووانە بن کە بەشێکی زۆریان لە ئووغازدا دەژین و لە بنەڕەتدا دەچنەوە سەر سیوورکانلووەکان. و هاوکات دەڵێت حەسنانلی لە دەوروبەری ٤ هەزار و دوو سەت بنەماڵەن و لە ناوچەی خەنەس مەلازگەرد و دارتوودا دەژین و ١١٠ گوندییان هەیە. عەشیرەتی بریزانلی بەشێکن لە حەسنانلیەکان و لە نزدیکی زەریاچەی وانەوەن. ٧- **قاچکانلوو:** (گەنجدان) و لە کوور قووچانەوەن. ٨- **جەمالانلوو:** لە قەڵای سفید دان. ٩- **پیرگانلوو:** لە ئیزی دان. ١٠

---

١٨٣- بەڕێز نووری پاشا نووسیوویەتی باکووری خوراسان زۆربەی زۆری کوردی زیلان و میلانن زیلان: ز لە کوردی دا بە مانای گیایەکی ناسکە کە کێوەکان دا ئەپۆشێنێ و نووسەریش دەڵێ لە کوردستا خوراساندا زیل بە مانای گیایەکی تازەیە.

**سارکانلوو:** (سارمانلوو)[١٨٤] لە سارکانلوو و خووی و ناوچەی سنووری ئێران و توورکیە و کوردستانی تورکیە دان. **١١- پەرکانلوو:** کە لە ناوچەی پەرکانلوو دان. **١٢- خانیانلوو:** کە لە ناوچەی قەزاقی دان. **١٣- قوولانلوو:** کە لە کەلاتەی سنجەر و نەسرئاوای سەرچەشمەدان. تاقمێك بەو باوەڕەن کە قوولانلووەکان لە عەشیرەتی بیچرانلوون کە لە گوندێکدا بەم ناوە دەژین و لە نزدیکی تەکمەرالی شیروانەوەیە.[١٨٥] **١٤- خانیانلوو:** کە لە ناوچەی قەزاقی دان. **١٥- مسکانلوو:** کە لە زەمانئاوادادەژین و مەسعوودی لە مورەوێجوزەهەبدا ناوی مسکلانی هێناوە. **١٦- قەرەشێخ ئەمیرلوو:** کە لە کەلاتەی کەربەلایی حسەین دان ١٧- مێهرانلوو کە لە ناوچەی خالەئاوا دان و هاوکات لە ناوچەی مێهرەجانی ئازەربایجاندا تاقمێك لەم کوردانە دەبینرێن کە پێشتر کوردەکانی ئەردەڵان لەوێ دەژیان. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە لاپەڕەی ١٢٠، ١٢٤، ٣٢٥، ٤١٦ی شەرەفنامە. **١٨- خووکانلوو:** کە لە چل دوختەران دان، زۆربەی خووکانلووەکان لە نێوان ئووغازوکوڕانی باکووری قووچان و لە دۆڵێکی بەرتەسکدا دەژین و تاقمێك پێیان دەڵێن خووکانلوو. **١٩- بەهلوولانلوو:** کە لە تویزاریدا دەژین ئەم عەشیرەتە پاشماوەی عەشیرەتی پەهڵەوانلوون کە ناوبانگی پەلوولانلوویان پێ دراوە. **٢٠- خەسرەوانلوو:** کە لە فەرتان (پەرتان)ی کۆن دان. **٢١- ئەمیرانلوو:** کە لە نێوان گلیان و سورخقەڵای پەرچین دان. **٢٢- جافکارانلوو:** کە لە ناوچەی جانئەحمەدی دان. ئایەتوڵا مەردۆخ دەڵێت: جاف لە دەروبەری ١٢ هەزار بنەماڵەن و ناوچەی ناوەندی ئەم عەشیرەتە سلێمانی عێراقە، ئەم عشیرەتە دوو لقن واتا جافی ئێران و جافی عێراق تاقمێك لە جافەکان لە قووچاندا دەژین. **٢٣- سیوودانلوو:** کە لە کەلاتەی شەرەفخان دان. ناسرەدینشا ئاماژەی پێ کردووە. **٢٤- کەل میشانلوو:** (Kalmishanlo) کە لە کەلاتەی شوور و لە

---

١٨٤- مەمی، دوای مردنی زیل کوڕەکان لێك جیابوونەوە و هەرکام عەشیرەتێکیان بە ناوی خۆیانەوە دروست کرد کە بریتی بوون لە: جەلالی کوردەکانی فیروزی خوراسان لەم کوردانەن حەیدەر مەهان و بەشێك لە زیلان ماوەتەوە تاقمێك کە ناوی زیلیان پاراستووە بەڵام ئێستا ئەم کوردانە لە کوردستان تورکیەدا لەهەرانبەر دەسەڵاتی توکیەوە وەستان تاریخ ریشەی نژادی کرد، ئێحسان نووری پاشا، ل ٢٣.

١٨٥- گۆڤاری هونە و مەردوم، ژمارەی ٤٣، گوڵانی ١٣٤٥، مەقالەی مەنووچێهر کەلانتەری سەبارەت بەعەشیرەتی میلانلووی خۆی.

دەوروبەری سولتانئاوای سەبزەوار و کلیدردا دەژین. کتێبی بەناوبانگی «کلیدر»ی بەڕێز دەوڵەتئابادی هەر سەبارەت بەم کوردانە نووسراوە و وەك گوتمان کە ئەم کوردانە لە عەشیرەتی تووپکانلوون. زۆربەی عەشیرەتی میلانلوو لە ناوچەی سنووری ئێران و تورکیە و شاری «خووی»دا دەژین. بەڕێز مەنووچێهر کەلانتەری لە مەقالەیێکی ڕێکوپێکدا بە جوانی باسی کردووە.

عەشیرەتی میلان لە ناوچەیێکی بەرپان و لە تەنشتی ڕۆخانەی زەنگمار لە نێوانی ماکۆ و گوندی قەتووری خوویدا بە شێوەی کۆچەری ژیان دەکەن.

کەس نازانێ وشەی میلان لە کەیەوە و لە چ وشەیێکیتر گیراوە. تاقمێك لە میلانیەکان دەڵێن: لەبەر ئەوەی پیاوێك کە ناوی «میل» بووە و ئەم عەشیرەتەی بنیات ناوە، پێیان دەگوترێ میلی (میلان) و تاقمێکیتر لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە وشەی مله (مل) گیراوە و بە مانای کێوە.

عەشیرەتی میلان دەبێتە دوو بەشەوە: ١- میلان ٢- خەلکانی[١٨٦]

میلان ٥ بەشی لێ جیا دەکرێتەوە: ١- مەمکانلوو[١٨٧] ٢- دوودکانلوو[١٨٨] ٣- مەندەلکانلوو[١٨٩] ٤- شێخکانلوو ٥- سارمانلوو[١٩٠]

هەروەها خەلکانی شەش بەشە، بە ناوەکانی: ١- کەچەلا نلوو،[١٩١] ٢-گلیکانلوو[١٩٢] ٣- ئوموویی[١٩٣] ٤- موروویی[١٩٤] ٥- قوردوویی[١٩٥] ٦- خوزوویی[١٩٦]

---

١٨٦- Khalle Kani

١٨٧- Mamakanlo

١٨٨- دوودکانلوو وابزانم هەر لەم تیکتانلووانەی قووچانەبن.

١٨٩- Mamdolakanlo.

١٩٠- زۆربەی سارمانلووەکان لە تورکیەدان لە فەرهەنگی جیۆگرافیای ئێرانی بەش خوراسان داهاتووە کە سار میران گوندێکە لە گوندەکانی میان باد ئێسفەراین کە ٥٤٥ کەسی لێیە، نووسەرپێی وابەکەسارمیران گۆراوەی سارمان لوویە.

١٩١- kachelanlo

١٩٢- Golekanlo

١٩٣- omii

١٩٤- moroi

ناوەندی کەچەلانلووەکان ناوچەی ئەنبارماران بوو. هەروەها لەم نووسراوەدا هاتووە کە سەرۆکایەتی عەشیرەتی میلان کوڕبەکوڕ گۆڕاوە و ئەگەر سەرۆکێك تا دوایین ڕۆژی ژیانی کوڕێکی گەورەی نەبووبێ، یەکێ لە نزیکترین پیاوە لێهاتووەکان بەو سەرکردەیە، سەرۆکایەتی گرتۆتە ئەستۆ. میلانیەکانی خووی شافێعی مەزهەبن، میلانیەکانی خوراسان و هەمووی کوردەکانی خوراسان شێعەن.

بە تێپەڕبوونی مانگی خاکەلێوە و گوڵان زۆربەی زۆری ئاژەڵدارەکانی ئەم عەشیرەتە لە گوندەکانی ڕوویاری ڕۆژئاوایی ئەرەس و خووی و ماکۆ و شاهپووردا بە ئاژەڵەکانیانەوە دەکەوتنە ڕێ و بۆ شوێن و ناوچە سەردەکان و سێرەکمان دەڕۆیشتن و بە خۆشی و شاییێکی زۆرەوە لە ییلاخدا چادرەکانیان دادەمەزراند و ئەم عەشیرەتە بە ماوەی ۳ مانگ لەوێ دەمانەوە و دوایین ڕۆژەکانی هاوین دەگەڕانەوە بۆ قشلاخ و ناوچە گەرمەکان.

ئەو بەشەی لە میلانیەکان[١٩٧] کە لە ئەرەسیکناردا ژیان دەکەن زۆر لە مێژەوە کاروباری ئاژەڵداری و کۆچ و چادریان بەجێهێشتووە و ڕوویان کردۆتە بازاڕ و وەك خەڵکی شارەکان ژیانی ئابووری خۆیان دابین دەکەن. ڕەشماڵنیشنەکان لە ڕێگای ییلاخ و قشلاخیاندا لەگەڵ گوندنشینە تورکەکان داویسەت دەکەن.[١٩٨] هەروەها دەبێ بڵێین کە تاقمێك لە کەچەلانلووەکان کە لە ئێسفەراین دان لەگەڵ عەشیرەتی میلانلوودا تێکەڵاون و بەشێکیتریان لە گوندی کاچلانلووی قووچان و جەعفەرئاباددان کە ئەم کوردانەپێشتر دانیشتووی شاری ماردینی کوردستانی تورکیە بوون.

نووسەری دیاربەکرییە بەم کوردانەی گوتووە: ئەکرادئاقکوچلوو[١٩٩] و قاوکەچلوو[٢٠٠] کە لە

---

qordui–١٩٥

khozui–١٩٦

١٩٧– میلنلووی ژووروو لە گوندەکانی جریستانەو لە ٤٢ کیلومیتری با جگیران دایە، ٣٢١ کەس دانیشووی هەیە میلانلووی خواروو لە گوندەکانی جریستانە و لە ٤ کیلومیتری با کووری باجیگرانە وەیە ٢٣٩ کەس دانیشتووی هەیەمیلانلووی سەفا لە گوندەکانی چرییە و لە ٣٧ کیلومیتری با کووری قووچانە وەیە، ٧٩ کەس دانیشتووی هەیە.

١٩٨– گۆڤاری هونەرو مەردوم، ژمارەی ٤٣، گوڵلی ١٣٤٥ مەقالەی بەرێز مەووچێهر کەلانتەری.

Aq Kacheiio–١٩٩

ماردین و لە نزیکی سیوورك و تۆرقە و دیاربەکردا ژیاون.[٢٠١]

ئەمینزەکیبەیگ دەڵێت: کەچەڵ هەزار ماڵێکە کە لە نزیکی پاڵوەوەیە.[٢٠٢] دێهخودا نووسیوویەتی: کەچرانلوو گوندێکە لە گوندە ناوەندیەکانی بەشی بجنوورد و ١١٢٤ کەسی تێدا دەژیت[٢٠٣] و ئاووهەوایێکی لەباریشی هەیە.

**٣٠- وڕانلوو** (Werranlo): لە بەرگی یەکەمدا لەم بارەوە زۆر دواین و هەروەها گوتمان وڕانووەکان نیوەکۆچەرین، زۆربەیان لە گوندەکانی شەفیع و خێرئاوا و ئیبراهیمئاوا و دەوروبەری ڕادەکان و چناراندا دەژین و کۆچەرنین، زۆرتر لە نیوەی ئەم هەزار بنەماڵەی وڕانلووە چادرنشینن کە هاوینان لە کێوەکانی بینالوو و کلیدر و ئەخلومەد دان و پاییزان دەچنە ڕووباری کەشفڕوود و لە ڕۆژئاواوە ڕوو دەکەنە ڕۆژهەڵات و هەر وەکو تووپکانلووەکان بۆ ماوەیێك لە جوڵگەی کەشفڕوودی دەرەگەزدا[٢٠٤] دەمێننەوە کە تا مەشهەد ٩٥ کیلۆمەتر نێوانیانە.[٢٠٥] بە هاتنی مانگی بەفرانبار ڕوو دەکەنە سەرەخس و لە تەنیشتی شوورلووق تا گونبەدی «لی»[٢٠٦] و نزدیکی خانگیران نیشتەجێ دەبن، ئەم عەشیرەتە زۆرتر لە ٢٠٠ کیلۆمەتر هاتوچۆ ناکەن و ڕانلووەکان ئێستا وشتریان نییە لە سەردەمێکدا وشتر تەنیا کەرەستە و ئامێری هەرەچاکی ئەم عەشیرەتە بوو کە بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی خۆیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە، بەڵام ئێستا لەبەر ئەوەی خەڵك لێیان تووڕە نەبێ و ئەڵێن ئالف و گزرەکانمانیان خواردووە لە ڕاگرتنی وشتر پەشیمان بوونەتەوە تا ئەو جێگای کە من بزانم

---

٢٠٠- Qavakachello

٢٠١- دیاربەکرییە، ئەبووبەکر تارالی، ل ٢٤٣.

٢٠٢- کورد و کوردستان، ئەمین زەکی.

٢٠٣- لوغەتنامەی دێهخودا.

٢٠٤- گەزەکانی دەوروبەری کەشفڕوود بۆ مەڕەکان زۆر لەبارن.

٢٠٥- ڕوباتماهی یا ڕوباتچاهەك لە تەنیشتی کەشفڕووددایە و هێشتا کەلاوەکەی هەر ماوەتەوە و دوایە بە فەرمانی سوڵتان مەحموود غەزنەوی بۆ ڕێز لێنانی فیردەوسی دوای مردنی ئەو شاعیرەمەزنە بنیاد نراوە.

٢٠٦- لە دۆڵی شور لوقدا پستە هەیە کە پێشتر مەکوی جەردە و دزدەکان بووە و لەبەر ئەوەی پییان گوتووە شورلووق چونکە ئاوی سوێریان هەبووە.

جگە لە تووپکانلووەکان و بریوانلووەکان کە ژمارەییێکی کەم وشتریان هەیە و لـە دەوروبـەری پسانکودا دەیانلەوەڕێنن، کەس‌تر لە کوردەکان وشتـری پێ نەماوە ئەم عەشیـرەتە بـۆ دابیـن کردنی ئاوی خواردنەوەش تووشی ڕەنجی زۆر بـوون و بـۆ ئاوهێنـان دەبـێ زۆر خۆیـان مانـدوو بکەن. ورانلووەکان بەم شێوەی کە باسی دەکرێ ١٤٠ ڕان مەڕیان هەیە.

١- عەشیـرەتی **قەنبەری (قەمووکی)** و عەشیـرەتی **قارەمانی** کە ٣٠٠ بنەماڵەن و ٤٠ ڕانی مەڕیان هەیە. ٢- **ئازووگی** کە ٣٠٠ بنەماڵەن و ٣٠ ڕان مەڕیان هەیە ٣- **ئایزییـەکان** ١٥٠ بنەماڵەن و ٧ ڕان مەڕیان هەیە ٤- **دوودەکیەکان** ٢٥٠ بنەماڵەن و ١٠ ڕانیان هەیە ٥- **یووسفیەکان** ٤٠٠ بنەماڵەن و ٤٠ ڕانیان هەیە ٦- **تەوانیـەکان** ١٥٠ بنەماڵـەن و ٥ ڕانیـان هەیە ٧- **مێرساقیەکان** کە ٥٠٠ بنەماڵەن و ١٠ ڕانیان هەیە مـەڕی و ڕانلووەکـان تـا چـەند ساڵی ڕابوردوو هەمووی لە ڕەگەزی کوردی[٢٠٧] بوو، بەڵام لەگەڵ ڕەگەزی بەلووچیدا تێکەڵ بوون و ئێستا دوو ڕەگەزەن، ئەگەرچـی لـە گوشـتدا نـاتوانن وەکـو مەڕەکوردییـەکان بێنـەوە" بـەڵام خوریەکەیان زۆر چاکە. عەشیـرەتی تووپکانلووی بەشی ڕۆژهەڵاتی، مـەڕی دوورەگـەی زۆریـان هەیە، بەڵام ڕەگـەزی مـەڕەکانی بەشـی ڕۆژئـاوایی بـە تایبـەت عەشیـرەتەکانی کـەیکانلوو و بیچرانلوو، سیووکانلوو و خەڵکی سەرحەد هەر لە ڕەگەزی کوردییە.

چەند ساڵێك دەبێت کە ئـەم کوردانـەش وەك کوردەکـانی کـاوانلوو و گوڵیـانلوو لەمـەڕە موغانیەکان کە لـە دەشـتی موغانـەوە هێنـراون کـەڵکیان وەرگرتـووە و مـەڕەکانی خۆیانیـان کردۆتە دوو ڕەگـەزە. تـا پـێش ڕاپـەڕینی سـاڵی ١٣٥٧ی گـەلانی ئێـران ماڵیـەیێکی زۆر لـە تووپکانلووەکان و وڕانلووەکان وەردەگیـرا و لە ڕاستیدا خەڵکەکە تاڵان دەکـران و پارەییێـك کـە وەك ماڵیە لەم خەڵکە وەردەگیـرا دەکرایـە خـەرجی ئاسـتانەی ئەشرەفیەی مەشـهەد، کـەواتا ڕاستی شتێکی‌تر بوو و ئەو پارانە خەرجی پیـاوە دەوڵەتیـەکان و خۆشـگوزەرانیەکانیان دەبـوا. ئاستانە پارەی لە وڕانلووەکان وەردەگرت" بەڵام تەنانەت توانای ئەوەی نەبوو کە چاڵاویکیان بۆ بکەنێت تاکو خۆیان و مەڕەکانیان لە تینوویدا نەخنکێن. دوای سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی

---

٢٠٧- زۆر سپاسی بەڕێز بەرات موحەممەد عادڵی زادەی و ڕانلوو دەکەم کە زۆریان یارمەتی داوم.

ئێران ئەمماڵیەیە لابرا و خەڵکەکە کەوتنە خۆشی و ڕاحەتی و تەنانەت قوتابخانە و نەخۆشخانەشیان بۆ کرایەوە و خۆشیان ڕادەبوارد.

٣١- **هیزوولانلوو:** هیزوولەکان لە قووچان و ناوچەکانی دەوربەریدا پەرژوبڵاون و تاقمێکیشان هێشتا ڕەشماڵنشینن. چەند بنەماڵەییێك لەم کوردانە لە وەرزی زستاندا هاوڕێ لەگەڵ ورانلووەکان ڕوو دەکەنە مراوەتەپە و لە تاقری بچووکدا نیشتەجێ دەبن و هاوینانیش ڕوو دەکەنە کێوەکانی باکووری ڕۆژئاوایی قووچان. بەناوبانگترین پیاوی هیزوول خوالێخۆشبوو خوداداد کووهستانی بوو کە پیاوێکی زۆر کارامە و پارەدار و بە بڕشت بوو، کووهستانیەکان چ ژن و چ پیاویان بە هێز و توانا و زۆر جوان و شیك بوون و لە بەناوبانگترین هیزوولەکانن و ناوبراوان ١٥ ڕان مەڕیان هەیە و بە ناوبانگترین کەسی ئەم تیرەیە موحەممەدخانی کووهستانییە، کە کوڕی خوالێخۆشبوو خوداداد کووهستانیە ناوبراو بە تەنیا ڕانێ مەڕی هەیە و وەرزی زستان لە سەرەخس و هاوینان لە کێوی موحەممەدبەیگی نزدیکی قووچاندا ئاژەڵداری دەکات.

ئەو هیزوولانەی کە لە ناوچەی مراوەتەپە دان برتیین لە: حاجی عەلی، حاجی ئەسەدۆڵا، حاجی شاحسەین و نوسرەت کووهستانی و ناوبراوان لە وەرزی زستاندا ڕوو دەکەنە دەشتی کوڕان کە لە باکووری گونبەدی کاووس دایە و هاوینانیش دەچنە کێوی ئارمووتلی کە لە ڕۆژهەڵاتی ئووغاز دایە. ١٣٦٣/٤/٤ی کۆچی هەتاوی بۆ چاوپێکەوتنی کووهستانیەکان ڕووم کردە ئارمووتلی (نووسەر) و ئامانجم ئەوە بوو کە برای زۆر بەڕێزم سێرات کووهستانی ببینم کە ناوبراو مامۆستای منداڵە هێزولانلووەکان بوو و دمویست بزانم ئەم مامۆستا ڕەشماڵنشینە چلۆن دەرس دەڵێتەوە، بەڵام بە داخەوە نەمتوانی مامۆستا ببینم. ئێستا کە سەبارەت بە کووهستانیەکان باس دەکرێت با ئەوەش بڵێین کە ئەم عەشیرەتە پیاوێکی شاعێریشیان هەبوو بە ناوی نوسرەتوڵلانەسیب کووهستانی کە زۆر بلیمەت بوو.[٢٠٨]

---

٢٠٨- بۆ یەکەمین جار ناوی نوسرەتوڵلای کوهستانیم لە زمانی پیرەمێردێکی کوردی هیوەدانلووە عەزیم بلووریانەوە بیست و دوایی زۆر ساڵ و مانگ بە دوای کەوتم تاکو سەبارەت بەم پیاوە زانیاری وەدەست

# نوسرەتوڵلا کووهستانی کێ بوو؟

بەڕێز گوڵشەن ئازادی بەرپرسی ڕۆژنامەی ئازادی لە مەشهەد لە نووسراوەیێکدا بە سەردێڕی (فروغی از دل کوهسار تابید و در سینەی کوهسار نهان گشت)[٢٠٩] نووسیوویەتی: ئەو ڕۆژەی کە خوا پەیمانی لەگەڵماندا بەست، گوڵە جوانەکان دەبێ دەسچین ببن (لاوە جوانەکان دەبێ جوانەمەرگ ببن). کەچی یەکێ لەم گوڵانە نووسرەتەوڵلا بوو کە بۆ هەموو کات بە تەنیا بەجێمانی هێشت. ناوبراو کوڕی ئەسەدوڵلای کووهستانیە. ئەم بنەماڵەیە وەکو زۆربەی قووچانیەکان کوردی زەعفەرانلوون. نەسیب لە گوندی داشبولاقدا کە گوندێکی بچووکە و لە نێوان کێوەکانی ئەخلومەددایە هاتۆتە دنیا. پێم وایە ئەم زاتە ساڵی ١٢٩٠ی کۆچی هەتاوی دنیای بۆ یەکەم جار بینیوە. باوکی نەسیب پیاوێکی نەخوێندەوار بووە و هاوکات دەوڵەمەندیش بووە. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەهۆش بووە ئەو ئازایەتیەی لە خۆیەوە پیشان داوە و کوڕەکەی وەبەر خوێندن ناوە. ساڵی ١٣٠٤ و ١٣٠٥ی کۆچی نەسرەت بۆ یەکەم جار شێعرێکی کوردی- فارسی لە ڕۆژنامەی شەرقدا بڵاو دەکاتەوە بە سەردێڕی (نوسرەتوڵلا قوتابی پۆلی شەشەمی سەرەتایی قوتابخانەی ڕەزەوی).[٢١٠] کە زۆر شیعرێکی شاعیرانە بوو. دوای چەند ڕۆژ کوڕێکی ژیرم بینی کە هات و شیعرێکی هێنابۆم و داوای کرد تاکو ببم بە هەڵەچنی شیعرەکانی، کەچی ئەم شاعیرە چکۆلەیە کە زۆر جوانیش دەینووسی نوسرەتۆڵا بوو.

کووهستانی دەورەی سەرەتایی خوێندنی تەواو کرد و چووە ناوەندی و لە قوتابخانەی فیردەوسی مەشهەددا دەستی کرد بە خوێندن و لەم سەردەمەدا لە ڕۆژنامەی ئازادیدا شیعر و نامیلکەکانی بڵاو دەکرانەوە و ئەمنیش نازناوی ((نەسیب))م پێی دا.

---

بهێنم. بەڕێزت لە نامەکەی خۆتدا نووسیووتە کە شاعیری جوانە مەرگم لە خەودا بینیوە و گوتوویەتی کە من هێشتا هەر جوان ماومەتەوە.

٢٠٩- ئەم نووسراوە بە ڕێز گوڵشەن ئازادی بۆ ئەحمەد تەمەدونی بەرپرسی گۆڤاری تەمەدنی نووسیوە گووتوویەتی، هەڤاڵی هێژام بەڕێزت لە نامەکەی خۆتدا نووسیووتە کە شاعیری جوانەمەرگم لەخەودا بینیو و گوتوویەتی کە من هێشتا هەر جوان ماومەتەوە.

٢١٠- تاکو ئێستا هیچ شیعرێکم بە زمانی کوردی لەم شاعیرەوە نەبینیوە.

هەستی شاعیرانەی نەسیب ناتوانێ لەگەل ڕێگە و ڕەوشتی حیساب و ڕیازیدا یەك بگرێت و بۆیە ناوبراو لە کاتی وانەی حیسابدا نەدەڕوێشتە قوتابخانە، بە تایبەت لە سەردەمێکدا بوو کە کچێکی برژانگرەش و ڕوومەتسپی دڵی دزیبوو و سەبر و تاقەتی لێ برابوو و ئەوەندە دلدارەکەی خۆش دەویست کە نەیدەتوانی تەنانەت دەرسیش بخوێنێ و سەرحی و شێت وەکو دێوانەیێك هەڵدەبەزێ و هاوکات دڵی پڕە لە حەز و تاسە و خۆشەویستی.

کووهستانی ساڵی ١٣١٠ی کۆچی دێتە تاران و بۆ یەکەم جار شاعیری گەورەی ئازەری واتا «شەهریار» دەبینێ و لە خزمەتیدا زۆر خۆش ڕادەبوێرێ هەتاکو ساڵی ١٣١٢ی کۆچی کە دەچێتە سەربازییەوە و ساڵی ١٣١٤ دەگەڕێتەوە قووچان و ژن دەهێنێ ئەویش نە یەك ژن، دوو ژن و بۆیە لەڕێی ناچارییەوە دەبێ کارێك بگرێتە ئەستۆ تاکو بتوانێ ژیانی ئەو دوو هاوسەرەی دابین بکات و هاوکات ناوبراو تەنیا شاعیری بە ئەمەکی ناوچەی قووچان بوو و هەر کەس بە هەر پلە و پایەییێکەوە کە دەهاتە قووچان حەزی لیێ بوو تاکو نەسیب ببینێ. ساڵی ١٣١٨ بەڕێز مونیرەدین پیرزادە داوای لێ کردووە بڕواتە مەشهەد و کاری چاکتر لە ئەستۆ بگرێت" بەڵام ناوبراو حەزی نەکردووە قووچان بەجێ بهێڵێ و هەر لەوێ ماوەتەوە. ساڵی ١٣٢٠ نەسیب بە بۆنەی ناخۆشیەوە دەبردرێتە مەشهەد و هاوکات دەبێت لەگەڵ ڕاپەڕینی ١٣٢٠ی کۆچیدا و بۆیە دوور دەخرێتەوە بۆ نیشابوور و شیروان. ساڵی ١٣٢١ی کۆچی بۆ هەمیشە لە هەموان ماڵئاوایی دەکات و جوانەمەرگ دەبێت. نەسیب بەڕاستی شاعیرێکی بلیمەت بوو لە ڕووباری شیعردا زەریاییێکی شاعیرانەی بەدی هێنابوو. دڵی ئاسمانێکی پڕبارانی تاسە و خۆشەویستی بوو، عاشقی سەعدی و حافز و مەولانا و خەییام بوو، بەڵام چی دەکەی تەمەن بێمەودایە و کات ناناسێ. ئەم زاتە ئەوەندە شیعر و شاعیری و دنیای ئەویندارى خۆش ئەویست کە ماڵە فەقیرانەکەی حاجی خوڕەم باباکوهی شیرازی بە هەزار کۆشك و تەلاری پاشایانە نەدەگۆڕیەوە. ناوبراو لەگەڵ شاعیرانێك وەکو خوالێخۆشبوان حاجی میرزا شەکور ئیشراق[211]،

---

٢١١- بۆ ناسینی هەر کەس دەبێ پێشتر هەڤاڵەکانی بناسین.

سەید حەسەن ساحێبوززەمانی[٢١٢]، میرزا موحەمـمەد تێهرانی و لاوانێك وەکو عێماد عێسار، تەفەززولّیـەکان[٢١٣]، مونتەجەبودیـن ڕەحیمـی، هەڵسوینیـشی هـەبووە و هـەروەها وەکـو مامۆستایێك بۆ بەڕێز فەرەخ و نەوید[٢١٤] ڕوانیوویە. نەسیب کـە زۆر حـەزی لـە ئاسـەوارەکانی ویکتۆر هۆگۆ و لامارتیـن بووە و هاوکات خۆیشی چەند نووسـراوەی هـەر بـەو شێوەی ئـەوان نووسیوە[٢١٥] و بەشێکی لە گۆڤارەکاندا بڵاو کراوەتەوە. ناوبراو زۆرتر خۆشی لە غەزەڵ هاتووە و غەزەڵە پڕ لە خۆشەویستیەکان ئەم ڕاستیەمان پێ دەسەلمێنن.

ئەمەش بڵێم دەمەوێ ئەو شیعرانەی نەسیب کە بۆ ئازادی گوتراون، کۆیان بکەمەوە و لە چاپیان بدەم و بۆ ئەم مەبەستەش باوکی نەسیب بڕیاری داوە یارمـەتیم بـدات. ئێـستاش دوو غەزەڵ لە غەزەڵەکانی نەسیب کە لە گۆڤاری «تەمەدون»دا لە چاپ دراون دەیخوێنینەوە:

اگـر خـواهـی بـه شادی بگذرانی زندگانی را

بـه غـفلت مگذران ای دوسـت جـوانـی را

جوانی کـامـرانی بـود صـد اوخ زنـادانـی

کـه از کـف رایگـان دادیـم نقـد کامرانی را

بـه حـرف مـدعـی رنـجیده از ما و ندانستی

تـفاوت‌هـاسـت یار جانی و یـار زبـانـی را

زمـن پـرسید اسـرار درون فـرقـه‌ی زاهـد

که عارف نیـک دانـد راز اسـرار نـهـانی را

دریغ از جور گلچینان که مرغان سحرخوان را

بـرون کـردند از خـاطر، هوای نغمه‌خوانی را

---

٢١٢– ئەم دوو کەساتیە لە پیاوە گەورەکانی خوراسان بوون.

٢١٣– جەهانگیر تەفەزولی شاعیر و وەرگێڕ بە پرسی ڕۆژنامەی ئێران ما و هەروەها مـەحموودی تەفـەزولی کە برای زانا و پسپۆڕی ناوبراو بووە و نامەی جەواهێر لەعل ئەهرۆی وەرگێڕاوەتەوە فارسی.

٢١٤– سەفینەی فەرەخ کتێبە شیعری خوالێخۆشبوو مەحموود فەرەخە.

٢١٥– سروودی بولبولێ یەکێ لە پەخشانە جوانەکانی کوێستانییە کە لە تەمەدوندا چاپ کراوە.

به ظلمات حیات ای دل مــدد از خضر راهی جو
کــه از فیــض دمــش یــابی حیات جاودانی را
شبی سرمست و رندانه بیا بــا مــا بــه میخانه
زخــط جــام و پیــمانه بخــوان راز نهــانی را
مــن و بلبــل در ایـن گلشن نبستیم آشیان زیرا
که اندر پی تطاول‌هــا بــود بــاد خــزانــی را
نصــیب از مــطرب و ساقی حدیث فرصت باقی
بگوش هوش بنیوش و بهــل دنــیــای فــانی را

***

بــه تیــره‌بــختــی جــان دادم و نــدانــستــم
دریــغ و درد کــه ایـــن آمــدن بــرای چه بود
نــدانی ز چــه رو مــی‌بــرد بــه ســوی عــدم
کســی کــه ایـــن هـمه آورد از عدم به وجود
ز روی وهم و جنــون هــر کــسی خیــالی کرد
بــرفــت و عــاقبــت‌الأمــر زیــر خاک نمود
بــه غیــر بــادیــه و سنگــلاخ هــیــچ نــدید
کــســی کــه ایـــن ره صـعــب‌العبور را پیمود
جهان چون کشتی بشکسته‌ایــست کز هر سو
نــمــوده مــوج عــدم راه را بــر آن مــســدود
خــوش آن کــه کــشتــی او در چهار موج عدم
شــکــســت و در ته دریای نــیــســتــی آســود
به قید بــود و نــبــود جــهــان مباش ای جان
کـه مــرگ زود کنــد فــارغـت ز بود و نبود[٢١٦]

٢١٦– بۆچی کەسی‌تر وەکو کوهستانی و وۆڵشەن ئازادی و تەمەدون نییە کە ئازایەتی بنوێنن.

**٣٢- هیوەدانلوو:**[٢١٧] هیوەدانلوو یان هیەدانلوو کە دەگەڕێتەوە سەر «هیوەدڵ». دوایی «ان»ێك نیشانەی کۆ و پاشگری شوێنی «لو»ی پێی زیاد کراوە.

هیوەدڵ ناوی شوێنێکە لە جەزیرەی کوردستانی عێراق کە خوالێخۆشبوو بەدلیسی لە شەرەفنامەدا پێیانی گوتووە «کوردەکانی یەزیدی[٢١٨]» لەبەر ئەوەی ئەم کوردانە توانیوویانە تاکو ئێستا ڕێورەسمی ئایینی زەردەشت بپارێزن بۆیە پێیان دەگوترێ «ئیزەدی». تاقمێك لە موسوڵمانە توندڕەوەکان پێیانیان گوت یەزیدی، واتا هەڤاڵانی یەزیدی کوڕی معاویە. کوردەکانی هیوەدانلوو بە شێوەی کۆچەری ژیان ناکەن و لە شاری قووچان و دووغائی و گوندەکانی دەوروبەریدا پەرژوبڵاون.[٢١٩]

حەبیبوڵلاخانی ناسر لەشکر یەکێ لە دوایین سەرکردەکانی هیوەدانلوو بووە کە لە بەرگی چوارەمدا باسی دەکەین.

یەکێ‌تر لە پیاوە بەناوبانگەکانی هیوەدانلوو، ئەمیرقولیخانی سەرهەنگە کە لە ڕۆژگاری ئەمیرحسەین‌خانی شوجاعوددەولە و موحەممەدناسری کوڕیدا ڕێزی زۆری بۆ دانراوە.[٢٢٠]

## تەنگوچەڵەمەکانی عەشیرەتی کوردی زەعفەرانلوو لە باری ئاژەڵدارییەوە

بە واتای نووسەری مەتلەعوشەمس، لە خوراساندا عەشیرەتە جۆربەجۆرەکان لە ڕادەبەدەرن. لە ڕاستیدا پارێزگای خوراسان زۆر پان و بەرینە. هەموو جۆرە ڕەگەزێك وەکو کورد، تورك، بەلووچ، عەرەب، تورکمان، هەزارە، جەمشیدی، بەربەری و قەرایی تێیدا دەبینرێ و هەروەها تات و تاجیکیش لەم ناوچەدا ژیان دەکەن، بەڵام ئەمن (نووسەر) زۆر لەم بارەوە

---

٢١٧- Hemadanlo

٢١٨- شەرەفنامە، ل، ١٥٨.

٢١٩- بەرگی یەکەم، ل، ٥٢٤.

٢٢٠- ئەمە بەشێك لە ژیاننامەی ٣٢ عەشیرەتی مەنی چامەشکەزك ناسراو بە زەعفەرانلوو بوو. پێم وایە دوایی بەڵگە گەلێکی‌تر وەدەست بێت کە ئەم ڕاستیانە زۆرتر بۆ ئێمە دەربکەوێ.

باس ناکەم و هەر ئەوەندە دەڵێم کە عەرەبەکانی شەیبانی و خوزەیمە و خەزاعی و میشمەست و زەنگوویی و بووهلوول لە باشووری خوراسان واتا لە دەوروبەری فێردەوس و تەبەس و قاینات و بیرجەند و سەرەخسدا دەژین و بە فارسی دەدون و قسە دەکەن.[٢٢١] تورکە بەیاتیەکان[٢٢٢] زۆرتر لە نەیشابوور دان. ئەو تورکانەی کە کۆچیان کردووە و دوور خراونەتەوە لە دەرەگەز و شیروان و قووچان و بجنووردا پەرژوبڵاون. تاقمێک لە تورکمانەکان[٢٢٣] لە دەوروبەری زۆرئاوای توربەتجام و دوو یان سێ بنەماڵەییێکیان لە سەرەخسدا و تاقمێکیتریان لە دەرەگەز و لانی زۆریشیان لە دۆڵی جەرگەلان و باکووری خۆرئاوایی بجنووردا دەژین کە پێیان دەگوترێ گوگلان. نخوور و یەمووتەکان[٢٢٤] لە دەوروبەری گونبەدی قابووس و بوغایریەکان و گرایلیەکان کە پاشماوەی مەغوولن لە بامی وەسفیئاوا و باکووری سەبزەواردا دەژین. بەرپەریەکان کە لقێکن لە مەغوولەکان لە دەوروبەری خاف و باخەرز و فەریماندا دەژین[٢٢٥]. قەراییەکان[٢٢٦] لە توربەتی حەیدەرییە و هەزارە و جەمشیدی[٢٢٧] و تەیموورییەکان لە

---

٢٢١- ئەم عەرەبانە لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عوسمان(د.خ) هاتوونەتە خوراسان.

٢٢٢- تورکە بەیاتیەکان لە سەردەمی سەفەوی و ئەفشاردا کۆچ دراونەتە نەیشابوور و تورکەکانی قارشی قووزی دەرەگەز و زەورام شیروان لە سەردەمی نادردا لە ماوە ڕانوفەهرەوە کۆچ دراوەنەتە ئەم ناوچانە خەڵکی ئێستەخری شیروان ١٠٠ بنەماڵەن مەتلەعوشەمس، ل ١٤١، ١٣٨.

٢٢٣- تورکمانەکانی گوگلانە لە سەردەمی قاجاڕدا لە سەردەمی نەجەفقولیخانی شادیلوودارووبان کردە بجنوورد و هەروەها دوای ڕاپەڕینی لنین هاتنە ئێران.

٢٢٤- تورکەکانی موهاجێر دوای ڕاپەڕینی ڕووسیە ڕوویان کردۆتە ئێران و لە ناوچەباکووریەکانی خوراماندا نیشتەجێ بوون. یەمووتەکانی لە ئەو لە ئەوبەری دوڵی چەندەرو لە نێوان زنجیرەکێوەکانی باڵەخاندا ژیانی شوافانە دەکەن و هەروەها لە سەردەمی موحەممەدحەسەنخانی قاجاڕەوە ڕەویان کردۆتە ناوچە ڕۆژهەڵاتیەکانی ڕۆخانەی ئەترەك و گورگان و یارمەتییێکی زۆری ئاغاموحەممەدی قاجاڕیان کردووە و هەروەها لە سەردەمی ناسرەدینشاوا لە گونبەرەوە خۆیانیان گەیاندە فەرهەنگ و فارسییان.

٢٢٥- لقێك لە مەغوولەکان لە سەردەمی هێرشی چەنگیری ساڵی ٦١٦ی کۆچی مانگیدا خۆیانیان گەیاندە خوراسان.

٢٢٦- قەراییەکانی توربەتی حەیدەرییە کە ساڵەهای ساڵ لەم ناوچەدا فەرمانڕەواییان کردووە لقێك لە عەشیرەتی تورکی قەشقایی بوون کە دانیشتووی شاری فارس بوون کولونێل ییت کە ساڵی ١٨٩٣ زلیینی هاتبووە خوراسان دەڵێت: گوتراوە کە قەراییەکان لە بنەڕەتدا تورکن و لە سەردەمی یەکێ لە سەرکردەکانی مەغوول ڕاگوێزراونەتەوە بۆ سووریە. ئەمیر تەیموور ئەم تورکانەی کردۆتە دانیشتووی فارس و لە سەردەمی شائیسماعیلی سەفەوی ڕاگوێزراونەتەوە خوراسان دوای ئەوەی ماوەیێك لە مەرو هەرات

دەوروبەری توربەتی جام و سەرەخسدا دەژین، زابولیەکان[٢٢٨] و تاقمێك لە بەلووچەکان لە سەرەخس دان و هەروەها کوردەکان کە باسی ئێمە لەسەر ئەوانە و بۆ یەکەم جار شائیسماعیل سەفەوی و دوایی شاتەهماسب و شاعەبباس ئەم کوردانەیان گواستەوە بۆ ئەم پارێزگایە. هەروەها لە سەردەمی نادریشدا کوردە ئەردەڵانیەکان گوێزرانەوە و دوای مردنی نادر جگە لە ئەردەڵانیەکانی کەلات هەموو ئەردەڵانیەکان گەڕانەوە زێد و وڵاتی خۆیان واتا کوردستان.[٢٢٩]

ئێستەخری لە سەدەی چوارەمی کۆچی مانگیدا باسی کوێستانی قەهستان و تەبەسینی خوراسان دەکات و دەڵێت: لەم ناوچانەدا کە باسمان کرد دەشتی زۆر هەیە کە لەم دەشتانەدا کورد و خەلەج خەریکی کاری ئاژەڵدارین.[٢٣٠]

ئیبنوحوقەل لە کتێبی سوورەتولئەرزدا لەم بارەوە دەڵێت: لە دەشتەکانی دەوروبەری شاری خوراسان و گوندەکانیدا کوردەکان خەریکی کاری ئاژەڵدارین.[٢٣١]

کلاویخوو لە سەفەرنامەکەی خۆیدا ئاماژە دەکات بە کوردە ڕەشماڵنشینەکانی خوراسان.[٢٣٢] بەڕێز دوکتۆر پاپێلی مامۆستای مەشهەد سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان بە زمانی فەڕانسە لێکۆڵینەوەی زۆری هەبووە و دەڵێت: کەچی هەر بۆم دەرنەکەوت کە کلاویخوو

---

ڕادەمێننەوە لە ئاکامدا ڕوو دەکەنە توربەت حەیدەریە و تا ئێستاش هەر لەم شارەدا ماونەتەوە و ئیسحاقخان سەرکردەیانە.

٢٢٧- بیت سەبارەت بە جەمشیدییەکانی سەرەخس دەڵێت: ئەم عەشیرەتە ساڵی ١٨٥٧ی زایینی بە دەستی حێساموسەڵتەنە لە هەراتەوە کۆچ درانە سەر جام و دوایی ساڵی ١٨٨٥ی کۆچی ١٥٠ بنەماڵە لەم جەمشیدییانە کۆچ دەدرێنە پەسکەمەری سەرجنس.

٢٢٨- ئەم شیرەتانەش ١٠٠ساڵی ڕابردوو دوای وشکەساڵیەکەی سیستان ڕوویان کردە مەرو.

٢٢٩- هاوکات نادر عەشیرەتی زەندی لە مەللیر و عەلیشکرەوە گواستەوە بۆ دەرەگەز بەڵام دوای مەرگی نادر ئەم کوردانە بە سەرکردایەتی کەریمخانەوە گەڕانەوە ناوچەکەی خۆیان. هەروەها نادر توانی ٣ هەزار بنەماڵەی ئەفشارەکان ئەروومی لە ساڵی ١١٤٦ی کۆچیدا لە ورمێوە بگوزێتەوە بۆ خوراسان. لە ئاکامدا هەر بە دەستی ئەوان کوژراوە زاشا عەشیرەتی بیرانوەندی لوڕستانی دوور خستەوە بۆ خوراسان ئەمانەش زۆرتر لە زەوینە قاقرەکانی خوراسان ڕامردن و تاقمێکیان گەڕایەوە ناوچە و زێدی خۆی.

٢٣٠- ئێستەخری، ل ٢١٦.

٢٣١- ئێبن حوقەل، ل ١٨٠.

٢٣٢- تاقمێك لەسەر ئەو باوەڕەن کە بۆ یەکەمین جار کوردەکان بە دەستی تەیموور لەنگ.

وشەی کوردی نووسیوە یان لوڕ. ئەگەر لووڕیش نووسرابێ هەر بەشێکە لە کـورد.[٢٣٣] زۆر لـەم بارەوە باس نەکەین، هەر ئەوەنـدە کـە ئێمـە دەمانـەوێ لێـرەدا سـەبارەت بـە کۆچـی مـەزن و مێژوویی کوردەکان بۆ خوراسان باس بکەیـن کە ساڵی ١٠٠٧ی کۆچـی مـانگی بـە فـەرمانی شاعەبباسی سەفەوی ڕووی داوە. لەم سەردەمەوە تا ئـەمڕۆ زۆربـەی کوردەکـان لـە خوراسـانی باکووریدا نیشتەجێ کراون و بەشی کەمیان هێشتا هەر چادرنشینن.

عەشیـرەتەکانی خوراسان دەبنە سێ لقەوە:

١- ئەو عەشیـرەتانەی کە بـە تـەواوی نیـشتەجێ کـراون، وەکـو: شـادیلوو، کـەیوانلوو، قەراچورلوو، سوفیانلوو، شێخەکانلوو و... هتد.

٢- ئەو عەشیـرەتانەی کە نیوەکۆچەرن وەکو: سیوکانلوو، بیچرانلوو، قەرامانلوو... هتد کە تاقمێکیان دانیشتووی گوندەکانن و خەریکی کـشتوکاڵن و هاوکـات ئاژەڵـداریش دەکـەن و جاروباریش بۆ ئەم شوێن و ئەو شوێن کۆچ دەکەن.

٣- ئەو عەشیـرەتانەی کە ئێستاش هەر خەریکی کۆچن.

عەشیـرەتی کرمانـجی خوراسان[٢٣٤] بەم شێوەیە دەسەڵات دابەش بووەتە نێوانیاندا، واتـا «ئیلخـان» یەکەمیــن دەسـەڵاتداری عەشیــرەتەکەیە و ٣٢ ئیـلبـەیگ لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیلخاندایە. هەر عەشیرەتێ بریتی بوو لە چەند تووپـەڕ و هـەر تووپـەڕ بـریتی بـوو لـە چـەند بنەماڵە کە هەموویان دەگەڕانەوە سەر یەك باوك. لە ڕابردوودا کوردەکـانی خوراسـان یـێلاخ و قشلاخیان لە باکوور بۆ باشوور بوو، واتا دەشتی نێوان نەیشابوور و سەبزەوار تا عێـشقئابـادی لەبەر دەگرت و لە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە دەگەیشتە سەرەخس و لە بەشی ڕۆژئاوایشەوە دەگەیشتدا

---

٢٣٣- گۆڤاری کولێجی ئاداب، ژمارەی ٤ و ٣ی ساڵی ١٣٦٢ کۆچی هەتاوی، نامیلکەی دوکتۆر پاپیلی.

٢٣٤- ئیل و شـەییێکی مەنموولییـە کـە لـە ئێرانـدا کـەڵکی لـێ وەردەگێرێت و بۆ عەشـیرەت بـەکاردێت و هەروەها لە کوردیدا ڕەمیشیی پێ دەگوترێ و عەرەبەکانیش پیێ دەڵێن ڕمووم و زمووم.
فەسایی کاتێ باسی ئیلی فارس دەکات دەڵێت ئیل کەسانێکن کە سەرانسەری ساڵ لە دەشـت و کێـودان و لە نێو ڕەشماڵدا ژیان دەکەن، بەڵام تایفە ماناکەی یانێ عەشیرەتی کە لە چەند لق پێك نەهاتووە و لە یەك بلووکدا دەمێننەوە و کەچی یان لە نێو ڕەشماڵدا دەژیـن و یان لە گوندەکاندا دەمێننەوە فەسـایی بـەرگی، ٢، ل ٣٣٠.

چەندەر کە لە باکووری گونبەدی کابووسەوەیە، بەڵام دوای ئەوەی ساڵی ١٢٢٩ی کۆچی ڕووسیە سنوورەکانی بەست، کوردەکانیش سەریان لێ شێوا و ئەمجارە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەڕۆیشتن بۆ ڕۆژئاوا و بەشێکیان لە تەنیشتی ڕوودی تەژەنی سەرەخس و بەشێکی‌تریان لە ناوچەی مراوەتەپەدا بوون و هەتا پرسگەی چات لە کەناری زەریای مازندەران و باکووری گونبەدی‌کابووس لە هاتوچۆدا بوون. عەشیرەتی قەراچوورلوو دوای ئەم کارەساتە دەستیان لە چادرنشینی هەڵگرت و لە ڕۆژئاوای بجنوورددا نیشتەجێ بوون.

کەچی لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە عەشیرەتەکانی کورمانجی خوراسان لە ڕابردوودا ناوچەیێکی بەرپانتریان بۆ ئاژەڵداری بە دەستەوە بووە و ٧٠ لە سەدی ئەم ناوچانە بۆ کشتوکاڵ ناڵەبار بوون. عەشیرەتە کوردەکان کاتێ دەکەوتنە ڕێ و یان بۆ قشلاخ و یان بۆ ییلاخ دەڕۆیشتن چوارپاکانیان ئەوەندە زۆر بوو کە پیاو حەزی لێ بوو بۆیان بڕوانێتەوە، بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ ئەو سامان و هەیبەتە بۆ کوردەکان نەماوەتەوە و ڕۆژبەڕۆژ دەست لە کۆچ و چادر هەڵدەگرن. ئێستا هیچ کەژوکێوێك نیە تاکو چادرنشینەکان کەڵکی لێ وەربگرن، واتا کێوەکان هەمووی بێ‌گژوگیا ماوەتەوە و جگە لە بەردی ڕەق چی‌تری تێدا نابیندرێ. زۆربەی زۆری ناوچەکانی باکووری خوراسان وەکو ناوچەی گازی خانگیرانی سەرەخس و کێوەکانی عەلی‌بلاخ لە باکووری قووچان و ناوچەی کوێستانی گەلیل لە باکووری شیرواندا کراونەتە پارکی نەتەوەیی و هەمووی قەدەغە کراون، بۆیە ڕۆژبەڕۆژ ئاژەڵدارەکان ئەژماریان کەم دەبێتەوە. هەروەها دەبێت بە ئەوەش ئاماژە بکرێت کە تورکمانەکانیش بەردی زۆریان خستۆتە بەر پێی کوردە کۆچەریەکان و ئازاری زۆریانیان داوە.

نەبوونی ئاوی خواردنەوە و گەنم و جۆ و دەرمان و دوکتۆر و بەیتەر و قوتابخانە بۆ چادرنشینەکان یەکی‌تر لەو هۆکارانە بووە کە بۆتە هۆی ئەوەی کوردەکان دەست لە چادرنشینی هەڵبگرن.

بارودۆخی جیوگرافیایی دوو گروپی تەواو کۆچەری و نیوەکۆچەری لە پارێزگای خوراسان و بەشێکی مازندەران واتا باکووری گونبەدی قابووسدا بەم شێوەی خوارەوەیە:

الف) بارودۆخی سەرحەدییەکان کە نیوەکۆچەرین و لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەلات لە

هاتوچۆدان.

**١- زیدەرییەکان و خێراواییەکان و ڕۆباتییەکان و ڕەغزانەییەکان** کە لە کوردەکانی شادیلوون، بەڵام بە تورکی قسە دەکەن و زمانی کوردی، زمانی دووەمی ئەم کوردانەیە کە ١٥ ڕان مەڕیان هەیە. پیاوی مەزنی ئەم کوردانە خوالێخۆشبوو دەوڵەت نەزەر خێرئاوایی‌یە کە پیاوێکی ڕووناکبیر و زانا بوو و هاوکات زۆر میوانی خۆش ویستووە.

ئەم خەڵکە بە زستانان دەچوونە داوێنی کێوی کوتەڵ کە لە نزیکی پالووزانەوەیە. زستانی ساڵی ١٣٣٩ی کۆچی هەتاوی زۆربەی مەڕەکانی ئەم کوردانە بە بۆنەی بەفروبارانی زۆرەوە لەناوچوون و دۆڵەکانی پالووزانە پڕبوو لە ئێسقانی مەڕ، تا ڕادەیێك کە گۆشت و ئێسقان ئەوندە زیاد بوو کە گورگ و کەمتیار بە تەواوی تێر بوون. لە هەمان کاتدا سورخ‌قەلعەییەکانیش لە ناوچەی یایدەڕەوە کە لە باکووری مراوەتەپەدایە هەر ئەم تەنگی و چەڵەمەیان بۆ بەدی هات و بەرەو هەژاری و نەداری توانەوە.

**٢- قووشخانەییەکان:** قووشخانەییەکان تێکەڵاوێکن لە حەڵواچەشمەییەکان، شەناقیەکان و یەنگی‌قەلعەییەکان و ١٣ ڕان مەڕیان هەیە. هاوینان لە کێوەکانی سنووری قۆشخانە و زستانەکان لە باکووری مراوەتەپە و لە ناوچەی هەجیی لە نێوان دادلی‌قەزوین و پاشایوولیدا نیشتەجێ دەبن. بەناوبانگترینیان بریتین لە: حاجی سەعادەتقولی، حاجی عەزیزوڵڵا، حاجی ئازاد، حاجی ئیمامویردی، حاجی ئەمانوڵڵا و کوێخا شاهوێردی.

**٣- جریستانییەکان:** تێکەڵاوێکن لە کوردەکانی میلانلوو و... هتد و ١٢ ڕان مەڕیان هەیە و بەناوبانگترینیان ستارخان و موحەببەتخان و حاجی موحەممەدە. هاوینان دەچنە کێوەکانی سنووری جریستان و زستان لە حەفتچاڵ لە نێوان مراوەتەپە و نارلیدا دەمێننەوە.

**٤- بیچرانلووەکان:** کە بریتین لە ئامانلووەکان، ترورانلووەکان، زینددوونیلووەکان و ٤٧ ڕان مەڕیان هەیە، بەردەرییەکان[٢٣٥] بە زستاناندا ڕوو دەکەنە دەرەگەز کە ٨ ڕان مەڕیان هەیە و هاوینان دەچنە کێوە سنوورییەکانی بەدەر لە نزدیکی باجیگران. ئەو بیچرانلووانەش کە

---

٢٣٥- بەردە یەکێ لە گوندە گرنگەکانی بیچرانلوویە کە لە ناوچەی سنووری ئێران و ڕووس دایە و لە پێشدا پێی گوتراوە کەلی، وەلی واتا قەڵای وەلی.

هاوینان لە دۆڵی کەیکانلوودا دەمێننەوە، هاوینان دەچنە کێوەکانی گوولیل و زستانانیش ڕوو دەکەنە هەجی و مەڵبەندیان دەبێتە مێوانتاپەمەس، پستەلی، ئایتەمورر و نالیقیمیش. پیاوی گەورەیان حاجی حەیدەرعەلییە.

**٥- سیووکانلووەکان:** کە بریتین لە ئووغازییەکان و کۆنەئووغازییەکان، بورانلووەکان و ئوولاشلووەکان.

ئووغازییەکان ١٥ ڕان مەڕیان هەیە کە هاوینان دەچنە کێوەکانی ئارمووتەلی، بیر، قەشمار، چینگە[٢٣٦] و زیلان. لە بواری مەڕدارییەوە هیچ تەنگانە و چەڵەمەیێکیان نییە. ئەم کوردانە زستانەکان دەچنە دۆڵی جورگەلان کە لە دەوروبەری حەسارچە و لە ناوچەی هەجی دایە. لە تەنشتی چای بیلان و ئاودووچەنگ و دادلیقەزویندا لە هاتوچۆدان. پیاوە مەزنەکانیان بریتین لە: جەهانگیر میرزادە، نوورعەلی شوجاعی، موحەممەدعەلی شوجاعی، غەزەنفەر مێسرزادە، ئەمیر ئیسماعیلی، چیپر حاجیزادە و شیرزاد مەنسووری.

کۆنە ئووغازییەکان کە ٣ ڕان مەڕیان هەیە و هاوینان لە کێوی بالاخانە و دۆڵی باسر لە نێوان دووربادام و کۆنە ئووغازدا دەمێننەوە و هەروەها زستانەکانیش لە ناوچەی جەرگەلاندا سەقام دەگرن، واتا لە نێوان ئیریقایە و بەچەدەڕەدا هاتوچۆیان دەکرد.

ئوولاشلووەکان دوو ڕانیان هەیە کە یەکیان لە ژێر چاوەدێری نوورعەلی جەعفەری دایە و هاوینان ڕوو دەکاتە دۆڵی ئوولاشلوو و دووەمینیان لە ژێر چاودێری دەوڵەتنەزەر و ڕەشیدی دایە کە لە ئەرمووتەلی سەر بە ناوچەی شەیتانلی و کالەواس دان و زستانەکانیش دەچنە خواری نارلییەوە.

بوورانلووەکان ١٦ ڕان مەڕیان هەیە. هاوینان لە دەوروبەری بوانلوو و کێوی زەکەریا[٢٣٧] و

---

٢٣٦- قەشمارچینگە یەکێ لە بەرزترین لووتکەکانی کێوی زیلانە کە لە نێوان ئووغاز و باجگیران دایە و لووتکەیێکی گردە و لەسەر ئەو لووتکەوە شەو کە دەڕوانی چراکانی شاری عێشقئاباد دیاری دەدات و هەروەها لە زستانیشدا هەرەس دەکات و ئەم شوێنە ئەوندە ساردە کە مانگی جۆزردان بەفرەکەی دەتاوێتەوە و هەر ئەو بەفر ئاوەیە کە خەڵکی ناوچە کە بۆ خواردنەوە کەڵکی لێ وەردەگرن.

٢٣٧- لەبەر ئەوە بەم کێوە دەڵێن «چیای زەکەریا» کە گوتراوە زەکەریای نەبی لە نێوان ئەم درەختانەدا بە هەڕە ئەنجن ئەنجن کراوە. لەم دارستانەدا دارێك هەیە کە پیێ دەڵێن دارگەنێ کە توکڵەکەی وەکو

دۆڵی بەردەر و کێوی گولێلدا دەمێننەوە و زستانانیش دەچنە باکووری مراوەتەپە واتا لە نێوانی قەرەقووراخ و نارلی و دووچنگ و ئەبووساریدا پەرژوبڵاو دەبنەوە. بەناوبانگترین پیاوانی ئەم عەشیرەتە بریتین لە: عەتاموحەممەد نادری، عەلی پەهلەوان، نادقولی شەرەفپوور و مورتاخان و هەروەها مەردانییەکان.

**٦- قاچکانلووەکان:** کە ٢٠٠ بنەماڵەیێك لەم کوردانە چادرنشینن و ٢٠ ڕان مەڕیان هەیە و زستان لە سەرەخس و دەرەگەز و مراوەتەپە دەمێننەوە و هاوینان دەچنە کێوەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی قووچان، واتا لە گەڕەکی بیچرانلوو و بریانلوو و هەروەها هەزارمەسجددا دەمێننەوە.

**٧- بریوانلووەکان:** ئەم کوردانە لە ناوچەکانی نێوان کەلات و دەرەگەز و سەرەخس و باکووری مەشهەددا یێلاخ و قشلاخ دەکەن و ١٥ ڕان مەڕیان هەیە و زۆربەیان لە مەشهەددا خانووبەرەیان پێکهێناوە و زۆر دەوڵەمەندن. بەناوبانگترین پیاوی ئەم عەشیرەتە حاجی ئیسماعیل کوڕی حاجی فەرهادخانی بریانلووە.

## ب) بارودۆخی گشتی کۆچەرەکان

وەك گوتمان ئەم دەستە لە کوردەکان لە هیچ شوێنێکدا ماڵ و مەڵبەندییان نەبوو و بریتین لە:

**١- باچوانلووەکان:** تاقمێکیان هێشتا هەر کۆچەرین و لە ناوچەی قووچان و ئێسفەرایندا خەریکی ئاژەڵدارین. باچوانلووەکان لە دەروبەری قووچاندا ١٤ ڕان مەڕیان هەیە و پیاوی گەورەیان بریتیە لە: حاجی مووسارەزا، حاجی نەورۆز موحەممەد، حاجی غولامرەزا و حاجی سلێمان و هەروەها هاوینەکان دەچنە کێوی عەمارەت و هەزارمەسجد کە لە باکووری قووچاندایە و زستانەکانیش دەچنە دەشتی کوران و ئاقتووقە کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی

---

هەڕەیە و گوڵی زەردی هەیە کە کوردەکان بە حەرامی دەزانن و دەڵێن دەسکردی شەیتانە. قەسەسولئەنبیا، بەسەرهاتی زەکەریا.

گونبەدیکابووسەوەیە.

باچوانلووەکانی[٢٣٨] بەشی ئێسفەراین تاقمێکیان زستان دەچنە مراوەتەپە و تاقمێکیتریان دەچنە دەشتی تاقی و کەویری سەبزەوار.

نوور موحەممەد عەلیزادەی باچیانلووم ئەم ساڵ لە ئارمووتەلیدا بینی (١٣٦٣/٤/٤).

**٢- توپکانلووەکان:** وەك گوتمان لە سەرانسەری خوراسانی باکووریدا لە هاتوچۆدان و لە دوو بەشی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییدا ییلاخ و قشلاخ دەکەن و ١٤٥ ڕان مەڕیان هەیە و ٩ ڕانی ئەم مەڕانە هاوینان دەچنە کێوی ئارمووتەلی کە لە نزدیکی شەیخکانلووەوەیە. سەرکردەی ئەم کوردانە عەزیزتووپکانلوو و سەعادەتقولی تووپکانلووییە. هەروەها عەبدوڵڵا تۆپکانلووم لە نێوان هیزەوانلووەکاندا بینی و تاقمێکی ئەم کوردانەش لە کێوەکانی کلیدر و بینالوود و لە نێوان سەرەخس و نەیشابوور و سەبزەواردا قشلاخ و ییلاخ دەکەن.

**٣- ڕووتانلووەکان:** کە دەڵێن زۆر دواکەوتوون و زۆر هەژار و نەدارن، بۆیە پێیان دەگوترێ «رووتان» واتا بێجلوبەرگ و هەژار. زۆربەیان لە شیرواندا دەژین، ١٢ ڕان مەڕیان هەیە و هاوینان لە کێوی ئارمووتەلی دەمێننەوە و زستانانیش دەچنە دەشتی کوڕان و ڕووباری سەمار (ئەترەك). پیاوە گەورەکانیان بریتین لە: باباموحەممەد حاجی موحەممەد مەجید و ڕەشید و تەیموو و حاجی بازرگان و حاجی فەرەج.

**٤- کاویانلوو:**[٢٣٩] کە پێیان دەگوترێ «کاوانلوو»، ٢٠ ڕان مەڕیان هەیە. بەناوبانگترینیان حاجی کەرەم مەولەوی، حاجی موحەممەدخان، حاجی حەیدەرعەلی

---

٢٣٨- سەبارەت بە لاچیانلووەکان لە بەرگی یەکەمدا باسی خۆمان تەواو کرد. گوتمان کە یارمەتی زۆری نادریان داوە و هەر ئەم کوردانە بوون کە نادیاریان کرد بە پاشای ئێران. بەڵام ڕێکەوتننامەیێکی نێوان نادر و حازر بووانی دەشتی مونمان کەوتە بەر دەست کە زۆربەی زۆری دڕابوو، کەچی دەزانین باچیانلووەکان لە دەشتی موغاندا بەشدارییێکی هەمەلایەنەیان کرد و لە ئاکامدا نادریان تەرخان کرد بۆ پاشای ئێران. بەیگ باچیانلوو، بێهبوودخان بریانلوو، ڕەزاخان قووجەخان، شێخوانلوو فاتێحی بەسرە، حاجیخان حەمەکانلوو موستەفابەیگ کەیوانلوو و... هتد و تاقمێك لە کوردەکانی زەنگەنە. (بڕوانە سەردارانی ئەز ئیلات و تەوایف دەرەگە: میرنیا، ل ٣٦)، (نادرنامەی قەدووسی، ل ٢٩١) و (یادداشتەکانی ئیبراهام گاتوونمی گووس خەلیفەی ئەرامەنە، وەرگێڕدراوی سەپنا، ل ٢٤ و ٢٣)

٢٣٩- گۆڤاری کۆلیجی ئاداب مەشهەد، ژمارەی ٤ و ٣، ساڵی ١٣٦٢ نامیلکەی دوکتۆر پاپێلی، ل ٥٦٧.

شگوفتە، حاجی مێسرخان، حاجی فەرهاد، حاجی ئەسەدوڵڵا، حاجی قوربان موحەمەد و خانلەرکاوانلووە. مەڕی زۆریان هەیە و هاوینان دەچنە کێوەکانی ئارمووتەلی و کیسمار و دەوروبەری ئەسپچیر و زستانانیش ڕوو دەکەنە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی گونبەد، واتا ناوچەکانی کوڕان و ئاقتوقە و ئەبووساری.

**٥- شەڕانلوو:** کە ١٢ ڕان مەڕیان هەیە. هاوینان دەچنە دەوروبەری دەوڵەتخانەکە لە باکووری قووچاندایە و زستانانیش دەچنە نارلی و کوڕان.

**٦- قەرامانلووەکان:** عەشیرەتەکانی مایوانلوو، ئیگانلوو، شادکانلوو و هەشت مرخییەکان هەر لە ڕەگەزی ئەم عەشیرەتەن و لە پەنای کێوی شاجەهان و دەوروبەری شیرواندا دەمێننەوە. ٤ ڕان لە ڕانەکانی قەرامانلووەکان کە تایبەتە بە ئیمام وێردیخان پەهلەوانزادە و براکانی و قوربانعەلی و موختار و بەبرخان و قەرامانلوو و نەورۆزعەلی نەورۆزی و براکانی، واتا موحەمەد و ڕەمەزان قەرامانلوو، هاوینان دەچنە کێوی ئارمووتەلی و لە تەختی ئەسمەر بەرانبەری حەمزەکانلووەکان چادرلێدەدەن و زستانانیش دەچنە باکووری مراوەتەپە و قاقلاندەرە.

**٧- گوڵیانەکان:** ئەم دەستە لە کوردەکان لە دەوروبەری بجنۆرد و لە نزیکی کێوەکانی ئالاداغدا دەژین و زستانیش دەچنە کێوی مراوەتەپە بەرەو ڕووباری ڕۆخانەی ئەترەك.

**٨- وڕانلووەکان:** هاوینان دەچنە سەر کێوەکانی بینالوود و دەوروبەری ئەخلومەد و زستانانیش ڕوو دەکەنە سەرەخس و ١٤٠ڕان مەڕیان هەیە. سەرۆکی عەشیرەتەکەش حاجی ئەردەشێر وڕانلووە.

**٩- هیزوولانلووەکان:** کە نازناوی «کوهستانیان» هەیە و ١٥ ڕان مەڕیان هەیە. تاقمێکیان لە سەرەخس و ڕادەکان و بڕێکیشیان لە کێوی کیسمار و ئارمووتەلی و مراوەتەپەدا دەمێننەوە و ییلاخ و قشلاخ دەکەن. خوالێخۆشبوو خوداداد کوهستانی سەرۆکی عەشیرەتی هیزوول بوو و کەچی ئێستا موحەمەدخان کوهستانی سەرۆکیانە. هەروەها عیزەتوڵڵا کوهستانی کە لە قەدیرئاوادا خەریکی کاری کشتوکاڵە و پێنج برای هەیە کە هەموویان کوڕی خوالێخۆشبوو خان موحەمەد خان کوهستانین. زۆربەی ئەم عەشیرەتە لە کێوی کیسمار و

ئارمووتەلی[٢٤٠]دا لە هاتوچۆدان.

خوێنەرانی هێژا ئەمە ئاماژەیێک بوو سەبارەت بە بارودۆخی کۆچەریە کوردەکانی خوراسان کە دەسەڵاتدارانی ڕابردوو هیچ ئاوڕێکیان لێ نەداوەتەوە و جگە لە ڕەحم و بەزەی خودای پیرۆز هیچ سەرپەنا و مەلجەئێکیان نەبووە، وەك دەزانین لە وڵاتانێکی‌تر وەکو ئامریکا بۆ عەشایرەکان و چادرنشینەکان کاری زۆر کراوە و منداڵە عەشایریەکان بە جوانترین شێوە خەریکی خوێندەوارین و لە خەڵکی ئاسایی ئەگەرچی بەجێ‌نەماوەن لە زۆر شوێنیشدا پێشکەوتووترن.

ساڵی ١٣٢٩ی کۆچی هەتاوی بەڕێز دوکتۆر موحەممەد موکری، سکرتێری گشتی ئیلات و عەشایری ئێران بە یارمەتی بەڕێز مەسعوود کەیهان وەزیری ڕۆشنبیری ئەو کاتە ویستیان خزمەتێك بکەن بە عەشایریەکان و بۆ گەیشتن بەو مەبەستەش سەرۆکی عەشیرەتەکان لە تاران کۆ کرانەوە و ئەم کۆبوونەوە هاوکات بوو لەگەڵ مردنی ڕەزاشادا (١٣٢٩/٢/١٧ی کۆچی هەتاوی)، بەڵام بە داخەوە بە بێ‌کەڵك و قازانج مایەوە. ڕژێمی فاشیستی پالەوی بە گرنگایەتی ئەم کۆبوونەوە پەی دەبات و ئیتر قەدەغەکرا و ئیزنی کاری وەها بە عەشایریەکان نەدرا[٢٤١]. وەك گوتمان ئەم کۆبوونەوە و دانیشتنە زۆرتر لایەنی تەشریفاتی هەبووە و هیچ کەڵك و قازانجێکی بۆ کوردە کۆچەرییەکان نەبووە، بە ڕاستی لە جیهانی سێدا کێ بیر لە هەژار و مافی مرۆڤانی هەژار دەکاتەوە؟ ژنە کوردی عەشایری لە زستانی تووش و سەخڵەت و لە نێو باوبۆران و کرێوە و بەفردا دەزێت و منداڵەکەی لە سەرمادا دەبێ ڕەق هەڵێت و هاوکات ژنی کاربەدەستەکان لە یەکەمین ڕۆژێکەوە کە منداڵ دەکەوێتە

---

٢٤٠ سەنیعودەولە سەبارەت بە ئارمووتەلی گوتوویەتی بە کێوێکە لە دەستی چەپی باکووری بەرگەدا کە دروستەکەی ئارمووتلویە بەڵام ئێعابە بەشی کیمسار دەڵێن. ئارمووتەلی و دوو چاوکەی خۆشی بە ناوی کانی‌فاتمە و بەگالی تێدایە و زەوینی چوار عەشیرەتی بەگان، کانی‌مشکان، نوولیکان و قەراشاتان لەم ناوچەدایە. دەڵێن بزماری ڕەشماڵی نوولیکانەکان لە سەردەمی شاتەهماسبی دووەمدا لە زێڕ بووە و کاتێ شاتەهماسب ئەمەی بیستووە بۆ داگیرکردنی ئەو وەزیرانە ڕوو دەکاتە ئارمووتەلی و کوردەکان خێرا بزمارەکان دەگۆڕن و پێی دەڵێن بەرێز درۆیان گوتووە و ئێمە زێڕمان نییە.

٢٤١– گۆڤاری ئامووزش و پەروەرش خوراسان، ژمارەی ٣ و ٤ ساڵی ١٣٤٩ی کۆچیێ، نامیلکەی بەڕێز شەهرەوان بەرپرسی گشتی بارهێنانی خوراسان.

زکیان لە جێگاکەی خۆیان ناجمن نەوەك منداڵەکەیان تووشی نیگەرانی ببێ.

راستی لەوێدایە ئەم کوردە بێ دەرەتانانە پیاوە جندرمەکان هەیتانەهایتا تالآنیانیان کردووە و ئەشکەنجەیانیان داوە. (پێش ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی هەتاوی). یان کێ ئەتوانێ بزانێ کە برا عەشایریەکانمان لە باشووری خوراسان بە تایبەت قاینییەکان لە ساڵەکانی ٥٠-١٣٤٩ی کۆچی هەتاوی چیان کێشاوە و چیان دیوە. زۆر جار بە بۆنەی نەبارینی باران و بەرفەوە هەمووی مەڕوماڵاتەکانیان لە دەست داوە.

کام پیاوە دەوڵەمەندی پایتەخت بیری لەم هەژارانە کردۆتەوە؟ ئەم غەدرلێکراوانە ئەوەندە ئاوی ناپاکیان خواردبووەوە کە هەموویان تووشی نەخۆشی وەبا و حەسبە هاتبوون.

ئەم کوردانە جگە لەوەی خۆیان بێ‌پەنا و پشتیوان مابوونەوە مەڕوماڵاتەکەشیان هەر بێ‌پەنابوو، ئەوانیش تووشی نەخۆشی هاتبوون. خۆیان و بەرخەکانیان یەك لە دوای یەك دەمردن و تەنانەت سەگیش لە خواردنی گۆشتەکەیان سڵی دەکردەوە.

جگە لە من لەو سەردەمەدا کەس نەبوو نازی ئەم کوردانە بکێشێ و ئەمنیش هەر بە شیعر نەبێ هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو و بۆیە ڕووم کردە کوێستانەکانی قورمکەن سەحرا و هاوارم دەکرد:

وابلانە، وابلانە لاشییان بوو خەرمانە
خادیی بوونە سەرگەردانە
کاڵی مانی، کاڵی مانی کەس خەوەری مەهێلنانی
میان ماڵی خادیان دانی
ئیری قەیە، ئیری قەیە زەواڵ هاتیە سەوامەیە
نەمە بینجە، نە کوجەیە
جەرگەلانە، جەرگەلانە لە سەر کورمینج بۆ تووفانە
نە پەز ما، نە هەسپ و ماینە

## تاقمێکی‌تر لە کورمانجەکانی خوراسان

جیاکردنەوەی تیرە و عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان کە لە دوو هەزار گوند و ٦ شاری ئەم پارێزگادا پەرژوبڵاون، کارێکی ئاسایی نییە. کوردەکان هەر لە گونبەدکاووسەوە هەتا سەرەخس و بە درێژایی ڕێگای شەمەندەفەر واتا لە باشوورەوە تا باجگیران کە لە باکووردایە دەبینرێن. سەرتیپ ڕەزمئارا کە نووسەری کتێبی فەرهەنگی جیۆگرافیای ئێرانە و بەڕێز شاکری نووسەری مێژووی قووچان و بەڕێز ئەبوولفەزڵ قاسمی و بەڕێز لاڕوودی لەم بارەوە لێکۆڵینەوەی زۆریان هەبووە و هەروەها پێش ئەم کەسانە، سەفەرنامەکەی ناسرەدین شا، لایەن و سووچی زۆر تاریکی ڕۆشن کردۆتەوە و نووسەری مەتلەعوشەمس بەش بە حاڵی خۆی، خۆی لەم ڕێگەدا ماندوو کردووە، بەڵام هیچ یەك لەم کارانە لەو ڕادەدا نەبوو کە بتوانێ یارمەتیدەری ئێمە بێ و بۆیە ئەمن (نووسەر) ماوەی ١٢ساڵی تەمەنی خۆمم لەم ڕێگەدا دانا و بۆ ناسین و ناساندنی کوردەکانی خوراسان قەت ڕانەوەستاوم و زۆر لەم بارەوە کاری باش و لێکۆڵینەوەی هەرەچاکم هەیە. من لەم ماوەدا توانیم بەڵگەی عەشیرەتە کوردەکان کە زۆربەی زۆری دڕابوو، کوی بدەمەوە و بەم شێوە توانیم عەشیرەتەکان لێك جیا بکەمەوە و کەچی دەبێ ئەم ڕاستیەش بدرکێنم کە کارەکەم هێشتا ناتەواوە و هەر لێرەوە داوای یارمەتی دەکەم لە برا کوردەکانم کە بۆ گەیشتن بەم مەبەستە یارمەتی من بدەن تاکو هەرچی زووتر بەو کارە گرنگە دەست پەیدا بکەین. ئەو کارەی کە من دەستم پێ کرد زۆر درەنگ، بوو لە بەر ئەوەی کاتێ کە من خۆمم ناسی زۆربەی پیاوە زاناکان لە دنیا دەرچووبوون و کەسیان لێ نەمابوو. هەروەها بە داخەوە ئەگەرچی کوردەکان بە ماوەی ٤ سەدە سەرکردەیی خوراسانیان کردووە، بەڵام لە بواری فەرهەنگ و کولتوورەوە زۆر لاواز بوون و هیچیان پێ نەکراوە و تەنانەت توانای نووسینی بەسەرهاتی خۆیانیان نەبووە. زۆربەی دڵتەنگیەکانم بە دەستی ئەمیرحسێن خان شوجاعولدەولەوەیە کە دەزانم چاك دەیتوانی ئەم کارە بکات، بەڵام بۆچی نەیکردووە، نازانم.

دەبێ ئەم ڕاستیەش بدرکێنین کە بوومەلەرزەی ساڵی ١٣١٢ی کۆچی مانگی قووچان،

زۆربەی ئەو بەڵگانەش کە ئەگەر بوویێت لە ناوی بردووە و هەرچی کە مایەوە کەوتە دەستی کوڕە خوێڕییەکانی ئەمیرحسێن خان و ئەوانیش هەموویان فرۆشت بۆ کڕینی ئەلکول و تریاك و لە ڕاستیدا غەدری زۆریان لە کورد کردووە و ئەتوانم بڵێم کە ئەم کوڕە ناخەلەفانە دەبێ بە ئاگری بێ‌فەرهەنگی خۆیان بسووتێن. من ئێستا دڵم بەو تازەلاوانەی کوردە خۆش کردووە و دەشزانم دەتوانن یارمەتی بدەن تاکو پەرە بدەین بە فەرهەنگە ڕەسەنەکەمان.

لێرەدا باسی ئەو عەشیرەتە کوردانە دەکەین کە تا ڕادەیێك لە مێژووی کرمانجدا ناویان ونبووە:

**ئەفشەرانلوو:** ئەم کوردانە تا ئەم دواییانە هەر بەشێك لە عەشیرەتی هیوەدانلوو بوون و لە ژێر فەرمانی حەبیبوڵلاخانی ناسرلەشکردا بوون.

**ئوودکانلوو:** ئەم کوردانە لە گوندەکانی قۆشخانە و ئوودکانلوو و قەرچقەی ئوودکانلوو و گندیخەرق کە ٥٦ کیلۆمەتر لە قووچان دوورە دەژین.

**ئوولاشلوو:** ئەم کوردانە کە بە «ئوولاشان» نازناویان دەرکردووە و لە گوندی ئووغاز و سەر بە عەشیرەتی سیووکانلوون و ٤٠٠ کەس دەبن. ئەم کوردانە لە کوردستانی تورکیەوە هاتوون کە لە ناوچەی سیواسدا دراوسێی سیووکانلووەکان بوون. ئەولیای چەلەبی لە سەفەرنامەکەیدا ناوی «ئوولاشلای» هێناوە[٢٤٢] و دەڵێ: لە چوارەمین ڕۆژی سەفەرمدا کە بەفروبۆران تەنگی لێ هەڵچنیبووم، گەیشتمە ئوولاش و کەچی وادیارە ئوولاشەکان خەڵکی ئەو شارە بن.

ئوولاشەکان بێ‌خەبەر لەوەی گوندەکەیانیان لە جێگای کۆنەشارێکی مێژووی لە خوراساندا بنیاتناوە، بەڵگە و عەتیقە و کەلوپەلی باستانی زۆریان دەست کەوت کە تا ئێستاش هەر درێژەی هەیە[٢٤٣]. دەڵێن ئەم شارە تا سەردەمی سەلجووقیەکان هەر خەڵکی تێدا هەبووە. وا بزانم دوایی بە دەستی مەغوولەکان بە تەواوی وێران کرابێ.

---

٢٤٢- سیاحەتنامەی ئەولیای چەلەبی، ل ٩.

٢٤٣- نووسەر هەوڵی زۆری داوە کە بەرگری بکات لە چاڵاوکەندی لە ڕادەبەدەر لە تەپولکەی ئوولاشلوودا، بەڵام بێ قازانج مایەوە و کەس ئاوڕی لێ نەدایەوە و ئاسەواری مێژووی زۆر بە تاڵان لە دەس چوو.

**بادخۆرانلوو:** ئەم کوردانە لە گوندەکانی بادخۆر بە جەماوەرێکی ٧٠٠ کەسیەوە لە باکووری قووچاندا دەژین.

**بەرزانلووەکان:** ئەمانە لە کوردەکانی بازرانیــن کە لە کەلاتی نادری و قووچان و بجنوورد و هەروەها لە گوندەکانی کیسەبایر و حەیدەرئاوا و بەرزانلوودا دەژین. ناسرەدین‌شا لە سەفەرنامەکەیدا باسی ئەم کوردانەی کردووە و دەڵێ: لە گوندی تەوەر بووم کە ئەم کوردانەم بینی. (ل١٠٩ی سەفەرنامە)

**بوورزانلوو:** لە دوو گونددا و هەر بەم ناوە دەژیــن کە ئەم دوو گوندە لە سنووری قۆشخانەدایە و هەروەها تاقمێکیان لە گوندی بەرزلئاوای نێوان قووچان و شیرواندا دەژیــن و لە جەماوەردا زۆرتر لە ١٠٠٠ کەسن. دەبێ ئەوەش بڵێیــن کە تاقمێکیان لە گوندی بوورسلان کە گۆڕدراوی «بەزلان»ە دەبینرێن.

**توورسانلوو:** ئەم کوردانە زۆرتر لە هەزار بنەماڵەن و لە ناوچەی چناران و مەشهەددا دەژین. زۆر جوان دیار نییە کە ئەم کوردانە بەشێکن لە عەشیرەتی کەیوانلوو یان شێخوانلوو، لە بەر ئەوەی ئەم دوو عەشیرەتە گەورەیە لە چناران و ڕادەکاندا دەژین. هەروەها تاقمێك لە توورسانلووەکان لە کەلاتدا دەبینرێن.

**پتکانلوو:** (petcanlo) کە لە گوندەکانی گلیانی شیروانە.

**پرتکانلوو:** (pertecanlo) کە دەچنەوە سەر عەشیرەتی بەناوبانگی پرتك.

**پرکانلوو:** (percanlo) کە لە ئێسفەرایــن و قووچاندا پەرژوبڵاون.

**پیرانلوو:** کە لە گوندەکانی مەزرەجی قووچاندا بە جەماوەرێکی ٢٠٠ کەسیەوە ژیان دەبەنە سەر.

مەردۆخ دەڵێت: «پیران» لە دەوروبەری چەند بنەماڵەییێکن کە لە باکووری ڕانیە و دەروبەری ساوجبلاغ موکری (مەهاباد)دا دەژیــن و سەر بە عەشیرەتی بووڵباسن.

هەروەها مەردۆخ لە لاپەڕەی ٩٢ی کتێبەکەیدا دەڵێت: «پیران» یەکێ لە سێ لقە بەناوبانگەکەی دیزەیە کە جەماوەرێکی ٦ هەزار بنەماڵەییە و لە دەوروبەری هەولێردا نیشتەجێن.

**پیـــرەوەدانلوو:** ئـەم کوردانـە لـە گوندێکـدا بـەم نـاوە دەژیـن و سـەر بـە عەشیـرەتی بیچرانلوون.

**جافکانلوو:** کە حکوومەتی ئەم کوردانـە لـەم سـاڵانەدا لـە ژێـر دەسـەڵاتی حـەبیبوڵڵای هیوەدانلوودا بووە. ئەم کوردانە پاشماوەی عەشیـرەتی گەورەی جـافن. عەشیـرەتی جـاف لـە بەناوبانگتـریـن عەشیـرەتەکانی کوردە کە لە سـەرەتای سـەدەی ئێستادا ٤٠ هـەزار بنەماڵـە بوون، بەڵام لەم سـەردەمـەدا هـەموویان پـەرژوبلاو بوونەتـەوە و زۆربـەیان لـە شـاری جوانڕۆی کرماشاندا دەژیـن و تاقمێکیشیان لە کوردستانی عێراقدان.[٢٤٤]

بـەڕێز حەسـەن جـاف کـە دوکتـۆرای فەرهـەنگ و تەمـەدونی ئیسلامی هەیـە لـە لێکۆڵینەوەییێکی زانستیدا کە لە بارەی عەشیـرەتی جافەوەیە و بە سەردێڕی «تحقیقی در مورد یك طایفەی ناشناختە ایرانی»[٢٤٥] کە لە گۆڤاری ژمارە دووی «بررسی‌های تاریـخی»دا سـاڵی ١٣٥٧ی کۆچی هەتاوی بلاو بۆتەوە. لەم بارەوە دەتوانن بڕوانن بۆ کتێبی «مورەویـجوزەهەبی مەسعوودی» و «ئـەلکاملی ئیبنوئەسیـر» و کتـێبی «جاوانلولقەبیلەتولکوردیـە» نووسـراوی دوکتـۆر مـستەفا جـەواد، چـاپی کـۆڕی زانیـاری کـورد، بەغـداد، سـاڵی ١٩٧٣ی زایـینی، لاپەڕەی٣.

**جەورانلوو:** لە گوندێکدا هەر بەم ناوەوە دەژیـن و وابزانـم لـە عەشیـرەتی جووزەکـانی ناوچەی مووسڵن و هەروەها مەسعوودی و مەردۆخ ئاماژەیان پێ کردووە.

**چەدانلوو:** لە گوندێکدا هەر بەم ناوە کە سەر بە ناوچەی جەعفەرئاوای قووچانە دەژین و ٣٠٠ کەسن.

**چووکانلوو:** لە گوندێکدا بە ناوی مایوان و هەروەها لە باکووری شیـرواندا دەژین.

**خاخیـانلوو:** لـە گوندێکـدا بـە نـاوی مـەغزار کـە لـە نێـوان شـاری کۆنـە قووچـان و

---

٢٤٤- ئیلات و عەشایر، ل ٢٣.

٢٤٥- لە بەڵگەییێکدا کە بە دەست کەوت، مەڵبەندی ئەو عەشیرەتە دەردەکەوێ و باسی کڕیـن و فرۆشی مۆڵکێکی ئەم کوردانەی تێدا هێناوە و باسی لەسەر کردووە.

تێکاملوودایە دەژین.[٢٤٦]

**خدر:** کە یەکێ لە عەشیرەتە کوردە کرمانجەکانی سەر بە عەشیرەتی کەیکانلوون. ڕەزاییەکانی باجگیران لەم ڕەگەزەن. هەروەها ڕەمەزان خدر پالەوانیش هەر لەم کوردانەیە.

**خەللاجان جەلاجلوو:** کە لە گوندی بیچرانلوودا دەژین و ١٣٢ کەسن.

ئەمینزەکی بەیگ دەڵێت: خەللاجان ٧٠٠ بنەماڵەی کۆچەریسن و بەشێکن لە عەشیرەتی میللی (مللان Mellan).

**خەلکانلوو:** ئەم کوردانە دانیشتووی گوندی خەلکانلوون کە لە گوندەکانی ناوچەی جەعفەرئاوای ژووروەو ٤٢٩ کەس جەماوەری هەیە و هەروەها لە دەرەعەمارەتیشدا ١٨٠ بنەماڵەیان دەبینرێن و ٥٠ بنەماڵەشیان دانیشتووی دەرەگەزن.

مەردۆخ دەڵێت: خالکانی یان خەلکانی ٤٠٠ بنەماڵەن و لە ڕووباری ڕۆژئاوایی زەریاچەی قووچحەساردا دەژین[٢٤٧]. «ئیبنوخەلکان» زانا و مێژوونووسی بەناوبانگ و نووسەری کتێبی «وەفیاتولئەعیان» هەر لەم کوردانەیە و دەڵێن ڕەگەزی دەچێتەوە سەر بەرمەکیەکان و دایکی کوردی خەلکانیە. بەڵام وەك دەزانین کوردستان دوای هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بووەتە مەکۆی بنەماڵەی پێغەمبەری خودا و کوڕەکانی حەزرەتی عەلی.

دوای تێکچوونی بنەماڵە و دەسەڵاتی بەرمەکی بە دەستی هارونەڕەشید و لە داردانی جەعفەربەرمەکی، تاقمێك لە ئەم بنەماڵەیە مانەوە و توانیان لە بەغدادەوە پەنا بهێننە کوردستان و بە تایبەت باوەگەورەکانی ئیبنوخەلکان ڕوویان کردە ئەربەل و هەر لەو کوردانە ژنیان خواست و دوایی ناوبانگی «ئیبنوخەلکان»یان پەیدا کرد.

نووسەری «تەقریرات ئوسووڵ» لە پێشەکی کتێبەکەیدا سەبارەت بە ئەم کوردانە داستانێکی گێڕاوەتەوە کە لە ڕاست ناچێت، ناوبراو دەڵێت: ئەبولعەباس ئەحمەد کوڕی

---

٢٤٦- مولکی خاخیانلووەکان لە دەرەگەزدا بوو کە ئاستانی قودس بارەگای ئیمام ڕەزا لێیانی کڕیوە و بریتی بووە لە شەش دانگ زەوینی کشتوکاڵی هەمان قەلعە و خاخیان و بەندەری ژوور شەمسولشوموس، کاویانیان ل ٥٠٩.

٢٤٧- کورد و کوردستان، مەردۆخ، ل ٨٤.

موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری ئیبنوخەلکان ئەربەلی بەرمەکی شافیعی خاوەنی کتێبی مێژووی پیاو وەفیاتولئەعیان لە ساڵی ٦١٨ی کۆچیدا لە ئەربەلی نزدیکی مووسڵ هاتۆتە دنیاوە و ساڵی ٦٨١ی کۆچی لە شاری دەمەشق لە دنیا دەرچووە و دەڵێن لە بەر ئەوە ئەم ناوەی پێ دراوە چونکە ڕۆژێك باوکی زۆر شانازی بە ئەوە دەکرد کە لە بنەماڵەی بەرمەکیەکانە و کەچی پێی گوترا: «خل کان ابی کذا ودع جدی کذا و نسبی کذا و حدثنا عما تکون فی نفسك الام.»[٢٤٨]

ئەمینزەکی بەیگ دەڵێ خەلکانیەکان ٤٠٠ بنەماڵەن و لە ناوچەی کالیفانی ڕەواندزدا دەژین.

**خورماتاش:** ئەم کوردانە لە کوردە زەعفەرانلووەکانن و هەروەها لە ٦ کیلۆمەتری باکووری قووچانەوەن.

**دوودیکانلی (تیتکانلی):** کە لە بەرگی یەکەمدا ئەم عەشیرەتەمان پێتان ناساند و دوایی پیاوە گەورەکانی ئەم عەشیرەتە گوتیان ئێمە سەر بە عەشیرەتی بادلانلووین.

ئەمینزەکی بەیگ ئەم کوردانەی سەر بە عەشیرەتی «میللی»ی زانیوە. گوندی تیتکانلوو کە گەورەترین گوندی قووچانە و ٢٥٠٠ کەس جەماوەریە، موڵکی ئەم کوردانەیە.

**زەردکانلوو:** ئەم کوردانە دانیشتووی قووچان و بجنووردن.[٢٤٩]

**زینکانلوو:** ئەم کوردانە لە گوندێکدا هەر بەم ناوە نیشتەجێن و ٥٠٠ کەسن.

**زینەدینان (زیندینلوو):** ئەم کوردانە لە ناوچەی جریستاندا دەژین و پێم وایە سەرەتا لە گوندی «زینووی» سەر بە کوردستانی عێراقەوە هاتبێتن.

**زەنگانلووەکان** (zanglanlo): ئەم کوردانە لە گوندێکدا بەم ناوە دەژین کە لە ناوچەی دەرەگەزدایە و تاقمێکی بچووکی ئەم کوردانە لە گوندی قووپرانلووی بجنووردا

---

٢٤٨- تەقریرات ئوسوول مەحموود شەهابی خوراسانی.

٢٤٩- زەردکانلووەکان دانیشتووی زەردەکو بوون کە لە باشووری مەرگوور و ئوشەویەوەیە و وابزانم مەڵبەندی زازاکان بووە

زەردکانلوو و ئەتوانێ گۆڕدراوی زەردکووهانلوو بێت.

نیشتەجێن. بڕێك بەو باوەڕەن کە ئەم کوردانە لە عەشیرەتی کەیوانلوون و ئەمنیش پێم وایە ئەم بیرە دروستە. هەروەها جەعفەرقولی زەنگەلی شاعیر و عارفی بەناوبانگی کورد هەر لەم عەشیرەتەیە و ناوبراو لە دواییىن ڕۆژەکانی ژیانیدا دەگەڕێتەوە ڕادکان کە ناوەندی عەشیرەتی کەیوانلوویە. جەعفەرقولی لە زۆربەی شیعرەکانیدا نازناوی «زەنگەلی» بۆ خۆی تەرخان کردووە و لە زۆر شوێنیشدا نازناوی «بێچارە»ی [٢٥٠] بۆ خۆی داناوە.

ئەمین‌زەکی بەگ لە کتێبی «کورد و کوردستان»دا لە کتێبی سویحولئەعشای قەلقەشەندییەوە دەگێڕێتەوە کە وڵاتێ کە لە چیاکانی هەمەداندا و نزیکی مەنتەقەی کەلالییە و ڕێگەی عەشیرەتی زەنگەلیەی کوردە. هەروەها دەڵێت کوردەکان لە ٢٤ ناوچەدا ژیان دەکەن و لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ەنگەلییەکان لە نزیکی هەمەداندا ژیاون و زۆربەشیان لە سەردەمی شاعەبباسدا ئەو کۆچە مەزنەیان کرد بۆ خوراسان.

**سالانقووچ:** کە بە «سوورناقووچ» ناوبانگی دەرکردووە و لە گوندی سوورناقووچدا دەژین و هەزار کەس جەماوەریان هەیە.

**سینانلوو:** تاقمێك لەم کوردانە لە ناوچەی سنووری بیچرانلوو و تاقمێکیان لە ناوچەی ئێسفەراییندا دەژین. ئەمین‌زەکی ناوچەی ئەم کوردانەی بە «زازا» لە ڕۆژئاوای خەرپووتی تورکیە زانیوە. واتا ناوچەی نێوان سیووکانلووەکان و بیچرانلووەکان. لە ڕاستیدا ئەم کوردانە کەیکانلوویین کە ئێستاش لە دۆڵی کەیکانلوو لە قەڵای حەسەن و قەڵای نەقەددا دەژین و پێیان دەگوترێ «سینانی».

**سیوەدانلوو:** پێم وایە هەر ئەو کوردانەی بن کە بە ناوی سیوەلدی ناوبانگیان دەرکردووە و لە ڕۆژئاوای شیرواندا ژیان دەکەن و ناسرەدین‌شاش لە سەفەرنامەی خۆیدا باسی ئەم کوردانەی کردووە و گوتوویەتی ئەم کوردانە لە ناوچەی تناسووانی شیرواندا نیشتەجێن زۆربەی ئەم کوردانە لە گوندی شارەك کە لە سەر ڕێی باجگیرانی قووچاندا دەژین و مەردۆخ لەم بارەوە دەفەرموێ: شەهارەکی (شاراکی) عەشیرەتێکی گەورە بوون کە لە فارسدا دەژیان و کەچی

---

٢٥٠– مەگەر لە قیامەتێ وەدادی تەگی عەلی چی ما، کۆگونەکاری جەفەر قولی زەنگەلی

ئێستا پەرژوبڵاو بوونەتەوە. شەرکیەکانی سیستان لەم کوردانەن.

**شەکانلوو:** وا بزانم لە کوردە شوکاکەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوایی بن.

ناسرەدین‌شا لە سەفەرنامەکەی خۆیدا کوردەکانی خوراسانی بە کوردی شوکاك ناو بردووە. شەکانلووەکان لە گوندی دوونمایی قووچان و لە گوندێکی بەم ناوە و بە جەماوەرێکی زۆرتر لە ٧٠٠ کەس ژیاون.

**شەرکانلوو:** ئەم کوردانە لە ناوچەی سنووری نێوان بیچرانلووەکان و جریستانیەکاندا نیشتەجێن و تاقمێك بەو باوەڕەن کە ئەم کوردانە لە عەشیرەتی کەیکانلوو و لە لقی سیووکانلوون. مەردۆخ ناوی شەرکانەکانی بە «شەرکیان»[٢٥١] نووسیوە و دەڵێ سەر بە عەشیرەتی مەزنی «میلین».

**شیرزەنلوو:**[٢٥٢] ئەم کوردانە لە نزدیکی جووزان و لە باکووری قووچان و لە گوندی شیرزەنلوودا دەژین و جەماوەرێکی ٣٠٠ کەسین.

**عەرەبگیرلوو:** عەشیرەتێکن لە کوردەکانی خوراسان کە لە کەلاتی نادریدا نیشتەجێن و تاقمێك بەو باوەڕەن کە ئەم کوردانە عەرەبن، بەڵام ڕاستی ئەمە نییە. لەبەر ئەوەی ئەمانە عەرەبگیرن نە عەرەب. پێم وایە لە شەڕێکی دژ بە عوسمانیەکاندا ئەم کوردانە عەرەبیان کەلەبچە کردووە. نووسەری عالەمئارا ئەم کوردانەی لە عەشیرەتی شاملوو زانیوە و گوتوویەتی: حەقوێردی سوڵتان عەرەبگیرلوو کە لە سەرکردەکانی ئازەربایجانە. لەم سەردەمەشدا عەرەبگیرلوو سەر بە عەشیرەتی شاملووە. هەروەها لە لاپەڕەی ١٠٨٦دا کاتێ ناوی سەرکردەکانی ئەم سەردەمە دەهێنێ، دەڵێ لە ٤٣هەمین ساڵیاتی دەسەڵات پەیدا کردن و پاشایەتی شاعەبباسدا ١٩ کەس لە عەشیرەتە کوردەکان و ئەڵوارەکان خاوەن دەسەڵاتێکی باڵان کە حەقوێردی خانی عەرەبگیرلوو و خەلیل سوڵتان سیلسپوور لە هەموان گرنگترن. هەروەها کەماڵ بەیگ عەرەبگیرلوو و موحەممەدقولی بەیگ عەرەبگیرلوو دەورێکی زۆریان هەبووە لە سەردەمی شاعەبباسدا.

---

٢٥١– لە بنەڕەتدا شەرك دروستە

٢٥٢– سپاس بۆ مێهدی جیهانی کە ڕێنوێنی کردم.

نووسەری مێژووی قزلباش سەبارەت بە عەرەبگیرلووەکان دەڵێت: ئەم کوردانە لە کوردەکانی چەمەشگەزکن.

**قەرەقاشلوو:** کە لە دوو گوندی ٣٥٠ بنەماڵەییدا لە نزیکی ئیسفەراین دەژین و گوندەکەشیان ناوی «ئەلەست» و «ئەلەسك»ە.

**کالتمانلوو (قالتمانلوو):** یەکێ لە عەشیرەتە کوردەکانی زەعفەرانلووە کە لە گوندێکی سنووری جریستان بە ناوی «کالتمانلوو»دا نیشتەجێن و ١٥٠ کەسن و سەر بە بیچرانلووەکان.

**کانیمەشکان:** ئەم کوردانە دانیشتووی ئووغازن و لە ڕەگەزی عەشیرەتی سیووکانلوون. نووسەر لە دایکەوە دەچێتە سەر ئەم عەشیرەتە. ئووغازیەکان، موحەممەد دۆستەکان، ئەمانزادەکان، ئەمانموحەممەدییەکان، بەیرەمیەکان، سەلقەتیەکان، موحەممەدزادەکان و ئەحمەدپوورەکان هەر لەم عەشیرەتەن.

خوالێخۆشبوو، مامۆستا غولامڕەزا ئەحمەدپوور بە بۆنەی بنیاتنانی قوتابخانەی گەورەی ئووغازەوە بۆ هەموو کات ناوی خۆی لە دڵی خەڵکدا نیشتەجێ کردووە و عەشیرەتی سیوکانلوو و بۆ هیچ کاتێ ئەم پیاوە لەبیر نابەنەوە.

کانیمشکان کە لە ئووغازدا بە «کاڵمشکان» دەناسرێت، پێم وایە سەرەتا لە گوندی کانیمشکانی سەر بە شاری سنەوە کە لە ناوچەی ژاوەرۆدایە ژیابێتن و بە فەرمانی نادرشا کۆچیان کردۆتە خوراسان. بەڵام ئەگەر ئەم کوردانە لە کانیمشکی سەردەشتەوە هاتبێتن بۆ خوراسان، هەڵدەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شاعەبباسی سەفەوی[٢٥٣].

**٣٨- کەرگرلوو:** یەکێ لە عەشیرەتەکانی زەعفەرانلووە کە نووسەری نادرنامە ناوی ئەم عەشیرەتەی بردووە و گوتوویەتی: کاتێ کە نادرشا زستانی ساڵی ١١٤٠ی کۆچی خەریکی سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی خوراسان بوو، تورکمانەکان لە باکووری ئەستەرئابادەوە هێرشیان هێنا و تاڵانێکی زۆریان کرد، کەچی نادر بۆ بەرگری لەم کارە فەرمانی دا بە ئیبراهیم خان

---

٢٥٣- خاتوو موعتەمەدی لە نامیلکەکەی خوی دا کە لە گوڤاری ئەرمەخاندا بڵاوی کردۆتەوە دەڵێت: کانی مشکان یەکێ لە گوندەکانی دەوروبەری سنەیە کە کەڵەزانا حاجی شێخ عەبدولحەمید کانیمشکانی عێرفان خەڵکی ئەو گوندەیە و شێخەکانی کانیمشکان زۆر بەناوبانگن لە پیاوەتیدا.

تاکو هاوڕێ لەگەڵ کوردەکانی کەرگرلوو و چەمەشگەزك و قەراچوورلوودا ئەم تورکمانانە سەرکوت بکات. بەڵام کوردەکان بە تایبەت قەراچورلووەکان بە فەرمانی نادریان نەکردووە و هێرشیان کردۆتە سەر ئیبراهیمخان زەهیرودەولە و ڕەحیمخان گرایلی و شکستیانیان دا. موحەممەدڕەزاخان کەرگرلوو فەرمانڕەوای مەرڤ کە پیاوێکی زۆر مەزنی ئەم عەشیرەتە کوردەیە و کاتێ کە نادرشا لە ڕێکەوتی ٤ی شەووالی ١١٥٣ی کۆچیدا ڕوو دەکاتە مەرڤ، بە بۆنەی برسیەتی سوپاکەیەوە. لە ڕەزاخان تووڕە دەبێت و دەسەڵاتی مەرڤی لێ وەردەگرێتەوە و هاوکات شاقولی سوڵتانی قاجار دەکاتە خاوەن دەسەڵاتی مەرڤ[٢٥٤]. نووسەر لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ پێوەندییێك ببێت لە نێوانی کریکلووەکانی ڕۆژئاوای بجنوورد و کریکەکانی لوبناندا و هەروەها عەشیرەتی کەرگرلوو (کەرەکانلوو) کە یەکێ لە لقەکانی تووپکانلوون، دەبێ پێوەندییێکی زۆر نزیکیان پێکەوە ببێت.

**٣٩- کوردکانلوو:** ئەم عەشیرەتە لە گوندێکی گەورەدا کە لە ٣٥ باکووری قووچاندا ژیان دەکەن.

**٤٠- کەلاغانلوو:** ئەم کوردانە کە کاغانلوویشیان پێ دەگوترێ، لە گوندی قووچرانلوو و باغچخی بجنووردا ژیان دەکەن. ئەمینزەکی ژمارەی ئەم کوردانەی بە ١٥٠٠ بنەماڵە زانیوە کە لە نێوان کەرکووك و خانەقیندا دەژین[٢٥٥].

**٤١- کورکانلوو:** ئەم کوردانە لە دوو گوندی بەم ناوەدا و لە نزیکی دووشاوی ناوچەی سنووری جریستاندا دەژین و ٤٠٠ کەسن و بە ناوی «کوییرکانلووی» ناسراون. وا بزانم سەر بە عەشیرەتی جەلالی و کوڕان بن.

**٤٢- کووسە:** ئەم کوردانە کە بە «کووسان» ناوبانگیان دەرکردووە و لە گوندێکی بەم ناوەدا لە ناوچەی جریستاندا دەژین و ٥٥٠ کەسن.

مەردۆخ نووسیویەتی: کووسە چلهەزار بنەماڵەیێکن کە لە ناوچەی سەقز و سیاکۆدا

---

٢٥٤- نادرنامە، قەدووسی، ل٩١.

٢٥٥- نادرنامە، ل ١٩٧.

دەژین[٢٥٦].

کووسە لە عەشیرەتە کوردەکانە و ٤٠ بنەماڵەن و لە ناوچەی سەقز و سیاکۆدا دەبینرێن[٢٥٧].

کووسە گوندێکە لە گوندەکانی جریستانی باجگیرانی قووچان کە ٣٤٧ کەس جەماوەری هەیە. کووسەئەحمەد گوندێکە لە گوندەکانی باردۆست کە لە بەشی سۆمای ڕەزاییە (ورمێ) دایە و ١٠٣ کەس جەماوەری هەیە.

**٤٣- گووگان یان گووگانلووەکان:** کە لە گوندێکدا بەم ناوە و لە دۆڵی عەمارەتی باکووری ڕۆژهەڵاتی قووچان و هەروەها لە نێوان گوندەکانی دوانلوو و کچرانلوودا نیشتەجێن. بەڕێز شاکری نووسیویەتی ئەم کوردانە ١٦٨ کەسن.

**٤٤- گیلانلوو:** کە لە گوندی جەعفەرئاوای قووچاندا نیشتەجێن و ٤٠٠ کەسن و وابزانم لە کوردەکانی «گیل» بن و زۆربەشیان لە گیلیانی شیرواندا نیشتەجێن.

**٤٥- مامیانلوو:** ئەم کوردانە لە عەشیرەتی گەورەی زەعفەرانلوون کە تاقمێکیان لە گوندی مامەوانلووی دەرەگەزدا نیشتەجێن.

**٤٦- مایوانلووەکان:** ئەم کوردانە لە گوندێکی نزدیکی شیرواندا دەژین و کوردەکانی مایوانلوو زۆرتر ناوبانگی پاڵەوانی و ئازایەتیان هەیە. پاڵەوان قوربان موحەممەد بەهادوری لەم عەشیرەتەیە.

**٤٧- مەدکانلووەکان:** ئەم کوردانە لە ناوچەی چری و لە گوندێکی بەم ناوە ژیان دەکەن و لە دەوروبەری ١٠ بنەماڵەیێك دەبن.

**٤٨- مەلوانلووەکان:** ئەم کوردانە لە گوندێکی بەم ناوە و لە ناوچەی جریستاندا نیشتەجێن و ١٠٠ بنەماڵەن. سەرکردەی مەلوانلووەکان لە سەردەمی ئەحمەدشادا ڕەحیمخان و دوایی ئیسماعیلخان و ئیبراهیمخانی کوڕی بوون[٢٥٨].

---

٢٥٦- تارێخ کورد و کوردستان، مەردۆخ، بەرگی ١، ل ١٠٦.

٢٥٧- جوغرافیای سیاسی کەیمان، ل ٦٢.

٢٥٨- سپاسی حاجی بەراتی عەلیزادەی بەرپرسی چاپخانەی شیروان دەکەم کە ڕێنوێنی کردم.

**٤٩- نامانلووەکان:** ئەم کوردانە لە گوندێك سەر بە ناوچەی جریستاندا دەژین و ۱۰۰۰ کەس جەماوەریان هەیە. حاجی دەوڵەت نامانلوویی لە پیاوە مەزنەکانی ئەم عەشیرەتەیە کە بە ماوەی ۸ ساڵ لە بەندیخانەی ڕووسەکان و ١٤ ساڵ لە بەندیخانەی ڕەزاشادا دیل کراوە و هەروەها چەند ساڵێك بۆ بەندەرعەبباس دوور خراوەتەوە و ئێستاش زۆرتر لە ۱۰۰ساڵ تەمەنیە. لە زمانی باوەگەورەیەوە دەگێڕێتەوە کە نامانلووەکان سەرەتا لە قەڵای شەواتەدا ژیاون و تورکمانەکان شەوانە نزیکی قەڵای قرچغە بوونەتەوە و تاڵانیان کردووە و زۆربەی پیاوەکانیانیان کوشتووە و ژن و منداڵە کانیانیان بە دیلی گرتووە و قەڵاکەیان سووتاندووە. بۆیە بە قەڵای شەواتە واتا قەڵای سووتاو ناوبانگی دەرکردووە. دوایی نامانلووەکان کە ۱۷ بنەماڵە بوون و لە نزدیکی سنوورەوە گوندێکی بەم ناوەیان بنیات نا.

لێرەدا حاجی دەوڵەت کە بە بۆنەی ناخۆشی چاوەوە لە جێگەدا کەوتبوو سەری هەڵێناوە و بە نووسەری گوت: «هی پسام جان چی بوێژم؟» واتا ئەی ئامۆزا گیان ئەمن چی بڵێم؟ سەرانسەری کێوەکان و دۆڵەکانی سنووری نامانلوو پڕە لە ئێسقانەکانی پیاوە پێشووەکانی ئێمە کە بە دەستی دوژمن کوژراون. دڵم پڕە لە زووخ و باسم بۆ گوتن زۆرە، بەڵام نازانم لە کوێوە دەستی پێبکەم و لە ڕۆژ و دوو ڕۆژدا باسی من دوایی نایەت. باوەگەورەم بۆمی گێڕایەوە:

ئێمە کە ڕۆیشتین لە دارستاندا حومالْ بهێنین تاکو خانوو دروست بکەین، تا گەڕاینەوە تورکمانەکان قەڵاکەی ئێمەیان سووتاند. پێنج کەس لە هەڤاڵانی ئێمە لە دۆڵی سەر بە ئەو ناوچەدا دوای ئەو کارەساتە کە «بەزاوی خوێنی» ناوبانگی دەرکرد خەریکی دار بڕین بوون. کە تێکڕا تورکمانەکان هێرشیان هێنا و ئەو ٥ هەڤاڵەمانیان کوشتبوو و خۆیانیان دەرباز کردبوو. ئێمە زۆر بە دوای قاتڵەکاندا گەڕاین، هەتا ڕۆژێك پیاوێکی «چێورەمەیی» پێمانی گوت: ئەم کارە بە دەستی تورکمانەکان کراوە و هەر وەها ئەم تورکمانەش یەکێ لە سەرکردەکان بووە کەچی ئێمەش پاڕاینەوە تاکو هەر کاتێ ئەو سەرکەردە بۆ نەچیر ڕووی کردە ئەم شوێنە هەواڵمان پێ بدات. بەڵام ئەو ناپیاوە خێرا دەڕواتە کن ئەو سەرکردە تورکمانە و ئەم ڕاستیەی بۆ ئەدرکێنێ و ئەوانیش خێرا ۱۲ کەس لە پاڵەوانەکانی خۆیان دەڕازیننەوە و ڕەوانەی دارستانیان دەکەن و ئەم ۱۲ کەسە لە سێ گرووپی ٤ کەسیدا دێن و خۆیان لە ئەشکەتێکدا

دادەگرن و بەو ناپیاوە چێورەمەییە دەڵێن ئێستا تۆ بڕۆ هەواڵیان بۆ ببە و بڵێ ئەو سەرکەردە تورکمانە هاتووە بۆ نەچیر. ئەویش خێرا ئەو هەواڵە دەهێنێ بۆ کوردەکان، بەڵام نەیگوت تورکمانەکان ١٢ کەسن و تەنیا گوتی ٤ کەسن. ئێمەش بە بیستنی ئەم هەواڵە پێنج کەسمان، خۆمانمان ڕازاندەوە و ڕۆیشتین و لە نیوەشەودا کاتێ کە ئەوان خەوتبوون و یەکیان و لە درەوەی ئەشکەوتەکە خەریکی دیدەبانی بوو. ئەویش کاتێ زانی هیچ باس و هەواڵێك نییە خێرا چەکەکەی نا ژێر سەری خەوت. سەلمان نامانلوویی گوتی من دەبم بە بەرپرسی کوشتنی ئەو تورکمانە کە لە بەر درگای ئەشکەوتەکەدا نووستووە. خێرا هەڕای کرد و دەستی نا ناقی و بە بێ ئەوەی دەنگی لێ بەرز ببێتەوە خنکاندی و تەرمەکەی پەرت کردە نێو دوڵەکەوە و ئێمەش خێرا هێرشمان برد و تورکمانەکان لە خەو ڕاپەڕین و ئەوەندە ترسابوون کە هیچیان پێ نەکرا و ئێمەش هەموویانمان دیل کرد و دەستیانمان بەست و بردیانمان بۆ «زاوی خوێنی» واتا ئەو شوێنەی کە ئەوان ٥ کەسیان لە هەڤاڵەکانی ئێمە کوشتبوو. لەوێ پێیانمان گوت ئەگەر ڕاست بڵێن ناتانکوژین و تەنیا دەتاندەینە دەستی ئەمیرحسێنخانەوە و ئێستا پرسیارێکمان هەیە و ئەویش ئەوەیە کە پێمان بڵێن کێ ئەو ٥ هاڤاڵەی ئێمەی کوشتووە و ئێستا لە کوێدایە و کاتێ ئەوان زانیان ئێمە زۆر سوورین لە سەر کوشتنیان، ئەو ٥ کەسەیان پێمان پیشان دا و ئێمەش ئەو ٥ کەسەمان بە زیندووی سووتاند و ئەو ٦ کەسەکەیترمان بردە قووچان و دایانمان بە دەستی ئەمیرحسێنخانەوە. ئەم کارەساتە بۆ تورکمانەکان زۆر دڵتەزێن بوو و سەرکەردەکەیان هەموویانی کۆ کردبووەوە تاکو جارێکیتر قەڵای نوێی نامانلوو بە ئاگری تووڕەیی خۆیان گڕ بدەن. بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش بە ٧٠٠ سوارەوە بەرەو نامانلوو بەڕێ کەوتن، ٤ پیاو لە ١٢ پیاوی نامانلووەکان بۆ زمهەرِ کردن ڕۆیشتبوون بۆ جریستان و ئێمەش کە ٨ پیاو بووین لە قەڵادا مابووینەوە، ڕێنمای تورکمانەکان لە تاریکی شەودا ڕێی لێ بزر دەبێ و بە جێگای ئەوەی لە پشتی قەڵاوە هێرش بهێنن لە کێوی بەرانبەری نامانلووەوە سەر دەردێنن. ژنێك کە تازە زەماوەندی کردبوو بەیانی زوو لە خەو ڕادەپەڕێ و دەبینێ کە لە کێوی بەرانبەریەوە سپای دوژمن سەنگەر دەگرێ و خێرا دەگەڕێتەوە و باوکی مێردەکەی لە خەو ڕادەچڵەکێنێ و ئەو بارودۆخەی پێ پیشان ئەدات. دەبێ بڵێم ئەو ژنە بە ئیشارەتی دەست

خەزوورەی تێدەگەیەنێ، لە بەر ئەوەی لە ناو کورددا باو بووە کە تازەوەویی تا چەند ساڵێك بۆ ڕاگرتنی ڕێز و حورمەت لە بەرانبەری خەزوورە و هێوەرەکانیەوە قسەی نەکردووە. دوای ئەوەی ئەو پیاوە بەو کارەساتەی زانیوە فەرمانی داوە بە تەواوی ژنەکانی قەڵا تاکو جلوبەرگی پیاوان لەبەر بکەن و دژ بە تورکمانەکان بووەستن. شەڕ دەستی پێ دەکات و لە ئاکامدا ١٧ کەس لە تورکمانەکان دەکوژرێن. پیرەژنێك بۆی دەردەکەوێ کە لە گەوڕدا دەنگەدەنگێ دێت و خێرا سەرنجی پیاوەکان بۆ گەوڕ ڕادەکێشێت کە دوژمن دەیەویست دیواری گەوڕەکە بشکێنێت و لەوێوە هێرش بهێنن. لەم کاتەدا پیاوێکی تورکمان تا نێوە خۆی کێشاوەتە نێو گەوڕەکەوە، کەچی ئەو پیرەژنە بە بەرد وەهای لێداوە کە کوشتوویەتی و تورکمانەکانیتر کاتێ ئەم کارەساتەیان بینیوە پاشەکشەیان کردووە. سەرکردەی تورکمانەکان فەرمانی پاشەکشە ئەدات بە سەربازەکانی و لە ناوچەییێکدا بە ناوی «تەختنیکان» وچانێك ئەدەن و ئەو سەرکردە زۆر ڕەخنە لە لێنەهاتوویی سەربازە تورکمانەکان دەگرێت کە بۆچی نەیانتوانیوە قەڵاکە داگیر بکەن. دوایی هانیان ئەدات تاکو جارێکیتر ئازایانە هێرش ببەن و خێرا قەڵاکە داگیر بکەن و بە هیچ کەس و هیچ شتێك ڕەحم و بەزەییان نەبێت. لەم کاتەدا ئاقاجان نامانلوویی بە چەکی باخرلی[259] تیرێك دەتەقێنێ و سەرکردەی تورکمانەکان بێگیان دەکات و سەربازە تورکمانەکان بە دیتنی ئەم کارەساتە هەڕا دەکەن و قەت نایەنەوە شەڕی نامانلووەکان.

٥٠- ناوخلوو: ئەم کوردانە لە گوندی «ناوخ» کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی قووچانەوە دەبینرێن. دەڵێن سەر بە عەشیرەتی وڕانلوون.

## گوندە کوردنشینەکانی دەرەگەز

١- ئووتانلوو: مەڵبەندی کوردەکانی ئووتانلووە و گوندێکی ٣٠ بنەماڵەییە کە لە پەنای کێوی شەکرئاوا چلمیردایە.

---

٢٥٩- ناوێکی بەناوبانگە بۆ چەك.

**٢- بووزانلوو:** ئەم گوندە لە دۆڵی دەروونگەری دەرەگەزدایە[٢٦٠].هێرۆدۆت پێی وابووە کە بووزانەکان لە شەش عەشیرەتە بنەڕەتیە مادیەکانن[٢٦١].

**٣- پالکانی ژوور.**

**٤- پالکانی خوار:** ئەم دوو گوندە مەڵبەندی کوردەکانی پالکانلوون.

**٥- پێشەندی:** گوندێکە چل بنەماڵەیی و مەڵبەندی کوردەکانی تووپکانلووە.

**٦- تەراوەری ژێر (خوار):** گوندێکە کە ٣٠٠ بنەماڵە لە کوردەکانی «بەوان»ی تێدایە (پێم وایە بەوان هەر بابان بێت).

**٧- توورانلوو:** ناوەندی کوردەکانی توورانە کە بە بورجقەڵا ناوبانگی دەرکردووە.

**٨- تووزانلوو:** گوندێکە کە ٧٠ بنەماڵە لە کوردەکانی تووزانی لە دڵی خۆیدا جێگە داوە و پاشماوەی ئەو کوردانە دانیشتووی «نەوخەندان» و «موحەمەدئاباد»ن.

**٩- جولفان:** پێم وایە هەر «جافان» دروست بێت. جاف یەکێ لە عەشیرەتە گەورەکانی کوردە کە ئێستا زۆربەیان لە کوردستانی عێراقدا دەژین و تاقمێکیان لە نزدیکی قووچاندا ژیان دەکەن.

**١٠- چاوشلوو:** گوندێکە گەورە کە ناوەندی عەشیرەتی چاوشلوو «چاپشلوو»ە کە لە عەشیرەتە تورکە ئەفشاریەکانن و تاقمێکی ئەم گوندە کوردی زەعفەرانلوون.

**١١- حەسەنئاوا:** کە ناوەندی کوردەکانی تووپکانلوو و پاڵەوانلووە.

**١٢- حەسار:** گوندێکە لە سنووری ئێران و سۆڤێتدایە کە لە دەوری ٧٠ بنەماڵە نەماوەری هەیە. لە کوردستانی خوراساندا چەند گوند بەم ناوە هەیە و مەردۆخیش ئاماژەی پێ کردووە و دەڵێ: «حەساران» یا «هەساران» عەشیرەتێکی گەورە بوون، بەڵام ئێستا پەرژوبڵاون.

**١٣- حەزرەت سوڵتان:** کە ئەم گوندە ٢٥ بنەماڵەیە و مەڵبەندی کوردەکانی تووپکانلووە.

---

٢٦٠- ئیلات و تەوایفی دەرەگەز، مینیا، ل ١٨٧.

٢٦١- ئیرانی قەدیم، پیرنیا، ل ٤٠.

**١٤- حەقوێردی:** کە جێگای کوردەکانی بیچرانلووە.

**١٥- خاخیانلوو:** ٥٠ بنەماڵـە لـە کوردەکـانی خاخیـان و ١٥ بنەماڵـە لـە کوردەکـانی تووپکانلوو و ١٠ بنەماڵە لە تورکەکان لەم گوندەدا نیشتەجێن.

**١٦- خادمانلوو**

**١٧- خەلانلوو (خەلکانلوو):** ٥٠ بنەماڵە لە کوردەکانی خەلکانی لەم گوندەدا دەژین.

**١٨- داغدار:** مەڵبەندی کوردەکانی بیچرانلووە.

**١٩- دەربەند ئوزدەك**

**٢٠- دەربەنـد ئولـەنگ:** خـەڵکی ئـەم دوو گونـدە لـە کوردەکـانی قۆشـخانەن کـە لـە گوندەکانی چیوومەرە و سەرانیەوە ڕوویان کردۆتە ئەم ناوچەیە.

**٢١- دوودانلوو:** گوندێکی ٨٠ بنەماڵەییە لە کوردەکانی دوودانلوو.

**٢٢- دەوڵەشانلوو:** ئەم گوندە ١٥٠ بنەماڵەییە بە گـشتی کـوردی دووڵەشـانلووە و لـە ناوچەی نەوخەندان دایە. ئـەولیای چـەڵەبی لـە سـەفەرنامەکەی خۆیـدا لـە بەشـی کوردسـتانی تورکیەدا نووسیویەتی: یەکەمیـن ڕۆژ گەیشتمە «دەوشانلی»[٢٦٢].

**٢٣- زیندینلوو:** ١٨٠ بنەماڵە لە کوردەکانی سیووکانلوو لەم گوندەدا دەژین.

**٢٤- شەمسیخان:** ١٥٠ بنەماڵـەیێکن لـە کوردەکـانی کـەیکانلوو و مامیـانلوو پێـك هاتوون.

**٢٥- شێخکانلوو:** ناوەندی کوردەکانی شێخکانلووە.

**٢٦- شــێخوان:** ئــەم گونــدە لــە نزدیکــی دەروونگــەر و لــە پــەنای کێــوی کۆچــڕدایە (شێخکانلووەکان لە گوندەکانی سێخوانلوو و شێخکانلووی سەر بە ناوچەی قووچانیشدا دەبینرێن).

---

٢٦٢- بەڕێز میرنیا لە بەرگی دووەمدا ناوی سەرکردەکانی عەشیرەتەکانی دەرەگەزی نووسیوە و هاوکات دەڵێت: گووەشانلوویان ژدەولەت شانلوو بەشێکە لە کوردەکانی عەشیرەتی زەعفەرانلوو کە لە کەپکان و میانکوو دەوڵەت شانلوودا ژیاون، بەڵام نووسەر لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم دوو عەشیرەتە لێك جیاوازن و گووەشانلوو گۆڕدراوی« کاوەستیانلووەی، دەڵێن کاتێ کە کۆچیان کردووە بۆ خوراسان لە کێوی دەماوەندا مانگاکانیان پای خستووە و بۆیە بەم ناوە ناوبانگیان دەرکردووە. یان شایەت لە کوردەکانی گووگرشیانلی بن کە لە باکووری مەرعەشدا ناویان لێ دەبرێ.

مەردۆخ دەڵێت: شێخەکان بەشێکن لە عەشیرەتی جوبرانلی کە لە نێوان بتلیس و مووشی کوردستانی تورکیەدا نیشتەجێن.

**٢٧- شێوە:** بریتیە لە ٣ گوند بە ناوی موحەممەدشەریف بەیگ و قەڵای کونە و قەڵای حەیدەریان کە زۆرتر لە ٢٠٠ بنەماڵە و زۆربەشیان کوردەکانی حەمزەکانلوو و بوودانلوو و قۆشخانەن.

وا بزانم پێوەندییێك ببێ لە نێوانی ئەم شێوە و شێوەی سەر بە ناوچەی بانە. بەتلیسی نووسیویەتی: بانە بریتییە لە دوو قەڵا، یەکیان قەڵای بیرۆز و ناوچەی بانە و یەکی‌تریان قەڵای شیوەیە (زێویە) کە لە نێوان وڵاتی بابان و ئەردەڵان و موکری دایە[٢٦٣].

مەردۆخ دەڵێت: شێوەکان وابزانم لە کوردە شوکاکەکانن کە لە ڕۆژئاوای کفریدا نیشتەجێن.

**٢٨- عەبباس قەڵا:** ٥٠ بنەماڵە لە کوردەکانی بیچرانلوو لەو گوندەدا نیشتەجێن و ئەم گوندە لە پەنای کێوی ئەڵڵاهوئەکبەر دایە.

**٢٩- قەڵای کۆنە:** ١٥ بنەماڵەی تێدایە.

**٣٠- قووروچانلوو:** کەقەڵای «حەسەن کەدخودا»یشی پێ دەگوترێ و لە سنووری نێوان ئێران و سۆڤیەت دایە و ٤٠ بنەماڵەی لێیە.

**٣١- قوشخانە:** گوندێکی ١٥٠ بنەماڵەییە کە لە کێوی کەلات وچیای قولی دایە و مەڵبەندی کوردەکانی بادلانلووە.

**٣٢- قولجوق**

**٣٣- کالشوور:** ٢٥ بنەماڵە لە کوردەکانی تووپکانلوو لەم گوندەدان.

**٣٤- کاهانلوو:** ٥٠٠ بنەماڵەی تێدایە و لە دۆڵی شەکراب دایە.

**٣٥- کەپکانلوو:** جەجووخان لەم گوندەدا هاتۆتە دنیا و مەڵبەندی کوردەکانی کەپکانە.

**٣٦- کەلی‌رامی:** واتا قەڵای ڕەحمانقولی کە گوندێکی ٢٥ بنەماڵەییە و مەڵبەندی

---

٢٦٣- شەرەفنامە، ل ٤١٣.

کوردەکانی کووم‌کیلانلووە.

**٣٧- کەلی‌سەیدان:** قەلای سەییەکان کە هیچ سەییدێك لەو گوندەدا نییە و هەموویان کوردن.

**٣٨- کەلی‌کالێ:** کە لە سنووری ئێران و سۆڤیەت دایە و ٥٠ بنەماڵەیە.

**٣٩- کەلی موحەممەدتەقی بەیگ سائینان:** کە ٢٥٠ بنەماڵەیە.

**٤٠- کەلەکەندیی:** گوندی کوردەکانی تووپکانلووە.

**٤١- کۆماج‌خوران:** کە ٤٠ بنەماڵەی تێدایە.

**٤٢- کەیوانلووەکان:** لە گوندی کاهوو و تیکابدا لەم کوردانە دەبینرێن و ئەم کوردانە لە نێوان زەرین کێو و جولگەی لوتفئاوا ئێلاخ و قشلاخ دەکەن.

**٤٣- گەپی**

**٤٤- گەدووگانلوو:** گوندێکە ٥٠ بنەماڵەیی و وابزانم مەڵبەندی کوردەکانی بیچرانلووە.

**٤٥- لوتف‌ئاوا:** گوندێکی کورد و تورك نشینە و لە ناوچەی دەرەگەزدایە.

**٤٦- مادانلوو:** واتا مادەکان (ماد+ان+لوو) کە گوندێکی ٦٠ بنەماڵەییە و لە ڕووباری ڕۆخانەی دەروونگەر و لە نزدیکی دوڵی عەلی بولاغ دایە. پیاوی بەناوبانگی ئەم عەشیرەتە حاجی قلیچ خانە.

**٤٧- مامیانلوو:** یان مامەدانلوو کە ئێستا پێی دەگوترێ «بەهادورخان» گوندێکی ٧٠ بنەماڵەییە و مەڵبەندی کوردەکانی مامیانلووە و ئەم گوندە لە نزدیکی سنووری سۆڤیێتەوەیە و تا ڕادەیێك بە ڕۆخانەی دەروونگەرەوە نزدیکە. ئەلیاس بەیگ مامیانلوو پیاوێکی گەورەی ئەم گوندەیە و هەروەها ناوبراو لە ڕاوێژەکەی سام‌خانی ئیلخانیدا بەشداری کردووە و پاڵپشتی خۆی بەرانبەر بە نادرشا لەو کۆبوونەوەدا دەربڕیەوە و یەکێ لە ئەو کەسانەی بوو کە بە سام‌خانی گوت نادر بکات بە زاوای خۆی و هەر بە بۆنەی پاڵپشتی ئەم کوردەوە بوو کە دانیشتوان بە گشتی پشتیاندا بە پشتی نادرەوە. بەڕێز حاجی شوکروڵلای شێخۆ یەکێ‌تر لە پیاوە گەورەکانی ئەم کوردانەیە.

**٤٨- موحەمــــمەدئاوا:** ناوەنـدی شـاری دەرەگـەزە و ٤٠٠ بنەماڵـەی کـوردی لێیــە و زۆربەی جەماوەری ئەم موحەمـمەدئاوایە تورکی کۆچەرین.

تورکەکانی موحەمـمەدئاباد و لوتفـئاباد و نەوخەندان بە گشتی تورکی کۆچەریـن کە لە ڕاپەڕینی ئۆکتۆبری فەڕانسە بەملاوە ڕوویان کردۆتە ئێران و بە تایبەت لە شارەکانی قووچان و شیـروان و بـجنوورد و مەشهەددا نیشتەجێ بوون. دەبێ ئەو ڕاستیەش بدرکێنیـن کە لە نێـوی ئـەم تورکانـەدا تاقمێـك لـە جـاش و بـەکرێ گیــراوەکانی «G.P.O»ی سـۆڤێت خۆیانیـان گەیاندۆتە ئێران.

هەروەك کە بەڕێز شاکری نووسیوویەتی ئەم بەکرێ گیـراوانە توانای ئەوەیان نەبوو دەستی خۆیان ڕوو نەکەن و کاتێ کە ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی ڕووسیە هێرشی کردە سەر گەلانی ئێران و گەیشتە شاری قووچان، ئـەم جاشـانە چوونە پێـشوازیانەوە و بـانگی «بـژی ئیـستالیـن، بـژی ئیستالیـن»یان سەر دا و هاوکات سوپای ڕووسیان گوڵباران دەکرد. شاری موحەمـمەدئاوا بـە دەستی ئەمیـرحسێنخان و حەیدەرقولیخان بنیات نرایەوە.

**٤٩- میاب:** کە ٣٠ بنەماڵەی کوردی لێیە.

**٥٠- مینە (مەهەنە):** کە مەڵبەندی کوردەکانی ئاشخانەیە.

**٥١- نەسرەتئاوا:** کە ١٣ بنەماڵەی تێدایە و لە سنووری نێوان ئێران و ڕووسیەدایە.

**٥٢- نەوخەندان:** کە بەشێکی کەمی کوردە و لانی زۆری تورکە.

**٥٣- یانبلاغ:** لە سنووری سۆڤیەت دایە.

## گوندەکوردنشینەکانی کەلاتی نادری

کـەلات یـەکێ لـە قـەڵا گـەورە و گرنگـەکانی ئێرانـە کـە قـەڵاییکی زۆر عـەجیب و سەرسوڕهێنەرە و لە مێژەوە زۆربەی داگیـرکەرانی بێگانە حەزیان لەوە کردووە دەست بگرن بـە

سەر ئەم قەڵایەدا[٢٦٤]. لە سەردەمی باستاندا قەڵای ناوبراو ماوەیێك بە دەستی ئێران و ماوییێکی دیکە بە دەستی توورانەوە بووە و هەروەها زۆربەی شەڕەکانی کتێبی شاهنامەی فێردەوسی لەم ناوچەیەدا ڕوویداوە. بە تایبەت شەڕی تووس سپەهداری ئێران و کەیخوسرەوی برای کە بە کوشتنی کەیخوسرەو ئاکامی هات.[٢٦٥]

دوابەدوای گرتنی کەلات بە دەستی نادری ئەفشار،[٢٦٦] ناوبانگی کەلانی نادری دەرکرد، لەبەر ئەوەی دوایی نادر زۆر بایەخی داوە بەو قەڵایە و زۆربەی گەنج و زێڕەکانی خۆی هێناوەتە قەڵای ناوبراو.[٢٦٧] دانیشتوانی کەلات تێکەڵاوێکن لە کورد و تورك و فارس کە برایانە و بە بێ هیچ تەنگی و پێکدادانێك لە کەناری یەکدا ژیاون. کوردەکانی کەلات زۆرتر لە عەشیرەتەکانی سوونیانلوو، شێخوانلوو، بریانلوو، کەیوانلوو و تەرسانلوون.

نووسەری سەفەرنامەی کەلات کە بە فرمانی ناسرەدین‌شا چووە چاوپێکەوتنی کەلات، سەبارەت بە دانیشتوانی دەربەندی ئەرغەوانشا ئاوەها دەڵێت: جەماوەرێکی ١٢٠ بنەماڵەیین و سێ عەشیرەت لەوێ نیشتەجێن کە بریتین لە جەلایر و بووباشی (توورکن) و تورسانلوو[٢٦٨].

---

٢٦٤- ن،ك، ئێران و قەزیەی ئێرانی، لورد کورزەن و سەفەرنامەی کەلات نووسراوەی مەحدوئیسلام کرمانی.

٢٦٥- شانامەی فێردەوسی.

٢٦٦- دەڵێن کاتێ نادر لە پشتی دەروازەکانی کەلاتەوە ماوەتەوە و نەیتوانیوە ئەو شارە داگیر کات، کەوتۆتە بیری تاکو پیلانێك دروست بکات. بۆیە فەرمانی داوە ڕانێك بزنی شاخ داریان هێناوە و بە هەر شاخێکەوە شەمێکی گیرداوە و ڕۆشنی کردووە و فەرمانی داوە ئەو بزنانە ببەنە سەر کێوەکەی کەلاتەوە. ئێوارە پەیام دەنێرێ بۆ خەڵکی کەلات و دەڵێ ئەگەر درگای شار نەکەنەوە بە هێزکانم کە لەسەر کێوەکەوە چاوەڕوانی فەرمانن، فەرمانی شەڕ دەدەم و ئەوانیش کاتێ بۆ کێو دەڕوانن کە هەمووی چرا و چراخانە، ترساون و درگای شاریان کردۆتەوە. هەر لەم کاتەوە بە بزنیان گوتووە کەلاتگیر.

٢٦٧- عەبدوڵڵای کوردی مەریوانی لە لایەن نادرەوە دەبێتە بەرپرسی پاراستنی گەنجەکانی نادر لە کەلاتدا و ئەوەندە لە ئازایەتی عەبدوڵڵا کورد متمانەی دەبێ کە دەڵێ: قەت ئەم گەنجانە لە دەست ناچێ و ئەگەر ڕۆژێ دوژمن زۆر بهێنێ بە تەقاندنەوەی قەڵاکە هەمووی درگاکان بۆ گەنج خانەکە دادەخرێت و دوژمن نایدۆزێتەوە، بەڵام بە کوژرانی نادر و هاوردنی سەری نادر لە لایەن عادڵشاوە عەبدوڵڵا مەریوانی کلێلی گەنجەکە ئەدات بە دەستەوە. (خواجەی تاجدار ژان گورەی فەڕانسەوی ل ٧٠ وەرگێراوی زەبیحوڵڵای مەنسووری)

٢٦٨- تورسانلووەکان زۆرتر دانیشتووی چناران و مشهەدوە و زۆرتر لە ١٠٠٠ بنەماڵەن.

ئەم ناوچەیە ٣٠٠ پیاوی هەیە[٢٦٩]. قەدووسی دەڵێت: دانیشتوانی کەلات بریتیین لە: کورد، عەرەبی شەیبانی، ئەردەڵان (کورد) و جەلایر[٢٧٠]. ئێستاش کە تۆزێك سەبارەت بە کەلات شارەزاییمان وەدەست هانی و هەروەك کە دەشزانین ڕووسەکان بەشێکی زۆریان لەم ناوچەیە داگیر کردووە و بەشێکی زۆر لە کوردەکان کەوتنە ئەوبەری سنوورەکانەوە. لێرەدا وا چاکە گوندەکانی کەلاتیش بناسین.

**١- ئابگەرم:** ٨٠ بنەماڵەی تێدایە کە ٢٥ بنەماڵەیانە کوردن.

**٢- ئەحمەدئاوا:** کە تێکەڵاوێکە لە ١٠٠بنەماڵە کورد و تورك کە ٣٠ بنەماڵەیان تورك و ٧٠ بنەماڵەشیان کوردن.

**٣- ئیدەلوو**[٢٧١]: کە ئیدەلیکیشی پێ دەگوترێ و لە بنەڕەتدا ئیدەلووی ئەفشار بووە،[٢٧٢] بەڵام دوایی کاتێ کە نادر عەشیرەتە ئەفشاریەکان دەگۆزێتەوە بۆ ناوچەکانیتری ئێران و دەسەڵاتی وڵاتانیتریان پێ ئەدات، هاوکات ناوچەی کەلات بە بێ کورد و جەلایر و ئەفشار دەمێنێتەوە. نادر بە جێگەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە تاقمێك لە کوردەکانی دەورووبەری سنە و کرماشان و بنەماڵەی زەندی گواستەوە کەلات و دەرەگەز کە زۆربەیان دوای کوژرانی نادر وەرگەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان.

زۆربەی ئەو کوردانەی کە نادر گواستیانیەوە بۆ کەلات لە کوردەکانی بادلانلووی قووچان بوون و هەر لەم سەردەمە بە دواوە کوردەکانی بادلانلوو و ئیدەلوو لە کەناری یەکدا وەکو برادەر و هەڤاڵ ماونەتەوە و بە دوو زمانی کوردی و تورکی قسە دەکەن. ئیدەلوو ٣٠٠ بنەماڵەی تێدایە.

---

٢٦٩- فەرهەنگی ئێران زەمین، بەرگی ٢٥، ل ١٨٣ نامیلکەی سەفەرنامەی کەلات.

٢٧٠- نادرنامە، ل ٣٧.

٢٧١- ئیدەوشەیێکی تورکییە و بە مانای سرنچکە. شایەت پێش هاتنیان بۆ خوراسان داری پرنکیان بوویێت.

٢٧٢- عالەمئارای عەبباسی ئەسکەئەرەبەیگ تورکمان بە پێشەکی ئێرج ئەفشارەوە.

٤- **باباڕەمەزان**[٢٧٣]: ١٥٠بنەماڵە لەم گوندەدان کە زۆربەیان کرمانـجن.

٥- **بەشارەت:** گوندێکی چل بنەماڵەییە و هەموویان کوردن.

٦- **پولگـەرد:** ٢٠ بنەماڵـە لـە کوردەکـانی زیـدانلوو، سـووفیانلوو و شـێخوانلوو لـەم گوندەدا دەژین.

٧- **چوارڕا:** ٥٠ بنەماڵەییێکە لە کوردەکانی زیدانلوو و سووفیانلوو.

٨- **چەهچەهە:** ٨٠ بنەماڵە لە کوردەکانی بابان دانیشتووی ئەم گوندەن. گوندی ناوبراو لە سنووری سۆڤیێتدایە.

٩- **چناری ژوور:** ٤٠٠ بنەماڵەی کوردی لێیە.

١٠- **چناری خوار:** ١٢٠ بنەماڵەیە و مەڵبەندی کوردەکانی کەیوانلووە.

١١- **چەرەم:** گوندێکە لە پەنای کێوی کەلاتدا و ٢٠٠ بنەماڵەی لێیـە، لـە شـاهنامەدا ناوی ئەم گوندە هـاتووە. زۆرتـر لـە ١٠٠بنەماڵـەی ئـەم دێیـە لـە سـەرکردەکانی عەشیـرەتی شادیلوون کە لە سەردەمی جەعفەرقولیخان شادیلوودا بۆ پاراستنی چەرم ڕەوانەی ئەو ناوچەیە کراون.

١٢- **حاجیئاوا:** ٣٠ بنەماڵەییێکە لە کوردەکانی جەلایر وبیاجخورانلوو.

١٣- **خاکستەر:** گوندێکە لە سنووری ئێران و سۆڤیەتدا و ١٠٠بنەماڵە لـە کوردەکـانی کوومکەیلانلوو و شادیانلوو لەوێدا نیشتەجێن.

١٤- **دەربەند:** گوندێکی ٣٠٠ بنەماڵەییە کە لە نزدیکی قـەڵای کەلاتەوەیـە و زۆربـەی دانیشتووانی گوندەکە کوردی جەلالیـن و تاقمێك لە سەیدەکانیشی لێیە.

١٥- **ڕەجەبئاباد:** سەر بە ناوچەی لایینە و ٥٠ بنەماڵەییێکی کوردەکانی زیدانلوو ئـەم گوندەیان پێك هێناوە.

١٦- **ڕوبات (روات):** ١٦٠ بنەماڵە لـە کوردەکـانی جـەلایر، زیـدانلوو، سـووفیانلوو و جوخۆرانلوو کە هەموویان کوردن لەم گوندەدا نیشتەجێن.

---

٢٧٣- باباڕەمەزان، بارەگایێکی ئایینیە کە دەڵێن حاجی زولفەقار جەلایر ساڵی ١٣٥٢ بنیاتی ناوە و دەڵێن زیارەتی یەکێ لە یارانی ئیمام ڕەزایە بە ناوی ڕەمەزان.

۱۷- **سینە:** ٤۰۰ بنەماڵە لە کوردەکانی سینانلوو و ساداتی تورك جەماوەری ئەم گوندەیان پێك هێناوە. زۆربەی سینانیەکان دانیشتووی بیچرانلووی ژوور و خوارن.

۱۸- **قەلعەی‌نوێ:** لە نزدیکی کەڵاتەوەیە و ٤۰۰ بنەماڵەی لێیە.

۱۹- **کەریم‌ئاوا:** لە نزدیکی لاینیەوەیە و ۱۱۰ بنەماڵە لە کوردەکانی زیدانلوو و سووفیانلوو دانیشتووی ئەم گوندەن.

۲۰- **کەلات:** ناوەندی کەلاتە و کورد و تورك و فارسی لێیە.

۲۱- **کەلاو (کەهلاب):** ۲۰۰ بنەماڵە لە کوردەکانی سووفیانلوو و زیدانلوو جەماوەری ئەم گوندە پێك دەهێنن.

۲۲- **لایینی‌کۆن:** لە پەنای کێوی هەزار مەسجدەوەیە و ۱۰۰ بنەماڵە لە کوردەکانی سووفیانلوو لەم گوندەدان.

۲۳- **لایینی‌نوێ:** لە گەورەترین گوندەکانی خوراسانە و ۷۰۰ بنەماڵەی لێیە و لەو گوندەدا کوردەکانی جەلایر، شێخوانلوو، باجخوانلوو، زیدانلوو و جوخۆرانلوو ژیان دەکەن.

۲٤- **یەکەباغ:** گوندێکە ۲۰۰ بنەماڵەیی کە کوردەکانی زیدانلوو، سوفیانلوو شێخوانلوو لەم گوندەدا دەژین.

بەڕێز حەبیبوڵڵای لاڕوودی لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی ژیانی نادرشای کوڕی شمشێر بەڵگەی زۆری لە کوردەکانی شێخکانلوو و سووفیانلووی داوەتە دەستەوە کە ئەوندە کەمڕەنگە ناخوێندرێتەوە.

هەروەها بەڵگەیێکی‌تری داوەتەوە دەستەوە و ئەویش تا ڕادەیێك کە خۆی توانای خوێندنەوەی بوویێت نووسیوویەتی.

ئەو بەڵگانەی کە تایبەتە بە کوردەکانی سووفیانلوو و شێخوانلوون، شەشس بەڵگەیە. ئەو یازدە بەڵگەیەی کە بە کورت هێناویەتی و ئێمەش بە شێوەی خوار دامانناوە:

۱- فەرمانی دانی پارەی ٦ کەس لە کوێخاکانی عەشیرەتی سووفیانلوو بە ناوی میرزا موحەممەد مێهدی مستەوفی -نووسەری تایبەتی نادرشا- کە بەرواری ئەم فەرمانە ۱۸ی زیقەعدەی ۱۱٤۸ی کۆچی مانگیە.

٢- فەرمانی دێهداری شاهوێردیخانی سووفیانلوو (١٧٠ی جیمادیولئەوەڵی ١١٥٠ی کۆچی مانگی)

٣- فەرمانی ڕاگەیشتن بە داخوازی شاهوێردی سووفیانلوو بۆ عاشوورخان ئەفشاری فەرمانڕەوای ئبیورد (٢٩ی ڕەبیعولئەوەڵی ١١٥١ی کۆچی مانگی)

٤- فەرمانی ڕاگەیشتن بە داخوازی شاهوێردی سووفیانلوو بۆ عاشوورخان[٢٧٤] ئەفشار حاکمی ئبیورد. (٢٩ری ڕەجەبی ١١٥٠ی کۆچی مانگی)

٥- فەرمانی کۆکردنەوەی کەلوپەل و پێداویستی خواردن لە ئازەربایجان بە ناوی شاهۆیردیخانەوە (٢٨ی شەوال ١١٥٥ی کۆچی مانگی)

وەك دەزانین هێز و سوپای نادر پێکهاتێك بوو لە سەربازە ئازا و لێهاتووەکانی کوردی خوراسان و عەشیرەتی ئەفشاری دانیشتووی جەلایر و کەلات و دەرەگەز. موحەممەدکازم لە عالەمئارادا بە جوانی نووسیویەتی کە هەر عەشیرەتێك چەند سەربازی داوە، بەڵام لە فەرمانەکانی نادردا بۆمان دەردەکەوێ کە کوردەکان تا چ ڕادەیێك ئازایەتی و تواناییان لە خۆوە پیشان داوە و چیبیان کردووە. ئەمن زۆر سپاسی بەڕێز لاڕودی دەکەم کە توانیویەتی بەشێك لەم فەرمانە لە کتێبەکەی خۆیدا کۆ بکاتەوە[٢٧٥] و لە فەوتان ڕزگاریان بکات.

ئێمە ئەو بەڵگەیەی کە سەبارەت بە سەرکردە و قەیخاکانی سووفیانلووە و لەوێ نووسراوە لێرەدا نوسیمانەوە:

((هو))

((بسم‌الله الرحمن الرحیم))

مۆری نادرشا لە سەرەوە: بسم‌الله

---

٢٧٤- عاشورخان پاپالووی ئەفشار زۆر دژی نادرشا بووە کە هاوڕێ جەعفەر قولیخانی کورد شادلوودا زۆر دژ بە نادر شەڕیان کردووە، بەڵام دوای کوژرانی جەعفەر قولی ئەویش خۆی ئەدات بە دەستەوە و نادر دەیکات بە سەرۆکی حکومەتی ئبیورد.

٢٧٥- بەڕێز لاروودی سپاسی ئەکەم. پیاوانەی کردووە کە بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکان یارمەییان داوە کە بریتی بوون لە: حەبیب شێخوانلوو، ڕەحمانبەیگی کورد لایینی، ئیسماعیل بەیگ (لە بنەماڵەی ئیسماعیل کورت)، حەسەنبەیگ جەلایر، موحەممەدبەیگ جەلایر، سەید ئەبولقاسم مووسەوی حسەینی.

نگیـن دولت و دیـن رِفته بود چون از جا   بـه نـام نـادر ایـران قـرارداد خـدا

لەو ڕۆژەوە نووسەری ئەم نامەیە واتـا میـرزاموحەمـمەد مێهـدی نووسـەری خەبووشـان کەوتۆتە بەر بارانی ڕەحم و بەزەیی پاشای پاشاکان (نادرشا)وە و دەنووسێت. بە فەرمانی پاشا عەشیـرەتی سووفیانلوو بۆ ٦ کەسیان حقوق دابیـن بکرێت کە بەم چەشنەیە:

شـاهوێردیبـەیگ سـووفیانلوو، یووسـفـخـان سـووفیانلوو، بێهبوودعـەلی سـووفیانلوو، یەعقووب سووفیانلوو، قادر سووفیانلوو و بەیگ دەردی(؟) سوفیانلوو.

١٨ ی زیقەعدەی ١١٤٨[٢٧٦]

ئەم فەرمانی قەیـخاییەش بۆ شاهوێردی بەیگ سووفیانلوو دەرچووە:

(اعوذبالله تعالی- فەرمانی پاشا)[٢٧٧]

ئەو کەسەی لە بەر ڕەحم و بەزەیی پاشا کەوتووە شاهوێردی بەیگی سـووفیانلووە کـە لـە شەش مانگی یەکەمی ئەمسالّەوە دەکرێتـە قەیـخای عەشیـرەت و جـەماوەری سـووفیانلوو. نـاوبراو دەبـێ زۆر کاروبـار و بارودۆخەکـە بـە جـوانی بـە ئەنـجام بگەیـەنێ، هـەروەها دەبـێ عەشیـرەتی سووفیانلووش گوێ بدەن بەم پیاوە و بە فەرمانی بکەن[٢٧٨].

١٧ی جیمادیولئەوەڵ ١١٥٠ی کۆچی مانگی

فەرمانی کۆکردەنەوەی ئارد و گەنـم لە ناوچەی شیـرخانی باشووری قەفقاز بۆ شاهوێردی بەیگ سووفیانلوو

بسم‌الله

نگیـن دولت و دیـن رِفته بود چون از جا   بـه نـام نـادر ایـران قـرارداد خـدا

(العلمُ عندالله- پاشا بە دروستی زانیوە). وەك چلۆن شاهوێردیخان کەوتۆتە بەر بارانی

---

٢٧٦- ژیانی نادری کوری شمشێربەیگ.

٢٧٧- بە داخەوە بەڕێز قەدووسی هەر وەکو لارووەی دەقی تەواوی بەڵگەکەی نەهێناوەتەوە. زۆربەی ئەم بەڵگانە هێشتا هەر لە بەردستی کوردەکانی خوراسان دایە، بەڵام ئێزن بە کەس نادەن ببێنێ!

٢٧٨- نادرنامەی قەدووسی، ل ٥٤١.

ڕەحم و بەزەی پاشاوە ئێستاش دەبێ بزانێ کە ئەم نامەی کە من نوسیوومە بۆ پاشام خوێندۆتەوە و پاشاش فەرمویەتی بۆچی ئەوەندە درەنگی کردووە و ئارد و گەنمەکانی بەڕێ نەکردووە و هەروەها بۆچی نەهاتووی ڕای بگەیەنی دوو هەزار بار لە «ئاقسوویقیان» دایە و بارەکەی «سوورساتچ»یش ئامادەیە. هەروەها میرزاکانی سوورسات نووسیوویانە کە ٢٠٠ خەروار بار ئارد ئامادەیە و بە تایبەت ٢٧٠ خەروار ئاردیان لە خەڵك ئەستاندووە. دەی ئێمە ٧٠ خەرواری وەرناگرین، بەڵام خێرا پاشماوەکەی کۆبکەوە و بیهێنە بارەگای پاشا و ئەو میرزایانەش کە ئەو ٧٠ خەروارەیان پێ دەدرێت دەبێ کاریان بە کاری عەلیمەردانخانەوە نەبێت. لە ئاکامدا دەڵێم ٢٥٠٠ خەروار گەنم لە لانی تۆیە و ٥٠٠ خەروار ئاردیش لە لای حاجی سەیفودینخان و بێهبود بەیگ و نەزەرعەلی بەیگ دایە کە لە سەر تۆیە خێرا کۆی بدەیتەوە و ڕاسپێری بکەی.[٢٧٩]

٢٨ی شەوالی ١١٥٥ی کۆچی مانگی

چەند بەڵگەییێکیتریش سەبارەت بە خەڵکی کەلات و ئبیورد و لایین هەیە کە چەند خاڵی گرنگی تێدایە و لە بواری مێژوویییەوە زۆر بەکاردێن و ئەم بەڵگانەم لە بەڕێز حاجی زولفەقار جەلایر وەرگرت کە هەر لێرەوە سپاسی دەکەم.

ئێستا بەڵگەی برێك لە زەوینە کشتوکاڵیەکانی ئبیورد کە پێشتر تایبەتی کوردەکانی شێخوانلوو بووە و دوایی ڕووسیەکان داگیریان کردووە و بەشێکیتری کە ماتەوە دەسەڵاتدارانی ئێران داگیریان کردووە بەم چەشنەیە.

نووسینی ئەم بەڵگەیە لە بەر ئەوە بوو کە ٤ بەشی لە زەوینەکانی شوورابە کە مولکی ئەفراسیاببەیگ و مورتزابەیگ و بنەماڵەکەی فوولادبەیگ ئاقایە[٢٨٠]. چوار بەشی ئەم زەوینە لە خاکی ئبیورددایە و لە چوار دەورەوە دەگاتە شوورابەی ورد، حەدی باخچەشمە، کەلات و تەکیە عەبدی و کەرناباد کە بە هەموو بار و زەوینەوە لە بەرانبەری ٣ تمەن و ٥ هەزار دینارەوە فرۆشراوە بە حسێنخان ئاقا، نەقدعەلی ئاقا، مەولانا ئەڵلاوێردی و کوڕەکانی

---

٢٧٩- نادرنامەی قەدووسی، ل ٥٦١.

٢٨٠- نەقەد عەلی خۆی ٥٢ ساڵی دوایی مردووە.

خوالێخۆشبوو زولفەقار ئاقای شێخوانلوو کە ئەم پارەیە دەبێ لە ماوەی ٣ساڵدا لە لایەن کڕیارەوە بدرێت بە فرۆشیار.

١٧ جیمادیوسانی ١٠٨٨ی کۆچی مانگی

خواری بەڵگەکە بە مۆری ئەفراسیابی کوڕی فوولاد و مورتزاقولی مۆر کراوە.

هەروەها خواری بەڵگەکەش دووبارە بە ئیمزای موحەممەدحسەین ماشك و شەهادەت عەوەزی کوڕی ئەڵلاوێردیخان دانیشتووی کولووجوو گەیشتووە.

سوڵتانعەلی کوڕی سوحبەتقولی شایەتی ئەم کڕین و فرۆشە بووە.[281]

بەڵگەیێکیتر کە تایبەتە بە مستەفای شێخوانلوو. ناوبراو بەشێك لە ناوچەی ئبیورد کە ساڵی ١١٣٢ی کۆچی مولکی خۆی بووە و دوای ٢٠ ساڵ کار و تێکۆشانی لە سەر ئەو زەوینانە نادرموحەممەد عەرەب گوتوویەتی ئەم زەوینانە مولکی منە، بۆیە پیاوە گەورەکانی کورد و ئەفشار شایەتیان لە سەر ئەوە داوە کە مولکی مستەفایە و پەراوێزی بەڵگەکەشیان بۆی ئیمزا و مۆر کردووە، بەڵام خۆیندنەوەی زۆر سەخڵەتە. وایش بزانم «نایبوسەڵتەنە» نووسراوە و ئەمەش دەقی بەڵگەکەیە:

دەبێ بە هەموانی ڕابگەیەنین کە تاقمێك لە پیاوە گەورەکانی ناوچەی ئبیورد کە ناویان لەم نامیلکەیەدا هاتووە، شایەتیان لە سەر ئەوە داوە کە بە ماوەی ٢٠ ساڵ مستەفا شێخوانلوو مالکی ئەم زەوینانەیە کە ئەم زوینە لە تەنشتی مولکی مەلایەعقووب چەشمە کوندە و دەربەنی سپی و زەوینە دەیمیەکانی سەنگەرئەوریانی و لە لایێکیتریشەوە دەگاتەوە دۆڵەکەی یادگار گاوشانلوو، بەڵام موحەممەد عەرەب ئەسکەندەری بە بێ هیچ بەڵگەیێك دەیەوێ ئەم مولکەی لێ داگیر بکات و ئێمەش ئەم شایەتیەمان داوە تاکو خودا و پێغەمبەرمان لێ ڕازی بێت.

مانگی جیمادیوسانی ساڵی ١١٣٢ی کوچی مانگی

---

٢٨١- موحەممەد فازڵ کوڕی خوالێخۆشبوو میرسوبحان عەرەب ئەسکەندەری بوو لە بەڵگەیێکیتردا کە ڕێکەوتی ساڵی ١١٤١ی کۆچی لەسەر مولکێك دەفرۆشێ بە نەدرخان کوڕی خوالێخۆشبوو نەقدعەلی شێخوانلوو.

ئەوانەی کە ئیمزایان لە سەری داناوە پیاوە گەورەکانی کورد و ئەفشارن کە لە پەراوێزەوە مۆریان کردووە و ناوبراوان بریتین لە: موحەممەد دانیشتووی ئبیورد، ئەوتار بەیگ ئەفشار، تالوونخان کوڕی خوالێخۆش بوو میرزایەعقووب، موحەممەدکەریمخان یووزباشی، موحەممەد قولیبەیگ قرخلوو، موحەممەد قەنبەربیاری و قەلەندەر بەیگ ئەڵلائوغلی. (پێم وایە) ڕۆستەمبەیگ و ئیسماعیلقولیبەیگ، تەیموربەیگ، سوڵتان وەلی ئبیوردی، گدایعەلی ئەفشار.

بەڵگەیێکیترمان بە دەستەوەیە کە سەبارەت بە کەژ و کێوەکانی هەزار مەسجدە و پێم وایە مولکی شاهوێردییە. ناوبراو لە شەڕەکانی نادردا خزمەتی زۆری کردووە و بۆیە پەنای بردۆتە نادر و نادریش چون زۆر خۆشی ویستووە خێرا کارەکەی بۆی جێبەجێ کردووە.

## بۆ گەورە پیاوی ئێران بم بە ساقەی

دەبێ بە بەڕێزتی ڕابگەیەنم کە ئەمن غولامی دەرگانەی تۆ شاهوێردی سووفیانلووم و دەبێ ڕاستییێکت پێ بڵێم و ئەویش ئەوەیە کە چەند مولکێکم لە زەوینەکانی هەزارمەسجد هەیە و جێگا و لەوەڕگای مەڕەکانی منە و ئێستا چەند کەسێك دەیانەوێ داگیری بکەن و ئەمیش داواکارم فەرمانێك بۆ ئەم داخوازیەم بفەرموون.

لە پەراوێزی نامەکەدا پێم وایە میرزامێهدیخان وڵامی داوەتەوە و نووسیویەتی:

پیاوی مەزنی مەشهەدی! ئاگاردار بە! ئەم مولکە مولکی کەسێکە کە لە شەرع و یاساوە مالکیەتی و کەسیتر ناتوانێ داواکاری ئەم زەوینە بێت.

١١ی ڕەمەزان ١١٥٣ی کۆچی مانگی

بەڵگەیێکی دیکە سەبارەت بە ئاوی ڕۆخانەی کەلات کە شەریکی ئێران و ڕووسیەیە:

وەك گوتمان بە بۆنەی ڕێکەوتنامەی نالەباری ئاخاڵەوە خوالێخۆش ئەرفەعودەوڵە گوتوویەتی نابێ خەڵکی کەلات لەم ڕادە بەولاوە برنج دروست بکەن، تاکو ئاوی ڕۆخانە بە بێ کەم و کوسپێك بگاتە ڕووسیە؟

وا بزانم ئەم فەرمانە لە لایەن موحەممەدتەقی میرزای ڕوکنودەولەی برای ناسرەدین شاوە کە والی خوراسان بوو درابێتە ئەکبەر بەیگی لایین.

ئەمەش دەقی فەرمانەکە:

بۆ پیاوی پایەبەرز و بەڕێز ئەکبەرخان والی لایین نووسراوە، کە دەبێ ناوبراو ئاگادار بێ ئاوی ڕۆخانەی لایین کە بڕیار دراوە لایینیەکان بەو ئەندازەی کە ئەمسال دانەیان وەشاندووە لە ئاوی ڕۆخانەکە کەڵك وەربگرن تاکو پاشماوەی ئاوەکە بگاتە ئبیورد و ئەوانیش کەڵك لەو ئاوە بگرن و دەبێ کەس پشت لەم فەرمانە هەڵنەکات. گەورە پیاوی خوراسان بێهبودخان[282] فەرمانڕەوای کەلات دەقی هەواڵەکەتان پێ ڕادەگەیەنێ.

مانگی ڕەبیعوسانی ١٣١١ کۆچی مانگی

لە پەراوێزی فەرمانەکەوە نووسراوە:

هەروەها بە ئاگاداری ئێوە دەگەیەنین کە لە ٥ یان ٦ خەروار شەڵتووکی برنج زیاتر نابێ لە کەلاتدا بووەشێنن تاکو ئاوەکە بگاتە ئبیوردیش[283].

هەروەها بەڵگەییێکیترمان لە خەڵکی لایین بە دەستەوەیە کە بە مۆری نەجدوسەڵتەنەی والی خوراسان گەیشتووە و کوڕی خوالێخۆشبوو ئاخوندزادەی خوراسانیش مۆری کردووە.

هەر وەك لە دەقەکەدا دیارە دەسەڵاتدارەکانی ئەو کاتە زۆر زڵمیان لە خەڵك کردووە و بە هەموو شێوەییێك لە ڕێگەی ماڵیاتەوە ڕووتیانیان کردۆتەوە. لایینیەکان پەنایان بردۆتە ئەمین دەفتەر تاکو ئەو ببێتە قازی و بڵێ زەوینەکانی لایین کە ڕووسەکان بەجێیان هێشتووە مولکی کێیە، ئەمین دەفتەر بیروڕای خۆی لەم بارەوە دەربڕیوە و نەجدوسەڵتەنەش مۆری لە سەر کردووە و دوایی موحەممەد کوڕی موحەممەد کازم (ناسراو بە ئاقازادە کە کوڕی ئاخوندزادەی خوراسانی بوو) ئەو نامە و بەڵگەیە دیوە و مۆری لەسەر داناوە.

بۆ پایەبەرز و هێژا بەڕێز ئەمین دەفتەر (خوازاوەستاوی بکات).

---

٢٨٢- بەڵگە تایبەتە بە حاجی زولفەقار جەلایر و هەر وەها سەبت کردنی بەڵگە لە ڕووشوێندا مۆر کراوە.

٢٨٣- سەرۆکی لەشکەری ڕۆژهەڵات لەم کاتەدا حسەین خوراعی بوو.

دەبێ بە شێوەی ڕابگەیەنم کە ماوەیێکە فەرمانڕەوا و ئەمیری خوراسان تەواوی زەوینەکانی ئێمەی کردۆتە زەوینی دەوڵەتی و بۆیە ئێمەش چەند جار ئەم کارەمان ڕاپۆرت داوەتە تاران، کەچی لە ئاکامدا وەفدێك لە تارانەوە بۆ شیکردنەوەی داخوازیەکەی ئێمە گەیشتنە ناوچەکە و لە ڕێکەوتی ٢١ی ڕەبیعوسانی ١٣٤٠ی کۆچی مانگیدا ئەم وەفدە و بەڕێز ئەمجەد ئاقای نەجدوسەڵتەنە و نوێنەرانی دایرەی ئەیالەتی و لەشکەری ڕۆژهەڵات دوای چەند ڕۆژ باس و لێدوان بەو ئاکامە گەیشتن کە ئەم زەوینانە مولکی دەوڵەتی نییە و تایبەتە بە ئێمە و جا لەبەر ئەوەی بەڕێزیشت بە تەواوی ئاگاداری مولکەکانی خوراسانی، داواکاریین لە پەراوێزدا خۆت ڕاستیەکان بدرکێنە.

ئەمین دەفتەر لە پەراوێزدا نووسیویەتی: ئەم زەوینانە تایبەت بە خەڵکی لایینە کە لە سەردەمی دابەشبوونی ئەم ناوچە لە نێوان ئێران و ڕووسدا ئیزن نەدراوە کشتوکاڵی تێدا بکرێ و ئێستا چەند ساڵێك دەبێ لە لایەن خەڵکی لایینەوە دەکێڵدرێت.

٢ی جودەی ئیتئیل ١٣٠١ی کۆچی مانگی

ئیمزای ئەمین دەفتەر

نەجدوسەڵتەنە دوای کوژرانی کولۆنێل پسیان بە ماوەی چەند مانگ دەبێتە والی خوراسان و لەم کاتەدا سەبارەت بەم باسە نووسیوویەتی: هەروەك بەڕێز ئەمین دەفتەر نووسیویەتی ئەم مولکە، مولکی خەڵکی لایینە.

مەلای بەنابانگی ئەو کاتەی خوراسان واتا ئاقازادەی کوڕی ئاخوندزادەش نووسیوویەتی زۆر جوان ئاشکرا و ڕوونە کە ئەم زەوینگەلە هەر وەکو چلۆن نەجدوسەڵتەنە و ئەمین دەفتەر گوتوویانە مولکی تایبەتی خەڵکی لایینە.

موحەممەد کوڕی موحەممەدکازم[284] (مۆر

٢٨٤- موحەممەدی کوڕی کازم کە سەرۆکی ئایینی خوراسان بوو و کوڕی خوالێخۆشبوو ئاخوند خوراسان بوو و پێیان دەگوت ئاقازادە و دوایی لە بەندیخانەی ڕەزاشادا مردوە (١٣١٦ی کۆچی هەتاوی) ڕاپەڕین گەوهەرشاد، سینا واحێد، ل ٧٧.

دەبێ ئەمەش بڵێین کە هەر سەبارەت بەم باسە لە تارانەوە تەلگرافێك کراوە بۆ مەشهەد و لەو تەلگرافەدا داوا کراوە لە والی خوراسان تاکو داوا بکات لەو وەفدەی کە ڕاسپێری مەشهەد کراون ڕاستیەکە بخەنە ڕوو.

ئەمیرلەشکەر خوزاعیش تەلگرافێکی بۆ خەڵکی لایین ناردووە و داوای کردووە لێیان تاکو لەم کۆبوونەوەدا بەشداری بکەن.

## شەڕی کورد و تورکمانەکان لە کەلاتی نادریدا

پێش ئەوەی ڕووسەکان ناوچەکانی باکووری خوراسان داگیر بکەن، تورکمانەکان زۆر جار سنوورەکانی ئەم ناوچەیانە داوەتە بەرەلاماری خۆیان، کەچی ناوچەکانی کەلات و دەرەگەز زۆرترین خەساری بە خۆیەوە بینیوە. بەڕێز لاروودی لە بەشی کۆتایی کتێبەکەیدا باسی شەڕی کوردەکانی کەلات و تورکمانەکانی کردووە و گوتوویەتی کاتێ کە تورکمانەکان پەلاماری ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئێرانیان داوە، کوردەکان بوونەتە لەمپەری ڕێگایان. ئەم نووسەرە باسی بەسەرهاتی ئەم شەڕانەی لە زمانی بەساڵاچووەکانی ناوچەکەوە نووسیوە. ئەم داستان و بەسەرهاتانە یادگاری شەڕ و پێکدادانە مەزنەکانی کوردە سنوورنشینەکانە کە دژ بە جەردە و هەوچیەکانی تورکستان وەستاون و چەندین ساڵ نێوانیان خۆش نەبووە. دەبێ بڵێین ئەم کارەسات و بەسەرهاتە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاش کوژرانی نادرشای ئەفشار. ئەم تورکە بێبەزییانە کاتێ پەلاماریان داوە زۆر جار وابووە کە چەندین گوند و لادێیان ئاگر داوە و ژن و منداڵی خەڵکەکەشیان بە دیلی گرتووە.

کوردە بە ساڵاچووەکان ئێستاش ئەم کارەساتە دڵتەزێنەیان لە بیرماوە، بەڵام سەربەست و دڵنیان و دەزانن کە ئیتر قاڵی ئەو تورکمانانە بڕاوەتەوە و هێرش ناهێننە سەریان. لە نێوان کوردەکانی ئەو ناوچەیەدا عەشیرەتەکانی شێخوانلوو و سووفیانلوو زۆرتر لە هەموان ئازەیەتیان لە خۆوە پیشان داوە و ئێستاش لە بەناوبانگترین کوردەکانی کەلاتن.

لە جەماوەردا کوردەکانی تورکستان خەڵکێکی دز و جەردەن و ژیانیان بە ئاژەڵداری و

مەڕ و بزنەوە بەسەربردووە. کەمتر گەنمیان وەشاندووە و زۆر جار نانی ساڵانەی خۆیانیان دابین نەکردووە و بۆیە زۆر کەوتونەتە بیری دزی و جەردەگەری و زۆربەی هێرشەکانیان بە خێراییەوە بووە[٢٨٥].

ناوەندی ئەم شەڕانەش زۆرتر ناوچەکانی نێوان سەرەخس تا نزدیکی زەریای خەزەر و دەشتی گورگان بووە کە سەرانسەری خاکی کەلات لە ناوەندی ئەم شەڕانەدا بووە.

**هێزەکانی شەڕ:** تورکمانەکان زۆربەی هێرشەکانیان بە ٣٠٠ سوارە و زۆر جاریش بە ٨٠٠ سەربازەوە بووە. ئەم تورکمانانە بە سەرکردایەتی تورکمانێکەوە بە ناوی «بای» کە لە پێشەنگی سوپاکەوە بووە شەڕیان کردووە، ئەم سەرکردەیە کڵاوی پەشمی لە سەر ناوە کە ئەو کڵاوە قژی درێژ و سپی بۆ تەرخان کرابوو و هەر وەها ڕەنگی کڵاوەکەش ئەرخەوانی بوو و جلوبەرگی سووریشی لە بەر کردووە. تورکمانەکان ئەوەندە ڕێزیان بۆ فەرماندەکەی خۆیان داناوە کە ئەگەر هەر فەرمانێکی پێیان بدایات خێرا جێبەجێ دەکرا، فەرماندەش خۆی پیاوێکی ئازا و دلێر بوو و لە هیچ شتێك نەترساوە و بۆ سەربازەکان ئەم جۆرە سەرکردانە حوکمی ئاڵای بووە و هەوڵیان داوە بە هیچ شێوەیێك نەهێڵن گەزندی پیش بگات.

کوردەکانی ئێرانیش کە جگە لە کشتی گەنم و ئاژەڵداری و ژیانی فەلایی چی‌تریان نەزانیوە و هاوکات لاوە کوردەکان لاوانێکی زۆر ئازا و دلێر بوون و هەموویان وەکو برادەر وەها بوون و هەر کاتێ دوژمن هێرشی بکردبایاتە گوندێك، هەموان خۆیانیان دەڕازاندەوە و دەچوونە مەیدانی شەڕانخێزەوە.

لاوە کوردەکان زۆرتر پیاو پیادە بوون و لەبەر ئەوەی شەڕ لە کوێستانە هەرداوهەردەکاندا بۆ پیاو پیادە ئاساییتر بوو تاکو سوارە. بەڵام لە بەر ئەوەی دوژمن خاوەنی ئەسپی ئازا بوو، کەمتر پێش دەهات کوردەکان دەستیان پێیان بگات. چەکی دوژمن، بریتی بوو لە شمشێر، نەیزە، تفەنگ و خنجەر، بەڵام کوردەکانی ئێران تفەنگی شاهسوونیان هەبووە و ئەم چەکانە سەرەنێزەی لە سەر بووە و لە شەڕە تەنێبەتەنێکاندا نێزەکەیان کردۆتە سك دوژمندا و هەڵیان

---

٢٨٥– لە ڕاستیدا ئەوان وەکو شەتیان بوون و تریاکیان بە ئەسپەکانیان داوە تاکو زۆر توندوتێژ بن، بۆیە سەرکەوتوون.

دڕیوە و لە کاتی تیرهاویشتنیشدا سەرەنێزەکەیان دەرهانیوە و تیریان هاویشتووە.

ئێستا بزانین داستانی شەڕە گەورەکانی کەلات بە چ شێوەیێك بووە.

سەرەتای داستانەکان:

١-داستانی تەخت کوشتار: هاوینی ساڵی ١١٦٣ی کۆچی مانگی ٣٥٠ کەس لە تورکمانەکان بە سواری لە قووپانەوە(؟) کە یەکێ لە گوندەکانی تورکستانی باشووریە بە بیانووی تاڵانکردنی لاییـن و خاکستەرەوە هێرش دەهێنن. سوارە تورکمانیەکان کە سەرتا پایان هەر چەك بووە لە سەر ئەسپی هەرەچاکیش دانیشتوون و لە پێشەنگی ئەم هێزەوە چەند سوارەییێك بۆ دیدەوانی پێشکەوتوون و هەر وەکو زنجیرێك لەگەڵ فەرماندەکەیاندا پێوەندییان هەبووە.

شوانەکان و مەڕەکانیان کە لە دەرەوەی گوندەوە بوون، خێرا هەواڵی هاتنی دوژمنیان گەیاندووەتەوە و ئەوانیش خێرا دەستیان لە کار کێشاوە و هاتوونەتە مەیدانی شەڕانـخێزەوە. هاوکات لاوێك لە کوردەکانی خاکستەری بووەتە فەرماندەی شەڕ و فەرمانی داوە تاکو لە هێڵی زنجیرەکەوە بە ئەهوەنی بە بێئەوەی دوژمن ئاگادار بێ هێرش ببەن. کەچی کوردەکان بە یەك ئیشارەت هەموویان تفەنگیان کێشاوە و تیریان هاویشتووە و لە یەك ئاندا چەند کەسیان لە تورکمانەکان کوشتووە. تورکمانەکان بە دیتنی ئەم کارەساتە هەڕا دەکەن. کوردەکان جارێکیتر تەقە دەکەن و لەم دوو تەقەدا ٤٥ سەرباز تورکمانەکان دەکوژرێت و ١٨ ئەسپیش بریندار دەبێت و هاوکات کوردەکان بچووکترین زیانێك نابینن.

سوارە تورکمەنەکان لە نێوان شەقامەکانەوە و کوردەکان لە سەر شاخەکانەوە تا نزیکی یەك فرسەخ بە دەم شەڕەوە ڕۆیشتنە پێشەوە و کاتێ تورکمانەکان گەیشتنە دەشتی بچووکی بیروونددەرە لە ئەسپەکان دابەزین و خۆیانیان گەیاندە سەر لوتکە و شاخەکان. لەو جێگەدا کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ «تەختکوشتار» لاوەکانی خاکستەر دەستیان لە شەڕ هەڵگرتووە و چاوەڕوانی یارمەتی دانیشتوون. هاوکات تورکمانەکان لە تەپۆڵکەکاندا سەرکەوتوون و کوردەکانیان داوەتە بەر تەقە و ٤ دەستە لە تورکمانەکان کوردەکانیان گەمارۆ داوە و زۆربەی لاوەکانیان دەسگیر کردووە و سەرکردەکەیان بەو لاوانەی گوتووە خێرا چەکەکانتان فرێ بدەن

ئەگینا هەمووتان دەکوژین. لاوە کوردەکانیش کە هیچیان پێ نەدەکرا، بە بێ‌هیچ شەڕ و پێکدادانێك چەکیان فڕێ داوە و تەسلیم بوون و تورکمانەکان خێرا هەموویان بەستووەتە یەکەوە و لە تەپەکە هێناویانیانە خوارەوە و لە هەراوەکەدا لاوەکانیان لە ڕووی عەرز درێژ کردۆتەوە و زۆریان لێیان داوە تا ڕادەیێك کە هەمووی گیانیان زامدار بووە و هاوکات تورکمانەکان چەقۆیان دەرهێناوە و سەری ئەو لاوە بێ‌سووچە کوردانەیان بڕیوە. ئەمەش بڵێم کە تورکمانەکان بە ئەمەیشەوە دەستیان هەڵنەگرتووە، تەرمی ئەو لاوانەیان کوت کوت کردۆتەوە. خەڵکی لاییـن و خاکستەر بە خێراییێکی زۆرەوە سوار و پیادە بەرەو تەخت کوشتار هاتوون و لە بەر ئەوەی تورکمانەکان توانای شەڕیان نەبووە بەرەو تورکستان ڕایانکردووە.

هەر لە تەختکوشتاردا دایك و باب و بنەماڵەی ئەو لاوە خوێنڕژاوانە کۆ بوونەتەوە و تەرمی ئەنجن ئەنجنی منداڵەکانیان بە خاك سپاردووە. ئەو لاوانە زۆربەیان خزم بوون و تەمەنیان لە نێوان ٢٠ تا ٣٠ ساڵدا بووە. تاقمێکشیان تازەزاوا بوون[٢٨٦]. تا ئەمڕۆ کە ١٦٠ ساڵ لەو بەسەرهاتە دڵتەزێنە تێپەڕیوە، گەلی کورد هەر بە یادی دەکەنەوە و بۆ خۆیان سروودێکیان دروست کردووە و هەموو کاتێ دەیخوێننەوە ﴿کە نووسەر شیعری کوردی سروودەکەی نەنووسیوە و ئەمنیش (وەرگێڕ) کوردییەکەیم وەدەست نەکەوت، بۆیە وەرگێڕاوی فارسیەکەیم بە کوردی نەنووسیەوە.﴾

ئەم کارەساتە بۆ خەڵکی ناوچەکە زۆر دڵتەزێن بوو و بۆیە کوردەکان هەر لەو هەراوەدا کە لەو ڕۆژە بە دواوە بە ناوی «تەخت کوشتار» ناوبانگی دەرکرد، سوێندیان بۆ یەکتر خوارد کە هەر یەکیان ئەگەر تورکمانێکی بینی یان ئەوەندە لەگەڵیا شەڕ بکات کە بیکوژێ یان دەبێ خۆی بکوژرێت.

---

٢٨٦– سەرتاسەری سنوورەکانی خوراسان پڕە لە ئێسقانی ئەم شەهیدە بێ‌ناو و نیشانە کوردانەوە کە لە مووسیقی کوردی خوراساندا بە تایبەت لە ئاهەنگی «ئەڵڵامەزارە»دا ڕەنگی داوەتەوە.

## ٢- کوژرانی نیازباتری تورکمەن بە دەستی ئیسماعیل کورت

دوو ساڵ دوای تێپەڕبوونی کارەساتی «تـەخت کوشـتار» بـۆ دووەم جـار سـاڵی ١١٦٥ی هەتاوی ٥٠٠ کەس لـە سـوارە تورکمانـەکان بـە سـەرکردایەتی نیازبـاترەوە کـە پیـاوێکی زۆر خوێنرێژ بوو لە ناوچەی تەژەنەوە[٢٨٧] پەلاماری گوندەکانی لایینیان داوە و کاتێ کـە کوردەکـان لاوێکیان لەگەڵدا بووە بە ناوی ئیسماعیل کورت کە کوڕێکی لێهاتوو و کەڵەگەت و باڵابەرز و بەهێز بووە. ڕۆژێك ناوبراو خەریکی درەو دەبێ و لە ناکاو چاوی بـە شـوانێك دەکـەوی کـە بـە شـیوەیێکی سەرلێشێواوانە لـە تەپۆڵکەکـەوە هەڵـدەهات و ئیـسماعیل بـۆی دەرکـەوت کـە تورکمانەکان هێرشیان هێناوە و بەرەو ئەو شوێنەی کە شوانەکە ڕایـدەکرد ڕۆیـشت و پرسیاری کرد چی بووە؟

شوان هاوکات کە ڕای دەکرد لە وڵامـدا وتـی: «ترمـان هـاتن، ترمـان هـاتن»[٢٨٨] و ئیتـر ڕانەوەستا و هەر هەڕای دەکرد، تاکو هەواڵ ببات بۆ خەڵکی لاییـن. ئیسماعیل کە هەموو کاتێ چەکی لەلا بووە خزاوەتە پشتی بەردێکەوە، چەکەکەی خستۆتە سـەر تیـر و چـاوەڕوان ماوەتـەوە تـاکو بتوانـێ سـەرکردەی تورکمانـەکان بداتـە بـەر تیـر و بیکـوژێ، بـە نزیـك بوونـەوەی سـوارە تورکمانەکان ئیسماعیل بۆی دەردەکەوی کە سەرکردەی ئەوان باترە و سـواری ئەسـپێکی سـپیە و خۆیشی کڵاوێکی گەورەی تورکمانی لە سەر ناوە لە پێشەنگی سپاکەوە بەرەو گۆڕسـتانی مـەرگ دێتە پێشەوە. کورت ئیسماعیل خێرا سینەی نیاز باتر دەگرێتە نیشانە و بە بێخەتا و ماتڵ بـوون تەقە دەکا و نیاز باتر لە ئەسپەکەی خاو دەکاتەوە، بەڵام کاتێ کە دەبینێ ئەسپ هەر بەرەو پێش دێت، ئەسپەکەش دەکوژێت. تورکمانەکان بە دیتینی ئەم کارەساتە هەموویان بەرەو تەژەن دەرباز دەبن و بۆ ماوەیێکی زۆر ئیتـر دڵی ئەوەیان نامێنێ هێرش بهێنن.

---

٢٨٧- تەژەن کە عەرەبیەکەی تەجەنە و کوردیەکەی «تیجان» و کەچی ناوچەیێکە لە باکووری سەرەخس و باکووری کەلاتدا کە ئێستا لە دەستی ڕووسیەوەیە. زۆربەی شەڕەکانی نێوان ئێران و تووران بـە تایبـەت شەڕی یازردە لە تەنیشتی تەژندا ڕووی داوە.

٢٨٨- کوردەکان بە تورکمانەکانیان گوتووە «ترمان».

## تۆڵەکردنەوەی کوژراوەکانی تەختکوشتار
## لە لایەن ئیسماعیل کورتەوە

خوا ئەزانێ ئەگەر ئەو ڕۆژە ئیسماعیل کورت نەبوایات تورکمانەکان چییان بە سەر کوردەکان دەردەهانی. کوژرانی نیازباتر کە یەکێ لە ناوبانگترین سەرکردە تورکمانەکان بوو، بوو بە هۆی ئەوەی ناوی ئیسماعیل بکەوێتەوە سەر زاری هەموان، ئیسماعیل بە کوشتنی نیازباتر قەناعەتی نەکرد و بیری لەوە دەکردەوە دەبێ تۆڵەی ئەو هەموو لاوە کوردە بێسووچ و بێتاوانانەی کە لە تەختی کوشتاردا کوژران بکاتەوە، بۆیە زۆربەی شەوان بە تەنیا دەڕۆیشت بۆ تورکستان و هەر کەسێکی بدیبایات دەیکوشت و بەیانیان دەگەیشتەوە لایین. ئیسماعیل وەها کارێکی کردبوو کە زۆربەی تورکمانەکان لە ترسی ئەودا ناوچەکەیان بەجێهێشت و بۆ شوێنێکیتر دەڕۆیشتن. هەروەها ژنە تورکمانەکان هەر کاتێ بیانویستبایات منداڵەکانیان بترسێنن دەیانگوت: «مەگری مەگری ئیسماعیل دێت.» ئیسماعیل سەری تورکمانەکانی دەنارده خوراسان و بۆ هەر سەرێکی بڕاو ٣٠ کیلۆ گەنمی وەردەگرت.

## کوژرانی نوێنەرەکانی تورکمەن بە دەستی ئیسماعیل کورت

شەوێکی هاوینی ئیسماعیل کورت دەڕواتە تورکستان و ٥ سوارەی تورکمەن سەر دەبڕێ و ئەو ٥ سەربڕاوە و ئەسپە پڕبایەخەکەی سەرکردەی تورکمانەکان دەهێنێتەوە لایین. دوو ڕۆژ دوایی تورکمانەکان دوو سەربازی سوارەی خۆیان بۆ وەرگرتنەوەی ئەسپەکە ڕاسپێری لایین دەکەن. کاتێ ئەم دوو تورکمانە دێنە لایین و دەبینن ئیسماعیل خۆی لە ماڵ نییە، میرزابەیگی کوڕی کە ئەو کاتە ١٠ ساڵان دەبێ دەیدزن و هەڕادەکەن، کاتێ ئیسماعیل دێتەوە و ڕاستیەکەی بۆ دەردەکەوێ لە قاچاخە ڕێوە دەکەویتە شوێن ئەو دوو تورکمانە و لە خێوەئاوادا ئەو دوو سوارە پەیدا دەکات و دەزانێ چوونەتە ماڵی گەورەی گوندەکەوە. تورکمانەکان دەست و پای میرزابەیگیان بەست بوو و لە سووچێکی ماڵەکەوە دایاننابوو و بە

بێ‌ئەوەی ئاوڕ لە ئەو بدەنەوە خۆیان زۆریان خواردبوو و دوایی نوستبوون.

کاتێ ئیسماعیل گەیشتە ئەوێ شەو لە ئاکامدا بوو و جێگای سمی ئەسپەکانی لە ئەوبەر ڕۆخانەکەوە بینی و بە دوایان کەوت و تا گەیشتە بەر درگای خاوەن ماڵە پڕ میوانەکە و بە ئەهوەنێکەوە خاوەن ماڵەکەی لە خەو هەستاند و پێی گوت: مەڵبەندی تورکمانەکانم پێ پیشان بدە. خاوەن ماڵ کە زۆر ترسابوو بە دەست ئاشیرەتی کرد و گوتی لەوێدان. ئیسماعیل دەچێتە پشتی درگای ماڵەکەوە و لە درزی درگاکەوە بۆ ژوورەکەی ڕوانی و بینی کە تورکمانەکان لە خەو هەستاون و خەریکن جلوبەرگ دەپۆشن و یەکیان بە ئەوی‌تری گوت: ... دووغان! دەزانی بە جوانی توانیمان جگەری ئیسماعیل کەباب بکەین؟ زۆر گران تەواو دەبێ و ئیسماعیل لە ڕێ ناچارییەوە و بۆ بردنەوەی کوڕەکەی دێتە تورکستان و ئێمەش لەوێ دەتوانین خێرا خوێنی بڕژێنین.

* تۆ چەندە هیچ نەزانی، ئیسماعیل زۆر زیرەکتر لەمانەیە.

- یانێ ئیسماعیل نایێتە دوای کوڕەکەیدا؟

* نە، ئیسماعیل ئەم کارە ناکات و جگە لە بردنەوەی کوڕەکەی چەند کەس لە ئێمەش دەکوژێ.

- تۆ چەندە ترسنۆکی، بۆچی ئیسماعیل ڕۆییننتەنە، یان لە ئاسمانەوە هاتووە کە تۆ ئەوەندەی لێ ئەترسی؟

* باشە تۆ باوەڕ مەکە ڕۆژی خۆی پێت دەڵێم کە ئیسماعیل کێیە.

- دەبینم زۆر لە ئیسماعیل دەترسی و ئەمەش بۆ پیاوێکی وەکو تۆ زۆر نالەبارە!

* پێم وایە ڕاست ئەڵێی، بەڵام ئەگەر پێم گەیشت پێی دەڵێم کە من بۆ ئەم کارە ڕازی نەبووم.

- تۆ ئیسماعیلت لە کوێ دیوە؟ دەڵێن زۆر کەڵەگەت و ئازا و زیرەکە و دوو چاوی جوانی هەیە کە پیاو ناتوانێ تیری نیگایان ببێت.

* ڕاستیەکەی ئەوەیە من ئیسماعیلم لە مەشهەددا دیوە و هەروایە کە تۆ دەڵێی و ئێستایش پێت ئەڵێم چاك وایە خێرا ئەم شوێنە بە جێ بهێڵین و دەرباز بین چاکترە.

- تۆ ڕاست دەڵی، کەسێ کە ٧٠ تورکمانی سەر بڕیبێت دەبێت هەر دێوێکی وەکو ئیسماعیل بێت، بڕوانە بۆ چاوانی کوڕەکەی دەڵی چاوی پڵنگە!

* بە ڕاستی تا ئێستا بۆ چاوی ئەم کوڕە بە جوانی نەمڕوانیبوو، تۆ ڕاست دەڵێی لە چاوە سپیەکانی بابی دەچێت.

- من زۆر حەزم لێیە پیاوێکی ئازا وەکو ئیسماعیل ببینم، بەڵام حەزم لێیە بە نوکی شمشێرەوە بڕۆمە دیداریەوە.

لەم کاتەدا هەر دوو تورکمانەکە کە زمانی قسەکردنیان نەما و وابزانم ئیزرائلیان بە چاوی خۆیان بینی و ئیسماعیل لە بەرانبەریانەوە ڕاست بووەوە. میرزا بەیگ بە دیتنی باوکی لە خۆشیان نەیدەزانی چی بکات و هاواری کرد: «بابەگیان خێرا هەردووکیان بێ گیان بکە.» ئیسماعیل تەقەییێکی کرد و یەکیانی کوشت و ئەوەی تریان کە هات لە پەنجەرەکەوە ڕاکات کەوتە بەر چنگی پڕ زۆر هەیبەتی ئیسماعیل و هێنایەوە دواوە... و ئەمە هەر ئەو کەسە بوو کە حەزی دەکرد بە شمشێرەوە بڕواتە پێشوازی ئیسماعیلەوە...

ئیسماعیل پێی گوت ئەمە شمشێر و ئەمەش سینەی من ئەگەر پیاوی خێرا سینەم هەڵبدڕە. ئەو تورکمانە بێچارەیە کە دەیویست بە هەر شێوەیێك دەبێ لە دەستی مەرگەوە دەربچێت شمشێری هەڵگرت و کاتێ ویستی سەری ئیسماعیل بە زەبری شمشێر بهاڕێت، ئیسماعیل خێرا دەستی تورکمانەکەی شکاند و بە کەنینێکی پڕماناوە ئەویشی بێگیان کرد. هێشتا لە لایێندا خۆر نەهاتبووە نیوەی ئاسمان کە خەڵکی لایێن زۆر دڵەخورپەی ئیسماعیلیان بوو ناکاو بینیان ئیسماعیل و کوڕەکەی گەیشتنەوە لایێن. بەڵێ خوێنەرانی هێژا ئەمە بوو بەسەرهاتی قارمانێکی کورد بە ناوی ئیسماعیل کورت.

## بێچوە پڵنگ یان میرزابەیگی کوڕی ئیسماعیل کورت

ئیسماعیل کورت تا ئەو ڕۆژەی زیندوو بوو تورکمانەکان نەیاندەوێرا پەلاماری خاکی

لاییـن بدەن و دوای ٦٠ ساڵ تەمەنی خێر و پیاوانە کۆچی دوایی کرد.[٢٨٩] دوای کۆچـی دوایـی ئیسماعیل میـرزا بەیگی کوڕی کە تەمەنی ٢٥ ساڵان بوو، بوو بە جێگری باوکی، ئـەم کـوڕە لاوەش هەر وەکو باوکی پیاوێکی ئازا و لێهـاتوو بـوو و هـەموو کـەس پێیـان دەگـوت بێـچوە پڵنگ.

کاتێ تورکمانەکان ئاگاداری مردنی ئیسماعیل کورت بوونەوە بە ٤٠٠ سـوارەوە ڕوویـان کردە لاییـن و دەیانویست هەمووی خەڵکی لاییـن بە یەکجارە سەر ببڕن.

هاوکات خەڵکی گوندەکانی لاییـن و خاکستەر ئاگاداری هاتنی دوژمن دەبنەوە و کەچی لە گوندەکان دێنە دەرەوە و دەچنە مەیدانی شەڕانـخێزەوە و لەم کاتەدا میـرزابەیگ سەرکردەت کوردەکان بوو و هێزەکانیشی ٥٠٠ کەس بوون، بەڵام کوردەکان توانای بەربەرەکانێیان نـەبوو و ڕایان کرد، یەکێ لە سەربازەکانی تورکمەن بە دوای گرتنی میـرزابەیگەوە بوو کە میـرزا خێـرا گەڕایەوە و بەردێکی فڕێدا و ئەسپەکەی دا بە عـەرزدا و سەربازەکەی کوشت و لـەم ئـاڵوگۆڕەدا یەکێ لە تورکمانەکان تەقەیێکی کرد و میـرزابەیگی بریندار کرد. کەلەبچەیان کـرد و بردیانـە نێو دۆڵەکەوە، سەرکردە تورکمانەکان کاتێ کە نزیکی میـرزابەیگ دەبوونەوە تێیان هەڵـدەدا و دەیانگوت ئەمەیە بێچووە پڵنگ، دەبێ کارێکی بەسەردا بهێنیـن کە خوێنی وی بکەینە چێژی کوڕەکانـمان، دوایی سەرکردەکەیان فەرمانی دا تاکو برینەکانی ساڕێژ بکـەن و هـاوڕێ لەگـەڵ دوو سەربازە و تورکستانی نارد و گوتی لە نزیکی قەهقەهەدا[٢٩٠] چاوەڕێ بـمێنن.

ئـەو ڕۆژانـە لـە گونـدەکانی لاییـن و خاکـستەرەوە بەشـێکی زۆر لـە سـوارەکان و پیـاو پیادەکـانی کـورد هاتنـە یارمـەتی کوردەکـانیتـرەوە و دوای شـەڕێکی قـورس ٨٠ کـەس لـە تورکمانەکان و ١٦٠ کەس لە کوردەکـان کـوژران، تاقمێـك لـە سـوارەکانی لاییـن بـە چـەکی ئاگرینەوە هاتنە مەیدانەوە و تورکمانەکان لە دۆڵی ئەرچەنگانەوە گەیشتنە هەراوی تورکـستان و هاوکات کوردەکان کوژراوەکانی خۆیانیان ئەسپەردەی خاك کـرد و میـرزابەیگ بـە دەسـتی زەخـمییەوە درایە دەستی دوو سەربازی تورکمانـەوە تـاکو بیبـەن بـۆ خـاکی تورکـستان، یـەك

---

٢٨٩- ئێستا بنەماڵەی ئیسماعیل کورت دانیشتووی گوندی چوارڕای خاکستەرن.

٢٩٠- لە خاکی سۆڤیەت دایە.

ساعەت دوای نیوەشەو، میرزا بەیگ کاتێ کە شەو برینەکانی ئیزنی ئەوەیان پێ نەداوە بنوێت و هاوکات سوارە تورکمانەکان بە هۆی ماندوو بوونەوە نووستبوون میرزابەیگ بە کەمترین مانوویوونەوە توانی دەستی چەپی بکاتەوە، بەڵام بە هۆی ئەوەی خوێنێکی زۆر لە شوێنی برینەکەی ڕۆیشتبوو توانای هاتوچۆی نەبوو. میرزابەیگ لە خوا داوای کرد تاکو دەرفەتی زیندوویوونی پێ بدات و تاکو بتوانێ تۆڵە لە دوژمن بکاتەوە. میرزا هێواش هێواش خۆی بە یەکێ لە تورکمانەکان نزیك کردەوە و شمشێرەکەی لە کەمەر کێشایەوە و خێرا کوشتی و ئازایانە ئەو تورکمانەکەیتریشی کوشت.

میرزابەیگ بەم شێوەیە توانی خوێنی تورکمانەکان بڕژێنێ. بەڵام بە هۆی ئەوەی کە خوێنێکی زۆر لە جەستەی چووبوو توانای هەڵسانەوەی نەبوو. بە هەر شێوەیێك بوو سواری ئەسپێکی زینکراو بوو و هاوکات دەنگی سەربازە تورکمانەکانی بیست کە لە دوورەوە زرنگەی دەهات و ئەویش بە پیچەوانەی هاتنی ئەوانەوە بە بێ‌ئەوەی بزانێ بۆ کوێ دەڕوات تەقاندی و ڕۆیشت.

لەو لاشەوە کاتێ کوردەکان بیستیان میرزابەیگ دەستگیر کراوە توانای و بڕستیان لێ بڕا و ویستیان لایین و خاکستەر بەجێ بهێڵن و ڕوو بکەنە جولگەی مەشهەد. کۆچ کردنی عەشیرەت و گەڕانەوەی میرزابەیگ بۆ لایین هاوکات بوو، یەکەمین کەسێ کە میرزابەیگی بینی شوانێك بوو کە بە دیتنی میرزابەیگ لە دوورەوە زۆر ترسا بوو. میرزابەیگی برینداری سواری ئەسپی سپی تورکمانیە و بەرەو ڕووی شوانەکە دێت و بانگی دەدا، هەی کوردینە ئەمن ئەوندە تینوومە کە بڕستم لێ بڕاوە، من میرزابەیگم، خێرا تۆزێك ئاوم بۆ بهێنن. شوانەکە کە ناوی مەردان بوو، میرزابەیگی ناسیەوە و ڕووی لێ کرد و لە ئەسپەکەی دایبەزاند و بە کڵاوەکەی خۆی تۆزێك ئاوی بۆی هانی و کردی بە دەمیەوە و خێرا مزگێنی گەڕانەوەی میرزابەیگی برد بۆ خەڵکی کورد: «مزگێن، مزگێن، چیلەپڵنگ هات، میرزابەیگ هات.»

کوردەکان بە بیستنی ئەم مزگێنیە ڕوویان کردە میرزابەیگ و هێنایانەوە نێو عەشیرەتەکەی خۆیانەوە و جارێکیتر ڕەشماڵیان هەڵدا و بانگی خۆشی و شاییان هەڵدا و خەم

و ناکۆکی کۆچی کرد و خۆشی بۆ بە جێگری.

دوای یەك مانگ، لە لایەن والی خوراسانەوە بە پێی فەرمانێك میرزابەیگ کرا بە سەرکردەی ناوچەی سنووری لایین و کەلات و ساڵێك ٢٠ تمەنی پێی دراوە و دەبوای هەر بەو پارەشەوە هێزەکانی خوی خڕ بکاتەوە.

## ٦- دووەمین دەسڕێژی دوژمن بۆ سەر خاکی خاکستەر و لایین و کەلات

دوای ئەوەی میرزابەیگ بە پێی فەرمانی والی خوراسان بوو بە جێگری باوکی و یەك ساڵ لەم بەسەرهاتە تێپەڕ دەبێ و جارێکیتر تورکمانەکان بە ٥٠٠ سوارەوە بۆ تاڵانی کوردەکان پەلاماری ناوچەکەیان داوە و ویستی تورکمانەکان لەم کارە زۆرتر کەلەبچەکردنی میرزابەیگ بوو ئەم جارە هێرشەکەیان ئەوندە خێراوئازایانە بوو کە تا میرزابەیگ ئاگاداری هێرشەکەیان دەبێ، سەرانسەری گوندەکەیان تاڵانکردبوو و هەواڵی ئەم پەلامارە لە سێ فرسەخی خاکستەرەوە گەیشتە دەستی میرزابەیگ بەم بۆنەوە میرزا بەیگ خێرا ٣٠٠ سەربازی لە گوندەکانی چەرم و سینەو ئیدلیك کو دایەوە و چووە شەڕی دوژمنەوە و ئەم کاتە هاوکات بوو لەگەڵ گەڕانەوەی تورکمانەکان بۆ تورکستان کە توانیبوویان خەڵکێکی زۆر لە کوردەکان خوێن بڕژێنن و لەم کاتەدا میرزابەیگ گەمارۆی دوژمنی داوە و ئەوانیش ڕێگەچارەیان لە شەڕدا بینیوە و خێرا ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند. شەڕێکی زۆر ترسناك و تووش بوو، میرزابەیگ سوارەکانی کردبووە سێ دەستەوە کە دەستەیێکی ئەم سەربازانە لە تەپۆلکەکانەوە سەردەکەوتن و دەستەیێکیتر لە تەپۆلکەکانی باکووریدا نیشتەجێ کران و دەستەی سێهەم لە نێو دۆڵەکەوە هێرشیان کردە سەر دوژمن.

میرزابەیگ چەند لاوێکی تەرخانکرد، بۆ پڕکردنەوەی تفەنگەکان تاکو کات لە دەست دەرنەچێ، بە هەر شێوەیێك بوو تورکمانەکان خۆیانیان گەیاندە دوڵی ڕۆخانەکە

میرزابەیگ ٨٠ سەربازی لە هەڤاڵانی خۆی بۆ دابەزاندنی پیلانێکی شەڕی نیزامی نارده

سەر کێوەکەوە.

تورکمانەکان بۆ هەر لایێك دەیانڕوانی جگە لە شمشێری کوردەکان چیتریان نەدەدیەوە و بۆیە ویستیان لە ئەوبەری دولەکەوە بچنە دەرێ تاکو بتوانن خۆیان دەرباز بکەن، بە نزدیك بوونەوەیان بە نێوانی دۆلەکە کوردەکان بەردێکیان خل کردەوە کە تورکمانەکان لەو بەسەرهاتە زۆر ترسان و لەم کاتەدا میرزابەیگ بانگی هەڵدا و گوتی: ئەی دز و جەردەکانی تورکمان، ئەی ناپیاوە هەوچیەکان بزانن مردن هاتووەتە پێشوازیتانەوە.

لەم کاتەدا بە سەربازەکانی فەرمانی داوە تاکو گریەکان بکەنەوە و بەرد بە تەغار بەربووەتەوە بە سەر تورکمانەکاندا و کاتێکیش ویستوویانە هەڵبێن لە نێو ئاودا خنکاون، ڕۆژی دوای سەری تورکمانەکان ڕاسپێری مەشهەد کرا.

## ٧- ناپیاوی مێهزەمان زیدانلوو و یارمەتی دانی دوژمن

میرزابەیگ دوای ئەنجامی ئەم ئازایەتیە کۆچی دوایی دەکات و کوڕێکی لاوی بە ناوی ئاقاگولیبەیگ لێ بەجێ دەمێنی و لەم کاتەدا بە داوی مردنی میرزابەیگ جارێکیتر کوردەکان بە بێسەرکردە دەمێننەوە. هاوکات مەهزەمان (موحەممەد دزەمان) ناوێك کە لە عەشیرەتی زیدانلوو بوو و مێژووە لەگەڵ کوردەکانی لایێندا نێوانی خۆش نەبوو و بۆ ئەوەی ئەم ناکۆکیە دەر ببڕێ چووەتە نێو سوپای دوژمنەوە و هانی دوژمنی داوە تاکو پەلاماری کەلات بدەن.

تورکمانەکان بە سوپایێکی ٤٠٠ کەسیەوە و بە ڕێنوێنی مەهزەمانەوە لە ڕێگەی کەرناوە[٢٩١] هێرشیان هێناوەتە سەر خاکستەر و هەمووی دیدەوانەکانی کورد کوژران و بۆیە خەڵکی گوندە کوردنشینەکان ئاگاداری ئەو هێرشە نەبوون و کاتێ کە بەم پیلانەیان زانیەوە دەسڕێژی دوژمن تەنگی لێیان هەڵچنیبوو. لە هەموو تاڵتر نەبوونی سەرکردەیێکی ئازای کورد، کوردەکانی زۆر ئازار دا و و تورکمانەکان توانیان خوێنی خەڵکی بێتاوانی کوردی ناوچەکە

---

٢٩١- karnawa

بڕێژن و ژمارەییێکی کەمی کوردەکان توانیان دەرباز بن و ڕوو بکەنە کێوەکانی دەوروبەر.

لاوێکی کورد بە ناوی ئەڵڵاقولی کە ئازایەتی خۆیەوە دوابوو تاریفی خۆی کردبوو، لەم کاتەدا کە بە دەستی دوژمنەوە دەردەچوو، یەکێ لە کیژە کوردەکانی گوند بە ناوی شیرین پێی گوت: های کوڕە کوردی نەمر، تۆ نەبووی کە دەتگوت من شێر و ڕۆستەمی زەمانم بۆچی ڕا دەکەی و ژن و نامووسی خۆت بەجێ دەهێڵی، ئەڵڵاقولی بە بیستنی ئەم قسانەی شیرین شمشێری دەرهانی و لاوەکانی‌تریشی گەڕانەوە مەیدان و پیاوانە شەڕی کرد، شەڕێکی سوور، خۆینی کووچە و کولانی گوندی سوور کردبوو. کەریم‌بەیگ و چەند سەربازی کورد لە لایینەوە هاتنە یارمەتی کوردەکانەوە و ئەڵڵاقولی لەم کاتەدا بانگی دەدا و دەیگوت: های خەڵکی خاکستەر ئاگادار بن کە دەبێ ئەم ناپیاوانە بە زەبری شمشێر لە گوندەکەمان دەربکەین و ئیزنی پەلاماری زۆرتریان پێ نەدەین، بزانن ئێمە نەتەوەی ئیسماعیل کورتین. مەهزەمانی ناپیاو بۆی دەرکەوت تورکمانەکان شکستیان خوارد بە کوردەکانی گوت: «لوو بکوژن، لوو بەرمەدەن، بیگرن، یەخسیری بکەن»

خاکستەریەکان ئیزنی ڕاکردنیان بە تورکمانەکان نەئەدا و مەرگیان بە خەڵات دا بە تورکمەنەکان، لەم شەڕەدا ١٤٠ لاوی کورد و تەواوی سوپای تورکمانەکان کە ٤٠٠ سەرباز بوون کوژران.

ڕۆژی دوایی کاتێ کە کەریم‌بەیگ و ئەڵڵاقولی‌خان سەرکەوتن، شیرین پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەی بە ئەڵڵاقولی ڕاگەیاند.

## ٨- شەڕی قورسی تەپەی مەحموود مەرەگانی٢٩٢ خیوئاوا

ڕۆژێ لە ڕۆژانی بەهار کاتێ کە یاران مەرەکانی کوردەکانی دووین و خاکستەر لە

---

٢٩٢- تەپەی مەحموود مەرگان هەر ئەو تەپۆڵکەیە کە نادر لە خاکی قەڵای هەزار ئەسپ بنیاتی ناوە، بەم شێوەیە کە نادر دوای ئەوەی خوارەزمی گرت، دژی هەزار ئەسپی کاول کرد و خاکەکەی گواستەوە و ئەم تەپەی پێك هێناوە. خەڵکە دیل کراوەکانیش گوێزرانەوە ئەو شوێنە و ئەم دیل کراوانە کە لە لایەن ئیلبارس خانەوە دیل کرابوون لەم شوێنە گوندێکیان بنیات نا بە ناوی خێوئاوا.

سنووری ئێران و توکرستاندا لە لایەن ژنە کوردەکانەوە دەدۆشران تورکمانەکان هێرش دەکەنە سەریان و ژنەکان کەلەبچە دەکرێن و مەڕەکان بە تالآنی دەبرێن بۆ ئەتەك کەچی تەنیا ٦ کەسیان دەبێتە بەرپرسی بردنەوەی مەڕەکان بۆ ئەتەك و پاشماوەی تورکمانەکانی کە لە دەوری ٢٥٠ کەسدا بوون، هێرشیان بردۆتە سەر خاکستەر.

مەحموودمەرکاغن کە یەکێ لە چالاکترین نەچیرەوانەکانی کورد بوو، هاوڕێی چەن نەچیرەوانیتر لە نێوان چەم و دۆڵ و چیاکاندا بۆ نەچیر دەگەڕان و بە یەکجارە چاویان دەکەوێ بە تورکمانەکان، هاوکات مەحموود بانگ دەکات لە هەڤاڵەکان و پێیان ڕادەگەیێنێ کە کاروبار چییە و پێکەوە هەموان سەنگەر دەبەستن و چاوەڕوانیان دەمێنن.

لەم کاتەدا ئاقاگولی بەیگی کوڕی میرزا بەیگیش کە بۆ تاقی کردنەوەی بارودۆخ بەرەو سنوور دەڕۆیشت، دەگاتە ئەم نەچیروانگەلە و ڕاستیەکەش بۆ ئەو دەردەخەن و ئەویش کە ٤ کەسی لەگەڵدا بووە دژ بە تورکمانەکان سەنگەر دەبەستن.

بەڕێز ئاقاگولی بەیگ بۆی دەرکەت کە هێزی یارمەتیدەر بە خێرایی لە لایینەوە ناگەن و هەر ئەمە دەبێتە هوێ نفلەبوونی مەڕەکانیانەوە و کەچی ئەویش نهێنی خۆی بۆ هەڤاڵانی خۆی درکاند و ئەوانیش هاتنە سەر ئەو ڕایەی کە ئاقاقولیبەیگ بە سواری ئەسپەکانی خۆی ڕوو بکاتە دەرەگەز و داوای یارمەتی بکات لە ئەڵلایارخان دەرەگەزی حاکمی دەرەگەز.

ئەسپەکەی گولیبەیگ لە ڕەگەزی ئەسپە تورکمانیەکان توانای گرتنی ئەویان نەبوو. مەحموود مەرگان هەر وەکو ئاریوبەرزەنی قارەمان ڕێگای لە تورکمانەکان هەڵچنیبوو و ڕێگای بە تاقە تورکمانێ نەئەدا بڕواتە پێشەوە.

کەچی تورکمانەکان لەم ئازایەتیە سەریان سووڕ دەمێنێ و بەڵام دوای دوو شەو و دوو ڕۆژ توانیان مەحموود مەرگان و هاوڕێیەکانی گەمارۆ بدەن. لەم کاتەدا ئاقاگولیبەیگ خۆی گەیاندە دەرەگەز و ئەڵلایارخان دەرەگەزی ٢٠٠ سەربازی بە سەرۆکایەتی ڕەجەب قولیخانەوە نادرە یارمەتیانەوە و دوای یەك شەو بە ڕێگەدا ڕۆیشتن، خۆیانیان گەیاندە تورکستان و ڕێیان لە ئەو تورکمانانە گرت کە دەایانەویست ژنە کوردەکان و مەڕەکانیان تالآن بکەن و بیانبەن بۆ عێشقئاباد، کوردەکان خێرا ئەو ٥ تورکمانەیان کوشت و ژنەکانیان هێنایەوە و

دەستیانیان کردەوە و چەکی تورکمانە کوژراوەکانیان دا بە ژنەکان و ٥ سوارکاری دەرەگەزییان کردە هاوڕێیان و ناردیانیان بۆ لاییـن و پاشماوەی کوردەکانیش لە ڕێگای کەڕناوە ڕوویان کردە سەنگدیوار، بەڵام بە داخەوە تـۆزێ پـێش ئـەوەی بگەنـە ئـەوێ، تورکمانـەمان، مەحـموود و هاوڕێیـەکانیان کوشـتبوو و دەیانویـست پـەلاماری سـەنگدیوار بـدەن، هاوکـات تاقمێـك لـە کوردەکانی لاییـن کە ٢٠٠سوارە و ٤٠ پیاو پیادە بوون هاتنە یارمەتیەوە و کوردەکان توانیان لە دوو شوێنەوە گەمارۆی دوژمن بدەن، شەڕێکی زۆر قورس دەستی پێکرد و لە ئاکامدا هێزە تورکمانییەکان تێکشکان و دوای کوژرانی ١٢٠ سەرباز و ٢١ برینـدار تورکمانـەکان جگـە لـە دەرباز بوون ڕێگاییێکیان بۆ نەمایەوە و هەموویان هەڵاتن هەروەها ٣٢ سەربازی کورد لاییني و ٦٥ سەربازی کورد دەرەگەزی کوژران.

## ٩- فیڵەبازی جەردەکان، دیل بوونی ئاقاگولیبەیگ

دوو ساڵ دوای شـەڕی تەپـەی مەحـموود مـەرگان، هەواڵیانـدا بـە ئاقـاگولیبـەیگ کـە تورکمانەکان توانیووویانە ٨ هەزار سەر لە مەڕی کوردەکـان تـاڵان بکـەن و بیبـەن بـۆ دەشـتی خـارەزم و گـولیبـەیگ هـاوڕێ ٢٦٠ سـەرباز کەوتنـە دوای تورکمانـەکان. تورکمانـەکان کـە دەیانزانی گولیبەیگ بە دوایانەوەیـە کەوتنـە بیـری ئـەوەی تـاکو پیلانێـك سـاز بگێـڕن و بـۆ گەیشتـن بە ئەم مەبەستە مەڕەکانیان لەسەر تەپۆڵکەییێکەوە مۆڵدا و خۆیان دووریـان گـرت و چاوەڕوانی هاتنی گولیبەیگ مانەوە.

بە دیتنی کوردەکان تاقمێك لە تورکمانەکان تەپۆڵکەکەیان دەور دایەوە و پشتی سـەریان لێیان گرت. لەم کاتەدا قولیبەیگ گەیشتە مەڕەکان و کاتێ زانی هـەمووی مـەڕەکان سـاغ و سڵامەتن بیـری لە ئەوە کردەوە کە چلۆن دەبێ تورکمانەکان ئەم مەڕانەیان بەجێ هێشتبێ.

لەم کاتەدا تورکمانەکان لە چوار لاوە گـەمارۆی کوردەکانیـان داوە، زۆربـەی زۆریـان لـە کوردەکان کردە قوربانی و هەروەها تاقمێکیتریان کەلەبچە کرد و یەکێ لـەو کەلەبـچەکراوانـە گولیبەیگ بوو.

تورکمانەکان ناپیاوانە تەرمی کوردەکانیان کە نیوەیان زیندوو بوون لە سەر یەك خست، بەبێ هیچ ڕەحم و بەزەییێك ئاگریان تێیان بەردا و سووتاندیانیان.

تورکمانەکان زۆر بەوە دڵخۆش بوون کە توانیبوویان گولی‌بەیگ کەلەبچە بکەن، لەبەر ئەوەی بۆ دانەوەی گولی‌بەیگ پارەییێکی زۆریان لە کوردەکان وەردەگرت بۆیە گولی بەیگ و چەند کەس لە کوردەکانیان بە دیلی برد بۆ عیشق‌ئاباد. دوای یەك ساڵ کوردەکان توانیان پارەییێکی زۆر پێك بهێنن و گولی‌بەیگ و هاوڕێیەکانی ڕزگار بکەن.

ئەم کارەی تورکمانەکان زۆر منداڵانە بوو لەبەر ئەوەی بە ڕزگاربوونی‌گولی‌بەیگ کوردەکان دەیانتوانی خۆیان بۆ شەڕێکی قورس بڕازێننەوە. کەچی هەروەهاش بوو و ساڵەکانی دوایی کوردەکان توانیان تۆڵەی ئەو ناپیاویە لە تورکمانەکان بکەنەوە.

## ١٠- کارەساتی هێرشی تورکمانەکان بۆ کەلات و خۆپیشاندنی کوردەکان لە تەخت کوتەڵیدا

سێ ساڵ دوای ڕزگار بوونی گولی‌بەیگ کە ساڵێکی وشك و قاتڕ بوو و برسیەتی زۆری بۆ تورکمانەکان هانی و ئەوان بۆ وەدەستهێنانی نانی ڕۆژانەی خۆیان کەوتنە بیری ئەوەی پەلاماری نەتەوەکانی دراوسێ بدەن و دراوسێش لە کورد زیاتر کەس نەبوو و بۆ ئەم مەبەستە تورکمانەکان لە ڕێگای یەکەتووتەوە پەلاماریان دا. دوای ڕووت کردنەوەی لە خۆیان هەژارترن بەبێ هیچ تالانێك ئەوێیان بەجێ‌هێشت و لە ڕێگای کێوی هەزارمەسجد لە باشووری تەهشوورەوە خۆیانیان گەیاندە چیای تەخت کوتەلی ڕێگای چی ڕێگا نەبوو، سەرانسەر هەوراز و لێژ بوو، ئەسپەکانیان توانای سەرکەوتنیان نەمابوو. کەم کەس توانیوویەتی لەم چیایەدا سەر بکەوێ. چیایەك کە ١٥٠٠ مەتر بەرزە و لە وەرزی سەرماشدا ئیزن بە کەس نادات لەوێوە بڕوات.

خەڵکی گوندەکانی چەنای ئەم چیایە ژیانێکی خۆشیان بوو. لەم کاتەدا کوردەکان تورکمانەکانیان دیبوو. هیچیان نەگوت، تاکو تورکمانەکان خۆیانیان گەیاندە سەر دوندی چیاکە

و بە گەیشتنی تورکمانەکان خێرا کوردەکان چەکیان خستە کار و بەبێ ئەوەی خۆیان هەوڵ بکەن سەرکردەی تورکمانەکانیان دا بەر تەقە و تیر و بە کوشتنی ئەو سەرکردەیە پاشماوەی تورکمانەکان یەك لە دوای یەك بەرەو نەمان تلانەوە و گشتیان کوژران و بەم شێوەیە کوردەکان لەم شەڕەدا بە بێ‌ئەوەی کەسیان لێ بکوژرێ هەموو تورکمانەکانیان کوشت.

## ١١- کوژرانی خەڵکی قەلعەنەو بە دەستی تورکمانەکان

تورکمانەکان دوو ساڵ دوای کارەساتی تەختکوتەلی، جارێکی‌تر پەلاماری کوردەکان دەدەن و دوای تاڵانکردنی گوندی «ساریقومەیش» پەلاماری قەڵای نەویان داوە و پیاوەکانی قەڵاکە ٣٥ کەس بوون و لە ژێر فەرمانی قلیجبەیگی جەلایردا بوون، کەچی قلیجبەیگ و هەڤاڵانی بەرنگاری تورکمانەکان وەستان و توانیان ڕاویان بنێن و قلیجبەیگ بەم کارەی زانی، خێرا بەرەو قەڵا گەڕایەوە تورکمانەکان بە دوای کەوتن و ئەگەرچی بە شەڕ و بەربەرەکانێ نەیانتوانی قەڵاکە بگرن، خێرا درگای قەڵاکەیان سووتاند و هێرشیان کردە سەر کوردەکان و قلیجبەیگ و هەموو هەڤاڵانیان کوشت و ژنە کوردەکان و نەسیربەیگی نوێنەری بەخشداری قەڵایان بە دیلی گرت و ڕاسپێری تورکستان بوونەوە، بەڵام دوای ساڵێك حکوومەتی ئێران بە پارە نەسیربەیگی کڕیەوە و تەنیا کوردەکان لەو بەندە زاڵمانەدا مانەوە و بەم شێوە گوندێکی گەورە لە گوندەکانی کەلات بە ئاگری ناپیاوی دوژمن سووتا و خەڵکەکەی کوژران و تەنانەت کتێبی جیۆگرافیای ئێران هیچ ناوێکی لەم گوندە نەبردووە.

## ١٢- شەڕی شووری

دوای لەناوچوونی قەڵای نەو، کوردەکان بۆ ئەوەی بتوانن لە هێرشی دوژمن بەرگری بکەن، قەڵایێکی‌تریان بە ناوی قەڵای شوور بنیات نا و ٥٠ سەربازی سوارەی کورد بە سەرۆکایەتی ئیسماعیلبەیگی جەلایرەوە لەوێ مانەوە. دوای ماوەیێك ٩٥ سەربازی تورکمان هێرشیان کردە سەر گوندی سەروود و دوای ئەوەی توانیان پیاوەکانی ئەوێ بکوژن، ژن و

منداڵەکانیانیان کەلەبچە کرد. کاتێ ئسماعیل‌بەیگ بەم کارەساتەی زانیـوە بە دوای دوژمـن کەوتووە و لە نزدیکی قەڵای موحەمـمەد عەلیخاندا گەمارۆیانی داوە، لەم کاتەدا تورکمانەکان خەریکی دابەشکردنی دەستکەوتی شـەڕ و ژنـەکوردەکان بـوون کـە سـەربازەکانی فەرمانبـەری ئیسماعیل‌بەیگ چەکیان لێیـان کێشاوە و زۆربـەیانیان کوشـتووە، ئـەم تورکمانانـە جگـە لـە سەرکردەکەیان و یازدە کەسی‌تر، کەس نەیتوانیوە دەرباز ببێ، هـەروەها کـچێکی ١٤ سـاڵانی کورد دەبێ بە نەسیبی ئەم سەرکردە پیسە تورکمانە.

## ١٣- شەڕی دیگچە

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك لە کارەساتی شووری، تورکمانەکان پەلاماری دەربەندی کـەلات ئەدەن و تاقمێکی‌تر لەو تورکمانانە پەلاماری گوندی دیگچە دەدەن و هاوکات ١٣٠ لاوەکوردی نەبەز تورکمانەکانیان لە دەربەند دەرکردووە و چوونەتە یارمەتی کوردەکانی دیگچەوە و یـەکێ لەم لاوانە سەری سەرکردەی تورکمانەکان دەبڕێ و بانگ دەدات ئەی تورکمانەکان ئەمە سـەری سەرکردەکەتان، ئێوەش ئاکامێکی وەهاتان هەیە، هـەر بـەم بۆنـەوە پاشـماوەی تورکمانـەکان ڕادەکەن.

## ١٤- پەلاماری باغکەند

دوو سـاڵ لـە کارەسـاتی دیگـچە تێپـەڕیبوو کـە تورکمانـەکان جـارێکی‌تـر پـەلاماری کوردەکانیان داوە و ئەم جارە گوندی باغکەند، کەوتۆتە بەر پەلاماریانەوە و تالانیان کردووە.

لەم کاتەدا خەڵکی بـەر دێ بـەم کارەسـاتەیان زانیـوە و لـە ٢٠ کیلۆمـەتری باغکەنـدا ناوڕێیان پێ دەگرن و هاوکات ڕێگاش لە تورکمانەکان بزر دەبێ و کوردەکان توانیان قرتەیان لێ ببڕن و کەسیان زیندوو نەهێڵن. نووسەری سەفەرنامەی کەلات ئاماژەی بەم کارەساتە کـردووە و دەڵێ چەند ساڵی پێش ٤٠٠ تورکمان پەلاماری گوندی باغکەنـد دەدەن و کەلوپـەلی خـەڵك تالان دەکەن و ژن و منداڵەکەشیان دیل دەکەن و بەرەوتورکستان دەچنەوە، بەڵام دەکەونـە بـەر

پەلاماری خەڵکی بەردێیەوە و ٢٠٠ کەسیان لێ دەکوژرێ و ٢٠٠ کەسیشیان دەرباز دەبێ و ڕوو دەکەنەوە تورکستان.[٢٩٣]

## ١٥- هێرشی تورکمانەکان بۆ کەبودگونبەدی کەلات

ساڵی دوایی کە وشکەساڵی تەنگی لە خەڵکی ناوچەکە هەڵچنیبوو، ١٨٠ سوارەی تورکمەن لە ڕێگای تەنگە یەکەتووتەوە پەلاماری کەبودگونبەدیان داوە و کوردەکان توانیان لە دوو کیلومەتری کەبود گونبەدەوە (خەلەج) دەسڕێژ بکەنە سەر تورکمانەکان و لە ئاکامدا توانیان ٤٢ کەس و سەرکردەکەیان بێگیان بکەن و پاشماوەکەیان دەرباز بن.

## ١٦- هێرشی سوارەکانی کەلات بۆ سەر تورکمانەکان

هێرشی تورکمانەکان بۆ سەر کەبودگونبەد زۆر بۆیان گران تەواو دەبێ و کاتێ کە بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی خۆیان ڕوو دەکەنە عێشقئاباد ١٢٠ سەربازی کوردی کەلات پەلاماریانیان داوە و لە ڕێگای چەهچەهەوە ڕوویان کردۆتە دەشتی مەرو و دوای شەڕێکی سوور توانیان تورکمانەکان شکست بدەن و ٥٠ کچ و ژنی تورکمەن کەلەبچە بکەن، کاتێ تورکمانەکان بەم کارەیان زانیوە پارەیێکی زۆر دەبەن بۆ کوردەکان و ژنەکانیان دەکڕنەوە و سوێند دەخۆن قەت پەلاماری کوردەکان نەدەن، کەچی هەروەها بوو و ئەمە بووە ئاکامی شەڕی کورد و تورکمان.

دەبێ ئاماژەش بە ئەمە بکرێ کە تەنیا گوندی «ژێرف» نەکەوتۆتە بەر پەلاماری تورکمانەکانەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی لە پەنای کێوێکی بەرزەوە بوو و تورکمانەکان دەستیان پێ نەدەگەیشت.[٢٩٤]

---

٢٩٣- فەرهەنگی ئێران زەوین، ئیرەج ئەفشار، بەرگی ٢٥، ل١٨٠ و سەفەرنامەی کەلات، پێداچوونەوەی قودرەتوڵڵا ڕەوشەنی زەعفەرانلوو.

٢٩٤- زندەگی نادرشای پسەر شمشێر، نوروڵڵا لاروودی ل ٣١٢.

## فەلسەفەی تەمەن درێژی خەلکی خاکستەر

ئەرفەعودەولە نووسیوویەتی: کاتێ کە بۆ دیاریکردنی سنووری ئێران و ڕووسیە ڕۆیشتین بۆ قووچان و بووین بە میوانی ئەمیرحسەینخانی شوجاعودەولە و کاتێ شوجاعودەولە لەوێ باسی دەکرد، گوتی: لەم قووچانەدا گوندێك هەیە بە ناوی خاکستەر کە خەلکەکەی زۆرتر لە ١٠٠ ساڵ تەمەن دەکەن و هەروەها قەت ددانیان ئێش ناکات و تا تەمەنی ٨٠ ساڵانیش ڕیشیان سپی نابێ" بەلام لەبەر ئەوەی لە تاراندا مێسباحولمەلێك پێی گوتبووم ئەگەر شتێکی سەیرت بینی، بینووسەوە و بۆمی بهێنەوە و ئەمنیش دەیدەمە وەزیری دەرەوە تاکو ئەویش بیدات بە ناسرەدینشا و کەچی پاشا، زۆر دەگەشێتەوە، بۆیە لە شوجاعودەولەم پرسی: خاکستەر لێرەوە زۆر دوورە؟ وەلامی دایەوە: نە زۆر دوور نیە. ئەمنیش لێی پاڕامەوە تاکو سوارەیێکی ڕێزان لەگەلم بنێرێت تاکو سەردانێکی ئەو گوندە بکەین. ڕۆیشتین، کاتێ کە گەیشتینە ئەو گوندە. ئێمەیان بردە بەر دەرگای مالی قوێخای گوند. پیاوێکی زۆر مێهرەبان بوو و فەرمانی دا بەرخێکیان بۆمان سەربڕی و نانی تازەیان بۆمان دروست کرد و زۆربەی خەلکەکەی زۆرتر لە ٨٠ ساڵ تەمەنیان بوو. کاتێ ئەم ئاکارەم بینی لەو پیاوەم پرسی: تاکو ئەم ڕاستیەم بۆ شی بکاتەوە. قوێخاش کە خۆی ٩٥ ساڵی بوو، گوتی: ئێمە لەم گوندەدا ٨٠ بنەمالەین[٢٩٥] و قەت ئێزن نادەین جەماورمان زیاد بکات و ئەوەی کە دەیبینی هەموومان بە ساڵاچووین، ئەوەیە کە هەر کاتێ مندالمان ژنی هێناوە، ئێزنمان پێ نەداوە لێرە بمێنێتەوە و زۆربەی خەلکی قووچان و شیروان مندالی ئێمەیە و هەروەها کاریشمان ئاژەلداریە و نان و پێخۆریشمان، نانی گەنم و ماست و دۆیە و کەمتر گۆشتیش دەخۆین و هەر کاتێ پێویستمان بە پارە ببێ لە مەڕەکانمان دەفرۆشین. گوتم: بۆچی ئێوە ئەگەر نەخۆش بکەون، حەکیمتان هەیە؟ قوێخا وەلامی دایەوە کە ئێمە قەت نەخۆش ناکەوین و جگە لە «پەتا» نەخۆشیترمان نییە و بۆ دەرمانی ئەم نەخۆشیەش، نەخۆش دەخەینە نێو لێفەیەکەوە و دەیبەسینە دارێکەوە

---

٢٩٥–خەلکی خاکستەر لە کوردەکانی کەمکەیلانلوون.

کە وەکو داڵدەڵەکانێ دەمێنێتەوە و هاوکات دۆیەکی زۆری پێ ئەدەین[٢٩٦] و پاشان داڵدەڵەکانێی پێ دەکەین و لە ئاکامدا هەر چێکی خواردبێت هەڵی دەهێنێتەوە و چاک دەبێتەوە و ئەمساڵ تەنیا دوو کەسمان لێ مردووە و ئەوەش لە سەر ئەو کێوەوە کەوتوونەتە خوارەوە.

## عەشیرەتی کورد شادیلوو

عەشیرەتی کوردی شادیلوو کە ئەمڕۆ بە شادێلوو ناسراون، یەکی لە عەشیرەتە مەزنەکانی کوردە کە هاوڕێی عەشیرەتی چامەشگەزك لە باشووری قەفقازەوە ڕوویان کردە ئازەربایجان و لەوێشەوە ڕوویان کردە خوار و وەرامین و هەروەها ڕێگای خوراسانیان گرتە باوەش.

ناوەندی کوردەکان لە قەفقازدا بریتی بوو لە شارەکانی دووەین[٢٩٧] و چەغووری سەعد، بووجنگەرد، گەنجە، ئیروان و قەرەباغ، و ئەمڕۆ زۆربەیان لە شاری بجنووردا دەژین. تاقمێکیش لەسەر ئەو باوەڕەن کە شادلوو لە دیسم شادلووە گیراوە، بەڵام من پێم وایە ئەم بیروڕایە ڕاست نییە، لەبەر ئەوەی دیسم خۆی دایکی لە کوردەکانی شادلووە و خودی دیسم لەم عەشیرەتەیە، نەك ئەم عەشیرەتە لە دیسمەوە هاتبێ. ساڵی ٣١٤ی کۆچی دیسم کورد شادیلوو ناوچەی ئازەربایجانی داگیر کرد. کەسرەوی نووسیویەتی: «بەڵام لەم سەردەمەدا لە ئازەربایجاندا کوڕە کوردێك بە ناوی دیسم کوڕی ئیبراهیم بەیرەق، ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکردبوو.

ئیبن مسکوویە نوسیوویەتی ئیبراهیمی باوکی دیسم پیاوێکی «خەوارج»ی بوو کە هاوڕێ هاروونەرەشید هاتبووە ئەو ناوچەیە. ناوبراو دوای کوژرانی هاروون لە نزدیکی مووسڵەوە

---

٢٩٦- کوردەکان لە ماستاو بۆ کاتی هەڵ هاوردنەوە (قەی، ئیستیفراق) کەڵکیان وەرگرتووە و بۆ خوێنی زۆر لە لەش چوون لە گمێز کەڵکیان وەرگرتووە.

٢٩٧- کوردەکانی دووەین دەبێ لە کوردەکانی شادیلوو بن، نەك کوردەکانی زەعفەرانلوو، ئەگەر لە ناوچەی زەعفەرانلوودا دەژین.

دەرباز بوو بۆ ئازەربایجان و کچی یەکێ لە پیاوە گەورەکانی کوردی دەست گرت و لەم ژنە کوڕێکی بوو بە ناوی دیسم...

دیسمیش هەر وەکو باوکی لەسەر باوەڕی خەوارج بوون و باوەڕیان بە خەلیفە و خەلافەت نەبوو و جا لەبەر ئەوەی دایکی دیسم کورد بوو و کوردەکان زۆر بەهێز بوون و ناوچەی ئازەربایجانیان بە دەستەوە بوو و بەم بۆنەوە بە یارمەتی ئەوانەوە توانیان دەسەلات پەیدا بکەن ئیبن حوقەل نووسیوویەتی: دیسم کوڕی شادلوویەیە. بەلام پێم وایە ئەم وشەیە ناوی ئەو عەشیرەتەیە کە باوکی دیسم ژنی لێیان خواستووە.[٢٩٨]

کەسرەوی ئاماژەی کردووە و دەڵێ: کوردەکانی شادیلوو عەشیرەتێکن لە عەشیرەتی مەزنی کوردانی ڕەوادی. هەروەها سەبارەت بە ڕەوادییەکان نووسیوویانە: عەشیرەتێکی مەزنن لە کوردەکان کە لە ئۆشنەویە و ئەو ناوچانەدا ژیانیان کردووە و پێیان دەگوترێ «هەمزانی»، وا بزانم عەشیرەتی هەمزانلوو بن، کە ئەمڕۆ پێیان دەگوترێ حەمزانلوو و لە دەوروبەری بجنووردا دەژین. ئیبنوخەلکەکان نووسیوویەتی: کوردەکانی ڕەوادی لە دەرەوەی شاری دووەین واتا ناوەندی ئەرمەنستاندا دەژین. پێم وایە شەدادیان هەر لەم شوێنەوە هەڵسابێتەوە. یەکێ لە بەناوبانگترین پیاوەکانی بنەماڵەی شەدادی، فەزلوونی کوڕی موحەممەدە، ناوبراو ٤٨ ساڵ خاوەن دەسەلات بووە و شەڕی زۆری دژ بە ئەرمەنیەکان دەکرد. مونەجێم باشی نووسیوویەتی: خەڵك زۆر فەزلوونیان خۆشویستووە و ناوبراو ساڵی ٤١٨ی کۆچی پردێکی گەورەی لە سەر ڕۆخانەی ئەرەس بەست، ناوەندی فەزلوونی شەدادی (شادیلوو) شاری گەنجە بوو. هەروەها فەخرەدین شەدادی یەکێ لە پیاوە گەورەکانی شەدادی (ڕەوادی) بوو، ناوبراو ساڵی ٥٥٠ی کۆچی کەوتە بەر شالاوی ڕق و کینەی کەشیشەکانی[٢٩٩] ئایینییەوە و توانیان دەسەلاتی لێ وەربگرنەوە و دەسەلاتیان دا بە دەستی فەزلوونی برای فەخرەدین شەدادەوە.

فارووقی نووسیویەتی: شەداد کەوتە سەری بۆ چاوپێکەوتنی شێرکۆی مامۆی سەلاحەدین

---

٢٩٨– شەهریاران گومنام، ئەحمەد کەسرەوی، ل ٦٧ و کورد و پەیوەستەگی نژادی ئوو، ڕەشید یاسمی، ل ١٨١ ٢٩٨.

٢٩٩– لە شاری ئانی ئەرمەنستانەوە گیراوە.

ئەیووبی بڕوات بۆ شام، دەڵێن شادی باوکی شێرکۆ خزمی بابی ناوبراو بووە.[٣٠٠] لێرەدا بەو ڕاستیە دەگەین کە عەشیرەتەکانی شادلوو، ئەیووبی، ڕەوادی، هەمزانی و شەدادی، هەموویان لە یەك ڕەگەز و بنەڕەتن[٣٠١] و لە درێژایی ڕۆژگاردا دەستە دەستە دەبنەوە و ناوی هەر لقێکی ئەم عەشیرەتەش بە پێی ناوی پیاوێکی گەورەوە ناو نراوە.

وەك دەزانین تاقمێکیان چون لە ژێر فەرمانی شادی کوڕی مەروان کوتووال لە قەلعەی تکریتدا بوون و دوایی ڕوویان کردە سووریە و میسر و زنجیرەی ئەیووبیەکانیان بنیات ناوە و چون دەسەڵاتداری ئەم عەشیرەتە سەلاحەدینی ئەیووبی بووە کە لە منداڵەکانی شادی کوڕی مەروان بووە[٣٠٢] بۆیە پێیان دەڵێن: «ئەییووبی». هەروەها شەدادیان کە لە شەدادەوە گیراوە" شەداد هەر ئەو شەودادەیە کە لەگەڵ شادیدا مێژوو زۆر باسیانی کردووە و وا بزانم عەشیرەتی شادیلوو لە سەرکردەیێکی بەناوبانگ بە ناوی شادیەوە گیراوە.

کەسرەوی دەڵێت: ئێمە زووتر باسمان کرد کە سەلاحەدین ئەیووبی و بنەماڵەکەی لە عەشیرەتە کوردەکانی ڕەوادی و شەدایان بوون و لە واتاکەی فارووقیدا دەردەکەوێ کە شادی باوەگەورەی سەلاحەدینە.[٣٠٣]

بەدلیسی لە شەرفەنامەدا باسی باوەگەورەکانی سەلاحەدینی ئەیووبی کردووە و دەڵێت: باوەگەورەی پاشای میسر، شادی کوڕی مەروانە و لە بنەڕەتدا لە کوردەکانی ڕەوەندەی دووەینن کە لە دەوروبەری ئازەربایجان دایە، بەڵام ئێستا دووەین کاول بووە و پێی دەگوترێ گوندی کرنی چەغووری سەعد. هەروەها بەدلیسی لە شەرەفنامەدا باسی عەشیرەتی شادلووی کردووە و دەڵێت لە ناوچەی لوڕستاندا ژیان دەکەن و کەچی لە کوردە لوڕەکان نین.[٣٠٤]

بە متمانەوە دەڵێم ئەم شادلووانە هەر ئەو شادیلووانە کە خەریکی یێلاخ و قشلاخ بوون و

---

٣٠٠– شەهریاران گومنام، کەسرەوی،ل ٣١١.

٣٠١– کوردستانی موکریان، حسێن حوزنی موکریانی، ل ٤٥٩.

٣٠٢– ئێبنوئەسیر سەبارەت بە ئەسەدەدین شێرکۆ و ئەیووب کە مامۆی باوکی سەلاحەدینی ئەیووبین دەڵێت: واصلهما من الاکراد الروادیه و هژالقبیل هم اشراف الاکراد

٣٠٣– شەهریارانی گومنام، ل ٣١١.

٣٠٤– شەرەفنامە، ل ٨٤، ٨٣.

ناوچەی ئەوان لە بنەڕەتدا شاری دووەیـنی قـەفقاز بـووە. ئیبنوعەمیـد وەزیـری ڕۆکنودەولـەی دەیلەمی کە گوتبووی دەبێ کوردەکان بکەین بە قەڵخانی خۆمان ساڵی ٣٥٥ی کۆچی ٥ هەزار درهەم ماڵیەی لەو کوردانە وەرگرتووە کە بە پارەی ئەمڕۆ دەبێتە دە میلیۆن تـمەن.[٣٠٥] دەڵـێن لە سەردەمی مەغوولدا بە واتای نووسەری نوزهەتولقولوب دوو هەزار تـمەنی مەغوولی (زۆرتر لە سـی میلیـۆن تـمەن) وەکـو ماڵیـە لـەو کوردانـە وەرگیـراوە کـە ئەمـە خـۆی ئازایـەتی و دەوڵەمەندی شادلووەکان دەسەلـمێنێ.

بەڕێز باستانی پاریزی دەڵێت: لە ناوچەی چەغووری سەعددا بەم شێوەی خـوارەوە ماڵیـە لە کوردەکـان وەرگیـراوە کـە دەبـوای کوردەکـانی دەنبـەلی ١٠ تــمەن، شـادلوو ٢٠ تــمەن، چەمەشگەزك و ئاغداش کە لە ژێر چـاودێری بیگلەربـەیگی شیـرواندا بـوون ١٠٠٢ تــمەن و ٦١٩٥ دینـار، عەشیــرەتی دەنبـەڵی ئازەربایــجان ٣١٩ تــمەن و ٩٠٩٦ دینـار و کـوردە شوقاقیەکان ٣٢٦ تـمەن و ٢٠٢٢ دینـار.[٣٠٦] ئـەم ماڵیاتانـەی کـە وەرگیــراوە لـە سـەردەمی سـەفەویەدا بـووە و ئـەم ڕاستیـەمان بـۆ دەردەخـات کـە لـە ناوچـەی قـەفقازدا عەشیــرەتی چامەشگەزك بارودۆخێکی زۆر لەباری بووە.

کوردەکانی شادیلوو دوای ئەوەی ڕوویان کردە خوراسان و لە ناوچەی باکووری ڕۆژئـاوایی ئەم پارێزگایەدا نیـشتەجێ بـوون.[٣٠٧] عەشیـرەتی چامەشـگەزك، زەعفـەرانلوو و شـادیلوو لـە سەرەتادا یەك سەرۆکیان بووە و زۆر پێکەوە خۆش بوون و هاریکاری زۆریان هەبووە.

ساڵی ١٢٤٨ی کۆچی مانگی کاتێ کە عـەبباس میـرزای نایبوسـەڵتەنە بـە مەبەسـتی سەرکوتکردنی ڕەزاقولی خان ئیلخانی زەعفەرانلوو هێرشی کردە سەر قووچان، نەجەعفقولیخان

---

٣٠٥- شەهریاران گومنام، ل ٦٧ و ١١٥.

٣٠٦- سیاسەت و ئیقتساد عەسر سەفەوی، باستانی پاریزی، ل ١٩٢ کە لە کتێبی تەزکیرەتولملووك گیراوە و سەبارەت بە بایەخی پارەی ساڵی ١٠٢٨ ی کۆچی مانگی کە ڕۆژگاری شاعەبباسە دەڵێت: ٨ هـەزار بـار گەنم لە سیستاندا بە هەزار تمەن دەکرێت کە هەر تمەن دە هەزار دینار و هەر پەنجا عەبباسی، تمەنێکە.

٣٠٧- مەسعوودی کەیهان دەڵێت: کوردەکانی شادیلوو ١٨٨ هـەزار بنەماڵـەن و لـە بجنـوورد نیـشتەجێن و هەروەها ٢ هەزار بنەماڵەیێکیان ڕەشماڵ نشینن. هـەروەها دەڵێت قەراچۆرلووەکان ١٢٠ بنەماڵـەن و لـە دەوروبەری خواردان.

بە پێچەوانەی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ ڕەزاقولیخاندا بەستبووی، ئەو سەرکردە نەبەزەی لە مەیدانی شەرانخێزدا بە تەنیا بەجێهێشت و هەروەها ئیزنی بە جەعفەرقولیخانی کوڕی نەداوە کە یارمەتی ڕەزاقولیخان بدات. هەر لەم کاتەوە نێوانی کوردەکانی خوراسان شێواوە و حکوومەتی قاجاڕیش زۆرتر هەوڵی داوە نێوانی کوردەکان خراپتر بکات و بۆ ئەم مەبەستەش نازناوی «ئیلخانی» داوە بە نەجەفقولیخان شادیلوو. ئاکامی ئەم کارە بووە ئەوەی کە ڕەزاقولیخان بۆ تاران و پاشان بۆ ئازەربایجان دوور خرایەوە و کەچی لە نیوەی ڕێگادا کوژرا و سامخان و ئەبولفەیزخانی کوڕی ١٣ ساڵ لە بەندیخانەدا مانەوە و هەروەها حسەینقولیخان کوڕی ڕەزاقولیخان ٢٧ ساڵ لە بەندیخانەدا دیل و بەند کرا. لە سەردەمی قاجاڕ و پالەویدا زۆرتر لە هەموو کاتێ غەدر لە کوردەکان کرا.

ڕەزاشا سەرەتا عەشیرەتی کوردی شادیلووی کرد بە دوژمنی زەعفەرانلووەکان و لە ڕۆژی ڕۆشندا سەردار موعەزەز ئیلخانی شادیلوو و خزم و کەسوکارەکەی تیرباران کرد و کاتێ زانی عەشیرەتی شادیلوو هیچ توانایێکیان نەماوە، چووە گیانی کوردەکانی زەعفەرانلوو کە دوایی لەم بارەوە زۆرتر باس دەکەین. هیوادارم ئێستا و داهاتوو ئەم خەتا و هەڵەیە دووپات نەبێتەوە.

سەبارەت بە سنووری نێوان شادیلوو و زەعفەرانلووەکان زۆرم پرسیووە و چەند کەس لە زەعفەرانلووەکان وەها وڵامیان داوەتەوە: حاج دەوڵەت نامانلوو گوتی: کرمانجی خوراسان دوو بەشە: ١- زاخۆر ٢- شادی، هەروەها لە بابم پرسیارم کرد کە سنووری ئەم دوو عەشیرەتە کوێیە، وڵامی دایەوە دوو گوندی خەتابی نێوان بجنوورد و شیروانە کە خەتابێك گوندی شادیلووەکانە و گوندی خەتابی دووەم مەڵبەندی زاخووران زەعفەرانلووەکانە. گوندی تەگمەران تایبەتی زاخوورەکانە و لە تەگمەران بەرەو خوار مولکی شادیلووەکانە، حاجی ڕەمەزانی مامۆی نووسەر لەم بارەوە گوتوویەتی لە ناوچەی چواربۆرج و بیرزەینەڵبەیگ بەرەو ژوور هەتاکو دەگاتە سەرەخس مەڵبەندی زاخۆرییەکانە و لەوێ بەرەوخوار مولکی شیدییەکانە، شادیلوو ساڵەکانی ڕابوردوو هەر کەسێك لە ناوچەی چواربۆج بەرەوخوار بچوایات، هیچ کاتێ گەڕانەوەی نەبوو، کوردەکانی زەعفەرانلوو دەیانگوت: «وەسەر شیدیی داچوو». بەڕێز غوڵامحسەین ڕەحیمیان نوێنەری پێشووی مەجلسی شورای میللی وەهای نووسیوە: کاتێ کە

من هێشتا لاو بووم و کاتێ لە بجنووردەوە دەڕۆیشتم بۆ شیروان و هەروەها پیاوێکی بەساڵاچووی بجنوودیشم لەگەڵدا بوو و کاتێ گەیشتمە دەوروبەری «قەرەخان بەندی» سەبارەت بە سنووری نێوان زەعفەرانلوو و شادیلووو پرسیارم دەکرد و ناوبراو گوتی: «لاوێك جان ژەڤیراکە لەپاتیر، شیدیی[٣٠٨] یەوە هەواله تیرزاخۆرانە»

وەك گوتمان وا دیارە زەعفەرانلوو هەر ئەو زاخۆرانە بێت کە موحەممەدکازم بۆ یەکەم جار لە کتێبی عالەمئارای نادریدا باسی کردووە و دەڵێ زاخۆران گوندێکە کاول کە لە باکووری شیروانەوەیە و لە ژووری گوندی هونامە دایە. هەروەها لە کوردستانی عێراقیشدا زاخۆران یەکێ لە شارە گەورەکانی کوردە. لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە شادلوو لە بنەڕەتدا هەر شادیلوویە.

## عەشیرەتەکانی شادلوو و قەراچورلوو و لقە جیاجیاکانیان

عەشیرەتی شادیلوو و قەراچورلوو کە دانیشتووی شاری بجنووردن هەر کام چەند لقێکیان لێ دەبێتەوە کە جیاکردنەوەی ئەم لقانە کارێکی ئاسایی نییە. عەشیرەتی قەراچوورلوو لە شادلوو بچووکترە، بەڵام ئازایەتی و لێهاتووی قەراچورلووەکان کەس ناتوانێ ئینکاری بکات و لە بەرچاوی نەگرێ. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە بەرگی یەکەم و هەروەها باسی حسێنقولیخان قەراچورلوو[٣٠٩] لە بەرگی سێهەمدا.[٣١٠]

---

٣٠٨- بە پێی ڕێزمانی کرمانجی هەر کاتێ پیتی «الف» پیتی دووەمی وشەکە بێت دەبێتە «ی» نەناسراوە، وەك «خادیی» کە دەبێتە «خیدی»، «بارە» دەبێتە «بیرە»، «شادی» دەبێتە «شیدیی».

٣٠٩- حسێن قولیخان قەراچورلوو هاوڕێ سەردار موعەزەز کورد شادلووی والی بجنوورد و هەروەها چەند سەرۆکیتری ئەم دوو عەشیرەتە ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی بە فەرمانی ڕەزاشا و بە دەستی ئەمیرجان موحەممەدخان قاجاڕی ئامیرهێزی خوراسان دران لە سێدارە، ئەم کارە بەو بۆنەوە بوو کە ئەم کوردانە توانای ئەوەیان نەبوو بایی ماڵیە ٦٠ هەزا تمەن بدەن بە جان موحەممەدخان.

٣١٠- بەڕێز ئێحسان نووری نووسەری تاریخ ڕیشەی نژادی کورد سەبارەت بە وەی کە بۆچی کوردەکان بە تایبەت قەراچلوولووەکان بۆچی بە تورکی قسە دەکەن، دەڵێت: ئەگەرچی ناوچەی ئازەربایجان موڵکی مادەکان بووە و دانیشتووانی ئەم ناوچەیەش هەموو ماد بوون، بەلام بە جێگای ناوی کوردستان ناوی ئاتورپاتکانی لەسەر نرا، بەڵام بزانن کە دانیشتوانی ئازەربایجان هەمووی کورد بوون و لە ژێر فەرمانی پاشا

قەراچورلووەکان دوای دەسەڵات پەیداکردنی نادرشا بەرەبەرە خۆیانیان لە عەشیرەتی زەعفەرانلوو دزیەوە و خۆیانیان بە عەشیرەتی شادیلوو نزدیك کردەوە و ژن و ژنخوازی ئەم دوو عەشیرەتە ڕۆژبەرۆژ پێوەندیانی زۆرتر گەرم دەکرد.

پیاوە مەزنەکانی ئەم دوو عەشیرەتە هەر وەك زەعفەرانلووەکان و تەواوی کوردەکانی جیهان لە کاری شەڕ و بەربەرەکانێ و ئازایەتیدا زۆر خۆیانیان پیشان داوە و بە جێگەی ئەوەی لە میشکی خۆیان کەڵك وەربگرن لە زەبری دەست کەڵکیان وەرگرتووە و هەر بەو بۆنەوە هیچ بەڵگەیێکی خۆمان یان مێژوونووسێکی کوردمان نییە کە توانیبێتی فەرهەنگ و کولتووری نەتەوەکەمان لە نەمان بپارێزێ، بەڵام نووسەر زۆر ڕەنجی داوە و گوندبەگوندی کوردستانی خوراسانی داوەتە پاوە.

بەڵگەگەلێکی زۆرمان لە سەردەمی سەفەوی و نادر بە دەستەوەیە کە دەستبەدەست هاتووە و گەیشتۆتە دەستمان.

لێرەدا دوو باس هەیە کە عەشیرەتەکانی شادلوو و قەراچورلوو پێکەوە نزدیك دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە هەر دووی ئەم عەشیرەتانە لە باشووری قەفقازدا ژیاون و زمانەکەیان زۆر بە زمانی تورکیەوە نزدیکە و زمانەکەی خۆیانیان واتا زمانی کودییان بە زمانی دووەم داناوە و دەیژمێرین، بەڵام ئەم دوو عەشیرەتە هێشتا جلوبەرگی کوردی لەبەر دەکەن. جگە لەم دوو عەشیرەتە تاقمێك لە عەشیرەتە کوردەکانی زەعفەرانلوو وەکو کەیکانلوو و حەمزەکانلوو و بریانلوو و بارانلووەکان[٣١١] و... لە بجنووردا ژیاون.

---

کوردەکان و ڕەوادیەکان و شەدادیەکان دا بووە بەڵام لەبەر ئەوەی ساڵەهای ساڵ بوو ژێر چەپۆکەی کوردەکان بوون ئیزن نەدران کوردی قسە بکەن و بوون بە تورك. تەنانەت خۆشیان پەیان بەم ڕاستیە نەبردووە بە پێچەوانەی تورکی قسە کردنیانەوە هێشتا ناوە کوردیەکان لە نێوانیاندا ماوەتەوە وەك دەبنە لێەکانی خۆی گۆرانەکانی ژەزاییە قەرەچوولیەکانی ئەرەس باران کە خۆیان ددان بە کورد بوونی خۆیان دادەنێن. کوردبەچەکانی پوودەهێن دەوروبەری تاران کە وەك قەرەچوولێەکان بە تورکی قسە دەکەن بەڵام دەڵێن ڕەگەزمان کوردە هەروەها سەنیعون و لە نووسیوویەتی پوودەهێن ١٥٠ بنەماڵەی لیێە کە هەموویان لە کوردەکانی ئەروومین و کۆچیان کردۆتە ئەوێ. (مەتلە عوشەمس، ل ٩.)

٣١١- بەرازنلووەکان کە بەشێکن لە کوردە بارزانیەکانی کوردستانی باشوورو لە نزدیکی شووعان و لە گوندی بەرزانلوودا دەژین. (سەفەرنامەی ناسرەدین شا، ل١٠٩)

زۆربەی زانیاریەکانمان سەبارەت بە عەشیرەتی کورد لە سەفەرنامەکەی ناسرەدینشاوە وەدەست هێناوە و ئەم پاشایە ئەگەرچی بۆ وڵاتی ئێران نەهامەتی هێنا" بەڵام زۆر بایەخی بە باسەمێژووی و فۆلکلۆریەکان داوە.

ناسرەدینشا لە سەفەرنامەکەی ساڵی ١٣٠٠ی کۆچیدا کاتێ کە گەیشتۆتە گوندی فیرووزە، گوتوویەتی خەڵکی ئەم گوندە ٢٥٠ بنەماڵەن و هەموویان کوردی شادیلوون و هەروەها، دەڵێت عەشیرەتی شادلوو، غەم پرانلوو و دیرانلوو[٣١٢] هەر لەم ناوچەدان، شادیلووەکان لە بنەڕەتدا دیرانلوون.

سەنیعودەولە کە لەم سەفەردا هاوڕێ ناسرەدینشا بووە، دەڵێت: جەماوەری فیرووزە ٢٠٠ بنەماڵەن و هەموویان کوردی شادیلوون و بە زمانی تورکی قسە دەکەن.[٣١٣]

هەروەها سەبارەت بە «چواربید» نووسیوویەتی: گوندی «چواربید» چل بنەماڵەیە و زۆربەیان لە کوردەکانی شادیلوون.[٣١٤]

لقەکانی تری عەشیرەتی شادیلوو برتیین لە: بەدرانلوو، قلیچانلوو، قووچرانلوو[٣١٥] ئالانلوو، بووغانلوو، بووقانلوو، دیرقانلوو،[٣١٦] ئیزانلوو، قوردانلوو، گوردانلوو، جویانلوو، مترانلوو، قەرابشلوو، گریوانلوو، جاپانلوو و کاغانلوو.[٣١٧]

---

٣١٢- پێم وایە دەیرانلوو لە قەڵای دەیری کوردستانی توکیەوە گیرابێ. هەروەها دەیرانیەکانی کونبان پاشماوەی ئەو کوردانە کە سەلاحەدین ئەیووبی کۆچیانی داوەتە ئەوێ و ئەمڕۆ نشیتەجێ دەیرمانی باشووری دوورگەی سوورن.

٣١٣- مەتلەعوشەمس، ل ١٢٦ و ١٢٥.

٣١٤- مەتلەعوشەمس، ل ١٢٦ و ١٢٥.

٣١٥- زۆر سپاس برای هێژام ئەحمەدی کوردی قووچرانلوو دەکەم کە بەڵگەکانی ٢٠٠ ساڵی پێشی نایە بەردەستم، گوندی قووپرانلوو زۆرتر لە ٢٠٠ بنەماڵەن و ملە نزدیکی بجنووردەوەیە پاشماوەی قووپرانلووەکان لە گوندی بورج دان تاقمێك لە کاغانلووەکان ئیزانلووەکان و زەنگالووەکان دانیشتوئوی گوندی قوپرانلوون.

٣١٦- پێم وایە دیرقانلی گۆڕدراوی دلیقانلی بێت کە بە واتای ئەمین زەکی دانیشتووی کوردستانی تورکیەن.

٣١٧- خوالێخۆشبوو و مەردۆخ نووسیوویەتی: کاکەیی یان کاکانلوو یان کاغیانلوو ١٥٠٠بنەماڵەیێکن و دانیشتووی دەوروبەری کەرکوکن و هەروەها لە نێوانی خۆیجەوزابی بچووك و ناوچەکانی قوورتووە و خانەقینیشدا دەبینرێن. پێم وایە لە ڕەگەزی کاسۆ بن. (کورد و کوردستان ل١٠٣)

چاپانلووەکان و تاقمێکیتر لە عەشیرەتی شادلوو لە سەردەمی ئاغاموحەممەدخانی قاجاردا بۆ پاراستنی ئاسایشی ڕێگا و بانی تاران هاتنە دەماوەند، هەر وەك چلۆن لە سەردەمی نادردا عەممارلووەکان لە قووچانەوە کۆچ دران بۆ گیلان، سەنیعودەوڵە نووسیوویەتی: گوندی جاپان کە ڕێگای تاران، خوراسان لە ئەویەوە دەڕوات ٢٠٠ بنەماڵەن و لە عەشیرەتی کوردی شادلوون، کوردەکانی شادلوو کە لە ئەم ناوچەدا ژیاون و لە سەردەمی شای شەهید (ئاقاموحەممەدشا)دا ڕوویان کردۆتە ئەم ناوچەیە، واتا ساڵی ١٢١٠ی کۆچی بە فەرمانی پاشا لە بجنووردەوە کۆچیان کردووە و گوندی جاپان لە دۆڵێك دایە. ئەگەر نیم فرسەخ لە جاپانەوە بڕوی، دەگەییتە گوندی سەربەندان. جەماوەری سەربەندان ٨٠ بنەماڵەیە کە ٥٠ بنەماڵەی ئەم گوندە کوردی شادیلووە و بە فەرمانی پاشا باخێکیان بنیات ناوە کە پێی دەگوترێ «باخی شا».

ئەوەی کە نووسەر بیستوویەتی ئەوەیە کە عەشیرەتی بە ناوی «گاوەیستانلوو» واتا کەسانێ کە خەریکی کۆچن، ئەو کۆچە مەزنەی کە کوردەکانی مەهاباد و ئازەربایجان بۆ خوراسان ڕۆیشتن و گاکانیان لە دەماوەندا ماندوو بوون و توانای ئەوەیان نەما خۆیان بگەیەننە خوراسان و هەر لەوێ مانەوە.

بەڕێز غولامحسەین ڕەحیمیان کە زۆر تامەزرووی کولتووری کوردەکان بوو، سەبارەت بە کوردەکانی دەماوەند نووسیوویەتی کوردەکانی شادلووی دانیشتووی جاپانی دەماوەند لە سەردەمی موزەفەرەدینشادا دەستیان داوە بە شۆڕشەوە و بۆیە پاشا سەدرئەعزەمی ناردە دەماوەند تاکو سەرکوتیان بکات.

تاقمێك لە شادلووەکان لە کەلاردەشتدا مانەوە و تاقمێك لە کوردەکانی کەلاردەشت لە عەشیرەتی خواجەوەندی کرماشانن. کوردەکانی «حەسەنکەیف» تاقمێکیان لە کەلاردەشتدا دەژین.

گوندە کورنشینەکانی دەماوەند بریتین لە: ئەجویت، موکا، ڕووبارەك، مەجل، کورد

مەحەلە، توویدەرە، مەکارپوود لاهوو[٣١٨] و... هتد.

**جاپان:** پێم وایە جاپان دروست بێت، کە جاپان ناوی سەرکردەیێکی کوردی سوپای ئێراندا لە شەڕی دژ بە عەرەبەکاندا بووە. کوردەکانی جاپانی بجنوورد و دەماوەند دەڵێن: ئێمە لە نەتەوەی ئەم پیاوە مەزنەین، بەڕێز موحەممەد جاپانی کە خۆی زۆر شارەزای فەرهەنگی کوردییە، دەڵێت: باوك و باوەگەورەی ئێمە لە کوردەکانی جاپانی دانیشتووی دەماوەندن. کەچی لەوێوە ڕوویان کردۆتە قووچان و لەگەڵ کوردەکانی زافەرانلوودا تێکەڵ بوون.

نووسەر لەسەر ئەو باوەڕە بووە کە جاپان گۆڕدراوی «جاوان» و «جافان»ە کە لە عەشیرەتی جافەکان بوون، بەڵام بەڕێز جابانی لەسەر ئەم باوەڕە نین و بۆیە نووسەر جارێکی‌تر دەستی داوەتە لێکۆڵینەوە و بۆی دەرکەوتووە ئەم عەشیرەتە لە جابانی پاڵەوانی شەڕەکانی ئێران و عەرەبەوە گیراوە و هەروەها سەرکردەی سەربازە ئێرانیەکان بووە و لە شەڕەکانی ئالیس و نەمارێقدا کە ساڵی ١٤ی کۆچی ڕووی داوە هەر سەرکردایەتی کردووە.

جابان هەروەها لە شەڕی وەلجەدا بەشداری کردووە کە سەرکردەی ئێرانیەکان لەم شەڕەدا جادوویە بووە و سەرکردەی عەرەبەکان خالیدبن وەلید بووە.

دوای شەڕی وەلجە کە ئێرانیەکان شکستیان خوارد، ئەردەشێری سێهەم فەرمانیدا بە بەهمەن جادوویە تاکو لە قیساناوە ڕوو بکاتە ئالیس.

بەهمەن جادوویەی جابانی لە پێشەنگی سپاکەوە ڕاسپێر کرد و هاوکات بەهمەن جادوویە خۆی بۆ ڕاوێژ ڕووی کردۆتە دەرباری ئەردەشێر و بینیوویە کە ئەردەشێر نەخۆشە، جابان کە لە پێشەنگی سپاکەوە بوو و زۆربەی عەشیرەتە عەرەبەکان هاتنە یارمەتیەوە و خۆیانیان بۆ شەڕ ڕازاندەوە. خالیدکاتێ کە بیستی مەسێحیەکانی بەکر خۆیانیان بۆ شەڕ ڕازاندبووە، ڕووی کردە ئەو مەسیحیانە و هاوکات ئاگای لە هاتنی جابان نەبوو و لەم کاتەدا جابان خۆی گەیاندە ئالیس. ئێرانیەکان لەو بیرەدابوون کە چاك وایە نانی نیوەڕۆ بخۆن یان دەست بکەن بە شەڕکردن، کەچی ئەوەیان بە چاك زانی پێشتر نانی نیوەڕۆ بخۆن، بەڵام جابان لەو باوەڕەدا بوو

---

٣١٨- هێزی موونزێر لە سەفەرنامەکەی خۆی بۆ بجنوورد ناوی گوندی فەشەمی هێناوە.

کە پێشتر شەڕ بکەن، هەموویان بەو باوەڕەدا بوون کە نان بخۆن و کەچی هەروەهاش بوو و دەستیان کرد بە نان خواردن.[٣١٩]

خالید کاتێ بۆ ئەوێ هات، خێرا پەلاماری سوپای ئێرانی دا و لە بەر ئەوەی عەرەبەکان زۆر ڕێکوپێك بوون و بە جوانی بە قسەی سەرکردەکەی خۆیانیان دەکرد و بوو بە هۆی سەرکەوتنیانەوە و بە پێچەوانەی عەرەبەکان سوپا و هێزەکانی ئێران زۆر ناڕێکوپێك بوون و قەت بە قسەی سەرکردەکەی خۆیانیان نەکردووە و بوو بە هۆی شکستیانەوە، سپای ئێران لەم شەڕەدا ١٧٥ هەزار کەس و سپای عەرەب ١٢ هەزار کەس بووە. کاتێ کە عەرەبەکان هێرشیان هێنا، جابان گوتی مەگەر من نەمگوت دەبێ پێشتر هێرش ببەین، ئێستا دەتوانن چی بکەن و چیتان لە دەست دێت، هەروەها گوتی زۆر چاکە پاشماوەی پێخۆرەکەتان پڕ بکەن لە زەهر و بێنە مەیدانەوە، ئەگە سەرکەوتن زۆر چاکە و ئەگەر سەر نەکەوتن دوژمن ئەم پێخۆرە دەخوات و گیانی پڕی دەبێ لە زەهر و دەمرێ.

بۆیە ئێرانیەکان دەستیان لە خواردن هەڵگرتووە و چوونەتە مەیدانی شەڕانخێزەوە" بەڵام ئەم جارەش بە قسەی جابانیان نەکردووە و ژەهریان نەکردۆتە ناو پێخۆری خۆیانەوە و عەرەبەکان نانساجیەکەیان خوارد کە قەت نەیاندەزانی نانی ساجی چییە.[٣٢٠]

بەڕێز مەشکوور نووسیوویەتی بە بۆنەی ئازایەتی ئێرانیەکانەوە لەم شەڕەدا خالید سوێندی خواردووە کە ئەگەر بتوانێ سەر بکەوێ، ئەوندە لە ئێرانیەکان بکوژێ کە خوێن هەر وەکو ڕووبار بڕواتە پێشەوە. جاپان لەم شەڕەدا کوژراوە.[٣٢١] خالێد لەم شەڕەدا ٧٠ هەزار دیلی ئێرانی سەربڕیوە" بەڵام ڕووباری خۆین پێك نەهاتووە.

نووسەر دەڵێت: جاپان لەم شەرەدا نەکوژراوە، بەڵکو لە شەڕی ئالیسی بچووکدا کوژراوە.

---

٣١٩– ئەلکامێل، ئیبنوئەسیر، وەرگێڕاوی خەلیلی، بەرگی ٢، ل١٠٩

٣٢٠– دیارە کەسێ کە نانی گەنم بخوات، توانای بەربەرەکانێ نییە لەبەرانبەر ئەو کەسانەی کە نانی جۆیان دەخوارد.

٣٢١– ئێران لە سەردەمی باستاندا، موحەممەد جەواد مەشکوور، ل ٤٧٤.

## کوردەکانی شادلوو و سنوورەکانی باکووری ئێران

کوردەکانی شادلوو وەك چلۆن لە ناوچەکانی ئازەربایجان و قەرەباغ و ناوچە باشووریەکانی قەفقازدا بەرپرسی پاراستنی سنوورەکان بوون و دژ بە دوژمن بە تایبەت تورکانی عوسمانی وەستاون هاوکات لە خوراسانیشدا بەرپرسی پاراستنی سنوورەکان بوون ناوچەی ناوەندی دەسەڵاتداریێتی کوردەکانی شادلوو لە باکوورەوە دەگاتە ناوچەی خوارەزم و لە باشوورەوە دەگاتە شاهروود و کەویری خوراسان و لە ڕۆژهەڵاتەوە ئێسفەراین و شیروان لەبەر دەگرێت و هەروەها لە ڕۆژئاواوە دەڕواتەوە سەر ئەستەرئاباد. سەرکردە کوردەکانی شادیلوو کە مێژوو باسیانی کردووە بریتین لە: قووچی[٣٢٢] یووسف باوەگەورەی کوردەکانی شادلووی خوراسان کە دوای دەسەڵاتداریێتی شاعەلی سوڵتان، ناوبراو دەسەڵاتی تەواوی کوردەکانی خوراسان دەگرێتە ئەستۆ، ئەم دەسەڵاتە ساڵی ١٠٣٧ی کۆچی بە پێی فەرمانی شاعەبباسەوە دراوە.[٣٢٣] هەروەها نووسەری عالەمئاراش ئاماژەی پێ کردووە هەر ئەم یووسف سوڵتانە بوو کە هێرشی کردە سەر عەبدولموئمێنخان ئوزبەك و ئازایەتییێکی زۆری نواند و لە پلەی قوورچییەوە گەیشتە پلەی سوڵتانی.

٢- نەجەفقولی کوڕی قوورچی یووسف کە دوابەدوای باوکی بوو بە سەرکردەی شادلووەکان.

٣- ئەمیر گوونەبەیگ کوڕی نەجەفقولی بەیگ.

٤- تەولیخان کوڕی ئەمیرگوونەبەیگ، ناوبراو هەر ئەو کەسەیە کە شاری بجنووردی بە یادی قەلعەی بجنگردی ئازەربایجانەوە بنیات نا.

٥- جەعفەرقولیبەیگ کوڕی تەولیخان (دەولیخان)

٦- نەجەفعەلیقولیبەیگ کوڕی جەعفەربەیگ تاقمێك لە مێژوونووسان بە هەڵە

---

٣٢٢- قوورچی نازناوێك بوو بۆ پیاوە ئازا و لێهاتووەکان کە توانای هەڵگرتنی چەکی گەورەیان بوو.

٣٢٣- عالەمئارای عەبباسی، بەرگی ٢، ل ١٠٨٨.

نووسیوویانە نەجەفقولی بە فەرمانی شاتەهماسب کوژراوە.

٧- ئیبراهیمبەیگ کوڕی نەجەفعەلیبەیگ.

٨- جەعفەرقولیخان کە لە شەڕی دژ بە نادردا کوژراوە.

٩- نەجەفعەلیخان کوڕی جەعفەرقولیخان.

١٠- تەولیخان کوڕی نەجەفعەلیخان هاوچەرخی شاڕۆخ نادری کە ئەمانی ئەمیر عەلەمخانی خۆزەیمەی داوە.

١١- ئیبراهیمخان کوڕی تەولیخان کە کەوتە بەر ڕق و قینی ئاغاموحەممەدخانی قاجارەوە.

١٢- نەجفعەلیخان[٣٢٤] (نەجەفقولی) ناسراو بە ئیلخانی کە ئەم نازناوە فەتحعەلیشا پێی داوە.

١٣- جەعفەرقولیخان ئیلخانی سەهامودەوڵەی کوڕی نەجەفقولیخان ئیلخانی.

١٤- حەیدەرقولیخان ئیلخانی سەهامودەوڵەی برای جەعفەرقولیخان.

١٥- یارموحەممەدخان ئیلخانی سەهامودەوڵەی کوڕی یەزدانقولیخان.

١٦- عەزیزوڵڵاخان سالار موفەخخەم کوڕی یارموحەممەدخان کە بە فەرمانی ڕەزاشا لە دار درا.

سەنیعودەوڵە لە کتێبی مەتلەعوشەمسدا باسێکی بە سەر دێڕی «باسی ئیلخانیەکان و دەسەڵاتدارەکانی بجنوورد»دا نووسیوویەتی:

باوەگەورەی ئەم زنجیرەیە یووسف بووە کە بە فەرمانی شاعەبباس بوو بە سەرکردەی کوردەکانی شادلوو، دوای ئەوەی نەجەفعەلیبەیگی کوڕی بوو بە سەرۆك و کەچی دوای ئەویش ئەمیرگونەبەیگ و دوایی تەولیخانی کوڕی ئەمیرگوونەبەیگ و پاشان جەعفەرقولی کوڕی

٣٢٤- نەجەفقولی خاوەنی ١٢ کوڕی ئازا بووە کە ناقمێکیان برتیین لە: ١- جەعفەر قولیخان ٢- حەیدەر قولیخان ٣- قەهار قولیخان، ٤- عەلی مەردانخان ٥- موحەممەد ڕەحیمخان ٦- ئازادخان ٧- سوبحان قولیخان ٨- یەزدان قولیخان ٩- موحەممەد قولیخان ١٠- شیر موحەممەدخان و... هتد.

تەولیخان و هەروەها نەجەفعەلی‌بەیگ و ئیبراهیم‌بەیگ و جەعفەرقولی‌خان، تەولی‌خان،[٣٢٥] نەجفعەلی‌خان، جەعفەرقولی‌خان کە لە لایەن ناسرەدین‌شاوە ناز ناوی «ئیلخانی» پێی دراوە کە پێشتر نازناوی «میرپەنجەی» پێ داوە دوای جەعفەرقولی‌خان حەیدەرقولی‌خان دەسەڵات کەوتە دەستی، دەبێ ئاماژە بە ئەمەش بکرێ کە حەیدەرقولی‌خان و جەعفەرقولی‌خان و یەزدانقولی‌خان برابوون، دوای حەیدەرقولی‌خان، یارموحەممەد سەهامودەولە بووەتە سەرکردەی بجنوورد.

## نەجەفعەلی‌بەیگی دووەم، کوردی شادلوو و ئەمیرەکانی‌تری بجنوورد

نەجەفقولی‌بەیگ کوردی شادلوو کە زۆربەی مێژوونووسان نەجەفقولییان بە جێگای نەجەفعەلی نووسیوە کوڕی جەعفەرقولی‌بەیگی یەکەمە کە لە بەرگی یەکەمدا باسیمان کردووە و گوتمان کە فەتحعەلی‌خانی قاجار ئەم پیاوەی وەك لەمپەرێك دەبینی لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجەکانیدا و بۆیە هانی پاشای داوە تاکو پاشاش بە دەستی خۆی کوردی ناوبراوی کوشت و ئەم کارە بوو بە هۆی شۆڕشی کوردەکانی زەعفەرانلووەوە لە گوندی «یام»دا و کەچی ئەم کوردانە بۆ تۆڵە کردنەوە پەیمانی یەکیەتی لەگەڵ نادردا دەوەستن و داوایان کرد تاکو فەتحعەلیخان کەلەبچە بکرێت و پاشان بکوژرێت. نادر دوای ئەوەی گەیشتە شاری قووچان، بۆ چاوترسانی پاشا خێرا فەتحعەلی‌خانی کەلەبچە کرد و لە باخی پاشادا لە سێدارە درا و تۆڵەی نەجوفقولی‌خانی لێ کرایەوە و کوردەکان بەم بۆنەوە دەستیان لە شۆڕش هەلگرت، ئەم بەسەرهاتە ساڵی ١١٣٤ی کۆچی ڕووی داوە.

ئیبراهیم‌بەیگ شادلوو: لە ناو بنەماڵەی شادیلووەکاندا ناوی ئەم پیاوە دوای نەجەفقولی‌بەیگ هاتووە، بەڵام زۆر شارەزاییمان سەبارەت بە بارودۆخی ژیانی ئەو بە دەستەوە نییە.

---

٣٢٥- بنیاتنەری شاری بجنوورد.

**جەعفەرقولی‌بەیگ شادیلوو:** نووسەری مەتلەعوشەمس گوتوویەتی ناوبراو کوڕی ئیبراهیم‌بەیگە و کەچی هەر ئەو پیاوەیە کە زۆر دژایەتی لەگەڵ نادرشا کردووە و هاوڕێ عاشوور بەیگ پاپالووی ئەفشار، ماوەییێکی زۆر دژ بە نادر شەڕیان کردووە کاتێ کە نادر بۆ خواستنی کچی سام بەیگ هات بۆ قووچان جەعفەرقولی‌بەیگ زۆر هەوڵی داوە نادر بکوژێ و بۆیە لە شەڕێکدا کە ڕووی داوە خۆی بە تەنێ چووەتە پێشەوە و نێو دڵی سپاکەی کوتاوە و ویستوویەتی نادر تیرۆر بکات کەچی سەربازەکانی نادر دڵی جەعفەرقولی دەگرنە نیشانە و بێ‌گیانی دەکەن.

**نەجەفقولی‌خانی سێهەم:** ناوبراو کوڕی جەعفەرقولی بەیگ شادلووە و لە سەردەمی نادرشادا دەسەڵاتی بجنووردی لە ئەستۆ بووە، دوای مردنی نادر کە لەو ماوەیەدا وڵاتانی ئێران بە بێ پاشا مابووەوە، هاوکات کەریم‌خان زەند لە فارس و موحەممەد حسەین‌خان قاجاڕ لە ئەستەرئابادا داخوازی پاشایەتیان بووە، لەم کاتەدا موحەممەد حسەین‌خان بۆ سەرکوت کردنی توکمانەکانی «یووخاری‌باش» داوای یارمەتی کردووە لە نەجفعەلی‌خان و ناوبراو خۆی و دەولی‌خانی کوڕی هاوڕێی ١٠ هەزار سەربازی کوردی شادیلوو و قەراچولوو چوونە یارمەتییەوە و بوونە هۆی سەرکەوتنیەوە. موحەممەد حەسەن خان سەرکردەی عەشیرەتی ئاشاقەباش دوای ئەم سەرکەوتنە چووەتە شەڕی دژ بە کەریم خانەوە، لەم شەڕەدا ناکۆکی کەوتە نێوان خانی قاجاڕ و نەجەفعەلی‌خانەوە و هەر ئەمە بوو بە هۆی پشت هەڵکردنی کوردەکانی شادیلوو لە شەڕ و لە ئاکامی شەڕەکەشدا زەندەکان بە سەرۆکایەتی ئامرهێزی بەناوبانگ شێخ عەلی‌خان زەندەوە سەرکەوتن و کاتێ کە خانی قاجاڕ دەیەوێ دەرباز بێت، یەکێ لە کوردەکان سەری دەبڕێ و سەری لە لەشی جیا دەکاتەوە و بە دیاری دەیبات بۆ کەریم‌خان و بەم شێوەیە زنجیرەی زەندییە پێك دێت.

**تەولیخان دووەم:** ناوبراو دوای مردنی نەجەفعەلی‌خان باوکی بوو بە خاوەن دەسەڵاتی بجنوود و سەرۆکایەتی عەشیرەتی شادلوو خرایە ئەستۆی و تا ڕادەییێك توانی خۆی لە شەڕەکانی سەردەمی شارۆخ بدزێتەوە.

لە بەرگی یەکەمدا ئاماژە کرا کە کاتێ ئەمیرعەلەمخان خۆزەیمە[٣٢٦] لە ترسی کوردەکانی زەعفەرانلوودا لە خوراسان دەرباز بوو و خۆی خستە پەنای تەولیخانی شادیلووی ژن برای" بەڵام کوردەکانی زەعفەرانلوو دەست هەڵگرتەبوون و ڕایان گەیاند بە تەولیخان، یان دەبێ ئەمیر عەلەم بدەیتە دەستەوە وەیان خۆت بڕازێنەوە بۆ شەڕ و پێکدادان، تەولیخان لە ڕێی ناچارییەوە، ئەمیر عەلەمخانی دەرباز کرد و ناوبراو ڕەوانەی ڕۆژهەڵاتی خوراسان دەبێ" بەڵام لە کاتێکدا دەیەویست بڕواتە نێوان قەلعەی خەراوەوە لە دەوروبەری هەرات دەسگیر کرا و دوایی لە مەشهەد کوژرا.

**ئیبراهیمخان دووەم:** ناوبراو کوڕی تەولیخانە و دوای باوکی دەسەڵاتی بجنووردی گردۆتە ئەستۆ، کاتێ کە ئاغاموحەممەدخانی قاجار هاتە خوراسان واتا ساڵی ١٢١٠ی کۆچی کەوتە بەر شاڵاوی ڕق و قینی پاشای قاجارەوە و خرایە بەندیخانە و دوای مردنی ئاغاموحەممەدخان لە لایەن فەتحعەلیشاوە ڕزگار کرا.

## نەجەفعەلیخانی چوارەم -ئیلخانی- کورد شادلوو

نەجەفعەلیخان کورد شادلوو ناسراو بە ئیلخانی کوڕی ئیبراهیمخانە و لە ئامرهێزە بەناوبانگە کوردەکانی خوراسانە و هاوکات یەکێ لە سەرکردەکانی شەڕی ئێرانی دژ بە هەراتە و باوکی جەعفەرقولیخانێ سەهامودەولەیە.

بەشێك لە باسەکانی لە بەرگی یەکەمدا خرایە بەردەستی ئێوەی ئازیزەوە و لێرەشدا کورتەییێك باس دەکەین.

نووسەری تاریخ رێجال ئێران نووسیوویەتی: نەجەفعەلیخان شادلوو کوڕی ئیبراهیمخانە و یەکێ لە سەرکردە گەورەکانی خوراسانە و سەرۆکی عەشیرەتی کوردی شادلووش بووە کە لە

---

٣٢٦- عەرەبەکانی خۆزەیمە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی حەزرەت عوسمان(د.خ) و حەزرەت عەلی(د.خ) خۆیانیان گەیاندە خوراسان، سەرۆکی ئەم عەرەبانە لە سەردەمی ئەبوومسلیمدا خازم خۆزەیمە بوو و دوای ئەو خۆزیمەی کوڕی دەسەڵاتی پەیدا کرد و زۆر یارمەتی ئەبوو موسلیمیان داوە، خازم توانی شۆڕشی ڕاوەندییەی کووفە سەرکوت بکات. خوزەیمە باوەگەورەی عەلەمەکانی بیرجەندە.

لایەن فەتحەعەلی‌شاوە نازناوی «ئیلخانی» پێ دراوە. لە ساڵەکانی ١٢٣٤ تا ١٢٤٥ی کۆچی مانگیدا تا کاتێ کە کوردەکانی شادلوو و زەعفەرانلوو دژ بە حەسەینخان سەردار ئیروانی دەستیان داوە بە شۆڕشەوە و دەسەڵاتیان لێ وەرگردۆتەوە و نەجەفعەلی‌خان و ڕەزاقولی‌خان زۆر یەکتریان خۆش ویستووە.

ساڵی ١٢٤٨ی کۆچی کاتێ کە نایبوسەڵتەنە هێرشی کردە سەر قووچان، نەجەفعەلی‌خان پەیمانی یەکیەتی لەگەڵ ڕەزاقولی‌خاندا بەستبوو و بەڵام پەیمانەکەی خۆی شکاند و چووە یارمەتی نایبوسەڵتەنەوە، ساڵی ١٢٤٩ی کۆچی کاتی کە موحەممەد شای قاجار لە لایەن باوکیەوە کراوەتە بەرپرسی شەڕی هەرات، نەجەفعەلی‌خان چووەتە هانایەوە.

ئەڵلایارخان ئاسەفودەولەی والی خوراسان دوایی لە تاران گەڕاوەتەوە بۆ مەشهەد. ساڵی ١٢٥١ی کۆچی بۆ سەلماندنی توانایی خۆی تاقمێک لە سەرۆکە خوراسانیەکانی دەسگیر کردووە و ڕەوانەی تارانی کردوون کە نەجەفعەلی‌خان و سام‌خان دوو کەس لەو سەرکردانەن.

نەجەفعەلی‌خان زۆربەی ژیانی دژ بە تورکمانەکان شەڕی کردووە و زۆر جار شکستیانی داوە. ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی کاتێک کە موحەممەدشای قاجار بۆ داگیرکردنی هەرات ڕەوانەی خوراسان دەبێت لە چەمەن بەستامدا هەواڵی پێ ئەدەن کە ئەڵلاقولی‌خان تەوەرەیی والی خوارەزم، تاقمێک لە تورکمانەکانی گووگلان دانیشتووی گورگان و بەشێک لە خەڵکی قاری قەلعەی گوێزراوەتەوە بۆ ئەتەک تاکو خوارەزمدا نیشتەجێیان بکات، کاتێ ئەم هەواڵە دەگاتە دەستی ئاسەفودەولە خێرا نەجفعەلی‌خان شادلوودەکاتە سەرۆکی هێزێک و ڕەوانە شەڕی ئەڵلاقولی خانیان دەکات.

لەم شەڕەدا نەجەفعەلی‌خان سەردەکەوێ و زۆر کەس لە هێزی دوژمن کەلەبچە دەکات و ١٥٠٠ بنەماڵەی تورکمانەکانی گووگلان دەهێنێتەوە بجنوورد و لەوێدا نیشتەجێیان دەکات.[٣٢٧]

---

٣٢٧- ناسیخوتەواریخ قاجار، چاپ سەنگی، ل ٢٤٥، دەبێ ئاماژە بکرێ کە تورکمانەکانی گووگلان ئێران کە دانیشتووی باکووری ڕۆژئاوایی بجنوورد و ڕووباری ئەترەک بوون، بە دەستی نەجەفقولی‌خان و جەعفەر

ئاسەفودەوڵە، هەواڵی سەرکەوتنی نەجفعەلی‌خان لە چەمەن بەستامدا بۆ موحەمـەدشا دەگێڕێتەوە و موحەمـەدشا ڕوو دەکاتە مەشهەد و نەجەفعەلی‌خان و جەعفەرقولی‌خان کـوڕی دەچنە نێو سوپاکەوە و پێکەوە هێرش دەکەنە سەر هەرات و لە بـەرواری ٢٣ شـەعبانی سـاڵی ١٢٥٤ی کۆچیدا گەمارۆی هەرات درا" لەم شەڕەدا کوردەکانی شوقاقیش بەشداربیان کـردووە کە لەگەڵ سەربازە قەزوینییەکاندا بوو بە شەڕیان.

عەزیزخان کورد موکری ئامرهێزی گشتی سـوپای ئێـران، بـوو بـە نوێنـەر تـاکو لەگـەڵ سەرکردە ئەفغانیەکاندا وتووێژ بکات" بەڵام لەبەر ئەوەی بێ‌کەڵك مایەوە، فەرمانی هێرش لـە لایەن پاشاوە درا.

سەرکردەی کوردەکـانی شـادلوو لـەم سـەردەمەدا جەعفـەرقولی‌خـان شـادیلوو بـووە کـە ئازایەتییێکی زۆری لە خۆوە پیشان داوە. ساڵی ١٢٥٧ی کۆچی کاتێ کە سەرانـسەری گورگـان کەوتـە بـەر پـەلاماری مەخـدوومقولی تورکمانـەوە، موحەمـــەدشای قاجـاڕ فـەرمانی دا بـە جەعفەرقولی‌خان تاکو بە ٦ هـەزار سـوارەی خوراسانیەوە هێـرش بکەنـە سـەری و سـەرکوتی بکەن، کەچـی هـەرواش بـوو و جەعفـەرقولی‌خـان تـوانی دوژمـن شکست بـدات و کوڕەکـەی مەخدوومقولیـــشی کەلەبـچە کـرد و وەك بارمتـەیێك ڕەوانـەی دەرگـای پاشـایەتی کـرد و ئەستەرئابادی ئەهوەن کردەوە.

## جەعفەرقولی‌خان -ئیلخانی شادلوو- سەهامودەوڵە

جەعفەرقولی‌خان ئیلخانی کوردشـادلوو، کـوڕی نەجەفعـەلی‌خـان، دوای بـاوکی بـوو بـە حاکمی بـجنوورد و ئەستەرئاباد، ناوبراو کە یەکێ لە سەرکردە بەناوبانگەکانی خوراسان بـوو و زاوای ڕەزاقولی‌خانی کوردی زەعفەرانلوو بوو کە لە سەرکوتکردنی ئوزبەکەکان و تورکمانەکاندا دەورێکی گرنگی هەبووە، لە جەماوەردا کوڕەکانی نەجەفعەلی‌خان لـە شـەڕدا زۆر ئـازا و دلێـر

---

قـولی‌خـان کـورد شـادلوو نیـشتەجێ کـران، تاقمێـك لـەم تورکمانانـەش دانیـشتووی شـاری بجنـووردن، تورکمانەکانی جەرگەلان دوای ڕاپەڕینی سۆڤیەت هاتوونەتە ئێرانەوە.

بوون و بۆ پاراستنی سەربەخۆیی ئێران ڕەنجی زۆریان کێشاوە.

کاتێ کە جەعفەرقولیخان و بابی لە شەڕی هەرات و سەرەخسدا بەشداریان کردووە زۆر ئازایەتیان لە خۆ پیشان داوە و توانیان سەرانسەری دیلە ئێرانیەکان لە تورکمانەکان وەربگرنەوە.

لە خولی دووەمی شەڕەکانی هەراتدا کاتێ کە ئاسەفودەوڵە و هێزەکەی لە لایەن سوپای دوژمنە گەمارۆ دران جگە لە جەعفەرقولیخان کەس نەیوێرا بڕوات و ڕزگاریان بکات.[٣٢٨]

لەم شەڕەدا کە ئاکامەکەی سەرکەوتنی جەعفەرقولیخان بوو ٢٠ سەربازی کوردی شادلوو کوژران و دەرباز بووەکانی دوژمن نەیانتوانی خۆیان بگەیەننەوە هەرات.

جەعفەرقولیخان و هێزەکانیتری خوراسان، هاوڕێ لەگەل ئاسەفودەوڵەدا ڕوویان کردە هەرات تا خۆیان بگەیێننە موحەممەدشا، بەڵام ئەو کەسەی کە ڕێنوێنیان بووە غەدری لێیان کردووە و بە فەرمانی شیرموحەممەدخان هەزارەیی، ئەو هێزەی ڕێنوێنی کردووە تاکو لە دۆڵێکی بەرتەسك و نارێیەوە بڕۆن و عەشیرەتەکانی هەزارە لە دوو شوێنەوە هێرشیان کردە سەر سوپاکە و جەعفەرقولیخان و سوپاکەی لە ئەسپەکانیان دابەزین و ڕۆیشتنە سەر دوندی چیاکە.

خەڵکی هەزارە و تورکمانەکانی سالوور و عەشیرەتی ئەفشار بە دیتنی جەعفەرقولیخان زۆر ترسان و خێرا دەرباز بوون. جەعفەرقولیخان لەم شەڕەدا زۆربەی زۆری لە دوژمن کوشت، و دوای شەڕەکە جەعفەرقولیخان کەوتە بیری ئەوەی لە دۆڵەکە بکاتە ئەو بەرەوە، بەڵام گەرما و تینوویەتی زۆری بۆ سوپاکە هێنا و نووسەری ڕەوزەتوسەفا لەم بارەوە دەڵێت: بە فەرمانی سەرۆکی شادیلوو، هەر کام لە سەربازەکان ئاویان پێ بوو دایان بە تینووەکان و هەروەها جەوهەرلیمۆ کە تۆزیك تینوویەتی دەشکاند درا بە سوپاکە و توانی بەم شێوەیە لە مردنی سپاکە بەرگری بکات.[٣٢٩] لە شەڕێکیتردا کە لە «بالامەرغاب» ڕووی داوە جەعفەرقولیخان سەرۆکی ٢٠ هەزار سەرباز بووە و دوژمنی تێك شکاندووە و ٧٠٠ کەسی لێیان کەلەبچە کردووە، لە شەڕێکیتردا سوارەکانی شادیلوو بە سەرۆکایەتی موحەممەد ڕەحیمخانی برای

---

٣٢٨- ڕەوزەتوسەفا، بەرگی ٩، ل ٢١٢- ناسێخوتەواریخ، چاپ سەنگی، ل ٣٥٢.

٣٢٩- ڕەوزەتوسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٨/٢ و ٢١٢.

جەعفەرقولیخان لە نزدیکی سەرەخس و لە تەنیشتی چۆمی تەژەن[٣٣٠] دا زۆربەی زۆری تورکمانەکانی سەرەخس و جامی کوژران و ٧٠٠ کەسیشیان لێ کەلەبچە کرا و شادیلووەکان دەسکەوتێکی زۆری شەڕیان وەدەست هانی. دوا بە دوای ئەم سەرکەوتنە ئاسەفودەوڵە فەرمانیدا بە جەعفەرقولیخان تاکو بڕوات و لەگەڵ خەلکی مەیمەنەدا وتوویژ بکات، جەعفەر قولیخان کاتێ کە ڕۆیشت خەلکی مەیمەنە هاتنە پێشوازییەوە و دوای ١٢ ڕۆژ باس و لێدوان توانی دڵی خەلکی ناوچەکە وەدەست بهێنێ و هێنایانیەوە ژێر فەرمان و حوکمی ئێران. ئاسەفودەوڵە زۆر سپاسی جەعفەر قولیخانی کردووە و دوایی پێکەوە ڕوویان کردۆتە موحەممەدشا کە گەمارۆی هەراتی دابوو بە بۆنەی ئەوەی زلهێزەییێکی وەکو ئینگلیز، ئیزنی نەدا بە موحەممەدشا زۆرتر بمێنێتەوە. سوپای ئێران لە ڕووی ناچارییەوە دەستی لە شاری هەرات هەلگرت و ڕوویان کردە غووریان.

موحەممەدشا لە غووریاندا فەرمانی دا بە ئەمیر ئەسەدوڵڵاخانی عەلەم قایینی تاکو بڕوات بۆ قایین و توون و تەوەس و دەسەلاتی ئەوێ بگرێتە ئەستۆ و هاوکات موحەممەد عەلیخان کوڕ ئاسەفودەوڵە و جەعفەر قولیخان شادلووی هاوڕێ لەگەڵ ٦ هەزار سەرباز نارد تاکو بەرنگاری غووریان بووەستن، پاشا خۆی گەڕایەوە تاران، ئەڵڵایارخان ئاسەفودەوڵە کە پیاوی ئینگلیز بوو و لە شەڕەکانی ئێرانی دژ بە ڕۆس لە ئازەربایجاندا دەرباز ببوو و کەچی ئەمەش هەر پیلانی ئینگلیز بوو[٣٣١] و هەر ئەمە بوو بە هۆی تێك شکانی سوپای ئێرانەوە و کەچی دوای مردنی نایبوسەڵتەنە بوو بە والی خوراسان. لەبەر ئەوە قائیمەقام فەراهانی توانای بینینی ئەم پیاوەی نەبوو، دوور خرایەوە بۆ خوراسان و ناوبراویش کە پیاوی ئینگلیز بوو

---

٣٣٠- عەرەبەکان بە «تەژەن» دەڵێن «تەجەن» و ئێستا لە خاکی سۆڤیەت دایە و هەر ئەو شەهدرووەدەیە کە فیردەوسی لە شانامەدا باسی کردووە و زۆربەی شەڕەکانی ئێران و توورن لەوێدا ڕووی داوە و شەڕی یازدەش لەوێ ڕووی داوە.

٣٣١- ئاسەفودەوڵە یەکێ لە پیاوە گەورەکانی قاجاڕ بوو کە کوڕی موحەممەدخان دولووی قاجاڕ بوو و سەردەمێك سەدر ئەعزەمی فەتعەلیشا بوو، خۆشکی ئاسەفودەوڵە ژنی عەباس میرزای نایبوسەڵتەنە بوو. قائیم مەقام فەرهانی کاتێك ئاسەفودەوڵە لە مەیدانی شەڕی ئێران و ڕووسدا دەرباز دەبێت زۆر ڕەخنەی لێ گرتووە کەچی هەر بەم بۆنەوە لە لایەن عەباس میرزاوە لە تاران دەدرێ لە سێدارە. (دانشنامەی ئێران و ئیسلام، بەرگی ١)

و زۆر خۆشی ئەویست کە خۆی ببێتە قائێم مەقام، ئەگەرچی توانی قائێمەقام بکوژێ" بەڵام قەت نەبوو بە قائێم مەقام لەبەر ئەوە موحەممەدشای قاجاڕ میرزاقاسمی کرد بە قائێمەقام و هەر بەم بۆنەوە شۆڕشی کرد و بە پێ فەرمانی ئینگلیز ویستی خوراسان سەربەخۆ بکات" بەڵام کەسانێ وەکو سامخان زەعفەرانلوو و نەجەفعەلیخان شادلوو و جەعفەرقولیخانی کوڕی بوون بە لەمپەری ڕێگای و ناوبراو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ناوبراوانی ڕەوانەی تاران کرد تاکو لەوێ بخرێنە بەندیخانەوە" بەڵام جەعفەر قولیخان و نەجفعەلیخان لەبەر ئەوەی لە شەڕی هەراتدا ئازایەتی زۆریان پیشان دابوو و هەروەها لە شەڕی قووچاندا یارمەتی نایبوسەڵتەنەیان دابوو ڕزگار کران و ڕەزا قولیخان لە بەندیخانەدا مایەوە تا ڕۆژی مردن و سامخان و براکەشی تا ساڵی ١٢٦٤ی کۆچی، هاوکاتی ساڵی مردنی موحەممەدشا لە تاران مانەوە. ئاسەفودەوڵە لەم سەردەمەدا توانیبووی خۆی بە خانەکانی شادیلووەوە نزدیك بکاتەوە و یەکەمین هەلی سەرکەوتنی بۆ ڕەخسا، هەروەها خۆشکی جەعفەر قولیخانی خواست بۆ سالاری کوڕی و کچەکەی سالاریدا بە جەعفەر قولیخان.

حەسەنخان سالاری کوڕی ئاسەفودەوڵە کە هاوکات لە خوراساندا خاوەن دەسەڵات بوو بە بێئەوەی بۆ باردۆخی ناوچەکە و دەسەڵاتی کوردەکانی زەعفەرانلوو بڕوانێ سکەی دروست کرد و ئەم شێعرەی لەسەر پارەکەوە نووسی: «سکه بر زر میزند سالاردین یاورش باشد امام هشتمین» واتا: سەرکردەی دین سکەی لە زێڕلی داوە ئیمامی هەشت[٣٣٢] یارمەتی بدات.[٣٣٣] بەم شێوەیە سەربەخۆیی خوراسان ڕاگەیندرا.

کاتێ کە هەواڵی سەربەخۆیی خوراسان گەیشتە تاران، میرزا ئاقاسی سەدرئەعزەم وای بە چاك زانی جەعفەر قولیخان شادلوو لە سالار جیا بکاتەوە و بەڵام سەرنەکەوت.

نووسەری ناسێخۆتتەواریخ نوسیوویەتی[٣٣٤]: پاشا بە شۆڕشی جەعفەر قولیخانی دەزانی

---

٣٣٢– سەفەرنامەی خوراسان و کرمان، ئەفزەلوولمەلێك، بە تێکۆشانی قودرەتوڵلا ڕەوشەنی زەعفەرانلوو، ل ٨٤.

٣٣٣– ناسێخوتەواریخ قاجار، چاپ سەنگی، ل ٤٤٥.

٣٣٤– میر عەلی ئەسغەر کوڕی ئاغامیر ئەبوالقاسم بیاری (بجنوردی) کە یەکێ لە قوتابیانی قوتابخانەی ئوورنجە و کتێبی «موتەووەل»ی تەفتازانی چاپ کردووە و لە پەراوێزەکەیدا نووسیوویەتی: لێرەدا دوایی

و بۆیە لە نامەیێکدا داوای کرد لە ئاسەفودەولە تاکو خێرا جەعفەر قولیخانی ڕاسپێری تاران بکات، بەڵام جەعفەر قولیخان قەت نەچووەوە تاران و لە سالار جیا نەبووە" کاتێ کە پاشا زانی میرزا ئاقاسی توانای هێنانەوەی جەعفەر قولیخانی نییە، لە ڕێی ناچاریەوە سلێمانخان کورد دەنبەلی کە پیاوێکی بە ئەزموون بوو کردی بە والی شاهروود و بەستام تاکو ناوبراو ئاگاداری بارودۆخی خوراسان بێت. کاتێ کە سلێمانخان گەیشتە فیروزکۆ بۆی دەرکەوت کە بە بۆنەی نەزانکاری جەعفەرخانەوە، توکمانەکانی گوگلان و سالار شۆڕشیان کردووە.

تورکمانەکان توانیبوویان والی ئەستەرئاباد کە یەکێ لە پیاوە گەورەکانی قاجار بوو بە دیلی بیگرن.

سلێمانخان ئەم بارودۆخەی بە تاران ڕاگەیاند و خۆی لە فیروزکووە ڕووی کردە چاردە و کەلاتە و لەوێش بۆی دەرکەوت کە جەعفەر قولیخان لە نەردینیشدا دەستی داوە بە جەردەگەریەوە و ژن و منداڵەکەی موحەممەد حەسەنخانی کەلەبچە کردووە، ئەم بەسەرهاتانە هەمووی ساڵی ١٢٦٢ی کۆچی ڕووی داوە و سلێمانخان ئەم هەواڵەی گەیاندەوە تاران و هاوکات چەند ڕاپۆرتدەری ناردە خوراسان و ئەستەرئاباد و خۆی ڕووی کردە بەستام و لەگەڵ تورکمانەکانی فەرەنگ فارسیان و چەناشەنگ کۆساردا دەستی کرد بە وتووێژ و توانی بیانکات بە یار و هەڤاڵی خۆی.

لە سەرەتای ساڵی ١٢٦٣ی کۆچیدا ئاسەفودەولە ڕووی کردە تاران تاکو بتوانێ ڕێگای ڕاپەڕینی خەڵکی تاران خاوێن بکاتەوە و هاوکات هانی سالار و جەعفەر قولیخان بدات تاکو بە مەبەستی کوشتنی موحەممەدشا و گرتنی تاران پەلاماری ئەو ناوچەیە بدەن و هەروەها ئەگەر ئەم کارەیان پێ نەکرا بتوانن دەسەڵاتداریێتی بەستام و دامغان بە پارە بکرن و بۆ ئەم کارەش زێڕێکی زۆریان لەگەڵ خۆیاندا برد و سلێمان کورد دەنبەڵی بەم ئاکارەی زاینوە و کاروبارەکەی بە پاشا ڕاگەیاندووە.

یەکێتر لە کارە هەڵەکانی حاجی میرزا ئاقاسی لە باری ڕاپەڕینی سالارەوە لە

---

پیێ دێت، ئەم بەڵگەیە ڕۆژی دووشەممەی ساڵی ١٢٦٣ی کۆچی واتا ئەوڕۆژانەی کەسالار و جەعفەر قولی خان دژ بە پاشا شۆڕشیان کرد و پاشا سەرکوتیانی کرد.

خوراساندا ئەوە بوو کە بە پێی داخوازی ئاسەفولدەولەوە، میرزا موحەمەدخان بیگلەربەیگی برای سالاری کرد بە جێگری ئاسەفودەولە و سالاریش هاوکات کرا بە بەرپرسی کاروباری بارەگای ئیمام ڕەزا تاکو بەم شێوە دووبەرەکیێ بخاتە نێوان هەڤالانی ئەم دوو برا، بەلام ئەم کارە بە پێچەوانەی بیری ئەو بوو و قەت دوو بەرەکیێ نەکەوتە نێوانی دوو براکە.

سالار و جەعفەر قولیخان لە بیری داگیرکردنی قەلعەی کەلاتدا بوون تاکو لە کاتێکدا کە لە لایەن دوژمنەوە هێرش دەکرێتە سەریان بتوانن لەوێ پەنا بگرن، لەم کاتەدا موحەمەد وەلیخان قاجار و مستەفا قولیخان هەمەدانی هاوڕێ لەگەڵ سەربازەکانی قەراگوزلوو و ئاقاجانبەیگ و سەرهەنگ فەوج سەمسامخاندا بەرپرسی پاراستنی کەلات بوون.

حەسەنخان سالار لە نامەیێکدا داوای کرد لە خەڵکی کەلات تاکو دژ بە سپای پاشا بووەستن و یارمەتی ئەمان بدەن و لە لایێکیترەوە فەرمانی دا بە موحەمەدخان چەلایی تاکو درگای ئەرغەوانشای کەلات بگرێ و هەروەها ئەمیر ئەسەڵانخان کوڕیشی هاوڕێ لەگەڵ جەعفەرقولیخاندا ڕەوانەی درگای تەفتە کرد.

هەروەها فەرمان درا بە سلێمانخان دەرەگەزی تاکو لە درگای دووچەوە بڕوات، جەعفەر قولیخان کوردی شادلوو بوو بە هاوڕێی ئەمیر ئەسەڵانخان و کەچی لە ئاکامدا توانیان کەلات بگرن و زۆربەی زۆری خەڵکەکەیان کەلەبچە کرد و بڕیار وابوو تاکو ڕەوانەی قووچان بکرێن و لەوێوە ڕاسپێرێ ئەستەرئاباد بن بۆ ئەوەی بیافرۆشن بەتورکمانەکان" بەلام بەگەیشتنیان بە قووچان یەزدان ویردی خان کورد زەعفەرانلوو دیلەکانی دابەش کردە نێوان کوردەکان دا و وەکو مێوانێکی مەزن ڕێزیان بۆ دانرا و قەت یەکیانی نەدا بە دەستی هێزەکانی سالارەوە، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە سالار زۆر تووڕە دەبێ و دەڵێ دوای گەڕانەوەم لە عێراق دەبێ خەڵکی قووچان بە یەکجارە بکوژم.

سالار کاتێ ڕووی کردە عێراق یەزدان قولیخانی برای جەعفەرقولیخانی هاوڕێ ٣٢٠٠ بنەماڵەی شادلوو ڕاسپێری کەلات کرد تاکو بارودۆخەکەیان لە ژێر چاوەدێری دابێ.

هاوکات سلێمانخان دەنبەلی ئەم بارودۆخەی بە تاران ڕاگەیاند و پاشان خێرا ئیبراهیمخان سەڵماسی بە هێزێکی ڕازاوەوە کە هێزەکان بە لانی زۆرەوە لە عەشیرەتەکانی

ئەفشار، عەبدولمەلەکی، خاجەوەند و ئەفشاری ساینقەلعە و کوردە کریەکان بوون ڕەوانەی خوراسان کران.

سالار سەرانسەری خوراسانی جگە لە شیروان و قووچان کە بە دەستی کوردە زەعفەرانلووەکانەوە بوو داگیری کرد بوو و هاوکات ڕووی کردە سەبزەوار و فەرمانی دا بە جەعفەر قولیخان شادلوو تاکو بە هێزێکی ۱۲ هەزار کەسیەوە هێرش بکەن. جەعفەر قولیخان لە ڕێگای کەلاتە خیجەوە ڕووی کردە گوندی قەهیج و لەوێ تۆزیك مایەوە کە سوپای دوژمن یەك فرسەخ و نیم پێیەوە دوور بوون، سپای ئێران لەم شەڕەدا سەردەکەوێ و جەعفەر قولیخان پاشەکشێ دەکات و ڕوو دەکاتە مەزنیان و لەوێ لەگەڵ سالاردا یەك دەگرنەوە و هاوکات موحەممەدخان بوغایری،[۳۳۵] جەهانگیر خان و سلێمانخان دەرەگەزی و موحەممەد ڕەحیمخان برای سلێمانخان لە نێو سپای جەعفەر قولیخاندا بوون.

لەم کاتەدا موحەممەد عەلیخان ماکوویی بە کەرەستەی شەڕەوە لە دامغانەوە خۆی گەیاندە دێیە مەلا تاکو لەوێ خۆی بگەیەنێتە ئیبراهیم خەلیلخان. هێزە سوارەکانی جەعفەر قولیخان لە تەنیشتی دێیە مەلا هێرشیان کردە سەر سوپای ئێران" بەڵام توانای بەربەرەکانیان نەبوو و دەرباز بوون.

ڕۆژی دوایی ئیبراهیم خەلیلخان لە تەنیشتی دێیە مەلادا خۆی گەیاندە موحەممەد عەلیخان ماکوویی و ڕۆژی دوایی شازادە حەمزە میرزای برای موحەممەدشا کە کرابووە بەرپرسی گرتنەوەی خوراسان بە کەرەستەیێکی زۆرەوە لەگەڵ ٥ هەزار سەرباز خۆیانیان گەیاندە سوپای قاجاڕ و ئاگاداری پیلانەکەی سالار کە گرتنەوەی میامی بوو، بوونەوە.

لە شەڕێکدا کە لە زەوینەکانی ئەرمیاندا لە نێوان هەر دوو سپادا ڕووی دا، هێزەکانی ئێران تەنگیان لە جەعفەر قولیخان و سالار هەڵچنی و ڕێگەچاریان بوو بە پاشەکشێ و دەرباز بوون. یەکێتر لە خاڵە گرنگەکانی شکستی سالار ئەوە بوو کە سپاکەیان خۆی بۆ شەڕی دژ بە سپای قاجاڕ نەڕازاندبووەوە، کەچی یەکێ لە سەربازەکانی سالار خۆی گەیاندە حەمزەمیرزا و

---

۳۳۵– بۆ غایریەکان لە عەشیرەتەکانی مەغوولی دانیشتووی خوراسانن.

گوتی هەر ئێستا کەریم دادخانی هەزارە و ئیبراهیمخان ڕادەکانی و حسەینخان بیش ئاقاجی هاوڕێ لەگەڵ سەربازە خوراسانی و هەزارییەکان دەیانئەوێ خۆیان بخەنە نێو سپاکەی ئێوەوە. بەم شێوەیە بەشێك لە سپای سالار بوون بە سەربازی حەمزە میرزا و هەروەها ڕۆژی دوایی قازی نەیشابوور و عەبدولعەلیخان سەرهەنگ خۆیانیان گەیاندە شازادە و تەسلیم بوون.

سالار بەرەو جووەین پاشەکشێێ کرد و خۆی گەیاندە قەڵای جەغتای، نیوەشەو سلێمانخان دەرەگەزی کە خۆی یەکێ لە هەڤاڵانی سالار بوو. سواری ئەسپ دەبێ و خۆی دەگەیەنێتە حەمزە میرزا و پێی ڕادەگەیەنێ کە سالار و جەعفەر قولیخان دەیانەوێ خۆیان بگەیەننە کەلات و ئێستا ئەگەر بەڕێزت ئیزن بدەی، ئەمن ڕوو دەکەمە دەرەگەز و بەهێزەکانی خۆمەوە، بەرنگاریان دەوەستم" بەم شێوەیە سلێمانخان خەڵکی دەرەگەز کەلاتی هاندا تا کو هێرش بکەنە سەر سپای شادلوو. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە بۆ کتێبی سەفارەتنامەی خوارەزم، ل ٧٥.

سالار و جەعفەر قولیخان لە بەرانبەر سپای دەوڵەتیەوە تەنیا مانەوە و بۆیە بەرەو بجنوورد پاشەکشێان کرد.

جەعفەر قولیخان خەڵکی شار و پیاوە گەورەکانی شادلووی کۆ کردەوە و ڕایگەیاند دەبێ هەمووومان یارمەتی سالار بدەین لە بەر ئەوەی ئەم پیاوە مەزنە لە لامان میوانە، خەڵکی بجنوورد ڕایانگەیاند کە هەموو قسەکانت ڕاستە" بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە حەمزە میرزا و سوپاکەی لەم نزیکانە دان و ئێمە توانای بەربەرەکانێمان نییە و چاك وایە ئێوەش خۆ بدەن بە دەستەوە.

جەعفەر قولیخان بۆی دەرکەوت کە خەڵکی بجنوورد یارمەتی نادەن و بۆیە ژن و منداڵەکەی خۆی هەڵگرت و هاوڕێ سالار لە بجنوورد دەرچوون و ڕوویان کردە گوندی ڕاز و دوایی لەوێوە خۆیانیان گەیاندە «تووقتەمش» و پەنایان بردە تورکمانەکان، حەمزە میرزا هێرشی کردە بجنوورد و لەوێدا بۆی دەرکەوت کە خەڵکی مەشهەد دژ بە سالار دەستیان داوە بە شۆڕشەوە، بۆیە موحەممەد عەلیخان ماکوویی کە زۆر ئازا و دلێر بوو لە لایەن حەمزە میرزاوە فەرمانی پێی درا تاکو ببێتە والی بجنوورد و شیروان و قووچان واتا حکوومەتی

عەرەبخانەی خوراسان خرایە ئەستۆی ئیبراهیم خەلیلخان خوویی و کورد خانەش درایە دەستی موحەممەد عەلیخانی ماکوویی و ناوەندی حکوومەتی ماکوویی بوو بە شاری بجنوورد. حەمزە میرزای برای پاشا فەرمانی دا بە موحەممەد عەلیخان تاکو لەگەڵ هێزێکی سەربازی ماکوویی و هێزێکی سەربازی تورک بەیات و ٤ دەستگا تۆپەوە لە بجنوورد بمێننەوە و خۆی ڕۆژی ١٧ی زیقەعدەی ساڵی ١٢٦٤ی کۆچی ڕووی کردە شاری مەشهەد.

موحەممەد عەلیخان تورکەکانی بەیاتی نارد بۆ قەلعەی گرمەخان تاکو بەرنگاری جەعفەر قولیخان ببنەوە و هاوکات خۆیشی هاوڕێ تورکە ماکووییەکان خۆش ڕای دەبوارد و زۆر زلم و زۆری لە خەلکی ناوچەکە دەکرد و کەسیش توانای هیچ باسێکی نەبوو، بەم زۆڵم و زۆر تەنگی لە خەلکەکە هەلچنی و لە نهێنیدا نامەیێکیان بۆ جەعفەر قولیخان نووسی و داوایان کرد تاکو وەرگەڕێتەوە و ئەوانیش دەست بدەن بە شۆڕشەوە. جەعفەر قولیخان خێرا گەڕایەوە و هێرشی کردە سەر تورکەکانی دەرمانە و سەملقان و گەرمەخان و ٥٠٠ کەسێ لیێان کەلەبچە کرد و خۆی گەیاندە نزدیکی بجنوورد و هەواڵی گەڕانەوەی خۆی گەیاندە خەلکی شاری بجنوورد و خەلکەکەش بە بیستنی ئەم هەواڵە دەستیان دا بە شمشێرەوە، زۆربەی زۆریان لە پیاوە دەولەتیەکان کوشت و دەروازکانیان بۆ جەعفەر قولیخان ئاوەلاکرد و ئەوانیش خۆیانیان گەیاندە نێو شارەوە و کاتی موحەممەد عەلیخان بەم کارەساتەی زانیووە، تۆپەکانی خستۆتە کار و شاری داوەتە بەر تۆپ و کەچی خەلکی بجنوورد کەوتنە بەر پەلاماری پیاوە دەولەتیەکانەوە" ئەم شەڕە ١٥ ڕۆژ درێژەی بوو و هەواڵی ئەم شەڕە گەیشتە شاری مەشهەد و حەمزە میرزا زۆر ئەم کارە ساتەی بەلاوە دلتەزێن بوو و نامەیێکی بۆ یەزدان وێردیخان نووسی و ڕایگەیاند کە ئێمە خۆمان چاك دەزانین هیچ دەسەلاتێك نەدراوەتە دەستەوە، بەلام لەبەر ئەوەی دەزانین کە زەعفەرانلووکان و خەلکی قووچان بە قسەی تۆ دەکەن و داواکارین کە هێزێك برازێنەوە و هێرش بکە سەر بجنوورد، بۆیە یەزدان وێردیخان بە خەلکی ڕاگەیاند کە چاك وایە ئەمڕۆ ئێمە یارمەتی سپای ئێران بدەین، کەچی خەلکی شار بە

قسەیان کردووە و پێکەوە لەگەڵ یەزدان وێردیخاندا هێرشیان کردە سەر بجنوورد.[٣٣٦] کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە بجنوورد جەعفەر قولیخان ڕووی کردە ئاقخاڵ و یەزدانوێردی خان خۆی گەیاندە بجنوورد، دوای چەن ڕۆژ حەمزە میرزا هاتە بجنوورد و بارودۆخەکەی تاقی کردەوە و خەڵکێکی زۆری ئازار داوە" بەڵام لەبەر ئەوەی وەرزی زستان بوو و هاوکات حەمزە میرزا ڕووی کردە مانە و سملقان و لەوێدا مایەوە و دوای ماوەیێك کەوتە بەر پەلاماری جەعفەر قولیخانی شادلووەوە.

شازادە لە ترسی گیانی خۆیدا دەرباز بوو و ڕووی کردە مەشهەد، دوای ماوەیێك سالار و جەعفەر قولیخان ڕوویان کردە کەلات و کاتێ ویستیان لە قووشخانەوە بەرەو کەلات بڕۆن، یەزدان وێردیخان ناو ڕێی پیێان گرت و ئەوانیش لە ڕێگای ناچارییەوە گەڕانەوە و لە ڕێگای خوارەزمەوە ڕۆیشتن، بەم بۆنەوە سالار داوای یارمەتی لە والی بوخارا کردووە.

بەهاری ساڵی ١٢٦٤ی کۆچی حەمزە میرزا گەیشتە چەمەن ڕادەکان و گوویاغ و هەواڵیان پێ گەیشت کە مەلاحسەین بەشروویەی خۆی گەیاندوەتە مەشهەد و بووەتە هەواڵی میرزا عەلی موحەممەد باب و هاوکات هەواڵی پێ گەیشت کە سالار و جەعفەر قولیخان شادلوو و ئاراز خان سەرەخسی بە مەبەستی داگیر کردنی مەشهەدەوە تا کەلی یاقووتی گەیشتوون.

حەمزە میرزا بەشێکی زۆری لە سوپاکەی ناردە مەیدانی ئەم هێزەوە، بەڵام شکستیان خوارد و بەرەو مەشهەد پاشەکشەیان کرد.

هاوکات شاری مەشهەد پڕ بوو لە نالەباری و شەڕ و ئاژاوە و هەروەها سەربازە تورکەکان خۆیانیان خستە حەمامی ژنانەوە و ژنی زۆریان بێناموس کرد و بۆیە مامۆستا ئایینەکان فەرمانی جیهادیان داوە.

شازادە حەمزە میرزا لە ترسی گیانیدا ڕووی کردە شار" بەڵام حەسەنخان کورد زەعفەرانلوو ڕێگای پێ نەدا و لە شەڕێکدا کە لە نێوانیاندا ڕووی دا حەسەنخان کوژرا و حەمزە

---

٣٣٦- ناسێخوتەواریخ قاجار، چاپ سەنگی، ل ٤٦٠.

میرزا لە «سەرشوور»ەوە خۆی گەیاندە شار، خەڵکی مەشهەد ئازایانە چەندین ڕۆژ شەڕیان کرد و سالار ئاگای لەم کارەساتە نەبوو و جەعفەر قولی‌خان شادلووی ڕەوانەی هەرات کرد و داوای یارمەتی کرد لە والی هەرات.

دوای ماوەیێك یارموحەممەدخان و جەعفەر قولی خۆیانیان گەیاندە نزدیکی مەشهەد و یارموحەممەدخان بە نهێنی نامەیێکی بۆ حەمزە میرزا نووسی و گوتی من هاتووم یارمەتی ئێوە بدەم و هاوکات لە نامەیێکدا داوای لە سالار کرد تاکو خێوە تگلاکەی پیێ پیشان بدات، جەعفەر قولی‌خان ئاگای لەم ناپیاویە نەبوو و پێش ئەوەی بگاتە مەشهەد بە دەستی سەربازەکانی یارموحەممەد کەلەبچە کرا و خێرا برایە بارەگای حەمزە میرزا جەعفەر قولی‌خان توانی لە بەندیخانە دەرباز ببێت و خۆی بگەیەنێتەوە جەماوەری شۆڕشگێڕەکان.

ڕۆژیی دوایی کاتیێ کە جەعفەر قولی‌خان خەڵکی بۆ شەڕ هان ئەدا هێرشی کردە سەر سپای یارموحەممەد و حەمزە میرزا و شکستیانی دا و هەتا فەریمان ڕاویانی نا. خەڵکی شار هاوکات تووشی وشکەساڵی بوون. نووسەری ڕەوزەتوسەفا دەڵێت: وەها وشکە ساڵێك بوو کە نان مەنێکی بە دوو تمەن دەفرۆشرا و بە بۆنەی خۆپیشاندانی سالار و جەعفەر قولی‌خانەوە، مەشهەد گیرایەوە.

لەم کاتە بە دواوە مەشهەد لە ژێر دەسەڵاتی سالاردا بوو و تا سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ناسرەدین‌شا هەر مەشهەدیان بە دەستەوە بووە.

لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەمان بە ئەوە کرد کە سام‌خان زەعفەرانلوو لە بەندیخانە دەرباز بوو و دامەزراندنەوەی خوراسان بوو بە یەکەمین کاری و هاوکات حەمزە میرزای مامۆی پاشای بیێدەسەلات کرد و حێسامولسەڵتەنەی کرد بە والی خوراسان.

کاتیێ کە سام‌خان و حێسامولسەڵتەنە بوون بە هەڤاڵ، سالار و جەعفەر قولی‌خان بیێ دەسەلات بوون.

ئەمیرکەبیر وەفدێکی ڕەوانە کرد تاکو لەگەڵ سالار و جەعفەرقولیدا باس بکەن، نووسەری ناسێخوتەواریخ لەم بارەوە باسی کردووە و دەڵی ئەمیرکەبیر بۆ باس و وتوویژ حاجی نوورموحەممەد و سلێمان‌خان ئەفشاری ڕەوانەی مەشهەد کردووە، ئەم وەفدە لە بەند

فەریماندا لەگەڵ سالاّر و جەعفەر قولیخان باس و وتووێژیان کردووە. بەڵام سالار ئاوڕی لێیان نەدایەوە و جەعفەر قولیخان خۆی دابەدەستەوە و ڕووی کردە ڕووین دژی ئێسفەراین و لەوێوە ڕەوانەی تاران بوو و بە گەیشتنی جەعفەر قولیخان، ئەمیرکەبیر زۆر ڕێزی بۆی داناوە و ناسرەدینشاش حورمەتی گرتووە، بەڵام سالار هەر دژایەتی دەکرد و تاکو لە مەشهەددا گەمارۆ درا و دوای یەك ساڵ کەلەبچە کرا و لە مەشهەد دران لە سێدارە.[٣٣٧]

## دەوری ڕاپۆرتدەرانی ئینگلیزی و فەڕانسەوی لە پێك هێنانی ئاژاوەی سالاردا

لە سەردەمی شاعەبباسەوە کە شێرلییەکان خۆیانیان گەیاندە ولاّتانی ئێران و توانیان دەستی زلهێزەی ئینگلیز درێژ بکەن بە سەر ناوچەکەدا، یەکێ لە کارە هەرە گرنگەکانیان دووبەرەکێ خستنە نێو گەلانی ئێران بوو، ئاشوی حەسەن سالار لە خوراساندا یەکێ لەو پیلانانە بوو کە ئینگلیزییەکان بۆ خەڵکی ئێران دایانڕشت.

موحەممەدشای قاجاڕ ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی کە پەلاماری هەراتی دا، ئینگلیز ئیزنی داگیرکردنی پێ نەدا و پاشای ناوبراو کاتێ کە لە هەرات گەڕایەوە جەعفەر قولیخان شادلوو و موحەممەد عەلیخانی کوڕی ئاسەفودەوڵە و ٦٠ هەزار هێزی لە نزدیکی هەرات دانا تاکو

٣٣٧- سالار بە پێشنیاری کولوونێل شیل باڵیۆزی ئینگلیز لە تاران دەستی داوە بە شۆڕشەوە، ئەگەرچی سالار نەیتوانی خوراسان بەش بەش بکاتەوە، بەڵام دوای کوشتنی پیاوانێك وەك ئەمیر کە بیرو سامخان زەعفەرانلوو توانی ئەفغانستان لە ئێران دابڕێکات. شیل زۆر ڕقی بوو لە ئەمیر کە بیرو سامخان لەبەر ئەوەی ئەمیر کە بیر ئاوڕی لە پاڕانەوەکەی شیل نەدابووەوە و سالاری لە تاراندا درا لە سێدارە. سامخانیش لەبەر ئەوەی ئیزنی جیابوونەوەی ئەفغانستانی نەئەدا کەوتە بەر شالاّوی ڕق و قینی شیلەوە و بۆیە هانی دەسەلاّتدارانی قاجاڕی ئەدا تاکو دژ بە سام خان بووەستن. (ئەمیر کەبیر و ئێران، فەرەیدوون ئادەمییەت، ل ٨، ٦٤٢)

بەڕێز مەکی نووسیوویەتی بنەماڵەی ئاسەفودەوڵە فەرمانبەری ئینگلیزییەکان بوون، باڵیۆزی ئینگلیز لە تاران (شیل) بە پێی ڕاپۆرتی ڕۆژی ١٩ی ئوکتوبری ١٨٤٨ی زایینی بۆ وەزیری دەرەوەی ئنگلیز، دەڵێت بنەماڵەی ئاسەفودەوڵە لە خزمەتی ئێمەدا بوون و ئەمانە غولامی حەڵقەبەگوێی ئێمەن. (ژیانی میزاتەقی خان ئەمیر کەبیر، حسێن مەکی، ل ٢٧٢)

ئاگاداری بارودۆخەکە بن.[٣٣٨]

ئاسەفودەولەی خالۆی عەباس میرزا ئاواتی ئەوە بوو کاتێ کە موحەممەد میرزا دەبێ بە پاشا، ناوبراو بکات بە وەزیر، بەلام موحەممەد شا، میرزا ئاقاسی کرد بە وەزیر و ئاسەفودەولەی بە شێوەییێکی لەسەر خۆوانە دوور خستەوە بۆ خوراسان و کردی بە دەسەلاتداری ئەوەی، ئاسەفودەولە لە شوێن هەلێك دەگەڕا قەرەبووی ئەم سووك کردنە لە میرزا ئاقاسی بکاتەوە.

بەلام باسی خوراسان و هەرات بۆ پاراستنی ئارامشی هێندۆستان زۆر گرنگ بوو و هاوکات هیند ژێرچەپۆکەی ئینگلیسەکان ئینگلیزیەکان بوو و ئینگلیزییەکان توانیان پیاوێك بە ناوی فەریەی فەڕانسەوی بکەن بە ڕاپۆرتدەری خۆیان لە کۆشکی پاشایەتی ئێراندا. فەریە سالی ١٢٥٥ی کۆچی مانگی هاوڕێ حسێنخان ئاجوودانباشی هاتە ئێران، بەلام کاتێ حکومەتی ئێران بۆی دەکەوت کە ڕاپۆرتدەرێکی فەڕانسەویە لە ئێران دەریان کرد. فەریە سالی دوایی بە جلوبەرگی هەژارانەوە ڕووی کردە خوراسان و چووە چاوپێکەوتنی ئاسەفودەولەوە و هانی دا تاکو دژ بە دەسەلات بووەستێ و دلنیای کرد کە سەر دەکەوێ.

فەریە دەلێ: لە مەشهەددا تاقمێکی زۆر هاتنە چاوپێکەوتنم و بە تایبەت ئیمام جومعە کە پیاوێکی نەرم و نیان بوو و لێرەدا زۆر سپاسی مەلامێهدی دەکەم کە بە بۆنەی ناوبراوەوە من توانیم ئەو کەلەپیاوە بناسم.

مەلا مێهدی تا چەند سالی ڕابردوو مەلای یەهوودییەکان بوو و دوایی ئایینی ئیسلامی بۆ خۆی هەلبژاردووە.

هەر وەك چلون ئاسەفودەولە سالی ١٢٦٣ی کۆچی بە زێڕێکی زۆرەوە ڕووی کردە تاران تاکو بەم بۆنەوە وەزیرموختاری ئینگلیز یارمەتی بدات میرزا ئاقاسی بێ دەسەلات بکەن و خۆی ببێ بە وەزیر. وەزیرموختاری ئینگلیز لە گوزارشتێکدا کە بۆ لەندەنی ناردووە، وەها دەلێت: ئاسەفودەولە و بنەمالەکەی بە گشتی و هەموو کاتێ لە خزمەتی دەولەتی ئینگلیز

٣٣٨- گۆڤاری یەغما، سەرماوەزی سالی ١٣٤١ی کۆچی، ل ٤٢٣ نووسراوەی بەڕێز سەعادت نووری.

دان، چاوەڕوانـم لە چاوپێکەوتنێکی خۆمانیدا بتوانـم کارێك بکەم تاکو پوستی وەزارەتـی پێـیٚ بدریٚ.[٣٣٩]

بەڵام موحەمـمەدشا کە چـەند جـار هـەواڵی ناپیـاوی ئاسـەفودەوڵەی پـیٚ گەیشت و[٣٤٠] ناوبراوی بۆ عێراق دوور خستەوە و ئاژاوەی سالار هاوکات لە خوراساندا دەستی پێکرد. کەچی سامخان و حێساموسەڵتەنە توانیان موحەمـمەدشا سەرکوت بکەن.

## حکوومـەتی جەعفەر قولی‌خان شادلوو لە ئەستەرئاباد و ڕزگارکردنی دیلە ئێرانیەکان و بەدی هاتنی ئارامش لەو ناوچەیەدا

جەعفەر قولی‌خان شادلوو ساڵی ١٢٦٥ی کۆچی هەتا ساڵی ١٢٧١ واتا شەش سـاڵ لـە تاران مایەوە و موحەمـمەد ڕەحیم‌خانی برای لـەم کاتـەدا فـەمانڕەوای بـجنورد بـوو. (بڕوانـە بەرگی یەکەم)

نووسـەری ناسـیخۆتەواریخ نووسـیوویەتی: سـاڵی ١٢٧١ی کۆچـی جەعفـەر قـولی‌خـان بـجنووردی بوو بە والی ئەستەرئاباد و جاجەرم و نەردین و میـرزا ئیسماعیل‌خـان مازنـدەرانی بوو بە جێگری ناوبراو و ڕۆژی ٨ی ڕەبیوسانی هاوڕیٚ سەربازە عەرەبەکان و کوردە چەگەنیەکان و شادلووەکان خۆی گەیاندە ئەستەرئاباد و خەڵکێکی زۆر هاتنە پێشوازییانەوە لە ئەستەرئاباد زۆربەی تورکەکانی ئاتابای و جەعفەربای و یـەمووت هاتنـە خزمـەتی و پەیـمانی یەکیـەتیان بەست و بە سەرۆکی خۆیان قەبووڵیان کرد و پییـانی گـوت ئەگـەر دیلـە ئێرانیـەکان نەدەنـەوە تووشی شەڕێکی سەختتان دەکەم. تورکمانـەکان لـەم قـسانە زۆرتـر ترسـان و ١٥٠٠ سـوارەی

---

٣٣٩- ئەمیر کەبیر و ئێران، فەرەیدوون ئادەمییـەت، ل ٦١، گۆڤـاری یـەغما، سـەرماوەزی ١٣٤١ی کۆچـی هەتاوی نوسراوەی بەڕێز سەعادەت نووری.

٣٤٠- ئاسەفودەوڵە غەدری زۆری لە ئێـران کردووە، نـاوبراو یـەکیٚ لـەو کەسـانەی بـوو کـە بـوو بـە هـۆی شکستی ئێرانەوە لە شەڕی دژ بە ڕووسیەکاندا هاوکات ئاسەفودەوڵە حاکمی ئازەربایجان بـوو و لـە شـەڕی گەنجەدا دەرباز بوو و خۆی گەیاندە تەبرێز و دوابەدوای ئەو ئێرانیەکان دەربـاز بـوون و ئێـران و هێزەکـەی تێك شکان، خوالێخۆشبوو قائێم مـەقام فـەراهانی لە شیعرێکدا ڕق و قـینی خـۆی سـەبارەت بـەم ناپیـاوە دەربڕیوە.

جەعفەربای و ئاتابای خۆیانیان ڕازاندەوە و پەیامیان نارد بۆ سەرعەشیرەتەکانی قرقچی و پێیانیان ڕاگەیاند کە دەبێ یان دیلەکان ڕزگار بکەن و یان شەڕ بکەن. کەچی ٩٤ دیل ڕزگار کران و خەڵاتێکی زۆریشیان ئاراستەی ئیلخانی کرد.[٣٤١]

دانەوەی دیلەکان لە لایەن تورکمانەکانەوە زۆر کارێکی ئاسایی نەبوو، لە بەر ئەوەی تورکمانەکان بۆ وەدەستهێنانی دیلێك ژیانی خۆیانیان خستۆتە بەر مەترسیەوە و تەنانەت دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانیش نەیانتوانیوە لێیانی وەربگرنەوە، بەڵام ئێستا ئەوندە لە خانی شادلوو دەترسن کە بە بێهیچ پارەیێك دیلەکان دەدرێنەوە، خەڵکی تورکمەنستان، ئەرمەنستان و ئوزبەکستان بە دیتنی ناوی جەعفەر قولیخان دەست و پایان دەهاتە لەزرین، کە ئەم کەڵەکوردە ئەوەندە بە هەیبەت و هێز بووە، تەنانەت ڕەزا قولیخان هێدایەت باڵیۆزی ناسرەدینشاش ئەو ترسەی لە سیمای پاشای خوارەزمدا بینیووە. ئەو ناوچە و دەسەڵاتدارەکانیان زۆر لە جەعفەر قولیخان ترساون و تەنانەت ناوێرن دیلە ئێرانیەکان نەدەنەوە،[٣٤٢] بەم شێوەیە تورکمانەکانی یەمووت و ناوچەی ئەستەرئاباد توانای ئەوەیان نەبوو دیلە ئێرانیەکان نەدەنەوە. بەڵام جارێك تاقمێك لە تورکمانەکانی قەزڵ ڕەبات و ئاخاڵ بە سەرۆکایەتی ئاقامحەممەد سەردارەوە خەڵکێکی زۆریان لە ناوچەی سملقان کەلەبچە کرد خستیانیانە بەندیخانەوە.

ئیلخانی هێرشی کردە سەریان و دیلەکانی ڕزگار کرد و لەم پەلامارەدا شازادە

---

٣٤١- شوجاعوسەلتەنەنی کوری فەتعەلیشا سەردەمێك حاکمی خوراسان بوو، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی کەوتە بیری ئەوەی کوردەکان بکات بە مەڤالی خۆی و بۆیە کچی ئەمیر گوونەخانی کرد بە ژنی خۆی و هەر ئەم کابرایە بوو کە دژی ئاگربەسی شەڕی ئێران و ڕووس وەستا.

٣٤٢- ڕەزا قولیخان هێدایەت نووسەری ڕەوزەتوسەفای ناسری ساڵی ١٢٦٨ی کۆچی مانگی واتا ٣ ساڵ پاش سەرکوتکردنی ئاشوی سالار لە خوراسان لە ژێر چاوەدێری جەعفەر قولیخاندا ڕەوانەی سەفارەتی خوارەزم کرا، ئەم سەفەرە ٧ مانگ درێژەی بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پاشای خوارەزم ساڵی ١٢٧١ی کۆچی پەلاماری سەرەخسی دابوو و بە دەستی سامخان کورد لە قافلی تەپەدا کوژرا بوو و هەمووی هێزەکانی دەرباز بوون، سەری پاشای خوارەزم گەیشتە دەستی ناسرەدینشا کە شاعیران لەم بارەوە شیعری زۆریان نووسیوە، ڕەزا قولیخان لە سەفارەتخانەی خوارەزمدا زانیارییەکی زۆر سەبارەت بە دیلە ئێرانیەکان وەدەست دەهێنێ و شی دەکاتەوە کە چ غەدریکیان لێ دەکرێ.

جەهانسووز میرزای سەرتیپ هاوڕێ ئیلخانی کردووە، ئەم دیلانە ٥٠٠ کەس بوون کە زۆربەیان کورد بوون.

جەعفەر قولیخان دوایی تورکمانەکانی گووگلانی لە ناوچەکانی ئینچە و ئامەند و جەرگەلاندا نیشتەجێ کردووە و ئێستاش هەر لەوێدا ماونەتەوە. تورکمانەکانی گووگلان بە ڕەحم و بەزییترن لە کوردەکانی یەمووت و لە سەردەمی سەفەویدا زۆر پلەوپایەیان بەرز بووە لە لایەن پاشاکانی سەفەویەوە.

## ئامادەبوونی جەعفەر قولیخان بۆ شەڕی دژ بە ئینگلیز لە باشووری ئێراندا

لە بەرگی یەکەمدا سەبارەت بە داگیرکردنی هەرات زۆر دواین" بەڵام لە بەر ئەوەی باسی هەرات و جەعفەر قولیخان باسێکی نێونەتەوەییە بە چاکمان زانی تۆزێکیتر باسی بکەین.

هەرات یەکێ لە شارە گرنگەکانی ئێران بوو کە خەڵکی ئەم شارە زۆر ئازا و دلێر بوون و قەت قسەی زۆریان قەبووڵ نەکردووە و بۆیە زۆربەی دەسەڵاتدارەکان لە شۆڕشی ئەم شارە مەترسیان هەبووە. زۆر کەس و زۆر سەرکردەی بەناوبانگی دنیا وەکو ئەسکەندەری مەقدوونی و نادر نەیانتوانیوە ئەم شارە داگیر بکەن، بەڵام دوو زلهێزەی دنیا واتە ڕووس و ئینگلیز لەم دوو سەدەی ڕابردووەدا توانیان هەرات لە ئازایەتی دوور بخەنەوە. ڕووسەکان دەیانویست خوراسان داگیر بکەن تاکو لەم شوێنەوە خۆیان بە هێند نزدیك بکەنەوە، ئینگلیزیەکان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستیان دا بە تاڵانکردنی هێندۆستانەوە و بە پێی ئەم باسانە ئێران کەوتە بەر شاڵاوی نەهامەتی و پیلانی ئەم دوو زلهێزەوە و بەشبەش کرایەوە. لە چەند ڕێکەوتنامەدا ناوچەکانی ئێرانیدا بە باوەشی بێگانەوە، هاوکات پاشای خوارەزم هێرشی کردە سەر سنوورە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئێران، بەڵام سامخان زەعفەرانلوو کە سەرکردەی سوپای ئێران بوو توانی سوپای خوارەزم تێك بشکێنێ و پاشای خوارەمیش بکوژێ. قاجارەکان لە جێگای ئەوەی بەم سەرکەوتنە بگەشێنەوە، ئاوڕێکیان لە ئامرهێز و سەربازەکان نەدایەوە و خۆیشیان هیچ

کەلکێکیان لێ وەرنەگرت، بەڵام ئینگلیز زۆر لەم کارە ترسا و زۆرتر لەوە دەترسا کە نە وەك سوپای ئێران هێرش بکەنە سەر هێندۆستان، ڕووسەکانیش زۆر گەشانەوە، لە بەر ئەوەی پێیان وابووە بە کوشتنی پاشای خوارەزم ڕێگایان بۆ ئاوەڵا دەبێ و دەتوانن پەلاماری هێند بدەن.

حێسامولسەڵتەنە و سامخان بۆ گرتنەوەی هەرات ئامادە بوون بۆ شەڕە ئینگلیزییەکان باسی هەرات و ئەفغانستانیان هێنا پێشەوە تاکو بەم شێوەیە سەربەخۆیی ئەو ناوچەیە ڕابگەیەنن و سنوورێك لە نێوان ئێران و هێندا بەدی بهێنن، سامخان دوای یەك ساڵ شەڕ و پێکدادان توانی هەرات بگرێت.

ئینگلیزیەکان میرزا تەقیخانی ئەمیرکەبیریان کوشت و ناپیاوێکی وەکو میرزا ئاقاخان نووریان کرد بە جێگری و بەم شێوەیە توانیان سامخان و حێسامولسەڵتەنە لە هەرات بکەنە دەرەوە، ئەم کارە بە فەرمانی پاشای ئێران بوو و لە فەرمانێکدا پاشا داوای کرد لە حێسامولسەڵتەنە و سامخان هەرات بەجێ بهێڵن و وەرگەڕێنەوە. لەم کاتەدا سامخان و حێسامولسەڵتەنە دەیانئەویست خۆیان هێرش بکەنە سەر ئینگلیز" بەڵام پاشای ئێران ئەو ئیزنەی نەداوە.

شیل وەزیر و نوێنەری ئینگلیز لە ئێراندا بەم کارەی زانیووە و بۆیە بیری لە ئەوە کردۆتەوە تاکو کارێ بکات سامخان و پاشا نێوانیان خراپ بێت و پاشا سامخان و حێسامولسەڵتەنە بێدەسەڵات بکات.[٣٤٣] میرزا ئاقاخان نووری لە نامەیێکدا کە بۆ حێسامولسەڵتەنەی نووسی ڕایگەیاند کە وا دیارە خۆتت بۆ پاشایەتی ڕازاندۆتەوە، بۆیە هەرات بەجێ ناهێڵی، ئێمە ئێستا فەرمانت پێ ئەدەین، دەبێ خێرا هەرات بەجێ بهێڵی و وەرگەڕێیتەوە مەشهەد.[٣٤٤]

شیل کە چاك دەیزانی سامخان و حێسامولسەڵتەنە چلۆن بیر دەکەنەوە بە ناسرەدینشای ڕاگەیاند کە ئەگەر هێزەکانی ئێران هەرات بەجێ نەهێڵن هێرش دەکەمە سەر باشووری ئێران، حێسامولسەڵتەنە لە نامەیێکدا داوای کرد لە پاشای ئێران تاکو بە قسەی شیل نەکات و

---

٣٤٣- ئەمیر کەبیر و ئێران، فەرەیدوون ئادەمییەت، ل ٨ تا ٦٤٢.

٣٤٤- ڕێجال ئێران، بامداد.

ئینگلیز قەت توانای ئەو کارەی نییە کە لە باشوورەوە هێرش بهێنێ.

ئیبراهیم سەفای نووسیوویەتی سامخان لەم ڕێگادا گیان و ماڵی دانا و بۆ سەربەستی و سەربەخۆیی ئێران زۆری ڕەنج کێشاوە و کەسی‌تر توانای کاری وەهای نەبوو.[٣٤٥]

بەڵام پیاوی بەکرێگیراو لە نێو هێز و سوپاکەی سامخان و حیسامۆسەڵتەنەدا زۆر بوو و لە هەموو گرنگتر میرزا موحەممەد قەوامودەولە بوو کە ئەم ناپیاوە دوای لەناوبردنی سامخان و حیسامۆسەڵتەنە ٤٥ هەزرا سەربازی ئێرانی لە کارەساتی مەرودا لە ناو برد و ئێران بە بۆنەی ئەم ناپیاوانەوە زۆری ڕەنج دیوە.

قەوام لە نامەییێکدا کە بۆ میرزا ئاقاخان نووری نووسیبوو ڕایگەیاند کە سامخان کوڕی ناپیاوێکە وەکو ڕەزا قولی‌خان و وەکو ماری بێ‌ئەمان وایە و تکاکارم زووتر لە هەرات بیهێننەوە بۆ مەشهەد.[٣٤٦]

کاتێ نامەکانی دەبیرولمەلێك کە بۆ فەڕۆخخانی ئەمینودەولەی نووسیوە دەیخوێنینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە نێوانی سامخان و حیسامۆسەڵتەنە زۆر لەگەڵ قەوامدا خراپ بووە.

کەچی قەوام وەهای کرد تاکو میرزا ئاقاخان نووری لە نامەییێکدا داوای کرد لە حیسامۆسەڵتەنە تاکو هەرات بەجێ بهێڵی و وەرگەڕێتەوە مەشهەد.[٣٤٧]

دوایی میرزا ئاقاخان فەرمانی داوە بە فەڕۆخخان ئەمینودەولە تاکو بڕوات و ڕێکەوتنامەی نالەباری پاریس ئیمزا بکات[٣٤٨] و هاوکات فەرمانی پێ داوە تاکو بە باڵیۆزی وڵاتانی فەڕانسە و ڕووسیە و تورکیە ڕای بگەیەنێ کە ئێران و ئینگلیز هیچ دوژمنایەتێکیان پێکەوە نییە و تەنانەت ئێران بۆ ڕازی کردنی ئینگلیز هێزەکانی خۆی لە هەرات کێشاوەتەوە.

بەم شێوەیە دەسەڵاتدارە ئینگلیزەیەکان وڵاتانی ئێرانیان داگیر دەکرد و پاشای ئێرانیان بە دابەزاندنی هێزەکانی خۆیان لە باشوورەوە دەترساند.

---

٣٤٥- بەڵگەکانی فەرۆخخان ئەمینودەولە، ل ٣٠٢.

٣٤٦- بەڵگەکانی فەرۆخخان ئەمینودەولە، ل ٣٠٢.

٣٤٧- هەمان بەڵگە، بەرگی ٢، ل ١٣٨.

٣٤٨- هەمان بەڵگە، بەرگی ١، ل ١٣٥ و ١٣١.

کاتێ جەعفەر قولیخانی شادلوو ئاگاداری ئەم بەسەرهاتە دەبێ هێزێکی گەورە لە کوردەکان و تورکمانەکان دەڕازێنێتەوە و داوا دەکات لە ناسرەدینشا تاکو ئیزنی ئەوەی پێ بدات هێرش بکاتە سەر ناوچەکانی باشوور و ئینگلیزییەکان ڕاو بنێ.

میرزا ئاقاخان لەم کارە زۆر ترساوە و لە نامەیێکدا کە بۆ فەرۆخخان ئەمینولمەلیکی نووسیبوو کە ئەو کاتە ناوبراو لە ئینگلیزدا بوو و لەو نامەیدا ڕایگەیاندبوو کە جەعفەر قولیخان کورد شادلوو بە تەواوی هێزەکانیەوە دەیەوی خۆی بگەیەنێتە خزمەتی دامودەزگای ئینگلیز کە لە کرمان و سیستان دان.[٣٤٩]

هەروەها لە نامەیێکیتردا کە بۆ ئەمینولمەلێکی نووسیبوو ڕایگەیاندبوو: ئیلخانی ئەبولمەلیك هاوڕێ ٥ هەزار تورکمان بە سەرکردەیی جەعفەر قولیخانەوە ڕوو دەکەنە کرمان.[٣٥٠] هاوکات هاوولاتیەکانمان لە باشووری ئێراندا پیاوێنێکی وەکو باقرخان،[٣٥١] ئەحمەدخان، ڕەییسعەلی دلواری و... هتدیان لە ڕێگەی سەربەخۆیی ئێراندا کرد بە قوربانی و کوردەکان و تورکمانەکان دەست لە ناوی دەست بۆ شکستی ئینگلیز هەولیان دا" بەلام ناسرەدینشانا پیاوانە خۆی بوو بە کارەکەری درگانەی پاشایەتی.

نووسەری ناسێختەواریخ دەلێت ئەو کاتەی کە دەولەتانی ئێران و ئینگلیز لێیان بوو بە شەڕ و شۆڕ ٦ هەزار تورکمانی یەمووتی هاتنە خزمەتی جەعفەر قولیخان و داوایان کرد تاکو جەعفەر قولیخان داوا بکات لە دەولەت کە ئیزنی ئەوەیان پێ بدات هێرش بکەنە سەر دوژمنی ئینگلیزی و جەعفەر قولیخانیش ئەم داخوازییەی بە درگانەی پاشایەتی ڕاگەیاند" بەلام پاشا ولامی دایەوە ئێمە خۆمان ئەوەندە توانابیمان هەیە کە کارەکانمان جێبەجێ بکەن و هیچ پێداویستییێکمان بە تورکمانەکان نییە" بەلام پاشا، وای بیر کردەوە کە ئەگەر ئەم کارە بکات تورکمانەکان دلگیر دەبن و ئەمەش زۆرتر قازانجی نابێت، لەبەر ئەوەی تا ئێستا

---

٣٤٩- هەمان بەلگە، ل ١٣٤، ١٣٥، ٢٣٩، ٢٥٨، بەرگی یەکەم.
٣٥٠- هەمان بەلگە، ل ١٣٤، ١٣٥، ٢٣٩، ٢٥٨.
٣٥١- لە شەڕە حەماسیەکاندا شێرەپیاوانی باشوور دژ بە ئینگلیزییەکان بە جوانی شەڕیان کردووە و بە تایبەت باقرخان و کوڕەکەی واتا ئەحمەدخان زۆر پیاوانە شەڕیان کردووە.

نەبووە ئەم تورکمانانە لەگەڵ پاشایێکی ئێراندا ڕابێن و ئەمە یەکەمین جارە و بۆیە فەرمانی داوە بە جەعفەر قولیخان تاکو ٢ هەزار سەربازیان لێ هەڵبژێرێ و هاوڕێ پیاوە گەورەکانی ئەستەرئاباد ڕوو بکەنەوە تاران.

کەچی جەعفەر قولیخان ئەم کارەی کرد و بە گەیشتنیان بۆ تاران موحسێن میرزای ئەمیر ئاخۆر و جەهانسووز میرزا و میرزا زەینەلعابدین مەلەکولکتاب چوونە پێشوازیانەوە و کاتێ ئێران و ئینگلیز نێوانیان خۆش بووەوە، تورکمانەکان زۆر خەڵات کران و دوایی گەڕانەوە ناوچەکەی خۆیان. دوای ماوەیێك جەعفەر قولیخانیش گەڕایەوە بۆ ئەستەرئاباد.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە پاشای ناپیاوی ئێران کە بۆ مانەوەی خۆی لەسەر ئەریکەی پاشایەتی دەبێ ئینگلیز ڕازی بکات. بۆ ئەم مەبەستەش دەستی داوەتە چ کارگەلێکەوە و بە چ پیلانێ توانی بەرگری بکات لە شۆڕشی نەتەوە ئێرانیەکان و پیاوە ئاینیەکانەوە، جارێکیتر ساڵی ١٢٧٣ی کۆچی تورکمانەکان هێرشیان کردە سەر سەرەخس و لە بەشی باکووری ڕۆژئاوایی بجنووردەوە خەڵکیان تاڵان کرد، کەچی ئەم جارەش هەر کوردەکان بوون کە توانیان سەرکوتیان بکەن.

هاوکات ئاقاموحەممەد سەردار تورکمان هاوڕێ ٤ هەزار سوارە پەلاماری بجنووردی داوە و سوبحان قولیخان برای جەعفەر قولیخان بەرنگاری بووەتەوە و ئیزنی پێ نەداوە خۆی نزدیکی سنوورەکانی شار بکاتەوە، کاتێ جەعفەر قولیخان لە تاران گەڕایەوە ئەستەرئاباد و ئاگاداری هێرشی تورکمانەکان بووەوە، خێرا هێرشی کردە سەریان و لە پەلامارێکدا ٢٠٠ کەسی لێیان کوشت و ٦٠٠ کەسیشی لێیان کەلەبچە کرد و گەڕایەوە ئەستەرئاباد.[٣٥٢] هەر کام لە تورکمانەکان ئەگەر هەر شتێکان دزیبێ هێناویانەتەوە ئەستەرئاباد بەڵکو دیلەکانی خۆیان وەربگرنەوە.[٣٥٣]

---

٣٥٢– ئاگر بەسی نێوان ئێران و ئینگلیز بوو بە هۆی لە دەست چوونی هەرات و بەشێکی بەلووجستان.

٣٥٣– نووسەری مێرئاتولبولدان لە، ل ٢١٥ و ٢١٤ی کتێبەکەیدا دەڵێت: جەعفەر قولیخان ئیلخانی بیگلەربەیگی ئەستەرئاباد تورکمانەکانی زۆر جار ڕاو ناوە و بۆ سپاسی تواناییەکانی شمشێرێکی ئەڵماسی سپێدار.

جەعفەر قولیخان کوردشادلوو چەندین و چەند ساڵ لە نائارامترین ناوچەی ئێراندا حکوومەتی کردووە و تەنیا کەسێ بووە کە توانیوویەتی تورکمانەکان سەرکوت بکات و شەڕوپێکدادانی لە ناوچەکانی ئەستەرئاباد، گونبەدکاووس، جاجەرم، نەردین، شاهروود و بەستام کۆ کردەوە.

بەڕێز بامداد نووسیوویەتی: جەعفەر قولیخان شادلوو تا ساڵی ١٢٧٤ی کۆچی لە ئەستەرئاباددا دەسەڵاتدار بوون.

هەروەها سەنیعودەولە سەبارەت بە بەسەرهاتەکانی ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی نووسیوویەتی جەماوەرێك لە تورکمانەکان بە مەبەستی تالانکردنی ناوچەکانی بجنوورد ڕوویان کردبووە ئەو ناوچەیە و سەربازەکانی جەعفەر قولیخان هێرشیان کردبووە سەریان و هەموویانیان تێکشکاندبوو. هەروەها سەبارەت بە بەسەرهاتەکانی ئەم ساڵە نووسیوویەتی: دوو دەستە لە سوارەکانی تورکمانی تەکەوقاری قەلعە کە دەستەیێکیان ٦٠٠ سەرباز بوون و هێرشیان کردبووە ناوچەکانی خوراسان و موحەممەد ڕەحیمخان شادیلوو هێرشی کردە سەریان و ڕاویانی نا.

جەعفەر قولیخان ساڵی ١٢٧٦ی کۆچی لە تاراندا کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی لە بارەگای ئیمام ڕەزادا بە خاك سپێردرا.

## ماندووبوونی ئەمیر توومان حەیدەر قولیخان کورد شادلوو لە ڕێگای سەربەخۆیی ئێراندا

حەیدەر قولیخان شادلووی حاکمی بجنوورد و جاجەرم و نەردین و گورگان یەکێ لە سەرکردە گەورەکانی سەردەمی ناسرەدین شایە، ناوبراو برای جەعفەر قولیخانی سەهامودەولەیە و کوڕی نەجەفعەلیخانی ئیلخانی شادلووە.

لێرەدا بەشێك لە ئازایەتی و توانایی ئەم سەرکردەیە دەخەینە بەر دەست. ناوبراو ساڵی ١٢٧١ی کۆچی بوو بە دەسەڵاتداری مشکینشاری ئازەربایجان. حەیدەر قولیخان پیاوێکی

چاك بوو و بە واتای مەتلەعوشەمس لە مەشهەددا حەمامێكی گشتی بنیات نا. بەڕێز بامداد لە كتێبی تارێخی ڕێجالدا نووسیوویەتی: حەیدەر قولی‌خان لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی خۆیدا بە جوانی توانی بەرنگاری توركمانەكان ببێتەوە. ساڵی ١٢٨٨ی كۆچی حەیدەر قولی‌خان كۆچی دوایی كردووە و یارموحەمــەدخانی كوڕی یەزدان قولی‌خان بوو بە جێگری ئەم پیاوە.[٣٥٤]

سەنیعودەوڵە لە بارەی بەسەرهاتەكانی ساڵی ١٢٧٨ی كۆچیدا نووسیوویەتی: تاقمێك لە توركمانەكان كە لە ناوچەكانی خوراساندا جەردەگەریان دەكرد، جەعفەر قولی‌خان كورد شادیلوو هێرشی كردە سەریان.[٣٥٥] هەروەها دەڵێت ساڵی ١٢٧٩ی كۆچی حەیدەر قولی‌خان تاقمێكی‌تر لە توركمانەكانی شكست دا.[٣٥٦]

ساڵی ١٢٨١ی كۆچی ناوچەكانی ئەستەرئاباد و گرگان دەستیان دا بە شۆڕشەوە و ناسرەدین‌شا حەیدەر قولی‌خانی كرد بە والی ئەستەرئاباد و دەسەڵاتی بجنوردیشی دا بە دەستی ئەمیر حسەین‌خانی شوجاعودەوڵەوە كە هاوكات حاكمی قووچان بوو.[٣٥٧]

هەروەها دەڵێت: بەڕێز سپاسالار و هاوڕێیەكانی بۆیان دەركەوت كە توركمانەكانی گووگلان و یەمووت زۆر بەهێز و بڕشتن، بۆیە بە سپاسالار فەرمانی دا بە حەیدەر قولی‌خان سەهامودەوڵەی ئیلخانی. سلێمان‌خان[٣٥٨] ئەفشار و مستەفا قولی‌خان قەراگوزلوو، حەبیبوڵلاخان تونكابونی، سەفەر عەلی‌خان سەرتیپ شاهسیوون ئینانلوو تاكو بچن و هێرش بكەنە سەریان.

بریلوسوڵتانی كوڕی ئازا و لێهاتووی ناسرەدین‌شا لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا بوو بە والی مازندەران و ناوبراو زۆر تاریخی حەیدەر قولی‌خانی شادیلووی داوەتەوە و دەڵێ زۆر گەشامەوە

---

٣٥٤– تارێخ ڕیجال ئێران، مێهدی بامداد بەرگی ٢، ل ٩٠.

٣٥٥– مێرئاتولبولدان، بەرگی ٢، ل ٢٧٩.

٣٥٦– میرئاتوالبولدان، بەرگی ٢، ل ١١، واتا ئەو جێگەی كە باسی دەسەڵاتداریێتی حێسامولسەڵتەنە دەكات لە خوراسان و سپاسالار پەلاماری توركمانەكان دەدات و ئەمیر حسێن‌خان یارمەتی دەدات و حسێن قولی‌خان قووچان دەگرێت.

٣٥٧– میرئاتولبولدان، بەرگی ٣، ل ٢٢ و ٣١.

٣٥٨– سلێمان‌خان ئەفشار، ساحێب ئیختیار كە بوو بە بەرپرسی دیاریكردنی سنووری ئێران و ڕووس.

که به دیاری ئەسپی بۆ هێناوم و زۆر کەلکم لێ وەرگرت و بۆیە لە گورگان زۆر خۆشم ڕابوارد.

زیلوسولتان دوایی بۆ چاوپێکەوتنی تورکمانەکان دەیەوێ لەگەڵ حەیدەر قولیخاندا ڕاوێژ بکات و ئەویش پێشنیاری پێ دەکات کە لە فەندەرسك و گونبەدیکاووسدا تورکمانەکان ببینێ، کەچی هاوڕێ حەیدەر قولیخان دەچێتە چاوپێکەوتنی تورکمانەکانەوە کە ١٥ هەزار کەس بوون. لێرەدا دەبێ بڵێین کە تورکمانەکان زۆری خۆیانیان کێشاوەتە ڕووی زێلوسولتاندا ساڵی ١٢٧٩ی کۆچی زێلوسولتان دەبێتە والی فارس و گەورەکانی عەشیرەتی قەشقایی لە سەمیرۆمدا لەگەڵ ٣ هەزار سوارە ڕۆیشتنە پێشوازییەوە زێلوسولتان دەڵێت لە بەر ئەوەی ئیلخانی قەشقایی داوای ئەسپێکی چاکی لە ئێمە کرد و ئێمەش سێ ئەسپمان ئاراستە کرد کە یەکیان ئەسپی کەرەندی حەیدەر قولیخان سەهامودەولە بوو.[٣٥٩]

## فەرمانی سەرکوتکردنی تورکمانەکان لە لایەن ناسرەدینشاوە بۆ حەیدەر قولیخان

ئەگەرچی حەیدەر قولیخانی سەهامودەولە توانیبووی لە پەلاماری تورکمانەکان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەستەرئاباد کەم کاتەوە و زۆربەیان بکات بە هاوپەیمانی خۆ بەڵام ناسرەدینشا لەم سەفەرەدا جۆرێکیتر بیری دەکردەوە و ویستی ئەوە بوو تورکمانەکان زۆرتر سەرکوت بکرێن. لە بەر ئەوەی چەند کەس لە شازادەکانیان دیل کردبوو.

ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی ناسرەدینشا ڕووی کردە خوراسان و ڕۆژی ١٨ی موحەرەم لە تەنیشتی گوندی ئەرمیای بەستامدا حەیدەر قولیخان هاتە پێشوازییەوە و دیلە تورکمانەکانیشی لەگەڵ دابوو. هاوکات پاشا زۆر ئاگای لە خۆی بوو کە نەوەك لە لایەن تورکمانەکانەوە کەلەبچە ببێت.[٣٦٠]

---

٣٥٩- تاریخ سەرگوزەشت مەشعوودی زێلوسولتان، ل ١٠٠، ٩٥، ٣٧، و ٦٣.

٣٦٠- سەفەرنامەی ناسرەدینشا ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی کە عەلی نەقی کوڕی ئیسماعیل حەکیمولمەمالێك نووسیوویەتی. ل ٩٩ و ١٠٠ و مێرئاتولبلدان، بەرگی ٣، ل ٧٣.

سەبارەت بە بەسەرهاتەکانی ڕۆژی ١٩ی موحەڕەم نووسیوویەتی ئەمینولمەلیك لەم ڕۆژەدا سەهامودەوڵە و پیاوەگەورەکانی شادلوو و تورکەکانی گۆگلانی بردە خزمەتی پاشا و ئەویش ڕێزی زۆری لییان گرت و هاوکات پاشا خەڵاتێکی زۆری دا بە سوبحانقولی برای حەیدەر قولیخان و شیر موحەممەدخانی برازای. هەروەها شاڵی کرمانی بە خەڵاتی درایە دە کەس لە پیاوە گەورەکانی تورکمان وەك سەفەر عەلیخان ئەرکەکلی و ئیدقدیخان و ئاق موحەممەدخان و... هتد. ناسرەدینشا لە ڕێگای نەیشابوورەوە ڕێگای مەشهەدی گرتە باوەش و لە کاتی گەڕانەوەدا لە ڕێگای قووچانەوە ڕووی کردە بجنوورد و ڕۆژی ٤ی ڕەبیعوسانی ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی لە گوندی نەودێ شیرواندا سەهامودەوڵە ڕۆیشتە پێشوازییەوە[٣٦١] کە هەزار سوارەی لەگەڵدا بوو. هەر لەم ڕۆژەدا کاتی ئێواران پاشا داوای کرد تاکو سەهامودەوڵە بڕواتە چاوپێکەوتنی و کەچی ڕۆیشت و پاشا داوای لێ کرد تاکو پەلاماری تورکمانەکان بدات و هاوکات نابێ کەسیش ئاگاداری ئەم کارە بێت. ڕۆژی پێنجەم پاشا ڕووی کردە بجنوورد ڕۆژی ٦و ٧ی ڕبیعوسانی لە بجنووردا مایەوە و سەهامودەوڵە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی پاشا ڕەوانەی ناوچەی تورکستان بوو و پاشا فەرمانی داوە تاکو لەم کارەدا هێزەکانی خۆیشی یارمەتی سەهامودەوڵە بدەن[٣٦٢]

بە بجنووردا پاشا فەرمانی داوە بە وێنەگری تایبەتی خۆی تاکو وێنەی سەهامودەوڵە و نەجەفعەلیخانی کوڕی[٣٦٣] و شاری بجنوورد[٣٦٤] بکێشێتەوە باخی ئیلخانی کە زۆر ڕازاوە و خۆشە بە بۆنەی پاشا ڕازاوەتر ببوەوە.[٣٦٥] بجنوورد کە لە کتێبە مێژوویییەکاندا بزنجرد نووسراوە لە بەشی باکووری کێوی ئەلبورزەوەیە بەشی باکووری کە ناوبانگی بە نەخجیرکێو دەرکردووە و لە باشووریشەوە دەخواتە ئالاداق و سەهلوك.

ئالاداغ کێوێکی زۆر بەرز و پڕ لە سکاییە و هەواییێکی دڵڕفێنی هەیە و هەروەها بولبوڵی

---

٣٦١– لە بەرگی یەکەمدا لەم بارەوە باسمان کردووە.

٣٦٢– مێرئاتولبواران بەرگی ٣، ل ٨٥.

٣٦٣– وێنەی سەهامودەوڵە و کوڕەکانی لە کتێبی ڕێجال ئێراندا هاتووە. بەرگی ٥، ل ٩٠.

٣٦٤– وێنەی شاری بجنوورد لە ئەلبۆمی ناسرەدینشادا هەیە.

٣٦٥– وێنەگەلێکی زۆر لە تەلارەکەی ئەمیر حسێنخان شوجاعودەوڵە و چەند قولیخان سەهامودەوڵە.

زۆری هەیە و جێگاییێکی زۆر سەیر و لەبار و خۆشە...

بـجنوورد شارۆچکەیێکی بچووکە و قەلعەییێکی زۆر بەناوبانگی هەیە و ٤ هەزار بنەماڵە لەم شارۆچکەدا دەژین و بازاڕ و حەمام و مزگەوتی زۆری تێدایە بـجنوورد لە چوار دەورەوە بەم شێوەیە کە لە بەش ڕۆژهەڵاتەوە چناران نەو دێ ئەسهەندان ترمی بیغـوو گـووگ کەمـەر و لـە بـاکوور تـا ڕۆژهـەڵاتیش سـیمبارخانە و کـەلاین گەرمەخانـە و ئـەغلوو و دونکـەل قوردانلـوو گوردانلوو نەجەفـئاوا، سووررووك سیوورك عەبدولئـاوا، ئـاقتەپـە، قـارلووق و قـەراخانبەنـدی بەندی یەغموور قـووچ قەلعـە و سەسـیاب دەبینـرێن چـەند دیـدەوانی لـە نێـوانی بـجنوورد و جارجەرم و نەردێن دا هەیە و هەر کەس بیەوێ بڕوات بۆ ئەستەرئاباد و عەباسئاباد و دەبێ لەم دیدەوانیانەوە بڕوات.

بەڵام تورکمانەکانی یەمووت قەت لێرەوە ناڕۆن، مەگەر کاتێ کە هاوڕێ گووگلان بن.

ڕۆژی چوارشەمـمەی ٦ی ڕەبیعوسانی ١٢٨٤ کە هاوکـات بـوو لەگـەڵ دووەمیـن ڕۆژی مانەوە پاشا لە بـجنوورد پاشا هەر خەریکی جێبەجێکردنی کاری دەوڵەتی بوو بەر لـە بـەیانی وڵامی پرسیاری وەزیرەکـانی دایـەوە و دوایـی سـەهامودەوڵەتی بـوو، بـەر لـە بـەیانی وڵامـی پرسـیاری وەزیرەکـانی دایـەوە و دوایـی سـەهامودەوڵە و شـوجاعودەوڵە و... هتـد هـاوڕێ ئەمێنودەوڵە و ئیعتزادودەوڵە ڕۆیشتنە خزمەتی پاشا و پاشان پاشـا سـەهامودەوڵەی کـرد بـە سەرۆکی هەموو هێزەکان.

ڕۆژی پێنجشەمە ناسرەدینشا لە بـاخی سـەهاموودەوڵەدا نـانی نیـوەڕۆی خـوارد و دوای نیوەڕۆ فەرمان ئەدات بە عـەلیخان گورجی کارەکەری تایبەتی خۆی تـاکو لەگـەڵ حەیـدەرقولی سەهامودەوڵەی کورد هێرش بکەنە سەر تورکمانەکانی تورکمانسەحرا. ئازادخان و موحەمـمەد قولیخان برای حەیدەر قولیخان پاشایان هاوڕێی دەکرد و پێکەوە ڕۆیشتـن بۆ نەچیـری کەو بـە دیتینی چەند کەو پاشا هەر لە ئاسمانەوە ٦ کەوی نەچیـر کرد[٣٦٦] و دوایی پێکەوە گەڕانەوە بۆ

---

٣٦٦- ناسرەدینشـا یـەکێ لـەو پاشـایانە بـووە کـە زۆر خۆشـی ڕابواردووە و بـۆ خۆشـی خـۆی زۆربـەی ناوچەکانی ئێرانی داوەتە باوەشی بێگانەوە ژن و شیعر و شەراو و وێنە و نەچیر باشـترین دیـاری بـوون بـۆ

ماڵی حەیدەر قولی‌خانی سەهامودەوڵە.

پاشا حەیدەر قولی‌خانی بە چەند دیاری خەڵات کرد و هاوکات خان‌باباخانی کوڕیشی کە ١٢ ساڵان بوو چەند خەڵاتی لە لایەن پاشاوە پێشکەش کرا و بە هاتنی شەو هێزەکانی سەهامودەوڵە و شوجاعودەوڵە لە بجنووردەوە ڕوویان کردە شووغان.[٣٦٧]

ڕۆژی ٨ی ئەو مانگە پاشا ڕووی کردە فیرووزە کە تا بجنوورد ٢ فرسەخ نێوانیانە ڕۆژی ٩ی ڕەبیعوسانی لە فیرووزەوە بەرەو چواربید بە ڕێ کەوتن و گوندەکانی ئێران چوتربید تا چوارده بریتین لە شووغان، چەپیە تەوەر بەرزانلوو مەڵبەندی کوردەکانی بارزانی.

ڕۆژی دەی ئەو مانگە پاشا ڕووی کردە بارەگای خەییام و یازدەهەم گەیشتە جارجەرم و نێوانی جاجەرەم و چارده ٨ فرسەخە و دوو ڕۆژ لەوی دەمێنێتەوە ڕۆژی چواردەیەم لە جاجەرمەوە بەڕێ دەکەوێ و خۆی دەگەیەنێتە گوندی ئەیوەروودەرە.

ڕۆژی ١٤ی ئەو مانگە لە نەردین دا هەواڵی سەرکەوتنی حەیدەر قولی‌خان دەگاتە دەستی پاشا.[٣٦٨]

حەکیمولمەمالێك لەم بارەوە نووسیوویەتی شەهابولمەلێك خۆی گەیاندە بارەگای پاشایەتی و هەواڵی سەرکەوتنی حەیدەر قولی‌خانی لە شەڕی دژ بە تورکمانەکاندا بە شا ڕاگەیاند هێزە سەرکەوتووەکەی حەیدەرقولی توانیوویانە ١٥٠٠ بنەماڵەی یەموتەکان بدزن[٣٦٩] و پیاوەکانیان بکوژن و وەرگەڕێنەوە هاوکات لەم شەوەدا موحەممەد قولی‌خانی برای سەهامودەوڵە و شوجاعودەوڵە کە هەر دوو کوردن گەیاندە وەپاشا و سەرەبڕاوەکانی تورکمانەکانیشی هێنابوو.

---

ناسرەدین‌شا و بە واتای خۆی دەڵێت مەو سەرەخس لە دەست بچێت بەو بۆنەوە خاڵی مەیجەك دەبینم موشکلە نییە.

٣٦٧- سەفەرنامەی ناسرەدین‌شا بۆ خوراسان و ڕۆژنامەی حەکیمولمەمالێك. ل ٣٥٧.

٣٦٨- مێرئاتولبولدان ناسری، نووسراوەی سەنیعودەوڵە، بەرگی ٣ و ڕۆژنامەی سەفەر خوراسان و حەکیمولمەمالێك، ل ٣٢٨.

٣٦٩- لەم شەوەدا ژن و پیاو منداڵ و لاو بە دڵێکی پڕ هیواوە لە خەودا بوون و ئاگایان لەوە نەبوو کە وەکەونە بەر پەلامارەوە و ئەمە بوو ئاکامی ئازاری خەڵك کە ئەشەو داوێنگیری تورکمانەکان بووەوە. تورکمانەکان ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی مانگی قەرەبووی ئەم پەلامارەیان کردەوە.

دوایی بۆمان دەرکەوت کە هێزە کوردەکان شەوی یەکەم گەیشتنە شووغان، شەوی دووەم گەیشتنە ڕوباتی عێشق و شەری سێهەم گەیشتنە ئارموودەلی و شەوی و چوارەم کالپووشیان بەجێهێشت و بۆ شەوی حەوتەم خۆیانیان گەیاندە فەرەنگ و فارسییانی نزدیکی گورگان.[٣٧٠]

## لێکدانەوەی دیلبوونی ژن و پیاوانی تورکمان
## بە دەستی کوردەکانی خوراسان

حەکیمولـمەمالێك لەم بارەوە نووسیوویەتی لەم شەوەدا تەواوی سـەرکردەکانی سـوپا لـە یەك شوێندا کۆبوونەوە کە عەلیخانی کارەکەری تایبـەتی پاشاشـیان لەگـەڵ دابـوو بـە خـودای پیـرۆز سوێندیان خوارد کە بۆ جاری دووەم هێرش بکەنە سەر تورکمانەکانی و لـە هـیچ شتێك نەترس و نەپرسن کەچی هەروەهاش بوو و دوای نوێژی شێوان و خەوتنتان سواری ئەسپەکانیان بـوون و لـەو شـەوە تاریکـەدا خۆیانیـان دەگەیانـدە نزیکـی گورگـان و لـەو شـەوەوە خۆیانیـان دەگەیاندە گونبەدقابووس و بۆ نوێـژی بـەیانی گەیـشتنە نزدیکـی تورکمانـەکان و دوای نوێـژی بەیانی هێرشیان کردە سەر تورکمانەکان و ئەوانیش بە بێـئـەوەی ئاگـاداری ئاوەهـا پـەلامارێك ببـن هەموو لە خەودا بوون و زۆری نەخایاند هێزەکانی سوپای ئێران توانیان زۆربەی زۆری پیاوە تورکمانەکان بکوژن و ژن و منداڵەکانیان کەلەبچە بکەن و وەرگەڕێنەوە و بەم شـێوەیە سـوپای ئیسلام سەرکەوت.

سەهامودەولە لە پێشدا دیلەکانی لە دەربەندەوە گەیاندە نەودێ و هـەواڵی سـەرکەوتنی گەیاندە پاشا و هەزار دیلی کەلەبچەکراوی لـە عەشیـرەتە تورکمانـەکانی قووچووق تاتارقـان یەخـمەز، چاروا و چەموور ناردە خزمەتی پاشا. پاشا زۆر لەم کارە خۆشی هات و گەشایەوە و هەر لەوێدا سپاسی خوای بەجێگە هانی.

ڕۆژی شەمـمە ١٦ی ڕەبیعوسانی ١٢٨٤ی کۆچی ناسـرەدینشـا لـە نهردینـەوە ڕەوانـەی کاشیدار دەبێ و لەوێـدا سـەهامودەولە و شـوجاعودەولە و سـەرکردەکانیتـری سـوپاکە دێنـە

٣٧٠– مێرئاتولبولدان ناسری، سەنیعودەولەبەرگی، ٣، ل٨٧.

خزمەتی پاشا و دیل و سەرەبڕاوەکانی تورکمانەکانیش پێشکەشی بارەگای پاشایەتی دەکەن.

هەر لەم شەوەدا پاشا شوجاعودەولە و سەهامودەولە بە چەند دیارییێك خەلات دەکات. بە گەیشتنی ئیوارەی ڕۆژی دوایی جارێکیتر پاشا خەلاتی خۆی ئاراستەی عەدودەولە و ئەمینودەولە و دەبیرولمەلێك و سەهامودەولە و شوجاعودەولە و عەلیخان کرد و بە هەر کام لەم کەسایەتیانە دوو کروور تووەمانی داوە. یەك ملیۆن توومانی ئەو کاتە و ناسرەدینشا هەر لەم ڕۆژەدا فەرمانی دا بە میرزا عەلیخان مونشی تاکو باسی ئەم سەرکەوتنە لە بەرگێکدا بنووسێت و بیدات لە چاپ و چەندین نوسخەی بدات بە موستەوفیولمەمالیك تاکو ئەویش بیبات و بلاوی بکاتەوە سەرانسەری ولاتی ئێراندا تاکو خەلك ئاگاری ئەم سەرکەوتنە ببنەوە.

هەر ئەو ڕۆژە ژن و مندالی تورکمانەکانیان هێنا خزمەتی پاشای ئێران و ئەویش بە ڕەحم و بەزەییەوە هەموویانی دابەش کردە نێوان سپاکەدا و بەشی منیش حەکیمولمەمالیك حەکیمی تایبەتی پاشا و نووسەری سەفەرنامەی ناسرەدینشا بوو بە ژنێکی بریندار.

ڕۆژی یەکشەممە ١٧ی ڕەبیعوسانی پاشا لە کاشیدارەوە هات بۆ تیلاوور و لە ڕێگەدا خەریکی باس و وتووێژ بوو لەگەل ئیعتزادەولە و سەهامودەلەدا.

## دابەشکردنی دیلیە تورکمانەکان لە نێوان قاجارِ یەکان دا بەدەستی ناسرەدینشا

هێشتا سێ سەعاتی مابوو بە ئێوارە پاشا فەرمانی دا تاکو هەموو دیلیەکانیان هانی و پاشا زۆر بە چاکە لەگەلیاندا دوا و بە تایبەت ژنێکی هێندی کە بە دەستی تورکمانەکان چەند سالی پێش بە دیلی گیرا بوو و زۆر غەدری لێ کرابوو کەوتە بەر ڕەحم و بەزەیی پاشاوە و هاوکات مارە کرا بۆ ئەنیسودەولەی پاشا.

ڕۆژی دووشەممە ١٨ی ڕەبیعوسانی پاشا لە تیلاوورەوە ڕۆیشت بۆ خۆش ییلاخ و هاوکات ئەمیر حسەینخان شوجاعودەولەی کورد هاتە پێشوازیەوە و پاشا زۆر ڕێزی بۆ ئەم سەرۆکە کوردە داناوە.

ڕۆژی سێشەممە ۱۹ی ڕەبیعوسانی کاتێ کە پاشا لە خۆیش بێلاخەوە دەڕۆیشت بۆ کەلاتەی خەلیج بەستام و لە نیوەی ڕێگەدا سەهامودەولە بە پاشای ڕاگەیاند کەژنی ئاقچەمەلا و دوو دیلیتر لە تورکمانەکانی لەنەودێ داون بوون و بە پێی فەرمانی پاشا خێرا ڕۆژانەوە و بەڵام خاوەنی ئەو دیلانە دەئنەویست بەپارە بیانکڕنەوە و بە تایبەت ئاقچە مەلاژنەکەی خۆی بە سێ هەزار تمەن کڕی و ئەو پارەیەش کرایە سەروکاری بنیاتنانەوەی ڕووباتعێشق و دوایی ناو نرا بە قەڵای ئاقچەمەلا.

لە کەلاتەی خەیجدا کاتێ پاشازانی ەکێ لە تورکمانەکانی دیل کراو کە پێشتر زۆربەی زۆری لە خەڵك کوشتووە هاوڕێ ۱۲ کەسیتر دایانی لە سێدارە هێشتا سەعاتێکی مابوو بە نوێژی شێوان کە پاشا نیشانی ئەمیر توومانی دا بە حەیدەر قولیخان سەهامودەولەی کورد و ناوبراو هەر لەوێوە گەڕایەوە بۆ بجنوورد و دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە وەك پێش بەدەستەوە بوو.

ناسرەدینشا ڕۆژی یەکشەممە ۲۲ی جیمادیولئەوەڵ دوایی هاورد بە سەفەرە پێنج مانگەکەی خۆی و بە سواری ئەسپە ڕەخشەکەی خۆی کە دیارییێك بوو لە لایەن ئەمیر حسەینخانەوە گەڕایەوە تاران.

حەیدەر قولیخان سەهامودەولە دوای گەڕانەوەی بۆ بجنوورد بوو بە بەرپرسی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران.

سەنیعودەولە نووسیوویەتی دوای چەند ڕۆژ حەیدەر قولیخان ئیلخانی سەهامودەولە ڕووی کردە مەشەت و تاقمێك لە تورکمانەکان لەم کاتەدا هێرشیان کردۆتە حەیدەرئاباد کە لە نزیکی سەمنقانەوە بوو دوای گەڕانەوەی سەهامودەولە لە مەشهەد عێزرەکانی خۆیان دەگەنینە قەڵای ڕاز و ئەم قەڵایەتاقەڵای قاری قەلعە کەمەڵبەندی تورکمانەکان بوو ۳۰ فرسەخ نێدانیان بوو، و دوای یەك ڕۆژ شەڕوپێکدادان تورکمانەکان شکستیان خوارد.[۲۷۱]

لە بەسەرهاتەکانی ساڵی ۱۲۸۵ی کۆچی دانووسراوە شوجاعودەولەی کورد و سەهامودەولەی کورد هێرشیان کردۆتە سەر تورکمانەکانن ئەتەك و ئاخاڵ و تێکیانیان

۲۷۱–مێر ئاتولبولدان، بەرگی ۳، ل ۱۰۸ و ۱۰۷ و مونتەزەی ناسری، بەرگی ۳ و ل ۲۳۵.

شکاندووە. و هەروەها نووسیوویەتی ساڵی ١٢٨٨ی کۆچی ٧٠٠ سوارەی تورکمانی خێوە بە سەرڕۆکایەتی ئیشان[٣٧٢]ەوە لە دەوروبەری جاجەرمدا پەلاماری خەڵکی ناوچەکەیان دا و هاوکات سەهامودەوڵەی خاوەن دەسەڵاتی خوراسان هێرشی کردە سەریان و زۆربەی تورکمانەکان بە تایبەت ئیشان کوژران. هەروەها نووسیوویەتی هەر لەم ساڵەدا ١٦٠٠ سوارە و پیاوەپیادەی تورکمانە لە نزدیکی سەرەخسدا پەلاماری خەڵکی ناوچەکەیان داوە و ئیلخانی کورد هێرشی کردۆتە سەریان و زۆربەیانی کوشتووە.

دوای ئەم شەڕانە و ئەم ئاڵۆزییانە کە سەرکردەی کوردەکانی شادلوو لە خۆیەوە پیشانی داوە هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بە حەیدەر قولیخان سەهامودەوڵە بە دەستەوە نییە، بەڵام بەڕێز بامداد لە کتێبی تاریخ ڕێجال ئێراندانووسیوویەتی ئەم کەسایەتیە لە ساڵی ١٢٨٨ی کۆچیدا لە دنیا دەرچووە و برازاکەی واتا یارموحەمەدخان بوو بە جێگری سەهامودەوڵە.[٣٧٣]

## شەڕەکانی موحەممەد ڕەحیم شادلوو، سنوورەوانی خوراسان

لێسانولمەلێك گوتوویەتی: دوای ئەوەی سامخان ئیلخانی ڕووی کردە بارەگای پاشا لە تاراندا ساڵی ١٢٦٦ی کۆچی مانگی تاقمێك لە تورکمانەکان پەلاماری قووچانیان دا و یەدانوێرویخان برای سامخان هاوڕێ جەماورێکی کوردی زەعفەرانلوو بەرنگاری ئەم تورکمانانە بوونەوە و ٤٠ کەسیان لێیان کەلەبچە کرد و هاوکات موحەممەد ڕەحیمخانی والی بجنوود دژ بە تورکمانەکان دەوەستێ و زۆربەی زۆریان لێ دەکوژێ و تاقمێکشیان لێ کەلەبچە دەکات و ڕەوانەی تارانیانی دەکات. لەم کاتەدا چل سەربازی تورکمان پەلاماری کوردەکان دەدەن و ٤ کەس بە دیلی دەگرن و دەرباز دەبن و کاتێ دەیانویست لە سنووری بوزنجرد بپەڕێنەوە موحەممەد ڕەحیمخان بەم ئاکارەی زانیوە و هێرشی کردۆتە سەریان و سی کەسی لێیان کەلەبچە کردووە و ٤ دیلە بیەرجومەندیەکەی لە تورکمانەکان سەندووە و ڕەوانەی ناوچەکە

٣٧٢- تورکمانەکان بە سەرکردە ئایینییەکانی خۆیان دەڵێن ئیشان و بە کۆیخاکانی خۆیان گوتووە ئاڵچی و بە پیاوە بەساڵاچووەکانیان گوتووە ئاقسقاڵ.

٣٧٣- تاریخ ڕیجال ئیران، بەرگی ٥، ل ٩٠.

خۆیانی کردۆتەوە هاوکات جەعفەر قولی خان شادلوو لە تاران دابووە.

## نووسەر سەبارەت بەبەسەر هاتەکانی ساڵی ١٢٦١ی کۆچی نووسیوویەتی:

لەم ساڵەدا هەزار سوارەی تورکمان پەلاماری شاهروودیان داوە و کاتێ ئەم هەواڵەگەیشتووتە دەستی موحەممەد ڕەحیمخان شادلوو بە تاقمێك لە سەربازەکانی خۆی فەرمانی داوە تاکو لە تەنیشتی قەرابقەرەدا خۆیان بشارنەوە و خۆیشی هاوڕێ لەگەڵ ٦٠٠ سوارەی کورد ڕووی کردۆتە ئەتەك و لەناکاو تووشی تورکمانەکان هاتووە و شەڕ دەستی پێ کردووە و توانیوویەتی ٤٠ کە لە تورکمانەکان بێگیان بکات و ١٥ کەسیشیان کەلەبچە کران و زۆربەشیان دەرباز بوون. ساڵی ١٢٧٠ی کۆچی مانگی واتا دوای ئەوەی تورکمانەکان لە ئەتەکدا قەلعەیێکیان بنیاتناوە تاکو بتوانن دژ بە کوردەکان بووەستن و شەڕ بکەن و کاتێ موحەممەد ڕەحیمخان ئاگاداری ئەم کارەساتە دەبێتەوە. خێرا پەلاماری تورکمانەکان ئەدات و ئەو قەڵایە داگیر دەکات و چل کەسیان لێ دەکوژێت و سی کەسیان کەلەبچە دەکرێن و ١٠٠ ئەسپ دەبێتە دەسکەوتی شەڕ و بۆ کوردەکان دەمێنێتەوە و زۆربەشیان دەرباز بوون و موحەممەد ڕەحیمخان دەکەوێتە دوایان و نەیانتوانی بۆ جاری دووەم قەلعەکە بگرنەوە و قەلعە بۆ هەموو کات کەوتە دەستی کوردەکان.

## یارموحەممەدخان سەهامودەوڵە و ڕەنج و تێکۆشانی ئەم پیاوە کوردە بۆ بەدیهاتنی ئارامش لە خوراسان و ئەستەرئابادا

بەڕێز بامداد لەم بارەوە نووسیوویەتی: یارموحەممەدخان سەهامودەوڵەی بجنوورد کوڕی یەزدان قولیخانی سەرکردەی کوردەکانی شادلووە. ناوبراو یەکێ لە سەرکردە سنوورەوانە بەهێزەکانی باکووری ڕۆژئاوایی خوراسان ساڵی ١٢٨٨ی کۆچی دوای حەیدر قولیخانی

شادیلووی مامۆی بوو بە دەسەڵاتداری بجنوورد.[٣٧٤]

یار موحەمـەدخان سالی ١٢٩٨ی کۆچی نازناوی سەهاموودەولەی پێـی دراوە. نـاوبراو ساڵی ١٣٠٢ی کۆچی مانگی لە لایەن ناسرەدینشاوە دەسەڵاتی گورگانیـشی پیـێ دراوە و بـە جوانی توانی تورکمانەکان لەو ناوچەدا ڕاو بنێت و ناوچەکە ئەهوەن بکاتەوە کە پێـشتر کـاتێ کە حەبێبوڵڵاخان ساعێدودەولە دەسەڵاتداری ئەوێ بوو نەیتوانیبوو ئەم کارە بکات. ناوبراو تـا سـاڵی ١٣٠٣ دەسـەڵاتی گورەگـانی بەدەسـتەوە بـووە و سـاڵی ١٣٠٤ ئەمیـرخان سـەردار وەجێهوڵڵا میـرزا بە جێگای یار موحەمـەدخان بوو بە دەسەڵاتداری گورگان.

ساڵی ١٣١٢ی کۆچی نازنـاوی سـەردار موفەخخـەمی پیـێ دراوە و بـە عـەزیزوڵڵاخانی کوڕی گوتراوە سەهامودەولە یارموحەمـەدخان ساڵی ١٣٢٢ی کۆچی، کۆچی دوایی دەکات و عەزیزوڵڵاخانی کوڕی سالار موفەخخەم دەبێ بە حاکمی بجنوورد و ئیلخانی شادلوو.[٣٧٥]

بەڵام سـەنیعودەولە لـە کتێبی مێرئاتولبولدانـدا نووسـیوویەتی سـاڵی ١٢٩٦ی کۆچـی سەهامودەولەی سەرتیپی یەکەم لە لایەن پاشاوە بە دیاریەکی پاشا خەڵات کراوە و هەروەها لە بەسەرهاتەکانی ساڵی ١٢٩٨ی کۆچیدا نووسیوویەتی:

یارموحەمـــەدخانی حـاکمی بـجنوورد تاقمێـك لـە جـەردە تورکمانـەکانی کوشـت و تاقمێکیتریانی ڕاو نا.[٣٧٦] یارموحەمـەدخان بە بۆنەی ئەو هەموو ئـازایی و لێهاتوویـەی کـە پیشانی داوە نازناوی ئەمیـر توومانی پیێ درا.

## یارموحەمـــەدخان کورد و ناسرەدین شاو ڕێکەوتنامەی فیـرووزە

زانایـانێ وەك هـانری مـوورزێر فەڕانـسەوی و حـاجیسـەییاح کـە لـە سـەدەمی

---

٣٧٤- حەیدەر قولیخان مامۆی یار موحەممەدخان بوونە ئامۆزای ناسرەدینشا لە سـەفەرنامەکەی خۆیدا دەڵێت: یـار موحەممـەدخان لـە کـوڕی یـەزدانقولییـە کـە مـردووە و لـە سـەردەمی دەسـەلاتدارێتی نەسرەتودەولە لە فارسدا دوور خراوەتەوە بۆ شیراز. یەزدانقولی بـرای حەیـدەر و جەعفـەر قـولیخانـە کـە سەهامودەولە.

٣٧٥- تاریخ رێجال ئێران، مێهدی بامداد، بەرگی ٤، ل ٤٣٢.

٣٧٦- مێر ئاتولبولدان بەرگی ٣، ١٦١.

یارموحەمـەدخاندا سەردانی بـجنووردیان کردووە هەموویان جگە لە چاکە چیتریان سەبارەت بەم سەرکردە کوردەنە نووسیووە.

سالّی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی کە ناسرەدینشا بۆ جاری دووەم سەردانی خوراسانی کـرد. یارموحەمـەد بە کوردەکانی فیـرووزە و عێشق ئابادی ڕاگەیاند تـاکو بـچنە بارەگـای پاشـا و نارەزایی خۆیان سەبارەت بە ئاکاری فیـرووزە دەربڕن.

ئێعتمادوسەلّتەنەش ئاماژەیێکی بـەم باسـە کـردووە و دەلّێـت: ڕۆژی دووشەمـەمە ١٧ی ڕەمەزانی ئەم سالّە پاشا گەیشتە چواربید، لەوێوە دوای ئەوەی سێ فرسەخ بە ڕێگەدا ڕۆیشتـن گەیشتنە تەخت باشقی، تاقمێك لە خەلّکی گەرماب کە چووبوونە ژێـر دەسـەلاّتی ڕووسـیەوە هاتنە خزمەتی پاشا و زۆر پاڕانەوە تاکو ئیزن بدات بێنەوە سەر ولاّتی ئێران.

پاشا زۆر لەم قسانە تووڕە دەبێ و فەرمان ئەدات ئەم کوردانە کەلەبچە بکـەن و زۆریـان لێ بدەن و دوایی پاشا فەرمان ئەدات تا کـو پارەیێـك بـدرێ بـە دانیـشتووانی گـەرماب تـاکو بتوانن لە هەراوی ئارمووتەلی و لە نزدیکی کالپووشدا خانوو بنیات بنێن.

و ئەو کوردانەش خێرا ئیسقانی مردووەکانیانیان لە گۆڕەوە دەرهانی و لە عێـشقئابـاد و فیـرووزە و گەرمابـەوە ڕێگـای ئێرانیـان گرتـە بـاوەش و بـە گەیـشتنیان بـە ئێـران ئیـسقانی مردووەکانیان نایە خاك و هاوکات بـە پاشـایان ڕاگەیانـد ئێمـە لـە سـنووری ئێـران و ڕووسـدا دەمێنینەوە و بۆ خۆمان ماتلّ دەمێنیـن تاکو هەلێکمان بۆ بڕەخسێ و زێدولاّتەکەمان وەدەست بهێنینەوە و ئەگەر ئەو کارەشـمان بۆ نەکرا هە ئەوندە کە بۆنی ولاّتی خۆمان دێتە لووتـمان دا بۆمان بە سەو ئەمە هەزار بەرانبەری دەشتی ئارمووتەلی بۆ ئێمە قازانـجی هەیە و کەچی ئەم کوردانە کە زۆربەیان شادلوو بوون لە گوندی قەلقەلیدا مانەوە[٣٧٧] و زۆر جار دژ بە تورکمانەکان شەڕیان کردووە زۆربەی کوردەکانی غولاّمان هەر وەکو کوردەکانی شـادلوو و بـە تـورکی قسـە دەکەن.

یارموحەمـەدخان لـە چـەمەن کالپووشـدا هاتـە پێشوازی پاشـاوە. ناسـرەدینشـا لـە

---

٣٧٧- ناسرەدینشا لە سەفەرنامەکەیدا غولاّمانی لە جیاتی گەرمابدا بەم ئاوارە کوردانەی شادلووە، بـەلاّم ئەم کوردانە لە سەردەمی ڕەحاخاندا بۆ جاری دووەم غەدریان لێ کرا و پارەی ئەم زەوینیانەیان لێ وەرگیرا.

سەفەرنامەکەی خۆیدا نووسیوویەتی کاتێ کە دەڕویشتین و گەیشتینە سەر دوندێك و لەوێوە جولگەی کالپووش کەوتە دەرەوە و هەر لەوێدا نانی نیوەڕۆمان خوارد و کەچی یارموحەممەدخان حاکمی بجنوورد بە مەبەستی پێشوازی کردن لە ئێمەوە چەند ڕۆژێك بوو گەیشتبووە ئەوێ.

روکنودەوڵە برای شا و حاکمی خوراسان لە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچیدا بە ناوبراو فەرمانی داوە تاکو کارێك بکات خەڵك بە جوانی بێنە پێشوازی پاشاوە و کەچی هەوەهاش بوو و یارموحەممەدخان تەنانەت تورکمانەکانیشی ڕام کردبوو و هانیبوویانیە پێشوازییەوە.

ئێعتمادوسەڵتەنە لە کتێبی خاترات و خەتەراتدا نووسیوویەتی گەیشتینە شوێنێك کە زۆر وشك و بێئاو بوو و تەنانەت سوارەیێك لە تینوویدا سیالاوی هات و هەر بەم بۆنەوە ئەمڕۆ سەهامودەوڵە ئاوێکی زۆری هێناوە و زۆربەی ئەو زەرەفانەی کە ئاوی تێدابوو لە ڕووسیەوە هاتبوون من پێم وایە تا ٢٠ ساڵی دیکە فەرهەنگی ئەم ناوچە دەبێتە فەرهەنگێکی ڕووسی. ئەم واتایەی ئێعتمادوسەڵتەنە زۆر دروست بوو لە بەر ئەوەی سەهامودەوڵە کە خۆی پیاوێکی زۆر زانا بوو کارێکی کرد کە بجنوورد لە سەدەمی دەسەڵاتدارێتی ئەودا زۆر بڕواتە پێشەوە و کەچی ناسرەدین شاش کاتێ سەردانی کوشکەکانی خانی شادلوو دەکات ئەوەندە خۆش دەبن سەری سووڕ دەمێنێ.

دەبێ ئەو ڕاستنیەش دەربخەین کە ئەو کوشکلانە[٣٧٨] بە پارەی خەڵك بنیات نەنرابوون. چونکە سەهامودەوڵە لە ئەستەرئاباد و لە گەنجێکی دۆزیبوەوە و بە بێئەوەی پاشای ئاگای لێوە بێت گواستبوویەوە بجنوورد و کەلکی لێوەردەگرت، بەڵام دوای مردنی سەهامودەوڵە لەسەر بەشکردنی ئەم گەنجە بنەماڵەکە بوو بە شەڕیان و ئەم شەڕەش تا چەند ساڵی ڕابردوو هەر درێژەی بووە.

ئێعتمادوسەڵتەنە دەڵێت: ئەمڕۆ ١٩ی ڕەمەزان١٣٠٠ گەیشتینە بجنوورد. ڕێگاکەمان دوو فرسەخ بوو و بە گەیشتنمان بە بجنوورد من خۆم گەیاندە ماڵی سەهامودەوڵە.

---

٣٧٨- سەهامودەوڵە و بنەماڵەکەی بۆ ئاوەدانی بجنوورد ڕەنجی زۆریان کێشاوە. (بڕوانە بۆ سەفەرنامەی ناسرەدینشا، ل ١٠٨، ١٠٩)

حەمامێکی لە بەردی مەرمەڕ دروست کردبوو کە زۆر ڕێکوپێك بوو. سەیفوعەلمەلێك لەم کاتەدا خۆی دەشوشت.

ڕەشماڵەکەی منیان بردە نێوانی باخەکەوە کە زۆر باخێکی دڵڕفێن بوو. تەلووزان و بەگمەزو موحەقێقتیش هەر لەم باخەدان مەلیجەك خۆی نزیکی من کردبووەوە هاوکات کوومار ووف و پیاوەگەروەکانی قەزاق و تورکمان چوونە پێشوازی پاشاوە.

بەیانی پێنجشەممە ٢٠ی ڕەمەزان چوومە ماڵەوە و چاوم بە ئاو فوارەیێك کەوت کە زۆر دیمەنێکی جوان و دلڕفێنی بوو و لەم کاتەدا پاشا لە حەمامدا بوو و ئێوارەی ئەو ڕۆژە هاوڕێ لەگەڵ تەلووزان حەیمتی تایبەتی پاشا ڕۆیشتنیە چاوپێکەوتنی ژنراڵی ڕووسەوە ئەم ژنراڵە پیاوێکی کورتەباڵا و کەڵەگەت بوو پاشاو ڕکنودەولە پێکەوە باسیان دەکرد و ئەم باسە زۆر درێژەی بوو.

ڕۆژی دووشەممە تەلگرافێك لە سەبزەوارەوە گەیشت و ڕاگەیێندرابوو کە ئەمینوسوڵتان ٧ ڕۆژە مردووە و تەرمەکەی بە بێکفن و دفن لە داوەرزەنی سەبزەواردا داکەوتووە و بۆنی کردووە.

پاشا کاتێ ئەم هەواڵەی پێ گەیشت خۆی دا لە نەزانی و دوایی لە نامەیێکدا کە بۆ عەزدولمەلێکی نووسیبوو سپاسی پیاوەتی ئەمینوسوڵتانی کردبوو و لە خوا پاڕابووەوە لە تاوانەکانی خۆش بێت و هاوکات ئەمینولمەلێکی کردبووە جێگری ئەمینوسوڵتان.

هەر ئەم ڕۆژە کاتێ گەڕامەوە خانووەکە خۆم ئیلخانی بجنوورد یەك قەتار وشتری بە دیاری بۆم ناردبوو.

بۆیە ئێعتمادوسەڵتەنە هەموو کاتێ بە چاکە ناوی سەهامودەوڵەی بردووە و هاوکات حسەینخان شوجاعودەوڵەی بە ناپیاو زانیوە لەبەر ئەوەی شوجاعودەوڵە قەت جگە لە پاشا دیاری بە کەس نەداوە.

ڕۆژی سێشەممە پاشا لە بجنووردەوە ڕوو دەکاتە قووچان و ڕۆژی چوارشەممە دەگەنە ناوچەی قووچان و ئەمیر حسەینخان کورد زەعفەرانلوو هاتە پێشوازی ناسرەدینشاوە و ڕۆژی

هەینی پاشا گەیشتە شیـروان[٣٧٩] و لەوێدا بە واتای ئێعتمادوسەڵتەنە پاشا سێ هەواڵی خۆشـی پێ دەگات: ١- هەواڵ دەگات کە سەهامودەولە توانیوویەتی هەموو دیلەکان لـە تورکمانـەکان بگرێتەوە ٢- هەروەها هەواڵ گەیـشت کـە چاوی ئەمیـن ئەقـدەس[٣٨٠] سـیووگولی شـا چـاك بووەتەوە ٣- پاشا ئەمڕۆ لە نەچیـردا سەرکەوتووە.

## ڕەزا قولیخان زەعفەرانلوو لە چەند دێڕدا

لە بەرگی یەکەمدا بە بەرپانی باسی ئەم کەڵە پیاوەمان کـرد و هـەروەها گوتـمان دوای چل ڕۆژ شەڕوپێکدادان لە ئاکامدا نایبوسەڵتەنەی عەبباس میـرزا توانی ڕەزا قولیخان شکست بدات، بـەڵام شکـستی ڕەزا قـولیخـان بـە بۆنـەی توانـایی عـەبباس میـرزاوە نـەبوو، بـەڵکو هاوپەیـمانەکانی وەك جەعفەر قولیخان شادلوو پەیـمانی خۆیانیان شکاند و ڕەزا قـولیخانیـان لە قووچان بە تەنیا بەجێهێشت و لە لایەن عەبباس میـرزاوە دەسگیـر کرا و ڕەوانەی تاران بوو و دوایی بۆ ئازەربایـجان دوور خرایەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئازەربایـجان لە میانــجدا بـە بۆنەی ئەشکەنـجە و ئـازاری زۆرەوە شـەهید کـرا و تەرمەکـەی گوازرایـەوە مەشـهەد و لـەوێ نێژرا،[٣٨١] بەڵام حسەین قولیخانی کوڕی بە ماوەی ٢٧ساڵ لە بەندیـخانەی قاجارڕدا مایـەوە و دوایی دەرباز بوو بۆ شیـراز و پەنای بردە حێساموسەڵتەنە.

لەم چەند ساڵەی ڕابردووەدا دەزگای چاپ و نەشری مێـژووی ئێـران کتێبێـکی بـە نـاوی نوخبەی سەفینە لە چاپ داوە و هەروەها گۆرانیـە فۆلکلۆریـە تورکمانیـەکان کـە ئەلێکساندر شودزکو کۆی کردبووەوە لـە پاشـکۆی کتێبەکـەدا باسـی ڕەزا قـولیخـان کـورد زەعفـەرانلووی نووسیبوو کە بەشێکی زۆری لە ڕاستی بە دوور بوو.

---

٣٧٩- لە بەرگی یەکەمدا لەم بارەوە دواوین.

٣٨٠- ئەم ژنەی پاشا دڵی خۆی دابوویە تـەلووزان حـەکیمی تایبـەتی پاشـا و زۆر جـار بەهانـەی لـە پاشـا دەگرت و تەنانەت جارێکیش سەفەری ئەورووپای کردووە و زۆر جار بۆ ئەوەی تەلووزان بێتە سەر بـاڵینی خۆی داوە لە نەخۆشی و چاوئێشە. (ریجال ئێران، بەرگی ١، ل ١٨٣)

٣٨١- ڕەزا قولیخان ساڵی ١٨٨٣ زایینی ١٢٤٩ی کۆچی لە ڕێگەی میانەدا لە دنیا دەرچوو.

پێم وایە ئەم گۆرانیانە لە دیوانەکەی مەختوومقولی شاعیری بەناوبانگی تورکماندا دانراوە و چاك نازانین کە ئەم شیعرانە شیعری مەخدوومقولییە یان نە؟ زۆر هەوڵم دا دیوانی مەخدوومقولی وەدەست بهێنم، بەڵام دەستم نەگەیشت و تەنیا ٢٢ ساڵی ڕابوردوو بۆ یەك جار ئەم کتێبەم لە مەتی مەلای قەزویندا دیوومە و خوێندوومەتەوە. لەم کتێبەدا لە بەشی «فەتح تەکەها»دا نووسراوە:

ساڵی ١٨٧٢ی زایینی ڕەزا قولیخان کوڕی دوازدە ساڵەی ئەمیر گوونەخان ئیلخانی کورد لە خوراساندا بە دەستی تاقمێك لە تورکمانەکانی تەکە دیل کرا، ئەم هەواڵە لە چناراندا گەیشتە دەستی ئەمیر گوونەخان و خێرا بە دوای تورکمانەکان کەوت و لە مایوانی ئێبیورد[٣٨٢]دا پێیان گەیشت و شەڕ دەستی پێ کرد و ئەم شەڕە کە سێ ڕۆژ درێژەی بوو و ئاکامەکەشی سەرکەوتنی تورکمانەکان بوو و ئەمیر گوونەخان بەرەو بجنورد دەرباز بووە. ئەم دو شیعرە وەکو ئەو دوو شیعرەیە کە بۆ ئەلسکاندر بۆرنێز[٣٨٣] لە سەفەری بوخارادا نووسراوە.[٣٨٤]

بە بێشك ئەم شیعرە بە بێهیچ بەڵگەیێك نووسراوە و شیعرێکی خەیاڵیە، لەبەر ئەوە لە هیچ کتێبێکی مێژوویدا ناوێك لەم شەڕە نەهاتووە و هەروەها تورکمانەکان بۆ هیچ کاتێ توانای ئەوەیان نەبووە خۆیان بە شاری قووچان نزدیك بکەنەوە و جگە لە جەردەگەری چیتریان پێ نەکراوە و هاوکات کوردەکان زۆر جار هێرشیان کردۆتە سەریان و زۆریان لێیان کوشتووە و گوندی مایوان ناوەندی کوردەکانی مایوانلوو کە لە باشووری شیروانەوەیە و تورکمانەکان قەت توانای ئەوەیان نەبووە خۆیان بگەیێنە ئەوێ و هەروەها ڕۆیشتنی تورکمانەکان وەیان هەرکەسیتر جگە لە ڕێگای کۆیستانی تەپۆلکەی ئەڵلاهوئەکبەرەوە ڕووی نەداوە و جا لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم تەپۆلکەیە و گوندەکانی دەوروبەری بە دەستی کوردەکانەوە بوو

٣٨٢- ئێبیورد لە لایەن ڕووسیەوە داگیر کرا.

٣٨٣- بورنێز یەکێ لە ئەفسەرە ئینگلیزییەکانی سەردەمی عەبباس میرزا بوو کە لە بەرگی یەکدا لەم بارەوە باسمان کرد.

٣٨٤- نوخبەسەفینە، نووسراوەی موحەممەد عەلی قوورخانچی و تەرانەکانی فولکلۆری تورکمان کە ساڵی ١٢٤٩ی کۆچی لە لایەن ئەلکساندێر شووزکۆوە کۆکرایەوە.

و قەت ئیزنیان بە تورکمانە جەردەکان نەداوە کە لێرەوە ڕێ هەلّکەن.

هەروەها لە سەرانسەری شەڕەکانی تورکمان و کوردەکاندا، تورکمانەکان زۆرتر لە یەك ڕۆژ نەیانتوانیوە خۆ ڕابگرن و شکستیان خواردووە. تەنانەت شەڕی کوردەکان و پاشای خوارەزم لە پولی خاتوونی سەرەخسدا کە شەڕێکی زۆر گرنگ بوو زۆرتر لە سێ ڕۆژ درێژەی نەبوو.

قەت هیچ پیاوێکی ژیر باوەڕ بە ئەوە ناکات کە کوردەکان شکستێکی ئاوەهایان خواردبێ و ئەگەرچی وەهاش بووبێت چلۆن ئەمیر گوونەخان کە شارەکانی چناران و قووچان و شیروانی بە دەستەوە بووە ڕووی کردۆتە شاری بجنوورد کە ناوەندی کوردەکانی شادلوو بووە و زۆر لەگەلّ کوردەکانی زەعفەرانلووشدا نێوانیان خۆش نەبووە.

ئەمیر گوونەخان ئەوندە ئازا بووە کە بە واتای سەرەنگ درویل،[٣٨٥] فەتحعەلیشا قەت نەیوێراوە بەرانبەری بووەستێ و زۆر لێی ترساوە، بەلّام ئەم زاتە ئەمرۆ چلۆن دەبێ بە دەستی تاقمێکی تورکمانەوە دەرباز بێت و ٣٠٠ کیلۆمەتر بڕوات و قەت لە هیچ شوێنێك ڕانەوەستێ، هەوەها چلۆن دەبێ تورکمانەکان ئاوەها ئازایەتییێکان لە خۆوە پیشان دابێ و مێژوونووسەکان نەیانزانیبێ.

ئەم شیعرە، کوردیە کە بەم چەشنەیە کە دەلّێ: ئەمیر گوونەخان گوتوویەتی، تورکمانەکانی تەکە موحەممەدخانی سەفدەرییان[٣٨٦] لێم دزی، موحەممەد حسەینخانی[٣٨٧] قەجرانیان بە دیل گرت، ئاسۆ بەیگم[٣٨٨] لەدەست چوو، حاجی خانی شێخ ئەمیر لووم[٣٨٩] کوژرا. ئەمیر گوونەخان بەم شێوەیە ئامرهێزەکانی دەلاواندەوە و دەیگوت خۆزگە ڕۆژێك

---

٣٨٥- سەفەرنامەی درویل، ل ١٦٥.

٣٨٦- نووسەری کتێبی نوخبەری سەفینە دەلّێت: موحەممەدخان سەفدەری یەکێ لە پیاوە بە دەسەلّاتەکانی دەرباری قاجاڕ بوو کە لە شەڕی مایواندا کوژرا. ئەم وتەیە بێبەلگەیە.

٣٨٧- لە پیاوە گەورەکانی قاجاڕ بووە.

٣٨٨- ئاسۆ بەی نەناسراوە.

٣٨٩- حاجیخان یەکێ لە ئامۆزاکانی ئەمیر گوونەخانی زەعفەرانلووە کە هاتە یارمەتی ژنە خێرئاواییەکانەوە، لە کاتێکدا تورکمانەکان پەلاماریانیان داوە. پێم وایە تورکمانەکان مەبەستیان لەم تێك شکانەی کە شانازیان پێوە کردووە ئەم شەڕە بووبێت، هەروەها لە شەڕی کورد و تورکمانەکاندا خێلّی قاجاڕ بەشداریان نەکردووە.

دەهات کە تۆڵەم لەم تورکمانانە بکردبایاتەوە، چەکە جەزایرییەکانم لە دەست دا و قەلعەی بەرزی پاراستنی ناوچەکەم لە دەست چوو، ئەسپێکم بوو بیهێنن و یاڵەکەی بە خەنە ڕەنگ بکەن تاکو هێرش بکەمە سەر تورکمانەکان، براکەم لە کێوی مایواندا کوژرا، هەواڵ ببەن بۆ ئیبراهیم خان[٣٩٠] و بڵێن تورکمانەکان، ئیلخانیان[٣٩١] دیل کردووە، من ئەوینەکەم لە دەست داوە. وای مائیبەیگ، وای قارەمانی مەڕەکانم لە دەست چوو و وشترەکانم تالآن کران. ئەمیر گوونەخان دەگرییێت و دەڵێت، دڵمان سووتا، باخی مایوانمان کاول بوو، هەر چێکم بوو لە دەستم چوو.

هەروەها ئاقاموحەممەدخان کاتێ کە ڕۆیشتووەتە شەڕی مەمشخانی کوردی چنارانەوە ئەم شیعرەی نووسیوە کە وەرگێڕاوەکەی دەنووسین (١٢١٠ی کۆچی و ١٧٩٤ زایینی). دەڵێن لە خوراساندا ئاغا موحەممەدخان ناوێك هاتووە کە خەڵکی ئەستەرئابادە و لە عەشیرەتی قاجارە و موسوڵمانێکی شیعەیە و دەڵێن پێداویستی سەربازەکانیان دەبەن بۆ بەستام و کەسکاییەکانی ئەوێ، هەورەکان ئاسمانی ناوچەکەیان داپۆشیوە و تەمومژێکی زۆر دەشتودەری داگرتووە و باران یاغریاغر دەبارێت و دەڵێن چل هەزار ئەسپی هەیە و هەموو ئەسپەکان زینی زێڕیان هەیە و چل هەزار چەکداری هەیە و یەك لە دوای یەك ئاگاداری کوێستانەکەنن و چل هەزار ئەفشار و چل هەزار تاتار لە سپاکەیدا دەبینرێن و کەچی ئەم خانەی قاجارە، کوردستانی داگیناسمانگر کردووە و ئێستا گرتنی مەمشخان بۆ ئەم زاتە، کارێکی ئاساییە.

ئەم شیعرە و ئەم باسە مێژووییەی کە لەم شیعرەدا هاتووە کتێبە مێژووییەکانی سەردەمی قاجاردا بە تایبەت دوو کتێبی ناسراو و بەناوبانگی ناسێخوتەواریخ ڕەوزەتوسەفادا نەهاتووە و لەم کتێبە مێژووییانەدا نووسراوە کاتێ کە ئاغاموحەممەدخان قاجار هاتووە بۆ خوراسان ئیبراهیمخان شادلوو چووەتە پێشوازییەوە و هاوکات ئەمیر گوونەخان زەعفەرانلوو

---

٣٩٠- ئیبراهیمخان شادلوو حاکمی بجنوورد و ئێسفەراین بوو کە کاتێ ئاغاموحەمەدخان دەڕوات بۆ خوراسان دەکەوێتە بەر شالآوی ڕق و قینی پاشاوە.

٣٩١- مەبەستیان ڕەزا قولیخانی کوردی زەعفەرانلووە.

ئیلخانی خوراسان و مەمشخانی کوڕی ڕۆیشتوونەتە پێشوازی پاشاوە و هەتا شاری مەشهەد هاوڕێی پاشای قاجارپیان کردووە.

مەمشخان پەلاماری نادر میرزای ئەفشاری داوە و کەچی کەلەبچەی کردووە و دەست بەسراو بردوویەتی بۆ بارەگای فەتحعەلیشای قاجاڕ هەر وەك لە بەرگی یەکەمدا گوتمان کاتێ کە فەتحعەلیشا ڕووی کردووە خوراسان و ئەمیر گوونەخان ڕۆیشتە پێشوازییەوە، بەلاّم مەمشخانی کوڕی دژ بە پاشا وەستاوە و ئاوڕێکی لیّ نەداوەتەوە و هەروەها ئیزنی نەداوە پاشا بچێتە چناران و کاتێ فەتحعەلیشاش گەمارۆی شاری دا چی پیّ نەکرا و گەڕایەوە.[٣٩٢] بە تایبەت سادقخانی کوردی شوقاقی کە هاوڕێی پاشا بوو بە نهێنی هانی مەمشخانی داوە تاکو خۆی نەدات بە دەستی پاشاوە و کاتێ فەتحعەلیشا لە تاراندا ئەم ڕاستیەی بۆ دەرکەوتووە خێرا سادقخانی بە زیندوویی ناوەتە نێوان دیواری خانوو و گەچی کێشاوەتە ڕوویدا.[٣٩٣]

دوایی مەمشخان بووەتە فەرمانبەری فەتحعەلیشا و لە شەڕێکدا مەمشخان توانی ٣٥٠ کەس لە تورکمانەکان بکوژێ و هاوکات ١٥٠٠ کەسی لێیان کەلەبچە کرد و ڕۆژی ٩ی ڕەجەبی ساڵی ١٢٢٨ی کۆچی سەری کوژراوەکان و دیلەکانی گەیاندە بارەگای پاشا.[٣٩٤]

دەبێ بلّێین کە ئەمە هەڵەیە کە لەم شیعرەدا نووسراوە ئاغامحەمەدخان و مەمشخان پێکەوە شەڕیان کردووە. دروستەکەی ئەوەیە کە مەمشخان دژ بە فەتحعەلیشا و نایبوسەلّتەنە شەڕی کردووە.

ساڵی ١٢٤٨ی کۆچی مانگی عەبباس میرزا لە ڕێگای چنارانەوە هێرشی کردە سەر قووچان و مەمشخان لە چناراندا بەرەنگاری نایبوسەلّتەنە بووەوە و لە ئاکامدا بە فەرمانی ڕەزا قولیخان، چنارانی دا بە دەستی عەبباس میرزاوە و کاتێ شار کەوتە دەستی عەبباس میرزا دەسەلاّتی شاری دا بە دەستی کەریمخانی زەعفەرانلووەوە و خوێ ڕووی کردە قووچان.

---

٣٩٢- ساڵی ١٢١٢ی کۆچی مانگی.

٣٩٣- سادقخان کورد شوقاقی هەر ئەو کەسە بوو کە تاقمێك دەڵێن ئاغا موحەممەدخان بە پێشنیاریاری ئەو کوژراوە.

٣٩٤- لە بەرگی یەکەمدا باسمان کردووە.

دەبێ ئاماژەش بکرێ کە بەداخەوە هیچ وێنەیێکمان لە ڕەزا قولیخان بە دەستەوە نییە و ئەو وێنەیەش کە لە کتێبی تاریخ ڕێجال ئێراندا هاتووە و نووسراوە و وێنەی ڕەزا قولیخانە، هەڵەیە و وێنەی ئەمیر گوونەخانی زەعفەرانلووە.

## حسەین قولیخان زەعفەرانلوو ٢٧ ساڵ لە بەندیخانەی قاجاڕدا مایەوە

لە بەرگی یەکەمدا گوتمان کە سامخان زەعفەرانلوو و ئەبولفەیزخان برای، ساڵەکانی ١٢٥١تا ١٢٦٤ی کۆچی بە ماوەی ١٣ ساڵ لە بەندیخانەدا مانەوە و نەجەفقولیخان شادلوو و جەعفەرقولیخانی کوڕی دوای ئەوەی ساڵی ١٢٥١ی کۆچی لە بەندیخانەی تاران ڕزگار کران گەڕانەوە بجنوورد و دەسەڵاتی بجنووردیان بە دەستەوە بوو، کەچی ئەم دوو سەرۆکە کوردە شادلووە دەیانتوانی ببن بە زامنی سامخان و براکەی و کاری وەهایان نەکرد.

نزاموسولتەنەی مامی لە بە سەرهاتەکانی خۆیدا لەم بارەوە دواوە و هەروەها ئاماژەشی بە ئەوە کردووە کە براکانیتری سامخانیش هەر لە بەندیخانەدا بوون کە بە دەستی سامخان کورد شادلوو ڕزگار کران.

سەردەمێك کە ڕەزا قولیخان زەعفەرانلووی خەبووشانی یاخی بوو و دژی دەسەڵات وەستا هاوکات حسەین قولیخانی کوڕی[٣٩٥] لە قەڵای ئەمیرئاوا دژ بە نایبوسەڵتەنە وەستا و هێرشی کردە سەری، کاتێ ڕەزا قولیخان شەشخانی هومێدی لێ بەسرا و لە لایەن قاجاڕیەکانەوە کەلەبچە کرا، حسەین قولیخانیش زانی پێی ناکرێ و خۆی داوە بە دەستەوە و ئەم باوك و کوڕە برانە تەبرێز، بەڵام لەبەر ئەوەی سامخان کوڕی بچووکی ڕەزاقولیخان دژایەتی نەکردبوو برایە تاران و لە ژێر چاوەدێری قاجاڕەکاندابوو و هەروەها کوڕەکانیتری ڕەزا قولیخان کە دەکرانە دوو دەستەوە، دەستەی یەکەم، یەزدانوێردیخان و ئەبولفەیزخان کە لەگەڵ سامخاندا

٣٩٥– پاشا، ساڵی ١٢٣٦ی کۆچی کە ڕووی کردە خوراسان، حسەین قولیخانی وەك بارمتەیێك هانی بۆ تاران.

لە یەکدا یەك هاتبوونە دنیا و دەستەی دووەم ئەمیر حسەینخان و ئەمیرگوونەخان کە دایکیان کچی نەجەفقولیخانی شادلوو[٣٩٦] بوو، سلێمانخان ئەفشار لە تاراندا دەبێت بە زامنی کوڕەکانی نەجەفقولیخانی شادلوو و سامخان و ئەبولفەیزخانیش لە ئاژاوەی سالاردا لە بەندیخانە دەرباز دەبن و پاشاش بەم بۆنەوە لە تاران فەلاقەی سلێمانخان دەکرێت و بێدەسەلاتیش دەکات سامخان بۆ ماوەیێك دەچێتە ڕیزی عارف و پیاوچاکانەوە دەبێتە هاونشینی مونەجیمباشی گیلانی کە یەکێ لە پیاوچاکانی سەردەمی موحەممەدشای قاجارە. زەرا قولیخان لە تەبرێزدا لە دنیا دەرچوو[٣٩٧] و حسەین قولیخان هاوکات لە بەندیخانەدا دیل کرابوو.

ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی مانگی دوای مردنی سامخان، خوالێخۆشبوو حێسامەوسەڵتەنەش دەسەڵاتی خوراسانی لێ وەرگیرایەوە و بوو بە حاکمی فارس و حسەین قولیخان لە تەبرێزدا دەرباز بوو و خۆی گەیاندە شیراز و پەنای بردە حێسامەوسەڵتەنە.[٣٩٨] ساڵی ١٢٧٨ی کۆچی مانگی حێسامەوسەڵتەنە لە بارەگای قاجار پاڕایەوە و پاشای قاجار لە تاوانەکانی خۆش بوو.

لە سەردەمێکدا کە ئەمیر حسەینخان حاکم و والی قووچان بوو ناوچەکە زۆر ئەهوەن و لەسەرخۆ بوو.[٣٩٩]

بڕیار درا حسەین قولیخان لە خزمەتی پاشادا بمێنێتەوە، بەڵام کاتێ ئێمە زستانی ١٢٧٨ی کۆچی مانگی دوای شکستی مەرو ڕۆیشتن بۆ خوراسان[٤٠٠] بینیمان کە دوو گوند لە موڵکی ڕەزا قولیخان لە لایەن ئەمیر حسەینخانەوە دراوەتە حسەین قولیخانی برای کە ئەم

---

٣٩٦- دایکی سام خان و براکانی لە ژنە دیلە تورکمانەکان بوو.

٣٩٧- لە میانەدا لە دنیا دەرچوو کە هێشتا نەگەیشتبووە تەبریز.

٣٩٨- ساڵی ١٢٤٨ی کۆچی ڕێکەوتە لەگەڵ داگیرکردنی قووچان و دیلکردنی ڕەزا قولیخان و حسەین قولیخانی کوڕی دا و حسەین قولیخان بۆ ماوەی ٢٧ ساڵ لە بەندیخانە دەمێنێتەوە.

٣٩٩- هیچ کام لە سەرکردەکانی زەعفەرانلوو وەك ئەمیر حسەینخان نەیانتوانی سەرۆکەکانی خوراسان سەرکوت کەن و هاوکات هەوڵی زۆری داوە تاکو یەکیەتی کوردەکان بپارێزێ.

٤٠٠- لەم شەڕەدا جگە لە حێشمەتودەوڵەی ناسرەدینشا و قەواموددەوڵەی وەزیری، کەستر لە سوپای ئێران زیندوو نەما. کوردەکان لەم شەڕەدا بەشدار نەبوون لەبەر ئەوەی سامخان بە فەرمانی ناسرەدینشا کوژرابوو.

کارەش بە فەرمانی حێساموسەڵتەنە کرابوو، دوایی نێوانی ئەمیر حسەین‌خان و حێساموسەڵتەنە خراپ دەبێت و خەڵکی قووچانیش کە زۆر لە ئەمیر حسەین‌خان دەترسان لە نامەیێکدا داوایان لە حسەین قولی‌خانی برای کرد تاکو وەرگەڕێتەوە قووچان و هەروەها ڕایانگەیاند کە لەبەر ئەوەی لەم کات و ساتەدا نێوانی ئەمیر حسەین و حێساموسەڵتەنە خراپە ئێمەش یارمەتیت ئەدەین تاکو دەسەڵاتی قووچان بکەوێتە دەستی بەرێزت کە برای گەوەی و دەبێ هەر تۆ سەرۆك و سەرکردە بیت.

حسەین قولی‌خان کە هێرش دەکاتە سەر قووچان و ئەمیر حسەین‌خان پیێ وابوو حسەین قولی‌خان بە یارمەتی حێساموسەڵتەنەوە هەڵمەتی هێناوە و خێرا و لە قووچانەوە بەرەو ئەستەرئاباد دەرباز دەبێت و حێساموسەڵتەنەش بێ‌ئەوەی ئاگای لەم ئاکارە بێت و هاوکات سەری سوڕ دەمێنی و فەرمان ئەدات بە پەرویز میرزای کوڕی فەتحعەلیشا تاکو ببێت بە حاکمی قووچان و میرزا عەلی‌ڕەزای مستەوفی دەکات بە جێگری.

بە گەیشتنی ئەم دوو کەسایەتییە، حسەین قولی‌خان هەر دوویانی کەلەبچە کرد و هاوکات چوار هەزار هێزی سوار و پیادەی تورکمانی تەکە[٤٠١] هاتنە یارمەتیەوە.

ئەم هەواڵە گەیشتە دەستی حێساموسەڵتەنە و ئەویش وای بە چاك زانی پەنا بباتە خالۆزاکەی واتا موحەممەد عەلی‌خان نازر کە دۆست و هەڤاڵی حسەین قولی‌خان بوو تاکو بڕوات و لەگەڵ حسەین قولی‌خاندا وتوویژ بکات و هاوکات ئەم هەواڵەشی ڕەوانەی تاران کرد.

کاتێ حسەین قولی‌خان موحەممەدعەلی نازری بینی خێرا ئەویشی کەلەبچە کرد و خستیە بەندیخانەوە. لە تارانەوە هەواڵ گەیشتە دەستی حێساموسەڵتەنە کە دەبێ ئاگادار بێت باسی تورکمانەکانی ئەستەرئاباد و شۆڕشی ئەوان زۆر گرنگە. حێساموسەڵتەنە، مێهدی قولی‌میرزای هاوڕێ قاوەچییێك ڕەوانەی قووچان کرد تاکو لەگەڵ کوردەکانی زەعفەرانلوودا

٤٠١- «تەکە» عەشیرەتێکی تورکمانە کە نادرشا لە دەوروبەری ئەستەرئاباددا نیشتەجێیانی کرد. ماوەیێکی ڕابردوو ئەم تورکمانانە بەرەو ئەتەك کۆچیان کرد و ساڵی ١٢٢٧ی کۆچی مەرویان داگیر کرد و لە ساڵی ١٢٩٩ی کۆچی بەم لاوە بە بۆنەی یاسای سنوورەوە پەلاماری ئێرانیان نەداوە. (لووگاشوا، بی‌بی ڕابێعە، تورکمانەکانی ئێران، وەرگێڕانی حسەین تەحوێلی)

پەیمان ببەستێ و بە حسەین قولیخانیش بڕیار بدات کە حکوومەتی قووچانی پێ بدرێت. حسەین قولیخان زوو هەڵخڵەتا و و بڕیاریشی دا کە ئەو سێ کەسە حەبس کراوە نەداتە دەستی تورکمانەکانەوە و بڕیار درا دامودەزگای بەزم و خۆشی و ژن و شەراو بۆ حسەین قولیخان بەدی بهێنن.[٤٠٢] مێهدی قولیخان دوای ئەوەی لەگەڵ سەرکردە کوردەکانی زەعفەرانلوودا پەیمانیان بەست لە قەلعەی قووچان هاتە دەرەوە لەم سەردەمە کورتەدا قەلعەکەی ڕێکوپێك کردبوو.[٤٠٣]

لە چناراندا بووین کە هەواڵیان هێنا حسەین قولیخان لەگەڵ چوار هەزار سوارەی تورکمان و زەعفەرانلوو لە قووچانەوە بەڕێ کەوتوون، ئێمە ڕوومان کردە ئەمیرئاباد. شەو بوو کە شازادە حێسامەوسەلتەنە داوای کرد کە من بچمە چاوپێکەوتنی، من پێش ئەوەی بڕۆم فەرمانم دا بە سپاکە تاکو هوشیار بن و ئامادەی شەڕ بن، حسەین قولیخان خۆی پێمان نزدیك کردبووەوە و هاوکات هاوڕێ موحەممەدعەلی خاڵدار خەریکی خواردنەوەی شەراب بوو، کوردەکانی زەعفەرانلووش دڵیان بە لای ئێمەوە بوو و تورکمانەکانیش ئاگاداری هیچ نەبوون، کاتێ خانی کورد مەستی لەسەری دەرچوو، ئێمە لەوێ نەمابووین و ئێمە دەڕۆیشتین و پاشا لە پشت سەری منەوە بوو، تێکڕا حسیەن قولیخان و کوردەکان و تورکمانەکان گەیشتن[٤٠٤] و ناوڕییان پێمان گرت، بەڵام هاوکات تاقمێك لە سەرکردە کوردەکانی هێزی حسەین قولیخان پشتیان لە ئامرهێزەکەیان هەڵکرد و چوونە یارمەتی شازادەوە، کاتێ خانی کورد ئەمەی بینی خێرا لەگەڵ تورکمانەکاندا بەرەو قووچان گەڕایەوە.

پیاوە گەورەکانی زەعفەرانلوو بە حێسامەوسەلتەنەیان گوت ئەگەر ئێمە پێشتر لە حسەین قولیخان خۆمان نەگەیەنینە قووچان. ژن و منداڵەکانیشمان ڕەوانەی تورکستان دەکرێن. بۆیە خێرا گەڕانەوە و ناوڕییان لە حسەین قولیخان بەست و لە ئاکامدا حسەین

---

٤٠٢- حسەین قولیخان ویستوویەتی ناخۆشیەکانی سەردەمی لاوەتی خۆی کە لە بەندیخانەدا بووە لەم ماوەدا قەرەبوو بکاتەوە.

٤٠٣- بنەماڵەی زەعفەرانلووەکان دوای وێران بوونی قەلعەی قووچان ئیزنیان پێ دراوە بنیاتی بننەوە.

٤٠٤- خاترات و ئەسناد حسەین قولیخان نیزاموسەڵتەنەی مافی، بەشی یەکەم، بە تێکۆشینی مەنسوورەی ئێتەحادییەی نیزام مافییەوە، ل ٢٩٨.

خاترات و ئەسناد حسەین قولیخان مافی.

قولیخان شکستی خوارد بەرەو فیـرووزە دەرباز بوو.

حێسامولسەڵتەنە زستانی ئەو ساڵە لە قووچاندا مایەوە و دوایی ئەسەدوڵا میـرزای کرد بە سەرۆکی قووچان و خۆی گەڕایەوە. ساڵی ١٢٨١ی کۆچی مانگی

کاتێ شازدە گەڕایەوە لە ڕادکاندا بوو بە میوانی خانلەرخانی کەیوانلوو، شەوێك لەوێ مایەوە و بەیانی حەمامی کرد و بەرێ کەوتەوە.

کوردانی کەیوانلووی دانیـشتووی ڕادکـان و چناران ژیـانێکی زۆر خۆشیان بوو ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی کاتێ کە ناسرەدینشا هات بۆ خوراسان کاتێ کە دەیەویست لە مەشهەدەوە بڕوات بۆ قووچان، پیاوەمەزنەکانی کوردی کەیوانلوو بە تایبەت موحەمـەد ڕەزاخانی حاکمی ڕادکان هاتنە پێشوازیەوە، ناسرەدینشـا دەڵێ کـاتێ گەیـشتمە نزدیکی ڕادکـان، خانلـەرخان ڕادکانی و موحەمـەد ڕەزاخانی حاکمی ڕادکان و... هتـد هاتنـە پێـشوازیـمەوە، خانلـەرخان ڕادکانی کە پیاوێکی بەساڵاچوو بوو زۆر ڕێزی بۆم دانا.

## فەرمانی ناسرەدینشا بۆ میـرزا حسەینخانی سپاسالار تاکو تورکمانەکان سەرکوت بکات

ئەم نامە فەرمانیە ساڵی ١٢٩٧ی کۆچی مانگی نووسراوە

بەڕێز سپاسالار ئەعزەم، ڕۆژنامە و تلگرافەکانی خوراسانم خوێندەوە و هەر لەو ڕۆژنامـەدا فەرمانـم داوە، بەڵام وام بە چاك زانی جارێکی دیکە بینووسـمەوە ئـەویش ئەوەیە کـە ئاگـاداری بارودۆخی خوراسان بن و ئەگەر دەرەگەزیەکان ناپیاویان کردووە ئەشکەنـجەیان بدەن و هەروەها بە دەرەگەزی و قووچانیەکان ڕابگەیەنن هێرش بکەنە سـەر تورکمانـەکان و ژن و منداڵـەکانیان دیـل بکەن. ئەم نامەی منە ببەن بۆ شوجاعودەولە تاکو ببینێ، بە ڕاستی تورکمانەکان لە بەرانبـەری ئەو پیاوەدا ناپیاوی زۆریان کردووە، و دەبێ خێرا قەرەبووی بکاتەوە.[٤٠٥]

٤٠٥- ئەڵلاهـ یارخـان دەرەگـەزی توانـای بەربـەرەکانێی لەگـەڵ تورکمانەکانیـدا نـەبووە و ناسـرەدینشـا و ئەمیـر حسێنخان ئاڵۆز بوون بە دەستیەوە. (بڕوانە بۆ ڕسالەی ڕەشیدییە)

# ڕاپۆرتی ئەمیــر حسەینخان شوجاعودەوڵە بۆ پایتەخت سەبارەت بە پیلانی ڕووسەکان لە ناوچە باکووریەکانی خوراسان

ئەم ڕاپۆرتە لە لایـەن سپاسـالار ئەعزەمـەوە (میــرزا حـسەینخـان) گەیـشتۆتە دەسـتی ناسرەدینشا کە لێرەدا بەشێکی بۆتان دەخەینە ڕوو، بەڵام بە داخەوە بەڵگـە دەسنووسـەکە لـە ناوچووە.

سپاسالار ساڵی ١٢٩٧ی کۆچی وەهای بۆ پاشانووسیوە:

شوجاعودەوڵە زۆر ڕێز و سڵاوی ئاراستەتان کردووە و هەروەها دوو تۆپیشی بۆتان ناردووە و سەبارەت بە کاروباری ڕووسەکان پێتـانی ڕاگەیانـدووە کـە کـاری ئاخـاڵ زۆر ئاسـایی نییـە، قووچان زۆر ئەهوەن و ئارامە و هەروەها خوراسان و ئەستەرئابادیش لە ژێر چەتری ئێوەدایە.

کوردەکانی تەبرێزیش بێدەنگ و باسن و وەکو جاران شۆڕش ناکەن.

غوڵامی درگانەی پاشایەتی حسێن

پاشا لە وڵامدا نووسیوویەتی:

نامەکەی شوجاعودەوڵەم خوێندەوە و نەخـشەکەی زولفەقارخانیـشم بـینی و جـارێکیتـر ناردمەوە و لە سەرتانە هەڵی بگرن، چون دوایی بە کار دێت،[٤٠٦] ناسرەدینشا ڕاسـتی گوتـووە، دەبێ ئەم نەخشەیە بپارێزرێت لەبەر ئەوەی مێژووی خوراسان لەم نەخـشە و نامـە و بەڵگانـەدا بەدی دەکرێن.

بەڵام بەداخەوە ئەم کارانە نەکراوە و زۆربەی زۆری بەڵگەکانی خوراسان ون بوون.

---

٤٠٦- ئەسناد بەرگوزیدەی سەردەمی قاجار، ئیبراهیم سەفایی.

# تلگرافی میرزا عەبدوولوەهاب ئاسەفودەوڵەی شیرازی والی خواراسان بۆ ناسرەدینشا

ئاسەفودەوڵە لە ساڵی ١٣٠١ تا ١٣٠٣ی کۆچی مانگی حاکم و والی خوراسان بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە بەرانبەری بارەگای ئیمامڕەزادا بێحورمەتی کردبوو خەڵکی مەشهەد شۆڕشیان کرد و پۆستەکەی لێ وەرگیرایەوە و ساڵی ١٣٠٤ی کۆچی لە تاران کۆچی دوایی کرد.

ئەم تلگرافەی کە کەوتە دەستمان بەرواری ٢٩ی جیمادیولئەوەڵی ساڵی ١٣٠٢ی لێ دراوە.

بۆ خزمەتی پاشایە ڕۆحم بێ بە فیدات، قوربانی ئەو خاکی بەری پێتەم، فەرمانەکەی بەرێزت گەیشتە دەستم و هەمووی فەرمانەکانتم لەسەر سەرم دانا و هەمووی ڕێکوپێك دەکەم، دەبێ پێتان بڵێم هەموو ناپیاوییەکان لە لایەن شەهابولمەلیکەوە بووە و لە ڕۆژێکەوە هاتۆتە ئەم شوێنە خەریکی خەڵك خڵەتاندنە، بە تایبەت تلگرافچی، بیگلەربەیگی نەسرەتولمەلیك[٤٠٧]، عیمادولمولك[٤٠٨] و نەسروڵلاخانی خڵەتاندووە، سپاس بۆ خوای مەزن زوو بەم ناپیاویەمان زانیوە و توانیمان پیلانەکەی بێڕەنگ بکەین، هەر وەك کە بەرێزت فەرمانت پێم داوە هاوڕێ لەگەڵ عەزەدولمولکدا دەچم، کاتێ گلەم لێ کرد هەم ترسا و هەم زۆر خەجاڵەتی کێشا و زۆر ڕێزم بۆ مامۆستا ئایینیەکان داناوە و هەر شەو، یەکیان میوانی منە نەسرەتولمولك سێ ڕۆژی دیکە دەبێتە میوانم بە ئیزنی خودا ڕێزی زۆری بۆ دادەنێم و هەروەها بۆ عیمادەلمولکیش ڕێزی زۆرم هەیە.

سەبارەت بە سەفەرەکەیش دەبێ بڵێم نابێ زۆر لەم شوێنە دوور ببمەوە، هەر ئەوەندە کە تا قووچان بڕۆم و سێ شەو لەوێ بمێنمەوە تەواوە و ڕێزی زۆریش بۆ شوجاعودەوڵە و

٤٠٧– نەسرەتولمولك عەلیخان قەراگوزلوو.

٤٠٨– عیمادولمولك لە سەردەمی ناسرشادا ساڵەهای ساڵ حاکمی تەبەس بوو.

سەهامودەوڵە دادەنێم و فەرمانی یەکسالی خۆمیان پێ ڕادەگەیەنم لەگەڵ شوجاعودەوڵەدا دەچین بۆ دەرەگەز و کاروباری مالیەی ئەوێ ڕێکوپێك دەکەم و دوایی دەچم بەرەو کەلات و کاروباری ئەویش ڕێکوپێك دەکەمەوە.

دەبێ لە ئاکامیشدا بلێم کە من کارێکم کردووە بە خوراسان کە قەت دوو هەزار کەس توانای کاری وەهایان نییە و بابیەکانی سەبزەواریش زۆر ئازار نەدەین چاکە،[٤٠٩] بە نهێنی بە حاجی فەرامەرزخانی حاکمی سەبزەوارم ڕاگەیاندووە تاکو ئاگادار بێت و قەت ئیزن نەدات کەس بڵێت من بابیم و ئەگەر کەس وای گوت خێرا کەلەبچە بکرێت و ڕەوانەی مەشهەد بێت.

سەبزەوار دوو عەشیرەتی تێدایە کە فەرامەرزخان زۆر ژیرە و دەزانێ چی بکات. عەشیرەتی عەباس ئاواییەکان زۆر شەیتانن و هیچ کاتێ سەرکردەیان نەبووە و ئێستا من موحەممەد ڕەزاخانم کردۆتە سەرۆکیان و دەزانم ئارام دەگرن و هەروەها عەشیرەتی ئەردین کە هەموویان تامەزرۆی موحەممەدقولین ببێت بە سەرۆکیان و لەم شوێنەدا کاری کشتوکاڵ زۆر لەبار و چاکە، هەوەها عێمادولمولك ڕاسپێری تەبەس دەکەم، بەلام هەر ئەوەندە کە عێمادولمولك ترسا زۆر چاك بوو تاکو بزانێ کەسێك هەیە فەرمانی پێ بدات. شێخوڕەبیس[٤١٠] زۆر ناپیاو و سپلەیە، لە ڕۆژێکەوە ڕۆیشتووەتە قووچان هەموو مانگێك دە تمەن پارە و یەك خەروار نانی پێ ئەدەم. کاروباری ئینگلیزییەکانیشم ڕێکوپێك کردووە، دوێنێ «ئێستیوورت»[٤١١] لەلام بوو و هەموو باسەکانمان تەواو کرد و هەردووکمان بڕیاری کەلوپەل و پێداویستیمان دا و هەروەها بڕیار درا دوو ڕۆژ جارێك بە تەنیا یەك ببینین و هاوکات لەگەڵ

---

٤٠٩- بابیەکانی خوراسان و سەبزەوار کە دژ بە دەوڵەت وەستا بوون.

٤١٠- میرزا ئەبولحەسەن میرزای شێخوڕەبیس قاجاڕ، سالی ١٣٠٠ و ١٣٠١ی کۆچی سەرپەرشتیاری بارەگای ئیمام ڕەزا بوو. ئاسەفودەوڵە ڕێزی بۆ ئەم پیاوە شاعیرە دانەناوە و ئەویش لە داخان ڕێگەی قووچان دەگرێتە بەر و لە شیعرێکدا گلەی خۆی دەردەبڕێ کە ناسرەدینشاش هەر بە شیعر وڵامی داوەتەوە. دەبێ بلێین ئەم کەسایەتییە سالی ١٣١١ی کۆچی مانگی دوای بومەلەرزەکەی قووچان کە شار بە تەواوی وێران و کاول بوو، تونێلی دروست کرد و خۆی گەیاندە قورئانە مێژووییەکەی بایسونقوڕی کە کوردەکان لە سەمەرقەندەوە هێنابوویان و ئەمڕۆ لە مۆزەی بارەگای ئیمام ڕەزای مەشهەد دایە.

٤١١- ئەم کابرایە یەکێ لە بەکرێگیراوەکانی ئینگلیز بوو و سالی ١٢٩٧ تا ١٣٠٢ی کۆچی بەبیانووی دیاری کردنی سنووری ڕووس و ئەفغانستانەوە لە خوراسان بوو و سالی ١٣٠٥ی کۆچی ڕۆیشت بۆ ڕەشت.

ڕووسیەکانیشدا نێوانمان کۆکە. کاروباری ئاخاڵیش بە چاکی دەڕواتە پێشەوە و باسی زۆریشم لەسەری هەیە و بەیانی من دەچم بۆ کەلات و دوو تۆپیش دەبەم تاکو لەوێ دایبمەزرێنم.

پۆستی ٢٨، زۆر بە قازانج بوو.

غولامی درگانەت ئاسەفودەولە

ناسرەدین شاش لە پەراوێزەکەی دانووسیوویەتی:

هەمووی وڵامەکانتم خوێندەوە و هەمووی ڕاستە و هەمووی دروست دەبێ، بەڵام سەبارەت بە باسی زولفەقار و هاتنی ڕووسەکان بۆ هەریرورد، من لە زمانی ئینگلیزییەکانەوە بیستوومە، دوێنێ نوێنەری ئینگلیز هاتە چاوپێکەوتنم و چەند هەواڵێکی هێنا و بۆیە منیش بۆ تۆ تلگرافم لێ داوە.

باسی زولفەقار هیچ کارێکی بە سەر کەلات و دەرەگەزەوە نییە و زۆر پێم سەیرە تۆ ئەمەت نەزانیوە و دەبێ بڵێم پێداویستی بە شاموحەممەد نییە.[٤١٢] بۆ زانیاری سەبارەت بەم کارە دەبێ لە عەتاخان تەیموری پرسیار بکەیت و ئاگادار بیتەوە کە زولفەقار لە خواری زوورئابادەوەیە، ڕووسەکان دەبێ لەم بەری هەریروودەوە بن یان نە خێرا دەبێ ئەم کارە بکەیت و وڵامەکەمان بۆ تلگراف بدەیت و ئەگەر ئاوەها بێت سنوورەوانەکانتان کۆتاییان کردووە، ڕووسەکان چلۆن دەبێ لە چۆمی هەریروودەوە کە سنوورە وەرگەڕێنەوە و بێنە خاکی خوراسان.[٤١٣] دەبێ خۆت ئاگاداری ئەم کارە ببیتەوە و خێرا وڵامەکان بۆ بەرێ بکەیتەوە.[٤١٤]

---

٤١٢- زۆربەی فەرمانەکان لە لایەن پارێزگار و پارێزەرەکانەوە دراوە و پێداویستی بە ئەوە نەبوو پاشا ئاگادار بێت، بەڵام ناسرەدین‌شا لێرەدا لە والی خوراسان چاکتر ئاگاداری بارودۆخی جیۆگرافیای خوراسان بوو.

٤١٣- موحەممەد حسێن موهەندس لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا بۆ شازادە ئەبولفەتح خان میرزای موئەیدودەولە کە لە ساڵی ١٣١٠ی کۆچییەوە حاکمی خوراسان بوو نووسیوویەتی: ١٠٠ کەس لە قەزاقە ڕووسیەکان لە پێشەنگی ڕووسیەکاندا نیشتەجێ پولخاتوون بوون و خانووبەرەیان بنیات ناوە و لە ڕێگای ڕۆخانەی تەژنەوە دێنە وڵاتی ئێمەوە، کەچی هەر لەم سەفەرەمدا سێ سوارەی قەزاق لەم بەری خاکی ئێرانەوە پێم گەیشتن کە بە زمانی ڕووس قسەیان دەکرد. (سەفەرنامەی ڕۆکنودەولە بۆ سەرەخس، بە تێکۆشانی موحەممەد گولبون، ل ٢٨)

## ڕووسە داگیـرکەرەکان و کوردەکانی خوراسان

هاوکات لەگەڵ دەسەڵات پەیداکردنی زنـجیـرەی سەفەوی لە ئێران لە باکووری وڵاتیـشدا ڕژێمی فاشیستی ڕووسیە کە بەرەو پێشکەوتن دەڕۆیشت و وڵاتی ئێرانیش هەر لاواز دەبـووەوە و بە تایبـەت لـە سـەردەمی سـوڵتان موحەمـەدی خودابەنـدەدا سـنوورەکانی ئێـران خـاوەن دەسەڵاتێکی زۆر بوو، چ لە بـواری سیاسـی و چ لـە بـواری ڕامیاریـەوە زۆر پێـشکەوتوو بـوو، ڕووسەکانیش هاوکات ملازیان گرتبوو و تـاکو لـە سـەردەمی شاسـوڵتان حـسەینی سـەفەویدا پەلاماری خۆیانیان دا.[٤١٥]

بە دەسەڵات پەیداکردنی نادرشـا، ڕووسـەکان ڕاونـران و هاوکـات نـادر بـە گواسـتنەوەی کوردەکانی عەمـمارلوو لە خوراسانەوە بۆ گیلان لە پەلاماری ڕووسەکان بەرگری کرد.

هەروەها دوای کوژرانی ئاغا موحەمـەدخان، ڕووسەکان ڕێگایان بۆ بووەوە و کەچی لـە سەردەمی فەتـحعەلیشادا ناوچەکانی قەفقاز و گورجستان و بەشێك لە ئازەربایـجان دابڕ کـراو بوو بە خاکی ڕووسیە. مەبەستی ئەو ڕووسیانە لە داگیـرکردنی ناوچەکانی ئێران گەیـشتـن بـە ئاوەگەرمەکانی باشووری ئێران بوو وەك چلۆن لە وەسیەتنامەکەی «پـتـری گـەورە»دا ئامـاژەی پێ کراوە.

لە سـەردەمی ناسـرەدینشـادا بـێتوانـایی و خوێڕیگـەری دامودەزگـای قاجـاڕ گەیـشتە جێگاییێك کە بەشێکیتر لە وڵاتی ئێران لـە بـاکووری خوراسـانەوە درایـە باوەشـی ڕووسیەوە. ئەمـجارە بە پێی ڕێکەوتنامەی ئاخاڵەوە لە ساڵی ١٢٩٩ی کۆچی مانگیـدا ئاخـاڵ و فیـرووزە بوو بە مولکی ڕووسیە.

پاشای قاجـاڕ جگـە لـەوەی هـیچ کـاتێ نـاوڕێ بـە ڕووسـیەکان نـەگرتووە، کاتێـك کـە

---

٤١٤– ئەسناد نەویافتە، ئیبراهیم سەفایی، ل١٧٥.

٤١٥– پـتری کـەبیر لـە لـەڕولاواز بـوونی دەسـەڵاتی شاتەهماسبی سێهەم قـازانجی زۆری کـرد و بـە پێـی ڕێکەوتنامەی ١٢ی سپتامبری ساڵی ١٧٢٣ی پترزبوورگەوە، شارەکانی ناوچەی باشووری قەفقازی لە ئێران جیا کردەوە.

ژنراڵێکی ڕووسی بۆ کۆکردنەوەی پێداویستیەکانی دەوڵەت دێتە خوراسان[٤١٦] پاشا پیی ڕادەگەینێ کە ئاگادار بە، شوجاعودەوڵە -ئەمیر حسێنخان کورد- پێت نەزانێ، ئەگینا ناوڕێت پێ دەگرێت.

کاتێ ڕووسیەکان بە زەلیلی ناسرەدینشایان زانیوە کەوتووەتە سەریان دا تاکو سەرانسەری ناوچە باکوورییەکانی ئێران واتا لە مەهابادەوە تاکو گیلان و مازندەران و خوراسان لە ئێران جیا بکەنەوە و بیخەنە سەر خاکی ڕووسیە، بەڵام ئینگلیزییەکان بەم کارەیان زانیوە و بۆ ئەوەی لە ڕووسەکان جێ نەمێنن، لورد کورزەنیان ڕەوانەی قووچان کرد تاکو کوردەکان هان بدات دژ بە ڕووسیەکان بووەستن.

لورد کەرزەن بە ئەمیر حسەینخانی ڕاگەیاند: دەڵێن ڕووسیە دەیەوێ خوراسان داگیر بکات و ئەمیر لە وڵامدا گوتی: ڕووسیە چلۆن ئەتوانێ کاری وەها بکات؟ لورد گوتی: وەك چلۆن توانی ئەتەك و ئاخاڵ بگرێ. ئەمیر بە تووڕەییەوە گوتی: نە، قەت کاری وا نابێت. خەڵك ئیزنی ئەم کارە نادەن و هەموان بۆ پاراستنی مەشهەد هەوڵ ئەدەن، خۆ ئێمە ماستاو نین هەڵمانلووشێنن، ئێمە دیوارێکی گۆشتین کە لە دیواری بەردیش بەهێزترین. بەڕێز مەحموود دەڵێت: ساڵی ١٨٨٤ی کۆچی جارێکیتر ڕووسیەکان پەلاماری ئێرانیان دا بەو بیانوەی کە گوتیان دەمانەوێ سنوورەکان دیاری بکەین و لە پاشای ئێران داوایان کرد تاکو بەشێکی دیکە لە خاکی خوراسان کە مەشهەدیشی دەگرتەوە بدرێت بەڕەوسییەکان، بەڵام سەدرئەعزەم ئیزنی کاری وەها نادات و ئەم باسە تا سەردەمی موحەممەد عەلیشا بێدەنگ دەمێنێتەوە.[٤١٧]

## ڕێکەوتنامەی نالەباری ئاخاڵ

ڕێکەوتنامەی ئاخاڵ ساڵی ١٢٩٩ی کۆچی مانگی لە لایەن ڕووسیەدا سەپایە سەر ئێران

---

٤١٦- ئێران و قەزیەی ئێرانی، لورد کەرزەن، ل١٥٨.

٤١٧- تاریخ ڕەوابیت سیاسی ئێران و ئینگلیز، مەحموود مەحموود، بەرگی ٥، ل ٩٨.

کە بوو بە هۆی شەڕی نالەبار و گرنگی موحەممەد ئەمین‌خان پاشای خوارەزم دژ بە سوپای ئێران بە سەرۆکایەتی سام‌خان زەعفەرانلوو، دەبێ ئاماژە بکرێ لەم شەڕەدا پاشای خوارەزم کوژرا و سپاکەشی دەرباز بوون.

کاتێ ئینگلیز پەی بەوە برد کە سام‌خان زۆر هێزی پەیدا کردووە، باسی هەراتی خستە بەردەست و هانی خەڵکی ئەو ناوچەیەدا تاکو دژی دەسەڵاتی ئێران بووەستن و بەم شێوەیە سام‌خانی حاکمی ئێران ناچار کراوە وەرگەڕێتەوە هەرات و بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لەوێ دژ بە شۆڕشگێڕانی هەراتی دەستنیشانی ئینگلیز، شەڕی کرد. دەبێ ئاماژە بکەین سام‌خان بڕیاری دابوو دوای شەڕی پاشای خوارەزم دەچێتە مەیدانی ئینگلیزیەکانەوە و ئەوانیش بۆ ئەوەی لەم کارە بەرگری بکەن باسی هەراتیان خستە ڕوو. بەڵام ئەم کەڵەکوردە جارێکی‌تر و لە مەیدانێکی‌تردا سەرکەوت و توانی بە پێچەوانەی هەموو دەسەڵاتدارانی مێژوو وەك نادر و... هتد هەرات داگیر بکات و ئەمجارە ئینگلیز کەوتە بیری ئەوەی تاکو داوا بکەن لە ناسرەدین‌شا بەڵکو پیلانێ دابڕێژێت ئەو کارێ بکات ئیزن بە سام‌خان نەدات لەوە زیاتر بڕواتە پێشەوە و هاوکات ڕژێمی ئینگلیز هێزی دەریایی خۆی لە بووشێهر دابەزاند تاکو پاشای ئێران چاوترسێن بکات.

هەروەها دەبێ ئاماژەش بکرێ کە کوژرانی پاشای خوارەزم بە دەستی سام‌خان هیچ کە بە قازانجی ئێران نەبوو، زۆر بۆیشی گران تەواو بوو و سەرانسەری ئەو ناوچانەی کە بریتی بوون لە سەمەرقەند و تاشکەند و بوخارا بە جێگای ئێران کەوتە دەستی ڕووسیەکان. پەلاماری ڕووسیەکان لە ساڵی ١٢٦٥ی کۆچیەوە دەستی پێ کرد و ساڵی ١٢٨٥ی کۆچی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان و شارە باکووریەکانی ئێران کەوتە دەستی ڕووسیەکان ئەگەرچی خانی خێوە ماوەیێك لە بەرانبەری ئەم ناپیاوانەوە وەستاوە و زۆریش پیاوانە بەرنگاریان بووەتەوە، بەڵام کاتێ داوای یارمەتی لە ناسرەدین‌شا کردووە پاشای ئێران گوێی پێ نەداوە و لە ئاکامدا خانی خێوە شکستی خوارد و ڕووسیەکان سەرکەوتن.

ساڵی ١٢٩٠ی کۆچی سپای ڕووس بە سەرکردایەتی کاوفمانەوە پەلاماری تورکمانەکانی یەمووتی داوە، ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی سەرتیپ لازارۆف ئەرمەنی و دوایی ژێنراڵ

ئوسکۆبولف[٤١٨] بوون بە بەرپرسی داگیرکردنی تورکمەنستان و عێشقئاباد و فیرووزە و نسا و ئەنا، خەڵکی ئەم ناوچەیە کە لە کوردەکانی زەعفەرانلوو و شادلوو و تورکمانەکانی یەمووت و گوگلان بوون، بۆ یەکەمین جار لە سەرانسەری مێژوودا پەیمانی یەکیەتیان بەست و شەڕی بەناوبانگی گوڵتەپەیان بەرێ خست. سەرکردەی کوردەکان لەم شەڕانەدا موحەممەد دوردیخان جەلالی بوو کە بە ئازایەتییێکی زۆرەوە ڕووی کردە مەیدانی شەڕانخێز. (بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە بەرگی سێیەمدا)

ئاکامی ئەم شەڕە شکستی کوردەکان و سەرکەوتنی ڕووسیەکان بوو و ئەم سەرکەوتنی ڕووسیانەش بە بۆنەی ئاگری تۆپخانەوە بوو کە هاوکات کوردەکان و تورکمانەکان بە شمشیر شەڕیان کردووە و لە کۆتایی ئەم شەڕەدا ڕێکەوتنامەی ١٢٩٩ی ئاخاڵ لە نێوان ئێران و ڕووسدا بەسترا.

ڕووسیەکان جگە لە فیرووزە کە ناوەندی دەسەڵاتی ژنراڵ موحەممەد وێردیخان بوو، سەرانسەری باکووری خوراسانیان گرت و خۆیانیان کرد بە سەرۆکی وڵاتە ئاسیاییەکان. ناسرەدینشا دوای شەڕی هەرات، ڕێکەوتنامەی ئاخاڵی ئیمزا کرد و ئەفغانستان و هەرات و بەلووجستان بە یەکجاری لە ئێران دابڕان.

## دەقی ڕێکەوتنامەی ئاخاڵ

ئەم ڕێکەوتنامەیە لە نێوان دوو وڵاتی جیاوازی ئێران و ڕووسدا لە ڕێکەوتی ١٢ی دسامبری ١٨٨١ی زایینی لە تاراندا بەستراوە.

لەبەر ئەوەی پاشای پاشاکانی ئێران و ئیمپراتووری ڕووسیە هەستیان بە ئەوە کرد کە دەبێ لە بەشی ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەرەوە هێڵی سنوورەکان بکێشنەوە تاکو هەر دوو لا بە

---

٤١٨- ئەمە هەر ئەو سەرهەنگەیە کە لە لایەن گرودکۆفەوە کرایە بەرپرسی کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ شەڕی مەرو و بوخارا لە خوراساندا و هاوکات ناسرەدینشا پێیانی ڕاگەیاند بوو تاکو هوشیار بن. ئەمیر حسەینخان ئاگاداری ئەم کارەیان نەبێتەوە و ئەوانیش لەوڵامی ئەمیر حسەینخاندا گوتیان لەبەر ئەوەی لە سۆفیەتدا وشکەساڵی هاتووە ئەم کارەمان کردووە.

ئاسوودەییەوە پاشایەتی بکەن وایان بە چاك زانی کە ڕێکەوتنامەیێك ئیمزا بکەن و بۆیە هەر کام نوێنەری خۆیانیان بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە ڕەوانەی ناوچەکە کرد، نوێنەری پاشای ئێران «میرزا سەعیدخانی موئتەمێنولمولك» بوو کە هاوکات وەزیری دەرەوەش بوو، نوێنەری ڕووس «ئەیوان زینوودیف» بوو.

ئەم دوو وەزیرە کاتێ کارەکەیان جێبەجێ کرد، ڕێکەتنامەیێکیان لە چەند بەشدا نووسی کە بەشەکانی بەم چەشنەی خوارەوەن:

**بەشی یەکەم:** لە بەشی ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەرەوە سنوورەکان بەم چەشنە دیاری کران کە هەر لە کەنداوی حسەین قولی هەتا چات هێڵی سنوور دابڕێژرێت کە دەبێتە چۆمی ئەترەك و هەروەها هێڵی سنوور لە چاتەوە هەتاکو دەگاتە کێوەکانی سەنگوداغ و ساکەریم دیاری کرا و لە بەشی باکوورەوە بەرەو چۆم چەندەر ئەم هێڵە درێژەی هەیە لە وێشەوە دەگاتە چقانقەلعە و کێوەکانی دەوروبەر و دۆڵی سوومبار لەبەر دەگرێت کە هێشتا هێڵی سنورەکە تا ئێرە هەر بە ئاوی چۆمی ئەترەك دیاری کراوە و ئەم ئاوە دەگاتەوە ئاخئاقایان و لەوێوە بەرەو دوندی چیای کووپێتداغ دەڕوات و لەوێشەوە دەڕوات بەرەو باکووری ڕۆژئاوایی تاکو دوای تێپەڕکردنی گەرماب[419] لەوێوە دەگاتە ڕوبات[420] و کاتێ گەیشتە ئەوێ دەبێتە سنوور و هێڵی سنوور لە دوندی چیاکانەوە تا دوندی چیای دالانچە درێژەی هەیە و لە باکووری ئەو چیاوە دەگاتە دوندی چیای خێرئاباد و لە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتیەوە دەگاتە نزدیکی گووك قتیال و لەوێوە دەگاتە دەربەند. ڕوودی فیرووزە کە ڕێگای عێشقئاباد و فیروزە لەوێوەیە و دوایی هێڵی سنوورەکە لەوێوە دەگاتە باکووریترین دوندی کێوی ئەسلەم و لەوێوە دەگاتە کەلتەچنار و دەگاتەوە ژێر کێو قەزلداخ و لەوێشەوە دەڕوات تاکو دەگات بە چۆمی بابادەرمز و لەوێشەوە ڕوو دەکاتە جولگەی نێوانی گاوورەس و لوتفئاوا.

**بەشی دووەم:** لە بەر ئەوەی لە بەشی یەکەمدا هێڵی سنوورەکان نووسرا و خرایە بەردەست، پسپۆڕانی سنوورەکان دەبێ بێنە ناچەکە و هێڵی سنوورەکان بکێشن.

---

٤١٩– گەرماب سەر بە شاری فیروزە بوو کە ڕووسیە داگیری کرد.

٤٢٠– یەکێ لە گوندە سنوورییەکانی ئێرانە.

**بەشی سێیەم:** لە بەر ئەوەی قەلعەی گەرماب و قەلقولاب لە باکووری هێڵی سنوورەکەوەن، دەبێ دەوڵەتی ئێران پاش یەك ساڵ ئەم دوو قەلعەیە بداتە ڕووسیە.

**بەشی چوارەم:** لە بەر ئەوەی چاوکەی چۆمی فیرووزە و سەند لە ئێران دایە دەبێ ئیزن نەدرێ لە دەوروبەری ئەم چۆمە گوندێکی نوێ بنیات بنرێ و هەروەها ئیزن نەدرێ زۆرتر لەمە لەو ناچانە کشتوکاڵ بکرێ. دوای دابینکردنی ئەم ڕێکەوتنامەیە هەر کەس بەرنگاری وەستا، هێرش بکرێتە سەری.

**بەشی پێنجەم:** بۆ پەرەپێدانی هاتوچۆی تیجاری و بازرگانی لە نێوان دوو ناوچەی جیاوازی خوراسان و ناوچەکانی نزدیکی خەزەر ڕێگاییێکی ڕێکوپێك دروست بکرێ.

**بەشی شەشەم:** وڵاتی ئێران بڕیار ئەدات کە ئیزن نەدات هیچ جۆرە چەك و تەقەمەنییەك لە ناوچەی ئەستەرئاباد و خوراساندا ئاڵوگۆڕ بکرێ و هەروەها دەبێ تورکمانەکانیش بێ‌چەك بکرێن. هاوکات هیچ ڕووسیەییێکیش ئیزنی فرۆشی چەکی بە ئیران لەم سنوورەوە نەبێ.

**بەشی حەفتەم:** بۆ پاراستنی ناوچە سنووریەکان لە پەلاماری تورکمانەکان سەربازانی ڕووسی ئیزنی ئەوەیان هەیە لەو ناوچانەدا هات و چوو بکەن و بمێننەوە.

**بەشی هەشتەم:** هەمووی ڕێکەوتنامەو پەیماننامەکانی پێشوو هەر بەردەوام بێت.

**بەشی نۆوەم:** ئەم ڕێکەوتنامەیەکە لە دوو بەرگدا نووسراوە و هەر دوولا ئیمزاو مۆریان کردووە و هاوکات پاشای ئیران[٤٢١] و ئیمپراتوری ڕووس ئیمزایان کردووەو دوای ٤ مانگی‌تر ئەم ڕێکەوتنامەیە لە تاراندا دەدرێتە دەستی هەر دوو لا.

تاران، ٩ی دیسامبری ١٨٨١ی زایینی

(٢٢ی موحەرەمی ١٢٩٩ی کۆچی)

ئیمزای زینوودیف

ئیمزای میرزا سەعید خان[٤٢٢]

---

٤٢١– لەم ڕێکەوتنامەدا بۆ دڵخۆشی لە پێشدا ناوی پاشای ئێران نووسراوە و پاشان ناوی ئیمپراتوری ڕووسیە هاتووە.

٤٢٢– جەماوەری ڕێکەوتنامەکانی مێژوویی ئێران لە سەردەمی هەخامەنشی تا پالەوی، کۆکردنەوەی، ع. وەحید مازندەرانی، لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی دەرەوە، ل ١٤٣. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە بۆ مەجموعە ڕێکەوتنامەکانی ئێران و دوڵەتەکانی‌تر، کۆ کردنەوەی حسێن پیرنیا موئتەمینولمەلێك، ل ١٧٤ و ١١٦ و

# بەرپرسانی ئێرانی بۆ دیاریکردنی سنوور به قازانـجی ڕووس کاریان کرد

خەڵکی کەلات ڕەنـجی زۆریان کێشا و پێیان وابـوو بەشـی زۆری ئـەم ڕەنـج و سـەختیە، تاوانی ئەرفەعودەولەیە و بۆیە چەند جار پەنایان بردە پاشا بە بێ‌ئەوەی بزانن کە هەمووی ئـەم ناپیاوەتیانیە لە لایەن پاشاوەیە.

ئەرفەعودەولە بە چەند خاڵی گرنگ ئامـاژەی کـردووە کـە لـە کتـێبی بەسـەرهاتەکانیدا دانراوە و دەڵێ: ساڵی ١٨٨٣ی زایینی (١٢٦٢ی کۆچی هەتاوی) وەك وەرگێڕی ڕێکەوتنامـەی ئاخاڵ وەرگیـرام و لە لایەن میـرزا سەعیدخانی وەزیری دەرەوە تلگرافێك گەیشتە دەستم تـاکو بـڕۆم بـۆ تـاران و پـێم بڵـێن چـی بکـەم و چـی نەکـەم. کەچـی ڕۆیـشتم و دوای سـەفەرەکەی ناسرەدین‌شا بۆ خوراسان بوو و بۆیە هەمووی ئەسپە «لاکنتی»یەکان لەناو چووبوون و ئەسـپی چاك نەمابوو من سواری ببم و تەنانەت لە نزیکی خوراساندا مـن سـواری کـەر بـووم و دوایـی وشتـرێکیان بـۆ هێنـام تـاکو سـواری بـم و لـەو سـەفەرمدا ترێـی زۆرم خـوارد و هاوکـات عەسکەریەیگیش سەوەتەیێك ترێی بۆ هێنام کە زۆرم لێی خوارد. عەسـکەریەیگ گـوتی: ئـەم هەمو ترێیەم بە سێ شایی[٤٢٣] کڕیوە کە زۆر پێم سەیرە بۆچی ئەوەندە هەرزانە.[٤٢٤]

ئەرفەعودەولە چەند ڕۆژێك لە مەشهەد دەمێنێتەوە، دوایی بۆ دیداری ڕوکنودەولەی برای ناسرەدین‌شا کە ئەو کات والی خوراسان بووە ڕاسپێری کەلات دەبێ. ئەرفەع دەڵێ: تـا بـەیانی

---

بەرگی دووەم، قەرارداد ئێران و سۆڤیەت، ل ٣٤٩ و سـنوورەکانی ئـێران و سـۆڤیەت، سـپەهبۆد ئـەمانوڵلا جەهانبانی، ل ٤٠.

٤٢٣- پارەی سەردەمی قاجاڕ.

٤٢٤- بارودۆخی کشتوکاڵ لەم سـەردەمە دا زۆر نالـەبار بـوو، سێوی باخـەکانی ئێران کـەس ئـاوڕی لێـی نەدەدایەوە، سێوی لوبنان دەهێنرا و لە لایەن دەوڵەتەوە بە پـارێکی زۆر دەیـان کـڕی و هـەروەها سـێوە عەرزیلەی پاکستان و پرتەقاڵی ئیسرایل دەهات و میوەکانی خۆمان فـڕێ دەدران و بۆیـە باخدارەکان دڵ سەردبوونەوە و ئەوەنـدە بـێ پـارە بـوون کـە بـۆ وەدەسـتـخستنی پـارەی ماڵیـە، زۆر جـار ژن و [illegible] خۆیانیان فرۆشتووە بە تورکمانەکان.

بە ڕێگەدا ڕۆیشتین و بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە کەلاتی نادری. لە کەلاتدا چاوم کەوت بە ئەمیر حسەین‌خان شوجاعودەوڵە و سەربازە قووچانیەکانی و یارموحەمەدخان سەهامودەوڵە و سەربازە بجنووردیەکانی و هەروەها موحەمەد عەلی‌خان دەرەگەزی و هێزەکەی.[٤٢٥] هاوکات نامەبەرێك لە سەرەخسەوە گەیشت و نامەییکی لە حاکمی سەرەخسەوە هێنا کە نووسیبووی: لەبەر ئەوەی سەیدێکی ڕەش‌پۆش لە مەرودا پەیدا بووە و سی هەزار کەسی کۆ داوەتەوە و دەڵێ من ئیمامی زەمانم (مێهدی) و دەمەوێ خوراسان داگیر بکەم، دەبێ بەرنگاری ببنەوە و بۆیە شوجاعودەوڵە و سەهامودەوڵە بوون بە بەرپرسی سەرکوت کردنی ئەم کابرایە، بەڵام لە بەر ئەوەی خەڵکی لوتفئاباد و لایین شۆڕشیان کردبوو و ناڕەزایی خۆیانیان سەبارەت بە ئەم کارەی ئێران (سنوور دارشتن و دابڕبوونی ناوچەکانی ئێران) دەربڕیبوو، پاشا وای بە چاك زانی لە پێشدا ئەم خەڵکە سەرکوت بکات و دوایی کاری دارشتنی هێڵی سنوور دەست پێ بکات.

ئەرفەعودەوڵە دەڕوات بۆ لوتفئاباد و ڕووسیەکانیش لە کێوی ئەو بەری لوتفئابادەوە و بە ٣٠٠ سەربازی قەزاقی و بە سەرۆکایەتی کولونێل ئاتاماژوور گوزمین کاراوایف وەستابوون و هاوکات میسیو پاختیانوف کپیلوف قەرەباغی وەرگێڕیان بوون و ڕووسیەکان کارێکی ژیرانە دەکەن و دەچنە نێو هێزە ئەفشاریەکانەوە کە سەرۆکیان سلێمان‌خانی ئەمیر توومان بووە و هاوکات نوێنەری ئێران بووە بۆ دارشتنی هێڵی سنوور، دوای دوو ڕۆژ لوتفئاباد بە پێی ڕێکەوتنامەی ئاخال بەشێك لە ناوچە باکووریەکانی ئێران دەدرێت بە ڕووسیە.

ئەرفەعودەوڵە دەڵێت، هێڵی سنوورەکە لە لوتفئاباددا بە هێڵی کەسك دیاری کرا کە زۆربەی زۆری زەوینە کشتوکاڵیەکانی خەڵکی لوتفئابادی لەبەر دەگرت کە دەکەوتنە خاکی ڕووسیەوە، ئێمە زۆر سەرمان سوڕما کە چلۆن دەسەڵات دارەکانی ئێران تەنانەت ئەندازیارێکی پسپۆڕیان بۆ دیاری کردنی ئەم هێڵە ڕەوانەی ناوچەکە نەکردووە. سلێمان‌خان بە کولونێل دەڵێت وەك خۆتان دەبینن ئەم ڕێکەوتنامەیە هەر لە تارانەوە ئیمزا کراوە و کەس لە دەسەڵاتداران شارەزاییکان بەم نەخشە نەبووە و زۆر نەزان بوون بەڵام ئێوە خۆتان، خۆتان بکەن بە قازی کە

---

٤٢٥- ئێران دیروز، پرێنس ئەرفەع، ل ٩٩.

چلۆن دەکرێ ئەم خەڵکە هەژارە بە بێزەوینی کشتوکاڵ بمێننەوە. کولونێل لە وڵامدا دەڵێت: ئێمە خۆ نەهاتووین عەداڵەتخانە دابمەرزێنین، ئێمە بەرپرسی ئەم کارەین و دەبێ ئەم کارە بکرێ. سلێمانخان تووڕە دەبێت و نەخشەکان فڕێ دەدات و دەڕوات و دەڵێت ئەوە من ڕۆیشتم و ئەو پۆستەشم ناوێ، هەر بەم بۆنەوە ئەم جارە دیاریکردنی سنوور جێبەجێ نەکرا و نوێنەری هەر دوو لا هەواڵیان گەیاندەوە پایتەخت دوای سی ڕۆژ لە تارانەوە دوو تلگراف دەگاتە دەستی سلێمانخان کە یەکێ لە لایەن پاشاوەیە و ئەویتریان لە لایەن وەزیری دەرەوەیە کە دەڵێ پاشا زۆر تووڕەیە و دەڵێ دەبێ تۆ هەر بەرپرس بی و ئەو کارەش خێرا دەبێ جێبەجێ بکرێ.

پاشا لە تلگرافەکەیدا گوتبووی بۆچی پێت وایە من زۆر حەزم لێیە ئەم کارە بکرێ؟ بەڵام چی بکەم دەسەڵات نییە. ژنراڵ ئوسکۆبلوف، گوڵتەپەی تەقاندەوە و دوایی عێشقئاباد و ئاخاڵیشی داگیر کرد، بەڵام کاتێ زانی ئەوێ وشك و قاقڕە ڕووی کردە خوراسان و بۆ ئەو مەبەستەش خۆی گەیاندە قووچان و هاوکات هێزەکەشی دابەزاند، دەی تۆ بڵێ من بە کام هێز و سوپاوە شەڕ بکەم، من خۆم زۆر لە ئیمپراتۆر پاڕامەوە تاکو فەرمانی دا بە ئوسکۆبولڤ هێزەکانی لە خوراسان وەربگەڕێتەوە دواوە، تۆ ئیزن بدە تۆزقاڵێکی خاکی لوتفئابادمان بۆ چییە، تکاکارم فەرمانەکەم مەشکێنە و بە قسەم بکە. دوابەدوای ئەم تلگرافە، پاختیانۆڤ نامەیێکی بۆم نووسی (ئەرفەعودەولە) و ڕای گەیاندبوو تاکو کارەکەرێکی زۆر بڕازێنمەوە بۆ داچەقاندنی نیشانەکانی سنوور. لە دانیشتنەکەی ڕووسدا سێ کەسم دەناسی کە بریتی بوون لە:
١- پاختیانووف ٢- جێگری کولوونێل، واتا سەرهەنگ سەرپیتسکی ٣- کپیلووف قەرەباغی کە پیاوێکی ئەندازیار بوو.

بەڵام لە بەر ئەوەی کولونێل نەیئەتوانی لە بەرانبەر ئەم لە بەرانبەر وەستانەی سلێمانخانەوە بێدەنگ بێت و هاوکات حەزی لێ نەبوو نامەی بوو بنووسێ، لە جیاتی ئەو، نامەیێکی بۆ من نووسی و ئەمنیش ئەو نامەیەم پیشانی سلێمانبەیگ دا، سلێمانبەیگ بە بێئەوەی کەس ئاگای لێ بێت پێمی گوت: تلگەرافەکەی پاشات بینیوە؟ دەی ئەگەر من ڕەزام لە سەری ببێت و ڕووسیەکان ئەو هێڵی سنوورە بەو شێوەیە بکێشن، تا دنیا دنیایە ناپیاوی بۆ خۆم و بنەماڵەکەم دەمێنێتەوە، من قەت کاری وەها ناکەم و بەم لوتفئابادییانەی کە تەنانەت

خوێندەوارێکیشیان نییە زوڵم ناکەم، دەڵێن: «دوایی، سلێمانخان سەد هەزار ئەمپریالی لە ڕوسیەکان وەرگرتووە و زەوینەکانی لوتفئابادی داوەتە باوشیانەوە». لوتفئابادیەکان پێشتر گوتوویانە ئەگەر زەوینەکانمان بدرێتە ڕوسیە خۆیشمان دەچینە ژێر دەسەڵاتی ڕووسیەوە، دەی ئەو کاتە چی بڵێم؟!

بیستوومە کە باوکی تۆ لە تەبرێزدا پیاوێکی پیاوانە و لەخوداترس بووە و چاک دەزانم ئێوەش چون کوڕی ئەو پیاوەن هەر پیاوچاك دەبن و مافی گەل و هۆز و نەتەوەکەت لە بەرچاو دەگری، ئەو ڕۆژە چاوم لێوە بوو کە ڕوسیەکان زۆر بە گەشاوییەوە لەگەڵ تۆدا دەدوان و پیشاندەری ئەوە بوو کە زۆر ڕێزیان بۆت هەیە، جا لێرەشدا جگە لە هەردووکمان و خودای پیرۆز نەبێت کەس لە نێوانماندا نییە، بەڵام هوشیار بە! ڕۆژی قیامەتت مەسووتێنە بۆ ژیانی دنیات... دوای ئەم وتووێژە ئەرفەعودەولە ڕوو دەکاتە سوپای ڕووس و ئەو هەلەشی بۆ دەرەخسێ چەند کارێکی باش بکات و ڕۆژی دواییش دەڕوات بۆ عێشقئاباد و خۆی دەگێڕێتەوە بڕیارم دا لە لوتفئابادەوە ڕوو بکەمە عێشقئاباد و لەوێ دیمانەیێکەم ببێ لەگەڵ ژنراڵ کامارۆفی ئامرهێزی ڕووسی ئەو ناوچەیە کە لەگەڵ ژنەکەی هەڤاڵ بووم. ئەرفەعودەولە ئەم هەلەی بۆ دەرەخسێ و لەو دۆستایەتیەی کە لەگەڵ خێزانەکەی کامارۆفدا بوویەتی بە جوانی بە قازانجی ئێران کەڵك وەردەگرێت و دەبێتە هۆی ئەوەی کە دیاریکردنی هێڵی سنوور لە لوتفئابادا لە ڕووی عەدالەتەوە ڕوو بدات.

وەك خۆی دەڵێ: سەرکەوتووانە لە عێشقئابادەوە گەڕامەوە و مزگێنیم دا بە سلێمانخان و سەرلەنوێ ڕۆیشتین و هێڵی سنوورەکانمان دیاری کردەوە، دوابەدوای ئەم سەرکەوتنەوە ساحێب ئێختیار (سلێمانخان)، ئەرفەعودەولەی هان داوە تاکو باسی ئاوی لوتفئابادیش ڕێکوپێك بکات. خۆی دەڵێت: کاتێ کە گەیشتینە دۆڵێك و زانیمان ئاو لەوێوە دێت و هەمووی ئاوەکەش لە چیاکانی قووچانەوە سەرچاوکە دەگرن و دەڕژێنە دۆڵی «قووزخان» و پاشان لەوێوە ڕوو دەکەنە سارای ئاخاڵ، ئەم چیایانەی کە بە گشتی لە نێوانی خاکی ئێران دان و بۆمان دەرکەوت کە لەوێ بە چاکی دەتوانین ئاوەکە دابەش بکەین لە نێوانی تورکمانەکان و خەڵکی ئێراندا. تورکمانەکان لە سەرچاوکەکە دان و ئێرانیەکان لە ئاودەست دان، دوای ئەوەی ئێمە لە

دەرەگەز ڕۆیشتینە دەرەوە ئیتر کەس کاری بە سەر لوتفئابادیەکانەوە نییە، بەڵام لێرەدا ماینەوە کە دەبێ ئاوەکە چلۆن دابەش بکرێ، کپیلووف گوتی بە منیان گوتووە دەبێ بە پێی سەرژمێری بنەماڵە دابەش بکرێ و ئەگەر بەم قسەمان بکردبایات دەبوای ئاوەکەمان دابەش بکربایاتە ١٦ بەشەوە،١٣ بەشی دەبووە بەشی تورکمانەکان و سێ بەشی دەمایەوە بۆ خەڵکی ئێران، من ڕەزام لەسەری نەبوو و گوتم ئەم کارە عەدڵ و دادی تێدا ڕەچاو ناکرێ. لە بەر ئەوەی خەڵکی سێ گوندی لوتفئاباد، شیلگان و حەسار هەموو پەرژ و بڵاو بوونەتەوە و بە پێچەوانەی ئەم سێ گوندە دانیشتوانی ناوچە تورکمانەکانیەکان زۆر پەرەی سەندووە و ئەگەر وەها بێ لوتفئابادیەکان لە ٢٠ بەش ٣ بەشیان ناکەوێ، بڕیار درا هەر دوو لا بۆ ڕاوێژ بێنەوە وڵاتی خۆمان و لەگەڵ سەرۆکەکانماندا وتوویژ بکەین و دوایی گەڕاینەوە و ئاوەکەمان کرد بە سێ بەشەوە کە یەك لە سێ درا بە ئێران و ٢ لە سێ درا بە تورکمانە ڕووسیەکان، هاوکات ئێمە و ڕووسیەکان فەرمانمان دا بە کارەکەرەکان تاکو گۆمێکی نوێ هەڵکەنن. شەوی ئاخرین چوارشەمەی ساڵ بوو کە شەوێکی زۆر سارد بوو، کوێخای حەسار پیاوێکی بەساڵا چووبوو بە ناوی عەلیبەیگخان[٤٢٦] کە زۆر قسە خۆشی بوو و دەیگوت تورکمانەکان ٨ جار پەلاماری حەساریان داوە و تاڵانیان کردووە و ئەمنیان بە دیلی گرتووە و تەنانەت تا مەرو و خێوە و بوخاراش هەر بەدیلی براوم، ئیتر نازانم ڕاست یان درۆ زۆری سەبارەت بە بەندبوونی خۆی بۆمان دەگوت. داوای لێم کرد تاکو بۆ شێوان لە ماڵی ئەوان میوان بم و گوتی لە بەر ئەوەی چوارشەممەسوورییە و ئێمە ئاگر هەڵدەگیرسێنین و میوە دەخۆین و هاوکات بۆ شێوان برنجمان هەیە، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ ماڵیان و دووکەڵ نزیك بوو کوێرمان بکات. لەناکاو چاوم بە پیاوێکی دەرەگەزی کەوت کە بە کڵاوە تورکمانیەکەیەوە شمشێر لە کەمەر هاتە ژوورەکەوە و سڵاوێکی کرد و هەر لە سڵاوەکەیدا بۆنی ناخۆشی دەهات. نامەیێکی دایە دەستمەوە، لە بەر ڕووناکی چراموشیەکەوە نامەکەم خوێندەوە کە نامەی سلێمانخان بوو کە بە پێچەوانەی پێشوو زۆر بە بێڕێز و حورمەتێکەوە نووسیبووی: پیاوی چاك من پێم وابوو تۆ وڵاتەکەت

٤٢٦- عەلی خانبەیگ حەساری ئەو کەسەیە کە هۆشاڵەی ترێ و کاڵەکێکی بار کرد لەسەر کەرێك و وەك دەربڕینی ناڕەزایی ڕەوانەی بارەگای پاشای کرد.

نافرۆشی و لەو ڕۆژەوە بیستوومە غەدرت لە ئێران کردووە زۆر ڕقم لێت هەستاوە و حەزم نییە زۆر لەسەری بدۆم و خێرا وەرگەڕێوە بۆ لوتفئاوا.

هاوکات نامەبەرەکەش فەرمانی دا تاکو خۆم و هاوڕێکانم ڕوو بکەینە لوتفئاوا. پاشان پێم گوت برۆ خزمەتی عەلیخان کە خەریکی دروست کردنی نانی شێوانە تاکو بێتە ئێرە، کاتێ هات پێم گوت تۆ ئەمشەو تۆزێك زۆرتر بخۆ لەبەر ئەوەی من ئیزنی خواردنی نانی شێوانم نییە و دەبێ برۆم بۆ لوتفئاوا. عەلیخانبەیگ چاوانی پڕ بوو لە ئاو و گوتی توخودا دە چرکەیتر ڕاوەستن، نان دروست دەبێ دەیخۆن و پاشان دەچن، کابرای دەرەگەزی کە خۆشی برسی بوو، وتەکەی عەلیخانبەیگی قەبووڵ کرد و پێکەوە نانی شێوانمان خوارد، بەڵام من لەبەر ئەو تۆمەتە توانای خواردنی هیچم نەبوو.

پاشان لە ماڵ هاتینە دەرێ و فەرمانم دا بە فەرمانبەرەکانم تاکو ڕەشماڵەکان کۆکەنەوە و ئەسپەکان زین بکرێن و بەڕێ بکەوین هەتا بەیان چارشێوی سپی دا بە سەر ڕەشایی شەودا بە ڕێگەوە بووین و ڕۆیشتینە خزمەتی ساحێب ئێختیار (سلێمانخان) و کاتێ کارەکەرەکانیم بینی وەکو جاران ڕێزیان نەگرتم و پاشان پرسیم: ساحێب ئێختیار لە کوێوەیە؟ گوتیان: خەریکی نوێژکردنە. ڕۆیشتینە خزمەتی و خەریکی پاڕانەوە بوو لە درگانەی خودادا و هاوکات لە ژێر چاوەوە بۆمانی دەڕوانی. دوای پاڕانەوەکەی لە دەرگانەی خودا، دەقی نامەکەی بۆم دووپات کردەوە و پاشان منیش بە هێمنیەوە گوتم: بەڕێزم تاوانی من چییە؟

گوتی: بە پێی نامە و بڕوای خەڵکی لوتفئاباد ئێوە بە شێوەیێك ئاوی سنووری لوتفئابادتان دابەش کردووە کە کەوچکێك لەو ئاوە ناگاتە دەستی خەڵکی لوتفئاباد و تەنانەت خەڵکی گوندەکانی حەسار و شیگلانیش بێئاو دەمێننەوە، دەی بەم چەشنە من ببمە شەوچەنەی هەمووی خەڵکی ناوچەکە؟

ئەرفەعودەولە زۆر لەم باسانە ئاڵۆز بوو و گوتی ئەوەی ڕاستی بێت بۆ خۆی دیارە و ئەگەر پێت وایە من کاری وەهام کردووە بۆچی تاقمێکی نوێنەری خۆت بۆ تاقیکردنەوە ڕەوانەی ناوچەکە ناکەیت؟ بۆچی بە ئەم قسە درۆیانە هەڵخڵەتاوی و پاشان ئەرفەعودەولە لوتفئاباد بە جێ دەهێڵێ و ڕوو دەکاتەوە تاران. بەڵام هێشتا نیو فرسەخ نەڕۆیشتبوو کە

سلێمانخان پیاوەکانی خۆی نارد بە دوایدا و تکایان لیێ کرد تاکو بگەڕێتەوە.

رۆژی دوایی سلێمانخان خۆی گەیاندە سنوورەکانی لوتفئاباد و بۆی دەرکەوت کە لوتفئاواییەکان درۆیان گوتووە و پاشان داوای لێبوردنی کرد لە ئەرفەعودەوڵە.

کاتێ ئەم سنوورە بەم شێوەیە دابەش کرا و ئاوەکە بوو بە سێ بەشەوە خەڵکی شەلەنگان و حەسار و لوتفئاباد ڕۆیشتنە پێشوازی ئاوەکەوە و نەزر و قوربانیان دەکرد و ئەو ڕووبارەیان ناو نا ڕەزائاباد.[٤٢٧]

کاتێ کاروباری لوتفئاباد گەیشتە ئاکام، هاتینەوە کەلات. لە سەرانسەری خوراساندا بیستوومە کە دەڵێن: گەر مەرگت ئەوێ بڕۆ کەلات، کاتێ ئێمە لەوێ بووین ئەمیری کەلات لە دنیا دەرچووبوو و کوڕێکی ١٧ و ١٨ساڵانی بە ناوی یەلەنگتووشخان ببووە جێگری. یەلەنگتووشخان جارێك لەگەڵ بابی هاتبووە مەشهەد.

بە داخەوە میرزا موستەفای ئێمە تووشی ناخۆشی مالاریا ببوو و کۆچی دوایی کرد. کاتێ کە ڕۆیشتن بۆ ناو قەزاقەکان و کوردەکانی زەعفەرانلوو بۆ چاوپێکەوتنی ئەمیر حسەینخان، بە بێدەوا و دوکتۆر ماینەوە. سپاس بۆ خودا حەکیمێکی ڕووسیەی گەیشتە فریامان، پاشان مانگێك دوای جێژنی نەورۆز کە کاری لوتفئاباد گەیشتە ئاکام ئەم وەفدە دێنەوە قووچان، ڕەزاخانی ئەرفەعودەوڵە خۆشی تا سنووری مردن دەڕواتە پێشەوە. بەڵام دوای ئەوەی چاك دەبێتەوە بۆ ماوەی یەك ساڵ لە قووچان دەمێنێتەوە و خەریکی دیاریکردنی هێڵی سنوورەکان دەبێ و سلێمانخانیش هاوکات لە قووچان لە ماڵی ئەمیر حسەینخان مابووەوە.[٤٢٨]

خۆی دەڵێ: کپیلووف ڕۆیشت، منیش خۆم گەیاندە قووچان و لەبەر ئەوەی ئەم سەفەرەمان ٤ ساڵ درێژەی بوو، دوو جار لە قووچاندا قشلاخمان کرد. جا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ تاوانی لەدەستدانی بەشێکی خاکی ئێران لە باکووری خوراسانەوە هەمووی لە گەردنی پاشای خوێرییەوە بووە و کەستر هیچ تاوانێکی نەبووە.

---

٤٢٧– ئێران دیرووز، خاترات ئەرفەعودەوله، ل ١١٩.

٤٢٨– هەمان بەڵگە، ل ١٢٤.

# فەرمانی ناسرەدینشا بۆ ئەمینوسوڵتان -سەدرئەعزەم- سەبارەت بە خوراسان

ناسرەدینشا، ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی لە فەرمانێکدا بۆ سەدر ئەعزەم دەنوسێت:

بەڕێز ئەمینوسوڵتان!

هەمووی پەیامەکانتم پێ گەیشت، ڕێز و سڵاوی ئێمە ئاراستەی نیزاموسەڵتەنە[٤٢٩] و ئاقاجان[٤٣٠] بکە. ئافەرین زۆر ئازایەتیت پیشان داوە، بەڵام دەبێ فەرمانێکی خێرا بدەیت بە زیائودەولە[٤٣١] تاکو هێرش بکاتە سەر عەشیرەتی دیرکەندی[٤٣٢] ناپیاو. نامەکەی زیائودەولەت بۆم ڕەوانە نەکردووە، پێم وایە گلەیی کردووە، هەروەها تلگرافێك ئاراستەی سەهامودەولە[٤٣٣] بکە، تاکو دیلە تورکمانەکان گل بداتەوە و پاشان لەگەڵ دیلیەکانی خۆی دا ڕەد و بەدەڵیان بکات، تلگرافێك لێ بدە بۆنازم[٤٣٤] تاکو بەو ئەندازە لە تورکمانەکان بە دیل بگرێت و هاوکات دژ بە شوجاعودەولە و سەهامودەولە نەوەستێ.

وەزیر موختاری ڕووس داوای کردووە کە ئیزنی بدەم بێتە دیدارم، بڕیار درا ڕۆژی چوارشەممە بێتە دیدارمەوە، ئێوەش بە هەر شێوەیێك دەبێ پارە و مواخڵی خەسرەو بەندەلی (نەناسراوە) هەروەك چلۆن نایبوسەڵتەنە نووسیویەتی بێدەن.[٤٣٥]

---

٤٢٩- نیزاموسەڵتەنەی مافی، حسەین قولیخان والی خووزستان.

٤٣٠- یەکێ لە دەسەڵاتدارەکانی لوڕستان و خووزستانە.

٤٣١- حاکمی لوڕستان.

٤٣٢- لە عەشیرەتە شۆڕشگێڕەکانی لوڕە.

٤٣٣- یار موحەممەد سەهامودەولەی بجنووردی.

٤٣٤- پارێزەری خوراسان.

٤٣٥- پەنجانامەی مێژووی د.ئیبراهیم سەفایی، ل ٦٦.

## ڕاپۆرتی موحەممەد تەقی میرزای ڕوکنودەوڵە

برای خۆم! ناسرەدینشا، والی خوراسان ئیزن نادات خەڵکی لوتفئابادی دەرەگەز لە ئاوی ڕووبارەکە کەڵك وەرگرن.

ئەم ڕاپۆرتە لە لایەن ڕوکنودەوڵەوە بۆ عەبباسخان قەوامودەوڵەی وەزیری دەرەوە ڕەوانە کراوە.

چەند ڕۆژی ڕابردوو ژنراڵ قونسوول لە نامەییێکدا سەبارەت بە چۆمی لوتفئاباد لە ئەمیرخان میرئاب شکایەتی کردووە و هاوکات ڕای گەیاندووە کە ڕێز و حورمەتی بۆ ڕووسیەکان دانەناوە و دەبێ تۆڵەی لێ بکرێتەوە، من ئەم نامەیەم نارده خزمەتی نازمولمەلیك تاکو وڵامی بداتەوە.[٤٣٦]

وڵامێك ئاراستەی ژنراڵ قونسوول کراوە و جارێکیتر قونسوول نامەییێکیتری نووسی، بەڵام وڵامێکی نەدرایەوە.

لەبەر ئەوەی ئەمەم بە بەڕێزت ڕاگەیاند تاکو پاشاییێکی وەکو حەزرەتت وڵامی ئەو بەشەی لە نامەکان بدەیتەوە کە بێوڵام ماونەتەوە و من توانای وڵامی ئەم نامانەم نییە، لە بەر ئەوەی دەترسم وەکو نازمولمەلیك بە تاوانبار دەربچم.

بۆیە پێشنیار دەکەم کە میرزا موحەممەد قولیخان پارێزەری بجنوورد ڕەوانەی مەشهەد بکەیت، تاکو وڵامی پرسیاری ڕووسیەکان بداتەوە لە بەر ئەوەی هەر لەم سنوورانەدا بووە و زۆر شارەزای کارەکەیە. زۆرتر سەرت نەیشێنم، هەر بەردەوام بێت.

١٨ی زیحەججەی ١٣٠٨

هەروەها ئەگەر ئەم پێشنیارەشت بە دڵ نەبوو، حاجی عەبدوڵڵاخانی پارێزەری بووشێهر کە لە تاران دایە ڕەوانەی مەشهەدی بکە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە.[٤٣٧]

---

٤٣٦- میرزا موحێبعەلی نازیمولمەلیك پارێزەری خوراسان کە دژی ڕووسیە بوو و هاوکات ڕووسیە پێشنیاری داوە بە پاشای ئێران تاکو میرزا موحێبعەلی بێ دەسەڵات بکرێ و ئەویش بە قسەیانی کردووە.

٤٣٧- پەنجا بەڵگەی مێژوویی، ئیبراهیم سەفایی، ل ١٢٠.

## ڕاپۆرتی سەفەرنامەی کەلات

نووسەری سەفەرنامەی کەلات، ساڵی ١٣٠٩ی کۆچی لە لایەن ناسرەدین‌شاوە دەبێتە بەرپرسی بارودۆخی کەلاتی نادری و بە شێوەیێکی زانستیانە بارودۆخەکەی لێکداوەتەوە.

قەلعە و گوندەکانی کەلات و ژمارەی بنەماڵەکانی بەم چەشنەی خوارەوەن:

١- کەبوودگونبەد و خوارەزمەحەلە، لە تەنیشتی چۆمەکەدان و ٨٠ بنەماڵەن.

٢- ئەرغەوانشا کە ١٥٠ بنەماڵەن و دوو عەشیرەتی کورد و تورکی لییە.

٣- قەلعەی کەرو، کە ٣٠ بنەماڵەی کورد و فارسی لێیە.

٤- خست، کە سی بنەماڵەی کورد و تورکی لێیە.

٥- قەلعەی سیرزاد کە چل بنەماڵەیە و لە کوردەکانی ئەردەلاّن.

٦- قەلعەی تاقداش کە ٥٠ بنەماڵەی تورکی لێیە.

٧- تفتە، ٣٠ بنەماڵەیە و هەموویان فارسن.

گوند و قەلعەکانی دەرەوەی کەلات بەم چەشنەی خوارەوەیە:

١- یەنگی قەلعە، کە ١٠٠ بنەماڵەی کوردی شێخوانلووە

٢- تازەقەلعە کە عەشیرەتی کوردی هەزانلووی[٤٣٨] لێیە و دەبێ ئاماژە بکرێت کە ئەم عەشیرەتە ١٦٠ بنەماڵەن و تاقمێکیان لەم تەقەلعە دان و پاشماوەکەیان هەر لە قەلعەی زۆوە[٤٣٩] تا خاکی چەهچەهەی ئەمیرئاوا ڕەشماڵنشینن.

گوندەکانی بەشی باکووری دەرەوەی کەلات:

١- قەلعەی چەرم کە ٥٠ بنەماڵەی کوردی لێیە.

٢- قەلعەی سینا[٤٤٠] کە ٨٠ بنەماڵەی کوردی لێیە.

---

٤٣٨- پێم وایە هیزانلوو بێت کەپێیان دەگوترێ. (هیزوولان)

٤٣٩- زوو، زاو، دۆڵ.

٤٤٠- «سینا»، مەڵبەندی کوردەکانی سیانلووە کە تاقمێکیان دانیشتووی ناوچەی بیرانلوو و تاقمێکیان لە ئێسفەراین دان.

٣- قەلعەی ئیدەلیك (ئیدەلوو) كە ٥٠ بنەماڵەی كـورد و تـوركی لێیـە، توركـەكان لـە عەشیـرەتی ئەفشارن.

٤- سوڵتانئاباد كە ٧ یان ٨ بنەماڵەی كوردی لێیە.

٥- لاییـن كە ٢٠٠ بنەماڵەی كوردی لێیە. گوندی خاكستەری لاییـن لە نێوان چیاكان دایە و ڕووبارێكی بەناوبانگ لە نێوانی گوندەكەوە تێدەپەڕێ كە پێشتـر دەگەیشتە خیووقئاباد و خەڵكی ئەوێ بەو بۆنەوە كشتوكاڵێكی زۆر لە باریان بووە، بەڵام ئەمڕۆ بەو بۆنـەوە كـە ئـەم ئاوە دەڕژێتەوە قەهقەهەی ڕووسیەوە. كشتوكاڵ كردن لە خیووقئاباددا قەدەغەیە.

قەلعەی تیـرگان كە ٦٠ بنەماڵەی كوردە و لە نێوانی كەژوكێوەكان دایـە. نووسـەر دوای ئەوە لە قەلعەی كەلات دێتە دەرێ بەم چەشنە بۆمان باس دەكات: ڕۆژی شەمـمە ئاخرین ڕۆژی مـانگی زیقەعـدە كاروبـاری كـەلات دوایـی هـات، یـەك سـەعات لـە ڕۆژ تێپـەڕیبوو كـە لـە كەبوودگونبەدەوە بەرەو شار ڕۆیشتیـن و خۆمانـمان گەیاندە دۆڵی ئەسیقلوو كە دوو فرسەخ لە كەلات دوورە. بەڕێز ئاخونـد حـاجی مەلاعـەلی پـەنا و سلێمانبـەیگ سـەرۆكی عەشیـرەتی سووفیانلووی دانیشتووی لاییـن هـاوڕێ تاقمێـك لـە خـەڵكی لاییـندا بـۆ شـكات و دەربـڕینی نارەزایی هاتن و گوتیان كە ئێمە ٢٠٠ بنەماڵەین و دانیشتووی لاییـنیـن و بە یـەكجارە ئـاو و زەوینەكانـمان لە دەست داوە و سەردەمێك كە یەلەنگ تـووشخـان[٤٤١] جـەلایر حـاكمی ئـەوێ بووە، سلێمانخان لە لایەن پاشاوە ئیزنی پێ دراوە كە بڕیارنامەی ئاخاڵ جێبەجێ بكات، لەبەر ئەوەی یەلەنگ تووشخان پیاوێكی كارامە نەبوو، فەرمانی دا بە خاوەن ئێختیـار تـاكو ئـاو و زەوینە كشتوكاڵیەكانی لاییـن بدات بە ڕووسیە. یەلەنگ تووشخانیش دەست بەجێ ئەم كارەی كردووە. ئێران بە بۆنەی ناپیاوی و لێنەهاتووی كەسانێكی وەك یەلـەنگ تـووشخـان و خـاوەن ئێختیارەوە چی بە خۆوە كـە نـەدیوە. كـاتێ ئێمـە زانیمـان كـەچ قوڕێكمـان بـۆ گیـراوەتەوە، پەنامان بردە خاوەن ئێختیار و ڕامان گەیاند كە بەم كارەی كە ئێوە كردووتانە هیچ زەوینێك بۆ

---

٤٤١- ئەرفەعودەوڵە دەڵێت: كاتێ كە گەیشتینە كەلات، والـی ئـەم شـارە لـە دنیـا دەرچـووبوو و یەلـەنگ تووش خانی كوڕی كە ١٨ ساڵان بوو، ببوە جێگری بابی و زۆر بەداخ بوو كە بۆچی ئێران سەركەوتوو نییـە و پێش ناكەوێ.

کشتوکاڵی ئێمە نەماوەتەوە و هاوکات خاوەن ئێختیاریش زانی چ قورێکی بۆ خەڵك گردۆتەوە و خێرا ڕای گەیاند بە ئێمە تاکو ڕوو بکەینە شاری مەشهەد و پەنا ببەینە ڕۆکنودەولەی برای ناسرەدینشا کە هاوکات پارێزگاری خوراسان بوو و هەروەها نامەیێکی بۆمان نووسیبوو تاکو پیشانی ڕوکنودەولەی بدەین، ئێمەش بەرەومەشهەد ڕۆیشتین و نامەکەی خاوەن ئیختیارمان دا بە دەستیەوە. چەند ڕۆژێك بە بیٚ‌ئەوەی وڵامێکمان درابێتەوە ڕەوانەی کەلات کراین کەچی دوایی حاجی ئیسحاقخان سەرتیپ ئەم پێداویستیەی ئێمەی بە تلگراف ڕاگەیاندە ناسرەدینشا. ئەویش لە وڵامدا گوتی هەموو شتێکمان بە خاوەن ئیختیار ڕاگەیاندووە و ئەم باسەشمان کردووە و ئەویش لە وڵامدا گووتوویەتی ئێمە زێراوی لاینمان داوەتە ڕووسیەکان و پێم وایە ئێوە ڕاست بێژن.

دوای ئەم تلگرافە حاجی ئیسحاق لە لایەن خاوەن ئێختیارەوە بیٚ‌دەسەڵات کرا و ئێمەش نەماندەتوانی تلگرافێك ڕەوانەی پاشا بکەین و تا ئێستاش هیچ پاریزەرێك نەهاتووەتە کەلات تاکو ئێمە دادی بۆ ببەین و هاوکات خەلکی گوندی خۆریش وەکو ئێمەیان بە سەردا هاتووە تەنانەت دەڵێن ڕووسیەکان ئیزن نادەن لە باکووری گوندەکەشەوە کە لە مولکی ڕووسیەکان جیاوازە کشتوکاڵ بکریٚ و دەبیٚ ماڵیەش بدەین. دوای بیستنی ئەم قسانە ڕۆیشتم بۆ باغکەند.[٤٤٢]

## ڕاپۆرتی وەزیر موختاری ئامریکا لە ئێران سەبارەت بە داگیرکردنی ناوچەکانی ئێران بە دەستی ڕووسیەکان

دوای ئەوەی بە پێی ڕێکەوتنامەی ئاخاڵەوە بەشێك لە ناوچەکانی خوراسانیان داگیر کرد و هەروها دواییش بەبیٚ هیچ ڕێکەونامەیێك ناوچەی سەرەخس و ناوچە ڕۆژ هەڵاتیەکانی چۆمی تەژەنیان داگیر کرد و هەموو ڕۆژێك هەڵمەتی داگیرکردنی ناوچەییکیان ئەدا کە نەوەك لە ئینگلیز جیٚ بمێنن. بنجامین وەزیر موختاری ئامریکا لە تاران بە بینینی ئەم کارەساتە

٤٤٢- فەرهەنگ ئێران زەمین و نادر شیرمەرد ئەتەك ، ل ١٣.

لە ڕاپۆرتێکدا ڕاستیەکان بۆ دەسەڵاتدارانی ئامریکا دەدرکێنێ کە ئێمە لێرەدا ئاماژە دەکەین بەشێکی ئەم ڕاپۆرتە کە دەڵێ: زۆر باس هەیە کە ئازاری گەلانی ئێران ئەدات، بە تایبەت دوو زلهێزەی گەورە واتا ئینگلیز و ڕووسیە بە هەر شێوەیێك و لە هەر لاییکەوە دڵیان بگرێ، ناوچەکانی ئێران داگیر دەکەن.

من لێرەدا باسی داگیرکردنی سەرەخس ناکەم کە ڕووسیە بۆ ئەوەی خۆی بە هەرات نزدیك بکاتەوە داگیری کرد.[٤٤٣] پاشان وەزیر موختار باسی ناوچەکانی هەرات و پاکستان و بەلووجستان دەکات و دەڵێت ڕووسیەکان لەوێوە دەیانەوێ خۆیان بگەیەننەکەنداوی فارس و تەنگەی هورمۆز.

وەزیر موختاری ئامریکا نەخشە و پلانی ئینگلیز و ڕووسیەی خستەڕوو. دەبێ ئاماژە بکەین ئەم سیاسەتەی ڕووسیە لە پتری کە بیرەوە بە جێمابوو بۆ ئمپراتووریەکانی دوای خۆی کە پێی وا بوو دەبێ ڕووسیە خۆی بگەیەنێتە ئاوەگەرمەکانی کەنداوی فارس و هەر بەم بۆنەوە بوو کە «برژنۆف» فەرمانی داگیرکردنی ئەفغانستانی دا و ئێستاش ئەو خەلکە بێپەنایە لە ژێر باری ئەستەمی ڕووسیەدا هەڵدەقرچن.

## تلگرافی نهێنی میرزامەلکۆم بۆ وەزیری دەرەوەی ئێران و وڵامی ناسرەدین‌شا سەبارەت بە کارشکێنی ڕووسیە

میرزا مەلکۆم‌خان -نازیمودەولە- وەزیر موختاری ئێران لە لەندەن کە پیاوێکی ڕۆشنبیر و ئازادیخواز بوو و هاوکات لایەنگری سیاسەتی ئینگلیز بوو و هەموو کاتێ پارێزەری مافە ڕەوا و ناڕەواکانی ئەوان بوو و هاوکات لە تلگرافێکدا بە نهێنی بە وەزیری دەرەوەی ئێرانی ڕاگەیاند کە دەیەوێ زۆربەی ڕاستییەکان دەربڕێ و هەروەها پەردە لەسەر لێنەهاتوویی و وڵاتفرۆشیەکانی پاشا و دامودەزگای قاجار بسڕێتەوە. پێم وایە دەسەڵاتدارانی ئینگلیز پێیان ڕاگەیاندبوو کە ئێران خۆی چییە تاکو وەزیر موختاری چی بێت کە ئەم وتەیە

٤٤٣- تاریخ ڕەوابێت سیاسی ئێران و ئینگلیز، مەحموود مەحموود، بەرگی٥، ل٩٩.

دڵی نازێمولـمەلێکی هەژاندبووەوە.

ناسرەدینشا لە وڵامی تلگرافەکەی مەلکۆمدا زۆر شتی نووسیوە کە لێنەهاتوویی خۆی ڕادەگەیەنێ.

میـرزا مەلکۆم لە تلگرافەکەیدا دەڵێت بەڕێز وەزیـری دەرەوەی ئێـران، بـە نهـێنی پـێتی ڕادەگەیەنم کە پێم وایە پیاوانێ وەکو تۆ بوونەتە لەمپەری ڕێـی سـەربەخۆیی ئێـران و تـەواوی ناوچەکانت دایە باوەشی ڕووسیەوە خودا ڕەحمی کـرد کـە هەراتـمان نەداوەتـە دەسـتەوە،[٤٤٤] ئەگینا ئەویش دەبووە مولکی ڕووسیە و لەوە دەترسم سیستانیش خەڵاتی ڕووسیە بکەیت. بـە ڕاستی من ئەوەندە دڵم بەم کارانەتان تەزیوە کە ژیانـم لە بەرچاو کەوتووە و خۆت ئەم باسانەی من بە شێوەیێك بە پاشا ڕابگەیەنە.

ڕەجەبی ١٣٠١ی کۆچی مانگی

وڵامی ناسرەدینشا لە پەراویزی تلگرافەکەدا:

ئێمە لە وڵامدا دەڵێین قەت مافـی خۆمانـمان نەداوەتە باوەشی ڕووسیەوە و ئێوەن کە زۆر شتتان خەڵاتی ئینگلیز کردووە، کاتێ ڕووسیە بە هێزێکی زۆرەوە ناوچـەی ئاخـاڵ و تورکمـانی داگیـر کرد و ئێمەش لە ئاستێکدا نەبووین بـەرنگاریان بووەستیـن و دوایـی چـیمان بکردبـات ئەگەر ئێمە ئیزنـمان نەدایات هێڵی سنوورەکان دیاری بکات بە زۆر دەیکرد. متمانەشـت بـبێ پەلاماری مەرویشی ئەدا و ئێوە چیتان دەکرد بۆچی دەتوانتوانی بە چەك و هێزتانەوە یارمەتی ئێمە بدەن تاکو بەرنگاریان ببینەوە، ئێوە متمانەتان ببێ دام و دەزگـای دەسـەڵاتدارێتی ئێـران لەم باسەدا هیچ تاوانێکی نییە، ئێستاش تکاکارم ڕووسیە بێتە هاوییـریمانەوە تاکو لەمپەری ڕووسیەکان بووەستیـن[٤٤٥] بەڵێ بەڕێزانی من ئەمە وڵامی پاشای وڵاتی بەرپانی ئێران بوو.

ئەم بەڵگانەم لەبەر ئەوە لێـرەدا هێنایـەوە تـاکو ببێتـە پێشەکییێك بـۆ باسـی چـۆنیەتی جیابۆنەوەی بەشێکی زۆری خوراسان لە ئێران و کاریگەری ئـەم جیابوونـەوە لەسـەر بـارودۆخی

---

٤٤٤- ئینگلیزییەکان بە پێی ڕێکەوتنامەی ١٢٧٣ی پارسیەوە هەراتیان لە ئێران دابڕ کرد.

٤٤٥- عەسری بێخەبەری، ئیبراهیم تەیموری، ل ١٧.

کشتوکاڵی خەڵکی کوردی ناوچە سنوورنشینەکانی سەرەخس و کەلات و دەرەگەز و قووچان و بجنوورد و هەروەها چۆنیەتی شەڕی نێوان کوردەکانی زەعفەرانلوو و ڕووسیەکان لە فیرووزە و عێشقئاباددا کە تا سەردەمی ڕەزاشای پالەویش هەر بەردەوام بوو.

## پیلانی ڕووسیە بۆ داگیرکردنی خوراسان

هەروەك گوتمان ڕووسیە لە سەردەمی پتری کە بیرەوە بیری لە ئەوە دەکردەوە تاکو بە شێوەیێك خۆی بگەیەنێتەوە کەنداوی فارس (عەرەب) و بۆ ئەم مەبەستەش داگیرکردنی خوراسان یەکێ لە ئەرکە گرنگەکانیان بوو.

هاوکات میرزا مەحموودخانی عەلائولمەلێك[٤٤٦] باڵیۆزی ئێران بوو لە ڕووسیە و چەند بەڵگەیێك دەکەوێتە دەستی کە هەمووی باسی چۆنیەتی داگیرکردنی ناوچە باکووریەکانی ئێران دەکات و ئەویش خێرا ڕەوانەی تارانی دەکات تاکو ناسرەدین‌شا بیانبینێ.

ئەم ڕاپۆرتە نهێنیە لە لایەن کولوونێل زالاتارفەوە پێنشیار دراوەتە برای ئیمپراتۆری ڕووسیە و دوای لێکۆڵینەوەیێکی زۆر، دەسەڵاتدارانی ڕووسیە پیلانی پەلاماری ئێران دادەڕێژن، کە باسی هێرش بۆ خوراسان و ئازەربایجان و گیلانی تێدا هاتووە و ئێمە لێرەدا هەر باسی شەڕی خوراسان دەنووسین.

خوراسان لە ناوەندی هێزەکانی ڕووسیە زۆر دوورە و بۆیە لە کاتی شەڕدا پیلانی نیزامی لەوێدا کارێکی ژیرانە نییە، جگە لە بەشی ڕۆژئاوایی کە برتییە لە ئەستەرئاباد و بەشی باشووری ئەترەك و گورگان کە ئەگەر لە زەریای خەزەرەوە ڕوو بکەینە ئەستەرئاباد شەڕی نیزامی لەوێ زۆر لە بارەوە.

دوو ڕووباری ئەترەك و گورگان زۆر قووڵ نین و هێزەکانمان بە جوانی دەتوانن لەو ئاوە بپەڕێنەوە. ئەو زەوینە کشتوکاڵیانەی کە بە ئاوی ئەم دوو ڕۆخانە ئاوەدێری دەکرێن زۆر چاك و پڕسەمەرن، ئاو و هەوایێکی زۆر دڵڕفێنی هەیە، کێوی باڵابەرزی ئەلبورز لە باشووری

٤٤٦- عەلائولمەلێك لە ڕێکەوتی ٤ی جیمادیولئاخری ساڵی ١٣٠٦ی کۆچیدا ڕاپۆرتی داوە.

ئەستارئابادەوە دابەش دەبێ بە سێ بەشەوە کە لە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە سەرانسەری خوراسان دەگرێتەوە، لەم بەشەدا تەنیا ڕێگای عێشقئاباد- شاهروود هەیە و دامەزراندنی تۆپخانە لەوێدا تەنیا لە مەسافەی ١٠٦٦ مەتریدا دەکرێ، بەڵام سوود و قازانجی ئەوەیە کە بە گرتنی ئەوێ، ناوچەکانی خوراسان و تاران بە یەکجارە لە ئێران دابڕ دەکرێن. شاهروود جێگای یەکگرتنەوەی هەمووی ئەو ڕێگایانەیە کە لە درێژایی ڕێگای تاران-خوراسان دایە. ڕێگایەك هەیە کە لە تارانەوە دەست پێ دەکات و دوای تێپەڕکردنی شاهڕوود دەگاتە چیاکانی ئەلبورز و پاشان دەگاتە مەشهەد و ڕێگای دووەم ڕێگایەکە کە دوای تێپەڕکردنی فیرووزکۆ و چاردە لە چواربەندی ڕێگای ئەستەرئاباددا دەگاتەوە شاهڕوود.

یەکەمین ڕێگا بۆ هاتوچۆی کالسکە دروست کراوە کە بۆ پێداچوونی هێزەکان زۆر ڕێگایێکی چاکە، بەڵام ڕێگای دووەم هەم بۆ کالسکە و هەروەها بۆ تۆپخانەشی نالەبارە و سەخڵەتە، بەڵام فەتحعەلیشا هاوکات کە تۆپخانەش بوو لەم ڕێگاوە ڕۆیشتووە، ئاو و هەوایێکی خۆش و ڕۆحبزوێنی هەیە.

ئێمە بۆ داگیرکردنی ناوچە پڕ کشتوکاڵەکانی مەشهەد و شیروان و بجنوورد و ناوەندی مەشهەد دەبێ بیری زۆر بکەینەوە و ڕێگای گوڵتەپە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە زۆر ڕێگایەکی بێمەترسییە، کاتێ کە هێزەکانی ئێمە لە ڕێگای پرهەوراز و نشێوەکانی گوڵتەپە پەڕینەوە هەتاکو دەگەنە مەشهەد هیچ کۆسپێکیان نابێت.

خەریکی دروست کردنی ڕێگایەکن کە لە عێشقئابادەوە دوای تێپەڕکردنی[٤٤٧] و دۆز ئادام[٤٤٨] و ئیمام قولی و قاتر چین[٤٤٩] و زادران[٤٥٠] دەگاتە خوراسان. خەڵکی خوراسان تێکەڵاوێکن لە کورد و تورك و تاجیك و تاتار و هەموویان زۆر ڕەقیانە لەدەسەڵاتی ناوەندی و بۆیە ئێمە دەتوانین ببین بە هەڤاڵیان و ئەگەر تەنانەت یارمەتی ئێمەیان نەدا یارمەتی

٤٤٧- هودانی سۆڤیەت.

٤٤٨- باجگیران.

٤٤٩- گوندەکانی سەر ڕێگای ڕووسیە بۆ باجگیران و قووچان.

٤٥٠- (زادران) گۆڕدراوی زەواران یان زووبارانە.

ئێرانیش نادەن.

زەوینی ناوچەکانی قووچان و بجنوورد و سەبزەوار بۆ کشتوکاڵ لەبارە و دەبێ هێزەکانمان لەوێ دابمەزرێنین.

دیارە لە کات و ساتی شەڕی ڕووسیەی دژ بە ئێمەدا بارودۆخی خوراسان زۆر پڕقازانج نییە، بەڵام بۆ ئەوەی خۆمان بگەیەنینە هەرات زۆر قازانجدارە.

هەروەها ئەگەر لە ناوچەی گیلاندا کەلوپەل و پێداویستی هێزەکەمان تەواو بوو، دەتوانین خۆمان بگەیەنینەوە خوراسان. کاتێ کە خۆمانمان گەیاندە مەشهەد، دوو ڕێگامان لەبەرە، کە یەکیان ڕێگای کەشفڕوودە و زۆر ڕێگاییێکی ئاسایی و جاکە و ڕێگای دووەم لە چیای ئەلبورزەوە تێدەپەڕێ و زۆر سەختە. لە گوڵتەپەوە تا هەرات ٤٤ تا ٥٠٢ جار دەبێ وچان بگرین.

لە گوڵتەپەوە تا شیروان ٩٦ وڕەستە[٤٥١] و لە شیروانەوە تا مەشهەد ١٨٩ وڕەستە و لە مەشهەدەوە تا فەریموونە (فەریمان) ٧٠ وڕەستە و لە فەریموونەوە تا گاوقەلعە (کافرقەلعە) ١٧٥ وڕەستە و هەروەها لە گاوقەلعەوە تا هەرات ١٢٠ وڕەستە و لە جەماوەردا ٦٥٠ وڕەستە. بۆمان دەردەکەوی کە ڕێگای نێوان سەرەخس و مەرو و هەرات زۆر نزدیکترە لە ڕێگای گوڵتەپە و عێشقئاباد و خوراسان و هەرات و بۆیە ئێمە خۆمان دەتوانین لە ڕێگە ئاساییەکانەوە بڕۆین و ئیزن نەدەین خۆیان بگەیەننە ئەو ڕێگایانە و هاوکات هێزەکانی ئێران لە ڕێی ناچاریەوە لە ڕێگا نالەبارکانەوە دەچنە پێشەوە کە سەرکەوتنیان دەست ناکەوێ. هەروەها ئەگەر هێزەکانی ئێران دژ بە ئەفغانەکان وەستان و هاتنە یارمەتیمانەوە دەتوانن لە ڕێگای تاران-نەیشابوورەوە بڕۆنیان لە ڕێگای تاران- بووشێهرەوە خۆیان بگەیەننە هەرات.

ڕێگای یەکەم چاکە، بەڵام ڕێگای دووەم کە ساڵی ١٨٣٦ی کۆچی تۆپخانە لەوێوە ڕۆیشتووە بۆ ئێمە باشترە، لەبەر ئەوەی هێزەکانی ئێران تاڵانمان ناکەن، لە دوایی ئەم ڕاپورتەدا، عەلائولمەلێکی باڵیۆزی ئێران لە ڕووسیەدا ئاماژە دەکات ئەم بەڵگانە. زۆر

٤٥١- هەر وڕەست ١٠٦٦ مەترە.

خۆمانی و نهێنیـن و دەبێ هوشیار بن نەیدرکێنن.

متمانەتان ببێت عەلائولـمەلێك بـۆ وەدەسـت هێنـانی ئـەم بەڵگانـە زۆر خـۆی مانـدوو کردووە، بەڵام ناسرەدین‌شای گوێ لە مشتە هیچی لێ حاڵی نەبووە.

## باسی شوجاعودەولە و ژینرال کاماردۆف

ئەمیـر حسێن‌خان زەعفەرانلوو -ئیلخـانی قووچـان- ناسـراو بـە شـوجاعودەولەی کـوڕی ڕەزاقولی‌خان ئیلخانی کە کچەزای نەجەفقولی‌خان کورد شـادلوو -ئیلخـانی بـجنوورد- بـوو و پیاوێکی زۆر ئازا و دلێر و بە بڕشت بوو و بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ سەرۆکی قووچان بوو و جگە لـە ناسرەدین‌شا ئیزنـی نـەداوە سـەرۆك و دەسـەڵاتدارێکی قاجـاڕ نزیکـی بێتـەوە. سـەرکردەکانی خوراسان بە تایبەت زەعفەرانلووەکان لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئەمیـر حسـێن‌خانـدا قـەت نەیانوێرا سەرهەڵێنن و قووچان لەو سەردەمەدا تەنیا شارێك بوو کە ئارامشی زۆری تێدا بـوو. ڕێکەوتننامە نالەبارەکانی پاشای ئێران و ئیمپراتووری ڕووس زۆر کاریگەری فەرێنی بوو لەسەر خانی کورد، لەبەر ئەوەی پاشا خۆی نەیئەوێرا دژ بە ڕووسیە بووەستێ، ئیزنی بە کوردەکـانیش نەداوە ئەم کارە بکەن.

هەروەك کە ئەرفەعودەولە لە بەسەرهاتەکانی خۆیدا ئاماژەی پێ کردووە ناسرەدین‌شا زۆر پیـاوێکی بـێ‌دەسـەڵات بـووە و چـاك دەیزانـی ئـەگـەر بـەرنگاری ڕووسـیە ببێتـەوە هـەروەك فەتـحعەلی‌شا، دەبوای دوای ئەوەی شەڕێکی بەڕێ دەخست و زۆر کەس دەکوژران. لە ئاکامـدا شکستیان دەخوارد و بەشێکی زۆر لە خاکی ئێرانیان دەدا بە دەستی ڕووسیەوە.

کاتێ کە ژنرال ئوسکووبۆڵف شارە باکووریەکانی خوراسانی دایە بەر تانك و تۆپ و یـەك لە دوای یـەك داگیـریانی کـرد و هاوکـات خەڵکەکەشـی دەکوشـت و لـەم شـەڕەدا کولوونێـل گرۆدکۆف بەرپرسـی دابینکردنـی پێداویـستییەکانی هێزەکـانی ڕووسـیە بـوو لـە ئێرانـدا و بـە جلوبەرگی ڕەسـمیەوە ڕۆیـشتە خزمـەتی پاشـا و ڕایگەیانـد کـە هێزەکـانی ڕووس پێداویـستی زۆریان دەوێت و دەبێ دابینی بکەیت. پاشاش خێـرا فـەرمانی دا تـاکو پێداویـستی سـوپاکەی

ڕووس دابیـن بکرێ و لە ڕێگای خوراسانەوە ڕاسپێرێ بوخارا ببێت و هەروەها ئاماژەشی کرد کە هوشیار بن ئەمیـر حسەینخان پەلاماری کەسەکانتان نەدات.

## باسی ئەمیـرحسەینخان شوجاعوودەوڵە سەبارەت بە حکوومەتی ئەمیـرقولیخان هیوەدانلوو

ئەمیر قولیخان لە بەر ئەوەی بـە فیـرووزەوە نزدیـك بـووە زۆر خـۆی بـۆ خـەڵکی ئـەو ناوچەیە ماندوو کردووە.

بە ناوی خودای مەزن:

ئەمیـرقولیخان هەر لە منداڵیەوە هەر وەکو منداڵی خۆم پەروەردە کردووە کە پیـاوێکی لێهاتووە و توانیوویە بە جوانی بەرنگاری دوژمن ببێتەوە. بۆیە منیش حکوومەتی جویـستانـم دا بە دەستیەوە و هیوادارم کە بۆ خەڵك ڕێز و حومەت دابنێ و جریستان لە نەهامەتی بپارێزێ و هاوکات خەڵکی جریستانیش دەبێ ئەم پیاوە مەزنە بە سەرۆکی خۆیان بپـەزێرن. چـاك وایـە نێوانی سەرکردە و خەڵکی ئاسایی زۆر خـۆش بـێ و زۆر لێـك جیـا نـەبن، هـەر بنەماڵـەیێکی جریستانی دەبێ هەموو ساڵێك قرانێك بدەن بە ئەمیـرقولیخان و بڕیاریش وابێ درا کە ئەگـەر خەڵك زۆریان لیێ کرا پەنا بهێننە ئەمیـر حسەینخان.

ئـەم حوکمـەم بـە خـەتی خـۆم لـە بـەرواری مـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی ١٣١٠ی کۆچـیدا نووسیووە. هەروەها پشتی بەڵگەکەش بە مۆری شوجاعودەوڵە مۆر کراوە.[٤٥٢]

## ئەمیـــر حسەینخان بۆ خەڵکی ژێر دەستەی خۆی خانووبەرە دروست دەکات

ئەمیـر حسەینخـان شـوجاعودەوڵە زۆر بـەوە دڵخـۆش بـوو کـە خـەڵکی قووچـان کـاری

٤٥٢- ئەم بەڵگەیە لە لایەن موحەممەد بلووریان هیوەدانلووە گەیشتە دەستم.

ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بکەن و خانووبەرە دروست بکەن، بە تایبەت لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانی ئەمیردا بە بۆنەی ئەهوەنی و ئارامی قووچانەوە هەتا ئووغاز کە گوندێکی دوورکەوتەیە زەوینیان کڕیوە. ئەمیر حسەینخان لەم کارە زۆر خۆشی دەهات، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکی قووچان بە تایبەت کوردەکان زۆر حەزیان لە کشتوکاڵ و ماڵکردنەوە نەبوو و هاوکات حەزیان بە ڕەشماڵنشینی بوو و خۆشیان لە شار و گوندنشینی نەدەهات و ڕوویان دەکردە کێو و ساراکان. ئەمە تەنیا خەڵکی کوردە کە هەر خەریکی قورئان خوێندن و شانامە بوون.

دەڵێن ئەمیر حسەینخان زۆر جار زەوینەکانی دابەش کردووەتە نێوان کوردەکان تاکو خەریکی کاری کشتوکاڵ بن، بەڵام بە داخەوە ئەم کوردانە زەوینەکانی خۆیانیان بەجێهێشت و خۆیانیان بە کاری ئاژەڵداری سەرگەرم کرد. کاتێ ئەمیر حسەینخان بەم ئاکارەی زانی سەرکردە کوردەکانی بانگ کرد و هەموویانی کوتەك دا و هەر کام ١٠٠ تمەن جورم کران و بڕیار درا کە قەت زەوینەکانیان نەفرۆشن. کەچی دوای مردنی ئەمیر کوردەکان ڕوویان کردەوە دەشت و هەراوەکان و بوون بە کۆچەری.

ساڵی ١٣٦٠ی کۆچی هەتاوی نووسەر ڕوو دەکاتە ڕەشماڵنشینەکانی دەوروبەری قووچان کە ئەم کوردانە بە تایبەت ڕوودکانلووەکان زۆر لە گوندنشینەکان گلەیان کردبوو و دەیانگوت کە ئیزن نادەن لە دەشتەکانەوە چادر لێ بدەین و دەبێ پارەیەکی زۆر بدەین بەم گوندنشینانە. پیرەمێردێك ٨٠ ساڵە کە ژن و منداڵێکی زۆری هەبوو، نووسەر پێی گوتووە باب و بابەگەورەکانتان بە قسەی ئەمیر حسێنیان نەکرد و بۆیە ئاوارە ئێوە ئاوارە و دەربەدەرن، ئەویش ئاخێکی هەڵکێشا بە دوویدا و گوتی بە خودا نازانم تاوانی ئەمیر بوو کە فێریانی نەکردووە یان باب و بابەگەورەکانی ئێمە تاوانبار بوون. بەڵام تاوانبار خودی کوردەکان بوون، لە بەر ئەوەی ئەمیر حسەینخان زەوینی پێیان داوە تاکو کشتوکاڵ بکەن و نەیانکردووە.

# بەڵگە

لەو ڕۆژەوە خوای مەزن یارمەتی منی داوە تا لە دڵی خەڵکدا بم، زۆر لە حاڵ و ئەحواڵی خەڵکم پرسیووە و زەوینی زۆرم داوە بە خەڵك بۆ خانوو دروست کردن. وەك ئەوەی کە بەڕێز قووریخان لە لایەن ئێمەوە لە تەنیشتی ماڵی براکەی خۆم (خوالێخۆشبوو حسێن قولیخان) زەوینێکی پێ درا کە ٦٠٠ مەتر بوو تاکو ماڵ و خانوو بەرەیێك بۆ خۆی پێك بهێنێ.

مانگی زیحەججەی ساڵی ١٠٦ی کۆچی مانگی[٤٥٣]

## ئەو نامانەی کە لە لایەن هەڤاڵانی هێژامەوە گەیشتوون

١- بەڕێز غولامحسەین ڕەحیمیان نوێنەری لێهاتووی خەڵکی قووچان لە مەجلیسی خولی چواردە و پازدەی مەجلیسی میللی ئێران کە بۆ چەسپاندنی نەتەوەیی کردنی نەوتی ئێران هەوڵی زۆری دا و بوو بە هۆی ئەوەی تاکو ڕێزدار دوکتۆر موسەدێق سەرۆکی وەزیرانی ئەو کاتەی ئێران لە دادگای نێونەتەوەیی لاهەدا وەکو مافی گەلانی ئێرانی. بیچەسپێنێ ئەم پایە بەرزە لە نامەیێکدا ئاوەی بۆم نووسیوە.

«٢٤/١/١٣٦٠ی کۆچی هەتاوی»

هەڤاڵی ئازیزم بەڕێز تەوەحودی

چاك دەزانم بۆ چاپی بەرگی یەکەمی کتێبەکەت کوسپی زۆر هاتە بەر پێت، بەڵام ئەو سەرکەوتنەت لێ پیرۆزبایی دەکەم، هیوادارم بەرگی دووەمیش سەرکەوتوانە بە چاپ بگەیەنن

٤٥٢- پشتی بەڵگەکە لە لایەن ئەمیر حسەینخانەوە مۆر کراوە و هە[illegible] باباخانی کوڕی و یەساوڵخان مۆریان کردووە و ڕەزاخانی وەزیری ئەمیر حسەینخانیش [illegible]

به پێچەوانەی بیری ئەو کەسانەی کە دەڵێن ناوی زۆردار و زاڵمەکانی ڕابردووت زیندوو کردۆتەوە. من لەو ڕایەدام کە کاری تۆ جێگای بچووکترین ڕەخنەش نییە، لەبەر ئەوەی ئێوە ویستووتانە ئازایەتی و توانایی عەشیرەتە کوردەکان پیشان بدەن و بە جوانی بۆ هەموان دەرتان خستووە کە گەلی کورد بۆ ڕزگاری باکووری خوراسان چەندە هەوڵتان داوە. واتا ئەو گەلە کوردەکەی کە نزدیك بوو ڕەگەزی خۆیان (کورد بوون) لە بیر ببەنەوە و لە کوردبوونی خۆیان حاشا بکەن وەك چۆن دەڵێن ئەگەر فیردەوسی کتێبی مەزنیشا نامەی نەنووسیایات ئێرانیەکان زمانی خۆیان لەبیر دەبردەوە ئێوە کارێکی وەکو فێردەوستیان بۆ نەتەوەی کوردی خوراسان بەڕێوە برد، بۆیە من لە کانگای دڵمەوە هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

براتان غولامحسەین ڕەحیمیان

٢- برای زانا و کۆڵەرمان بەڕێز ئەحمەد شەریفی مەهابادی کە چەندین ئاسەواریان بە چاپ گەیشتووە و ئەوانیش لە نامەیەکدا بۆ من ئاوەهایان نووسیوە.

«بە ناوی خوا»

برای هێژام بەڕێز تەوەحودی

وێڕای سلاوێکی گەرم، لە ڕێگایێکی دوورەوە دەستت ماچ دەکەم و لە خوای مەزن داواکارم سەرکەوتوبێت خۆشەویستەکەم ئەم نامەیەم لە شارە جوانەکەی سنەوە بۆت نووسی و متمانەشم نییە کە دەگاتە دەستت.

برای خۆم سەبارەت بە کتێبە بەنرخەکەتان «کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان» تێبینی زۆرم هەیە و سەرچاوەی زۆریشم لەبەردەست دایە و بۆیە داواکارم ناونیشانی خۆتم بۆ بەرێ بکە تاکو ڕەوانەی خزمەتتانی بکەم.

برای کوردتان ئەحمەد شەریفی ١٣٦٠/١/٣٠

بەڵام دوای ئەوەی تەنگ و چەڵەمەکانم بۆ برای بەڕێزم کاك ئەحمەد شەریفی دەرخست ئەوانیش جارێکیتر نووسیانەوە.

برانگی مە دەلال کاك تەوەحودی

پاشە گلێك سلاڤان شادی تەژە خودی مەزن دەخازم کتێبایەتەکەریت کردەبۆ، گەهیشتە دەستی من ژەکەرمی تە، تەشەکورێ دەکەم برای هێژام: ئەم چەند وشەیەم بە زمانی کوردی کرمانجی کە لە نێوان کوردەکانی ناوچەی ورمێ تورکیە عێراق سووریە و تا ڕادەیەك لە نێوان کوردەکانی ڕووسیەدا باوە بۆتانم نووسی، بەڵام ئەوەی نازانم کە تا چ ڕادەیەك لەگەڵ زمانی ئێوەدا جیاوازی هەیە؟[٤٥٤]

تەوەحودی گیان لە داهاتوویەکی نزدیکدا چەند بەرگ کتێبی باشت سەبارەت بە مێژووی کوردستان بۆ بەرێ دەکەم و چەند کتێبیتریشت پێ دەناسێنم کە پێم وایە لە کتێبخانەکانی مەشهەد یان تاراندا دەست دەکەون.

١- کتێبی سەرزەمینی زەردەشت یان تاریخی ڕەزاییە نووسراوەی عەلی دێهدار سەبارەت بە مێژووی کورد کە زۆر پڕقازانجە.

٢- کتێبی سەرزەمینی قەزوین نووسراوەی مەنووچێهر وەرجاوەند، سەبارەت بە عەشیرەتی کوردی عەمارلوو.

٣- کارنامەی ئەردەشیری بابەکان، چاپ و ساغکردنەوەی خوالێخۆشبوو سادق هێدایەت سەبارەت بە کوردەکان.

٤- کتێبی گرنفۆن، سەرداری سپای یوونان، سەبارەت بە کوردەکانی سەردەمی هەخامەنشی.

٥- کتێبی شەهریاران گومنام، نووسراوەی ئەحمەد کەسرەوی، سەبارەت بە مێژووی کورد

٦- شەرفنامەی بەدلیسی (ناسنامەی کوردە)

٧- چەند نامیلکەی دیکە سەبارەت بە عەشیرەتەکانی زەعفەرانلوو شادلوو و... کە لە گۆڤاری هونەر و مەردمدا چاپ بووە.

٨- تاریخ عالەمئارای عەبباسی نووسراوی ئەسکەندەربەیگ تورکمان نووسەری تایبەتی شاعەبباس سەبارەت بە قەڵای دمدم و شەڕەکانی ئەمیرخان دژ بە شاعەبباس.

---

٤٥٤- هیچ جیاوازییێك لە نێوان ئەو زاراوانەید کە فەرمووتەنیە

چەند تێبینی:

١- لە لاپەڕەکانی ٤٩-٥٠ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەتاندا نووسیووتانە ئەمیرخان برادۆست لە شاخی شمشێرخانەوە خۆی فڕێ داوەتە خوارەوە نە وەك بە دەستی شاعەبباس بکوژرێت.

بەڵام لەم بارەوە دەبێ بگوترێ کە ئەمیرخان هیچ کاتێ کاری وەهای نەکردووە. چەند کەس لە ژن و منداڵی کوردەکان ئەو کارەیان کرد، بەڵام ئەمیرخان کاری وەهای نەکرد و تا دوایین دڵۆپی خۆینان لەگەڵ هاورێکانیدا بەربەرەکانێی کرد و جگە لە کچێکی ئەمیرخان هەموو کوردەکان لەو شەڕەوا کوژران ئەو کچەش دەرباز بوو پەنای بردە گوندی کۆڵە لە دەرەی قاسملوودا بە ماوەی ٤ ساڵ خۆی شاردەوە و پاشان هاورێ لەگەڵ کوردە موکریەکان و برادۆستەکاندا دژ بە سەفەرییەکان وەستان و جارێکیتر توانیان قەڵای دمدم بگرنەوە کە ئەم باسە زۆر درێژ و بۆ شیکردنەوەی زۆرتری کتێبێکی کوردیتان بۆ ڕەوانە دەکەم و هاوکات شریتێکی کاسێت بەیتی دمدم کە وەکو لۆلۆوەکانی ئێوەیە بۆتانی دەنێرم.

٢- تکایە وێنەی نووسراوی بەڕێز مەحەممەد فەتحی ئەگەر دەکرێ بۆمی بەڕێ بکەن.

٣- سەبارەت بە وشەی ئورمیە کە هەر وەکو ئوورشەلیم و بەشی ئوور بە مانای شارە و شەلیم بە مانای موقەددەسە و هەروەها بەشی میە یا ما لە زمانەکانی عەرەبی و عێبری و سریانیدا بە مانای ئاوە لەبەر ئەوەی ئورمیە لە تەنیشتی زەریاچەی ورمێوەیە.

(٤، ٥، ٦، ٧ و ٨): سەبارەت بە عەشیرەتەکانی گوردانلوو، کوردانلوو و پسرانلوو کە لە ناوچەی شپرانی نێوان سەڵماس و خۆی دایە و سەبارەت بە عەشیرەتی شێخکانلوو و کاوانلوو و میلانلوو و زیلانەکان باس کراوە.

بە سپارسەوە ئەحمەد شەریفی ١٣٦٠/٢/٢٢

نووسەر بە شیعرێك بە ناوی دمدم بە زمانی فارسی وڵامی کاك ئەحمەدی داوەتەوە کە ئێمە وەرگێڕدراوی کوردیەکەیمان بۆتان نووسی.

سڵاو بۆ مەهاباد و کوردەکانی

بە تایبەت سڵاو بۆ کاك ئەحمەدی زانا

سڵاو بۆ پیاوە پیاوانەکانی کوردستان

سڵاو بۆ شێر و پاڵەوانەکان

سڵاو بۆ پیر و لاوی کورد

سڵاو بۆ قەڵای بەناوبانگی کوردستان

سەرانسەری دڵی مێژوو پڕە لە ناوی کورد

هەر لە سەردەمی کاوە و جەمشید هەتاکو سەردەمی ساسانی

سڵاو بۆ زاڵ سڵاو بۆ سام و

سڵاو بۆ شێرە کوردەکان

سڵاو بۆ ئەو کوردانەی بوون بە سنوورەوانی ئێران

دژ بە دوژمن ڕاوەستان

چەند جوان گوتی گزنفۆن کە سەرۆکی سپای ڕۆم بوو سەبارەت بە ئازایەتی کوردەکان

باسی بارامی چووبین ناکەم

کە بە تەشی خەسرەوشای کوشت

هیشتاکو بیستوون لە بەر سام و هەیبەتی فەرهاد دەلەرزێ. ئەو کەسەی کە دەیویست دڵی کێو بلرێنێ بۆ دڵی شیرین

سڵاو بۆ سارۆییرە

شێری شەڕی چاڵدوڕان

سڵاو بۆ خانی لەپزێرین

و سڵاوی ئێمە بگەیەنە بە خاکی شەهیدانی دمدم

و سڵاو و ڕێزی کوردانی خوراسانیان پیێ ڕابگەیەنە

سڵاوی کوردەکانی بجنوورد و قووچان و شیروان و کەلات و چناران

بگەیەنە بە بارزانی و گەورەپیاوانیتر

مەشهەد ١٣٦٠/٣/١٨ تەوەحودی

هەروەها نامەی بەڕێز موحەممەد فەتحی و وڵامی نووسەر کە لەو نامەدا کاک موحەممەد باسی کتێبە بەنرخەکەی نووسەری کردووە و ئەو گلەشی کردووە کە هەر کاتێ لەگەڵ کوردەکانیتردا یەك دەگرن دەبێ بە زمانی فارسی قسان بکەن؟

## کامبووز یا زەعفەرانلوو فیلسۆفی دەشتی وشکی بەلووجستان

دوای چاپی بەرگی یەکەمی کتێبەکەم زۆر کەس بە تایبەت مامۆستا فەتحی هانیان دام تاکو کەسایەتی کامبووزیا بە هەموان بناسێنم.

ئەگەرچی خۆیشم زۆر حەزم لێ بوو ئەم کەسایەتیە بناسێنم و دەمویست بۆ ئەم مەبەستەش پێوەندییێکم ببێ لەگەڵ منداڵەکانی دا، بەڵام ئەگەرچی ناوبراو ١٤ کوڕ و ١٤ کچی بوو قەت سەرنەکەوتم لە یارمەتی منداڵەکانی خوالێخۆشبوو کامبووزیا کەڵك وەربگرم. تەنانەت بەرگێکی کتێبەکەی خۆم بۆ کوڕەکەی بەرێ کرد تاکو لە کتێبخانەکەی بابی دای بنێ، کەچی ئەو کارەش نەکرا. پاشان داوام کرد لە هەڤاڵێکی بەلووچم بە ناوی ڕوودینی تاکو بۆ باس و لێکۆڵینەوە لەسەر خوالێخۆشبوو کامبووزیا ڕەوانەی ئەوێ ببێت، دوای ماوەییێك گەڕایەوە و نووسراوەییێکی لە یەکێ لە کوڕەکانی بەم شێوە بۆمان هێنا:

«ئەمیرتەوەکول کامبووزیا کوڕی ئەمیربابا خان موشیرەدیوان کە ساڵی ١٢٧٨ی کۆچی لە تاراندا هاتە دنیا و لە کوردەکانی زەعفەرانلووی قووچانە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە تاران و مەشهەد خوێندووە و دوایی دەڕواتە تاشکەند لە لقی زانستە ڕامیارییەکاندا درێژە دەدات بە خوێندن.

شارەزایی لەگەڵ چەند زمان بە تایبەت زمانەکانی ڕووسی، فەرانسەوی، عەرەبی ئەڵمانی و... هتددا بووە. لە سەردەمی ڕەزاشادا دەکەوێتە بەر ڕق و قینی پاشاوە و ساڵی ١٣١٤ی کۆچی بۆ شاری زاهێدان دوور دەخرێتەوە و دەبێتە بەرپرسی دایرەی ماڵیەی ئەو شارە و دوای چەند ڕۆژ خۆی لەو کارەش دەدزێتەوە و خەریکی کاری حقووقی دەبێت و درێژە بە خوێندنەوەی ... بە جۆربەجۆرەکان دەدات.

کتێبخانەکەی نزدیکی ٢٥ هەزار بەرگ کتێبی تێیدایە کە ٨٠ بەرگی ئەو کتێبانە دەستنووسن. ناوبراو برایەکی بووە بە ناوی میرزا موحسێنخان کامبووزیا. هەروەها چەندین گۆڤار ﻭ بڵاوگە باسی کامبووزیایان کردووە.

ڕۆژنامەی کەیهان لە ژمارەی ٢٧ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٥٧ی کۆچی هەتاویدا سەبارەت بە کامبووزیا و کتێبخانەکەی وەهای نووسیوە.

درگاکانی ئەم کتێبخانەیە کە ٢٧ هەزار کتێبی لێیە هەر حەوت ڕۆژ جارێك دەکرێتەوە ئەوەش بۆ تەکاندنی تۆزی کتێبەکان.

زاهێدان: هەواڵنێری کەیهان: گەورەترین کتێبخانەی سیستان و بەلووجستان و یەکێ لە گەورەترین کتێبخانەکانی باشووری ئێران هیچ پارێزەرێکی بۆ دانەنراوە و خوێنەران و لایەنگرانی خوێندنیش لێی دوورن.

ئەم کتێبخانەیە بە دەستی کەڵەپیاوێك بە ناوی ئەمیرتەوەکول قووچانی زەعفەرانلووی ناسراو بە کامبووزیا -فیلسووف کەویر- بە پارەی خۆیەوە بنیاتی ناوە و زۆرتر لە ٢٥ هەزار بەرگ کتێبی تێیدایە، کامبووزیا لە سەردەمی خۆیدا زۆر بەناوبانگ بووە و بە داخەوە ٣ ساڵی ڕابردوو کۆچی دوایی کرد و بە پێی وتەی خۆی هەر لە نێو کتێبخانەکەیدا نێژراوە، دوای خۆی ئەمیرحەسەنی کوڕی سەرپەرشتیاری کتێبخانەکەیە. ئەمیرحەسەن بە بۆنەی ئەوەی کاری زۆرە، هەموو کات ناتوانێ لەو کتێبخانەدا بمێنێتەوە و هەر حەوت ڕۆژ یەك جار درگای کتێبخانەکە دەکرێتەوە. لەم کتێبخانەدا ٦٠ بەرگ کتێبی چاپ کراو و ٢١ بەرگ کتێبی دەستنووسی کامبووزیا دێتە بەرچاو. ئەمیر حسەین گلەی لەوە کردووە کە بەو بۆنەی خۆم کارمەندی دەوڵەتم دەرفەتی مانەوەم لەو کتێبخانەدا نییە، تکاکارم لە وەزارەتی فەرهەنگ و هونەر بێت و سەرپەرشتیاری کتێبخانەکە بگرێتە ئەستۆ.

کامبووزیا کە بە ٧ زمانی جۆراوجۆر دواوە لە ساڵی ١٣١٤ بەم لاوە هەر خەریکی کاری کشتوکاڵ بووە.

لاپەڕەی ١٥ی ڕۆژنامەی کەیهان
ڕۆژی یەکشەممە ٢٧ی خاکەلێوە ١٣٥٧ی هەتاوی

بەڵام من (نووسەر) ئەوەی کە سەبارەت بە کامبووزیا بیستوومە ئەوەیە کە دوای ئەوەی ئەم زانایە بۆ زاهیدان دوور دەخرێتەوە لە کەویردا چاڵاو دەکەنێت و لەو هەراوەوشك و قاقڕەدا خەریکی کشتوکاڵ دەبێ. بۆیە خەڵکی ناوچەکە زۆر خۆشیان ئەویست.

هەروەها نامەی بەڕێز حسەین تیامی کە لە زۆر شوێندا ڕەخنەکانی باشن و بڕێ جاریش ڕەخنەکانی جوان نین.

ئیتر ئێمە لە نووسینەوەی نامەکەی بەڕێز حسەین قیامی دوورمان گرت. نامەی بەڕێز عەبدوسەمەد ئەمیرشوقاقی، نامەی بەڕێز ڕای بەهادور هتوورام لە هینده‌وە کە نووسەری مێژووی بەلووجستانە و سەبارەت بە کوردەکانی بەلووجستانی ئێران و پاکستان زۆری باس کردووە و دەڵێ نەتەوەی کورد لە بنەڕەتدا چوار عەشیرەت بوون بە ناوی: چەندوو، بەدەرد، تەوەکولی، و بە زمانەکە زۆر لە مێژووە لە ناوچەی ڕۆژئاواوە کۆچیان کردۆتە ناوچەکانی ئێران و ڕۆژهەڵاتی ئێراندا لەگەڵ بەلووچەکان تێکەڵ بوون.

عەشیرەتی چەندوو دوای ماوەیەکی کورت ڕوویان کردە بەلووجستان و لەگەڵ عەشیرەتەکانی دامەنی و بامەنیدا تێکەڵ بوون.

عەشیرەتی دامەنی لە ناوچەی خاش و ئێرانشاردا دەژین و پاشماوەی ئەم کوردانە لە ئەفغانستان دان بە ناوی کورد ناوبانگیان هەیە.

ناو براو ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات کە عەشیرەتە کوردەکانی بەلووجستان بە هۆی ئاڵوگۆڕی پێکهاتوو و دەسەڵاتەوە کوردبوونی خۆیان لەبیر بردۆتەوە و بەلووچی قسان دەکەن.

ئەمەش ڕەگ و ڕیشەی گەورەکانی کورد تا ساڵی ١٩٠٧ی زایینی

سەردار خۆئیدادخان

سەردار مەلیك دینارخان

سەردار یووسف

سەردار ئەڵڵادنەخان

سەردار یارموحەمـەد

میهمانخان

وەلی موحەمـەدخان

ئەفزەل خان

سەردار مەلك دینارخان

شیـرزەمانخان

بەڵام من پێم وایەکە بامەنی هەر ئـەو کـوردە بامەندیـەکان بـن کـە بەدلیـسی دەڵێـت لـە ناوچەکانی حەما و مەرعەشدا دەژین.

من خۆم پێم وایە کوولاییەکان و بەرە ئاهۆییەکان هـەر کـوردن و هـەر لـەو کوردانـەن کـە هاورێ لەگەڵ باوەگەورەکانی ڕۆستەمدا لە زابولەوە ناوچەی نێوان نوسەیبیـن و زەریاچەی وان بۆ پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران هاتنە ئەو ناوچەیە، دوای هاتنیان بۆ ئێسفەهان.

ڕوویان کردە ستیان و شارێکی نۆییان بنیات نا بە ناوی زابود کە دوایی بوو بە زابول.

کتێبی ئیلات و عەشایر دەڵێ برە ئاهووییەکان بەلووچ نیـن و کـۆچ یـان کـوردن و ئەمانـە لەرەگەزی مەمەسەنیەکانی

نامەی بەرێز جەلیل موقەدوەم کە سپاسی نووسەری کـردووە نامـەی بـەرێز موحەمـمەدی سەمەدی نووسەری کتێبی جـمهووری ١٩٤٢ نامەی بەرێز ئەحـمەبەحری.

و دواییـن نامەش لە لایەن برای خۆشەویست بابـا موحەمـمەدموحەمـمەدیان ئێـسفەراین دانیشتووی تارانەوە گەیشتۆتە دەستمان.

نامەی بەرێز ئیبـراهیم زەنگەنەی قاسمئابادی سـەبارەت بـە عـەشیـرەتی زەنگەنـەش هـەر گەیشتۆتە دەستمان کە ئاماژەیێکی پێ دەکەین، بەڵام سـەرەتا دەبـێ بڵـێم کـە بـەرێز حەقیـر سەبارەت بەم عـەشیـرەتە نووسیوویەتی کـە عـەشیـرەتی زەنگەنـەی نیـاز ئابـاد. وا دیـارە لـە سەرەتای دەسەڵات پەیداکردنی سەفەویەکاندا لـە کرماشـانەوە هاتوونەتـە خـەوافی خوراسـان و قـەڵای نیازئاوایـان بۆیـان چـۆڵ کـردووە و لـەوێ نیـشتەجێ بـوون. نیازئـاوا لـە سـنووری

ئەفغانستانەوەیە ئەگەر پیاوێکی ئەو عەشیرەتە ژنەکەی دەمرد نەیدەتوانی بۆ جاری دووەم ژن بهێنێ. هەروەها هیچ ژنێکی ئەم عەشیرەتە جگە لە نێو قەڵاکە قەت شوێنێ‌تری تا دوایین چرکەی ژیانی نەئەدی. دوایین سەرۆکی ئەم عەشیرەتە ناوی ئەمیرقولی سوڵتان بووە کە ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە.

دوای ئەوەی ئەم نامەی بەڕێز حەقیرەم بینی خێرا خۆمم کۆ کردەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم عەشیرەتە و زەنگم بۆ بەڕێز عەلی ئەکبەر زەنگەنەدا کە لە مەیدان بار بوو. سەبارەت بەو عەشیرەتە پرسیارم لێ کرد و ئەویش گوتی ئێمە بەڵگەیەکمان لە لایە کە تایبەتە بە ئیمان زەینەلعابێدین(د.خ) و بۆیە منیش ڕۆژی دوایی گەیشتمە خزمەتی و بەڵگەکەم بینی و زۆر شتم بۆ ڕوون بووەوە.

بەڵام ئێستا بزانین ڕێزدار ئیبراهیم زەنگەنە سەبارەت بەم عەشیرەتە چی نووسیووە؟ زەنگە دەڵێت: عەشیرەتی زەنگەنە لە گوندی نیازئاوا، قاسمئاوا، ئەسەدئاوا، ئیبراهیمئاوا و شارەکدا نیشتەجێن و لە دەوروبەری هەزار بنەماڵەن و زۆربەشیان خەریکی کاری ئاژەڵدارین و تاقمێکیشان خەریکی کشتوکاڵن ئەم عەشیرەتە موریدی مەبیبی کوڕی مەزاهێران و شانازی بەوە دەکەن کە لاشەی شەهیدانی کەربەلایان کۆکردۆتەوە، بە تایبەت ژنەکانیان و بۆیە ئیمام زەینەلعابێدین زۆریانی خۆش ویستووە و بە پێی فەرمانی ئیمام قەت ماڵیەیان نەداوە.

دەڵێن عەشیرەتی زەنگەنە بە سێ جار کۆچیان کردۆتە ناوچەی خەواف و دەڵێن ئەم کۆچە بە بۆنەی دوو هۆکارەوە بووە: ١- لەبەر ئەوەی عەشیرەتی زەنگەنە لە ناوچەی کرماشان و هەمەداندا هێزێکی زۆری بووە و دەسەڵاتدارەکانی ئێران لێیان ترساون و بۆیە پەلپەلیانیان کردۆتەوە و بۆ خوراسان دوور خراونەتەوە بۆ پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران. لقی یەکەمی زەنگەنەکانی نیازئاوا لە سەردەمی سەفەویە دا لە ناوچەی کرماشانەوە ڕوویان کردۆتە خەواف و زەنگەنەکانی ئەسەدئاواش هەر لەوانن و پێکەوە پێوەندیان هەیە، یەکێ لە کەڵەپیاوەکانی ئەم عەشیرەتە لە سەردەمی کەریمخاندا ناوی جەعفەرخان کورد زەنگەنە بووە.

لقی دووەمی زەنگەنەکان لە گوندی قاسمئاوا دان. دەڵێن لە سەردەمی نادرشادا لە هەمەدانەوە دوور خراونەتەوە و سەرۆکی ئەم کوردانە لەو سەردەمەدا نەورۆزخان بووە کە ٩ کوڕی هەبووە.

لقی سێیەم: ئەو کوردە زەنگەنانەن کە لە سەردەمی شاعەبباسدا دوور خراونەتەوە بۆ مەرو و هەرات و هاوڕێ لەگەڵ نەورۆزخاندا ڕوویان کردۆتە قاسمئاوا، سەرکردەی ئەم کوردانە لەو کاتەدا بەدیعا زەنگەنە بووە و ئەم بەدیعایە خۆشکەکەی ژنی نەورۆزخان بووە، دەڵێن بەدیعا زۆر نەترس و ئازا و لێهاتوو بووە. بەدیعا لە کەبیرکۆدا قەڵاییێکی بە ناوی مەنگان دروست کرد و ئێستاش هەر ماوەتەوە.

زۆر سپاس- ئیبراهیم زەنگەنە

ئێستا بزانین بەڵگەی ئیمام زەینەلعابێدین چیە:

بەڵام ئیمام زەینەلعابێدین فەرموویان مەلك مەحموود، مەلك موحەممەد و مەلك سەعید کە هەرسێکیان کوری سەلمان زەنگەنەن دەبێ بانگ بکرێن و خێرا ئەوانیش حازر کران، ئیمام فەرمووی دەسەڵاتدارەکان بچنە سەر دەسەڵاتی خۆیان. دەسەڵاتدارەکان گوتیان: سووچمان چییە؟ قوربان بۆچی دەرمان دەکەی؟

ئیمام فەرمووی: قەت وا مەڵێن. من زۆرتانم خۆش دەوێت. ئێوە زۆر ڕەنجتان کێشا و هەر لە کەربەلاوە تاکو شام گیانی ئێمەتان پاراست، ماڵی دنیاتان بە بۆنەی ئێمەوە بەجێهێشت و منداڵەمانتان لاشەی شەهیدانی کەربەلایان پاراست تاکو توانیمان بە خاکیان بسپێرین. ئەوان گوتیان: قوربان منداڵەکانمان؟! ئیمام فەرمووی: لە ناوچەی فارسدا دەمێننەوە. ئەوان گوتیان قوربان حەزمان لێیە لە خزمەتی خۆتدا بمێنینەوە. ئیمام فەرمووی: کەڵەپیاوێ لە بنەماڵەی من لە وڵاتی ئێوەدا دێتە دنیا بە ناوی ئیسماعیل حەیدەری کە کوڕێکی دەبێ بە ناوی شاعەبباس و ئێوە دەبنە سەربازی ئەو.

دەسەڵاتدارەکان خەمبار بوون و گوتیان لە منداڵەکانمان غەدر دەکرێ.

ئیمام فەرمووی قەت کەس ناتوانێ غەدریان لێ بکات و هەر کەس کاری وا بکات وەبەر نفرینی ئێمە و ڕەسوول و ئیمام حسێن دەکەوێ.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە خێڵی سەفەوی چەندە فێڵەبازبوون و بۆ ئەوەی شاعەبباس دەسەڵاتی لە دەست نەدات خۆی چەسپاندووەتە بنەماڵەی پێغەمبەرەوە تاکو کوردەکان بەم بۆنەوە چاك سنوورەوانیان بۆ بکەن.

وەك گوتمان کوردەکان چاکترین سنوورەوان بوون. هەر لە کوردەکانی فەلەستینەوە هەتا کوردەکانی لوبنان و سووریە و عێراق و تورکیە و ڕووسیە هەموویان سنوورەوانی ئێران بوون. ئیمپراتووری بەهێزی ساسانی بە دەستی ئەم کوردانە پاسداری لێ دەکرا، پێش ئەنووشیروانیش هەر کوردەکان بوون کە بەرهەڵستی هێرشی داگیرکەران بوون، بە تایبەت کوردەکانی بەلووجستان و پاکستان.

بەڵام بەرێکردنی کوردەکان بۆ سنووری قەفقاز هەر لە سەردەمی ساسانیەکانەوە لە سەردەمی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی ئێراندا بووە هەتاکو سەردەمی سوڵتان موحەممەدی خودابەندە واتا ئەو کاتەی کە تاتارەکان هێرشیان هێنایە سەر ئێران و هاوکات لەزکیەکان و عوسمانیەکانیش پەلاماری ئێرانیان دا. بە واتایەك دەڵێن لەم کاتەدا کوردەکانی پازووکی، چامەشگەزك، شادیلوو، کەڵهوڕ، زەنگەنە و تورکەکانی قاجاڕ لە ناوچەی قەفقازدا بوون و دژبەدوژمن وەستان. ئەگەرچی دوایی شاعەبباس کوردەکانی دابەش کرد بە سێ بەش، بەشێکیانی ڕەوانەی شەڕی لەزگیەکان کرد و بەشێکیتری ڕەوانەی شەڕی عوسمانی و بەشی سێهەمی ڕەوانەی شەڕی تورکمانەکانی باڵخان کرد. ئەم بەشی سێهەمە بوون بە دوو ڕێچکە ١- ئاشاقەش ٢- یووخاریباش. دوای ئەوەی سوڵتان موحەممەد شکستی خوارد و شاعەبباس بوو بە خاوەن دەسەڵات، خێرا ڕووی کردە فێڵبازی و بەو شێوە ٤٥ هەزار بنەماڵەی کوردی ڕەوانەی خوراسان کرد تاکو هەم لە دەسەڵات پەیداکردنیان بەرگری بکات و هەم سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێرانیش لە هێرشی دوژمن بپارێزێ.

دوای ماوەیێك کوردەکانی زەنگەنە و کەڵهوڕی کرماشانی لە قەفقاز دوور خستەوە و ڕەوانەی کرماشانیانی کردەوە، بەڵام دوای ماوەیێك شاعەبباس لەو هەموو هێزە دەسەڵاتدارەی کورد ترسا و بۆیە زەنگەنەکانی ئازەربایجانی ڕەوانەی وڵاتی فارس کرد. دەکرا کوردەکانی لوڕ و بەختیاری و شبانکارە و قەشقایی و... دژ بە شاعەبباس بووەستن و ئیزن نەدەن ئەو هەموو

کوردە زەنگەنە ببەنە ناوچەکەیان، بۆیە شاعەبباس ڕووی کردە ئەو فێڵەیە کە خۆی بە کوڕی ئیمام زەینەلعابێدین بناسێنێ. مێژوو بە ئێمە دەڵێ عەشیرەتی بەنی ئەسەد لاشەی شەهیدانی کەربەلایان بە خاك سپارد، نە ژنە کوردە زەنگەنەکان. بە ڕاستی نەتەوەی کورد دەبێ هەر کڵاو لە سەریان بنێن.

شیل، باڵوێزی ئینگلیز لە ئێران لە سەردەمی ناسرەدین‌شادا ئاماژەیێکی جوانی سەبارەت بە کوردەکانی کرماشان داوەتە دەستەوە و دەڵێ: کەلهوڕ ١٥٠٠ بنەماڵە، گۆران ٣٣٠٠ بنەماڵە، سەنجابی ١٥٠٠ بنەماڵە و زەنگەنەکان ١٠٠٠ بنەماڵەن.

هەروەها سەبارەت بە نیشتەجێ بوونی کوردەکان لە سنووری ڕۆژئاواییەکانی ئێراندا دەڵێ: هەر لە وڵاتی بەغداد و کەرکووك و قەڵاچوالانەوە عەشیرەتەکانی زەنگەنە و موکری و گەڕووس و کەلهوڕ بە ئەندازەی ٨ لك (هەشت سەد هەزار) بنەماڵەن.

لە شوێنێ‌تردا دەڵێ: زەنگەنەکان لە دەوروبەری کرماشان دان.

بەڕێز کەیهان دەڵێ: لە دەوروبەری ٢٠٠ کەسیان لە تالان دەشتی هەلیلاندا دەژین و تاقمێکیشان لە چوارلنگی بەختیاری دان.

ئەمین زەکی بەیگ دەفەرمێ: کوردەکانی زەنگەنەی ڕۆژهەڵاتی ئێران سەرەتا لە ئەفغانستاندا بوون کە دوایی وردەوردە ڕوویان کردە ڕۆژهەڵاتی خوراسان و بەلووجستان.

مەردۆخ دەڵێت: زەنگەنە لە دەوروبەری ٤٥٠ بنەماڵەیەکن کە لە لەوای کەرکووك و خانەقین و کفری و ئیبراهیم خانجی و سووماکی کوردستانی عێراقدا نیشتەجێن. تاقمێکیشیان لە کرماشان و هەلیلان دان.

عەشیرەتی زەنگەنە دوو بەشن: ١- فارس ئاغا ٢- ڕۆستەم ئاغا

شەرەفخان بەدلیسی دەڵێ لە ئەفغانستانیشدا دەبینرێن کە پێم وایە لە ئەفغانستانەوە ڕۆیشتوون.

پێم وایە لەبەر ئەوەی شەرەفخان هاوچەرخی شاعەبباس بووە پێش شاعەبباسیش کوردەکان گوێزراونەتەوە بۆ ئەو ناوچانە.

فەرهەنگی جێوگرافـی ئێران سـاڵی ١٣٢٩ی کۆچی هـەتاوی سـەبارەت بـەم عەشیـرەتە دەنووسێ زەنگەنە گوندێکە لە دەوروبەری ماهیدەشتی سەر بە شاری کرماشان و ١٥٥ کەسـی لێیە. زەنگەنە گوندێکە لە مازانی شاری مەلایر و ١٦٨٠ کەسی لێیە.

زەنگەنە: گوندێکی کولیایی لە سونقوری سەربە شاری کرماشان و ١٩٠ کەسی لێیە

زەنگەنە: گوندێکی سەر بە کازروونە و ٢٩٥ کەسی لێیە.

زەنگەنە: گوندێکی تورکنیشن لە بەشی کەنگانی سەر بە شـاری بووشـێهر و ٢٣٠ کەسـی لێیە.

دێهخودا دەڵێ: زەنگەنەی دەشتستان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی بووشـێهر دان و لـە سـەردەمی سەفەویدا لە کرماشانەوە هاتوونەتە فارسستان.

مەساحێب دەڵێ:

زەنگەنە: گوندێکی سەر بە کەمازانی شاری مـەلایری هەمـەدان و سـاڵی ١٣٣٥ی کۆچی هەتاوی ١٤٠٤ کەسی تێدا ژیاوە و دوو بەشە زەنگەنەی ژوور و زەنگەنەی خوار

زەنگەنـە: نـاوی عەشیـرەتگەلێکی ئێرانیـە کـە لـە کرماشـان و فـارس و خوزوسـتان و کوهگیلوویەدا دەژین. وادیارە سەرەتا لە کرماشاندا بوون. ئەو بەشانەی کە لـە کوهیگلوویـە و خووزستانداﻥ لە دەوروبەری ساڵی ١٠٨٦ی مانگیدا هاتۆنەتە ئەوێ. لە وڵاتـی فارسەکانیـشدا زەنگەنە دەبینیـن و لە ناو قەشقاییەکانیشدا زەن گەنە هەیە.

دەتوانیـن بۆ پیاوی گەورەی ئەم عەشیـرەتەش ئاماژە بکەینە سەر بیژەن نامدار زەنگەنـەی وەزیری نەوتی ئێستای ئێران. (وەرگێڕ)

کوردەکانی خوراسان لە شەڕی ئێرانی دژ بە عێراقدا زۆر پیاوانە شـەڕیان کـرد و دەتوانیـن ئاماژە بکەینە سەر چەند شەهیدێك وەکو شەهید کامران نەجاتوڵڵاهی، دوکتۆر قاسم سـادقی نوێنەری خەڵکی مەشهەد لە مەجلیسی شۆرای ئیسلامی، موحەمـمەد ڕەجـەبزادە، خواجەی مووسەوی ئوولاشلوو، ڕەجـەب ئیـرانپوور، تـاهێر خـەراج کوهنـەئووغازی و عـەلی ڕەجـایی حەمزەکانلوو و... هتد کە بە خوێنی گەشی خۆیان دژ بە فاشێستەکانی ڕژێمی بەعس وەستان و پیاوانە تا دوادڵۆپی خوێنیان شەڕیان کرد.

هەروەها تاقمێك لە سەربازە کوردەکانی ئێران لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا نامەیان بـۆ ڕادیۆی کوردی خوراسـان نووسـیبوو کـە ئێمـە بـە پێویـستی نازانیـــن بینووسـین چۆن بابـەتی مێژوویی نییە.

# ناوەرۆک

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ٢٠٠٦

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێرانی |
| --- | --- | --- |
| ٣٣٧-ئەفسانەی کتێب | کۆمەڵێ نووسەر | یاسین عومەر |
| ٣٣٨-کۆ چیرۆك | ڕەووف بێگەرد | |
| ٣٣٩-قەدری جان | مەریوانی عومەر دەوڵەت | |
| ٣٤٠-ئیتێـك لـە ڕۆژنامـەوانیی کوردیدا | شوان ئادەم ئەیڤەس | |
| ٣٤١-تیشکێك بۆ سەر ڕۆمان | عەبدولڕەحمان مونیف | شیرین.ك |
| ٣٤٢- لە گوڵەوە هەتا سووتوو | شێرکۆ بێکەس | |
| ٣٤٣-محەمەدی قازی کێیەو... | ئا:سەیدعەلی ساڵحی | ڕێباز مستەفا |
| ٣٤٤-ئافاتـــەکانی بنەماڵـــەی مێخەك | عەتا محەمەد | |
| ٣٤٥-فەلسەفەو لاهوت ... | د.حەمید عەزیز | |
| ٣٤٦- دیوانی مەولەوی | | |
| ٣٤٧- لەئەدەبی ڕووسییەوە | | ئەنوەر قادر محەمەد |
| ٣٤٨-لاوێتی لە پیریدا | ئەمین ڕوەیحە | تۆفیق سەعید محەمەد |
| ٣٤٩-فیکری خۆرئاوا | هاشم ساڵح | شوان ئەحمەد |
| ٣٥٠-کلاولارو قەرەچی | د.ئیبراهیم یونسی | ئەحمەد مەولانی |
| ٣٥١-گـەڕان بـە دوای ماناکـانی شیعریدا | عەتا قەرەداغی | |
| ٣٥٢-هەڵدانـەوەی دەفتـەرەکانی شیعرو.... | مەحمود دەروێش | جەمال غەمبار |
| ٣٥٣- ئێستا مەنگو بێگیانە | ئۆکتاڤیۆپاز | ئەدیب نادر |
| ٣٥٤-نیتشەو پاش تازەگەری | د.محەمەد کەمال | |
| ٣٥٥-بازاڕی بۆنفرۆشان | دڵشاد عەبدوڵڵا | |

٣٥٦-بارانی ڕەنگاو ڕەنگ      فەرەیدون عەلی ئەمین

٣٥٧-یادداشتەکانم      پ. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ

٣٥٨- کۆمۆنیزمی ئەوروپایی      فۆڵفگانگ لیۆنهارد      د.کوردۆ عەلی